# سەردەم

## گۆڤارێکی تایبەتە بەوەرگێڕان و کولتوری بیانی

**55**

**هاوینی**

2008

**ســـــاڵی دەیەم**

- سـەردەم گۆڤـارێکی وەرزییـە، تایبەتـە بـە نوسـین و وەرگێڕانـی کولتوری بیانی لە بواری فەلسەفە و رەخنە و زانستە مرۆییەکان و داهێنانی ئەدەبی و ئیستاتیکیدا.
- داوا لەو بەرێزانە دەکەین کە بابەت بۆ سەردەم ئامادەدەکەن، هاوپێچ ناوی تەواوی نووسەر، وەرگێڕ، سەرچاوەو زانیارییەکانی تایبەت بە چاپ و بڵاوکردنەوە، لەگەڵ کۆپییەك لەدەقی ئەسڵیی بابەتی وەرگێردراو بنێرن.
- ئەو بەرێزانەی بە نوسین و ئامادەکردن بەشداریدەکەن پێویستە هەموو مەرجە ئەکادیمیەکان، لە بابەتی میتۆد و سەرچاوەو ئەمانەتی نوسینەوە، پێرەوبکەن.
- باشتر وایە بابەتەکان بە کۆمپیوتەر تایپ کرابن، بە فۆنتی سەحیفە بۆڵد، هاوپێچ لەگەڵ سی-دی و دەقی چاپکراوی بابەتەکەو ئەدرێس و ناونیشانی ئەلیکترۆنی نوسەر یان وەرگێردا.
- ئەو بەرێزانەی لە ئینتەرنێتەوە بابەت وەردەگێرن پێویستە هاوپێچ ناونیشانی تەواوی سایت و لینك و رۆژی بڵاوکردنەوەی سەرچاوە ئەلیکترۆنیەکە بنێرن.
- بەرهەمەکان گەر بڵاوبکرێنەوە، یان نا، نادرێنەوە بە خاوەنەکانیان.
- پەیوەندییەکان لە رێگای سەرنووسەرەوە ئەنجام دەدرێن.


**خاوەنی ئیمتیاز:** شێرکۆ بێکەس

**سەرنووسەر:** رەووف بێگەرد

**سکرتێری نووسین:** شوان ئەحمەد

**دەستەی نووسین**

رێبین هەردی  د. شاهۆ سەعید

**دەرهێنان و کاری کۆمپیوتەری**

تاڤگە فائق

**بەرگ:** نەرمین مستەفا

**هەڵەچنی چاپ:** ساکار رەووف



**ناونیشان**

سلێمانی – شەقامی سالم

دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

تەلەفۆن: سەرنووسەر 2136659

دەزگای سەردەم 3129609

**بۆ پەیوەندیکردن لە دەرەوەی وڵاتەوە**

**Tel - Fax: 0044 7543129839**

ناردنی بابەت لە دەرەوەی وڵاتەوە لە رێی سندوقی پۆستی ژمارە ( ***14665/615* و *14665/616***) تاران

**لە رێگەی (ئیمەیل)ەوە:**

*govarysardam@yahoo.com*

*www.serdam.info*

*www.serdam.net*



دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

# سەردەم

## ناوەرۆكی ژمارە 55



**نرخی ( 1200 ) دینارە**

# تاڵیس یان سەرهەڵدانی فەلسەفە

لە ئەڵمانییەوە: کاوە جەلال

پێدەچێ کەسێك پیر بوو بێ و هەست بکات کۆتایی لە نزیکبوونەوەدایە، ئەو کەسە بکەوێتە نێو دۆخێکی ئەوتۆوە، کە لە ساتێکی ئارامیدا لەبارەی سەرەتاکانی ژیانی خۆی بەرەو پاش بیربکاتەوە. ئەمە فەلسەفەش دەگرێتەوە. تەمەنی ئەو ئێستا دووهەزار و پێنجسەد ساڵە. بێگومان ژمارەی ئەو کەسانە کەم نییە، کە مەرگی بەم زووانەی ئەو رادەگەیەنن" هەروەها کێ ئەمڕۆ خەریکی فەلسەفە بێ، ئەوا پێدەچێ هەندێك جار هەستێك لە لای سەبارەت بەوە سەرهەڵبدات، کە گوایە ئەو شتەی ئەو پێوەی خەریکە شتێکی ماندووکەر و کەمێك لەکارکەوتووە. دەشێ لەم هەستەوە پێداویستییەك بۆ ئەوە بێتە ئاراوە، کە مرۆڤ بۆ رابووردوو بگەڕێتەوە و بەدووی ئەو سەرەتایانەدا بگەڕێ، کە فەلسەفە هێشتا بە تازەیی و هێزی لاوێتییەوە لەنێو سەردەمی خۆیدا بووە.

بەڵام کێ بەم چەشنە لە ساتی سەرهەڵدانی فەلسەفە بتوێژێتەوە، ئەو کەسە دەخزێتە نێو نادڵنیاییەوە، چونکە بۆ رووداوە هۆشەکییەکان دائیرەیەکی باری کەسێتی نییە، کە تۆمارەکانی بەرەو رابووردوو هێندە بڕ بکەن، کە ئیتر مرۆڤ بتوانێ تۆماری ئەو رۆژەی لەدایکبوونی فەلسەفەی تێدا بدۆزێتەوە. کەس بە دڵنیایی نازانێ، کەی فەلسەفە بەڕاستی هاتۆتە ژیانەوە" سەرەتاکەی لەنێو تاریکیی کاتەکاندا بزرە.

بەڵام ترادیسیۆنێکی دێرین دەبێژێ، فەلسەفە لەتەك تاڵیسدا، کە پیاوێکی زیرەکی شارە بازرگانیی ئیۆنیای ئاسیای بچووکی گریکی بوو، سەرچاوەی گرتووە. تاڵیس گوایە لە سەدەی شەشەمی پ.ز. لەوێ ژیاوە و یەکەم کەس بووە لەنێو مرۆڤاندا فەلسەفاندوویەتی. بەڵام بە هیچ شێوەیەك هەموو کۆڕی زانایان لەتەك ئەم تێڕوانینەدا یەك ناگرێتەوە. هەندێك زانا ئاماژە بۆ ئەوە دەدەن، کە ئایدیای فەلسەفییانە لە لای هۆنەرانی سەرەتای گریك شیاوی دۆزینەوەن" ئەوان هێسیۆد یان هۆمێر بە یەکەمین باوکانی فەلسەفە دادەنێن. هەندێکی

دیکە لەمەش دوورتر بەرەو پاش دەگەڕێنەوە و دەبێژن، کە پێشتر لە لای گەلانی ڕۆژهەلأت جۆرێکی فەلسەفە هەبووە، ئەمەش تەنانەت پێش ئەوەی گەلی گریک لەنێو ڕووناکیی مێژوودا دەرکەوتبێ.

بەلأم زانایەکی سەرەتای سەدەی هەژدەیەم، کە ئەندامی "ئەکادیمیای زانستەکان لە بەرلین" ( *Berliner Akademie der Wissenschaften*) بوو، تێڕوانینێکی رادیکالتری لەمە هەبوو. ناوی ئەم زانایە یاکۆب بروکەر بوو، یان، وەك چۆن لەو سەردەمەدا باو بوو، ناوی خۆی دەنا یاکۆبوس بروکەروس. ئەم زانایە لێکۆڵینەوەیەکی لاتینیی قەوارە ئەستوور بە ناونیشانی "مێژووی ڕەخنەیی فەلسەفە، لە بێشکەی جیهانەوە هەتا سەردەمی خۆمان" دەنووسێ. کەواتە سەرەتای فەلسەفە، گەر متمانە بەم زانایە بکەین، دەگاتەوە بە هەرە یەکەمین سەرەتاکان: هەتا بێشکەی، یان بەپێی شیمانەی وەرگێڕانی وشە لاتینییەکەی، هەتا لانکەی مرۆڤایەتی. هەر بەم شێوەیەش لەسەر بەرگی بەندی یەکەمی نووسینەکەی وێنەی دیمەنێکی پێشکات (پێشمێژوو – و) هەیە، کە لەنێویدا ورچێکی هەرە سەرەتایی جیهان بۆ نێو خۆی ڕۆچووە و هاوکات چەپۆکی چەپی دەجوێ. لە سەرووی وێنەکەوە نووسراوە ( *ipse alimenta sibi*)، واتا: "ئەو خۆی خۆراکی خۆیەتی". ئەم ڕستەیەش گوایە ئەو واتایەی هەیە، کە فەلسەفە پێویستیی بە خۆراکی دەرەکی، بە زانست یان بە هونەری پێش خۆی، نییە، بەڵکو ئەو خۆی بۆ خۆی بەسە" بە کورتی: فەلسەفە لەنێو خۆیەوە دێتە ئاراوە، ئەمەیش تەنانەت لەو کاتەدا، کە مرۆڤایەتی هێشتا لەنێو لانکەکانیاتی.

هەر بۆیە یاکۆبوس بروکەروس لە گەڕانیدا بۆ سەرەتاکانی فەلسەفە ناچارە بەردەوام بەرەو پاش بگەڕێتەوە: بۆ پشت گریکەکان، ئینجا بۆ پشت میسرییەکان و بابلییەکان، بەڵێ بۆ پشت تۆفانی نوح، بۆ ئەو کاتەی نێوان ئادەم و نوح، کە مرۆڤایەتی جارێ یەکەم هەنگاوەکانی دەنێ. هەر بۆیە بەشی یەکەمی بەرهەمە قەبەکەی ئەم ناونیشانەی هەیە: "فەلسەفەی پێش تۆفانی نوح". بەلأم بروکەروس بەمەشەوە ڕاناوەستێ، بەڵکو ئەو پرسیارە دەکات، کە داخۆ پێش سەرەتای مرۆڤایەتی، لەنێو فریشتە و دێمۆنەکاندا، فەیلەسوف نەبوو بێ. بێگومان لێرەدا دوای لێتوێژینەوەی تیژمەغزایانە بەو سەرەنجامە دەگات، کە نە فریشتە و نە دێمۆنەکان فەیلەسوفن. هەروەها کاتێك بروکەروس وردتر لە ئادەم و کوڕ و کوڕەزاکانی دەڕوانێ، ئیتر ئەوانیش لە لای دەکەونە ژێر گومانەوە. بێگومان بروکەروس دەتوانێ لە لای ئەوان ئەسەری پەرچاندنی فەلسەفی ئاشکرا بکات، بەلأم ئەم پەرچاندنانە بەس نین بۆ ئەوەی ئادەم و وەچەکانی بە پۆشاکی فەیلەسوف بپۆشرێن، یان وەك بروکەروس خۆی دەبێژێ: ئادەم کاتی نەبووە بۆ مەزەنەگەرایی فەلسەفی. چونکە کێ بە درێژایی ڕۆژ ناچار بێ خەمی پێداویستییەکانی لەشی بچێژێ، کێ، هەروەك بیبل دەبێژێ، ناچار بێ نانەکەی لەنێو ئارەقی ڕوخساریدا بخوات، ئیتر ئەو کەسە، کە ئێوارە داهات، چیدی سەری نابێ بۆ هزرۆکەی قووڵمەغزا.

جگە لەمە یەکەم مێژوونووسی فەلسەفە، ئەڕیستۆتێلیسی مەزن، هەمان تێڕوانینی هەیە. ئەو پەیوەست بەمەوە دەبێژێ، دوای ئەوەی پێداویستییە دەرەکییەکان هەتا ڕادەیەك ساتار

بوو بوون و مرۆڤان کاتیان بۆ شتی دیکە هەبوو، ئیتر دەرفەت بۆ هاتنەئارای زانست و فەلسەفە رەخساوە، ئەم حاڵەتەش بۆ یەکەم جار لە میسردا بووە، ئەمەش بێگومان لە لای کاهینەکانی ئەو وڵاتە. هەر بۆیە ئەمان ماتماتیك و ئەستێرەناسییان دۆزییەوە. بەڵام ئەرِیستۆتێلیس دەبێژێ، کە فەلسەفە، لە مەغزایەکی هەقیقیدا، بۆ یەکەم جار لەلای گریکەکان سەری هەڵداوە، ئەمەش بێگومان لەو کاتدارییەدا، کە جەنابێکی گەورە بازرگان لە شاری دەوڵەمەندی میللەتدا هەیبووە. هەر بەم شێوەیە ئەرِیستۆتێلیس دەگات بەو پنتە، کە تێیدا هەمیشە لە نوێوە سەرەتای فەلسەفە دادەنرێ: دەگات بە فەیلەسوف تاڵیسی میللەتی.

بەڵام مرۆڤ دەربارەی ژیان و جەوهەری تاڵیس زۆر نازانێ. ئەرِیستۆتێلیس وەك بازرگانێکی زیرەك، تەنانەت دەتوانین بڵێین، وەك بازرگانێکی تەماحکار دیاریی دەکات. بەم پێیە رۆژێك تاڵیس هەست دەکات، کە لەوە دەچێ بەرهەمی زەیتون بەتایبەتی لەو ساڵەدا زۆر بکەوێتەوە، ئیتر ئەویش سەرجەمی دەزگاکانی ڕۆنگوشین دەکرِێتەوە و پاشان بە سوویەکی بەرز بەکرێیان دەدات. بێگومان ئەوە جەخت نیە، کە داخۆ ئەم چیرۆکە ڕاست بێ. بەڵام بە پێچەوانەوە ئەوە جەختە، کە تاڵیس بە پرسیارە سیاسییەکانەوە خەریك دەبێ و پاشان ڕوو دەکاتە ماتماتیك و ئەستێرەناسی. تاڵیس لەم بوارەدا دەبێ بە پیاوێکی بەناوبانگ: بۆی دەلوێ بە پێشحسابکارییەکی پوختی خۆرگیرانێك هەستێ و ئاسمانیش لەمەدا بەپیرییەوە دێ: خۆر بەڕاستی لەو ڕۆژە پێشڕاگەیەنراوەدا دەگیرێ.

مێژوونووسێکی هاوچەرخ ئەم هەقیقەتە دەکات بە پاڵهێزێك بۆ ئەوەی ساتی زایینی فەلسەفە بە پوختی دیاری بکات“ ئینجا ئەم ڕستە پوختە دەنووسێ: "فەلسەفەی گریکەکان لە 28ی ئایاری 585ی پێش زاییندا سەرچاوە دەگرێ" – چونکە ئەمە ڕۆژی ئەو خۆرگیرانە پێشڕاگەیەنراوەیە. بێگومان مرۆڤ لە خۆی دەپرسێ، کە دەبێ فەلسەفە چ پەیوەندییەکی بە خۆرگیرانەوە هەبێ، یان تۆ بڵێیت مەسەلەکە ئەوە بێ، کە مێژووی فەلسەفە زنجیرەیەك نەبێ لە ڕۆشنبوونەوە، بەڵکو زنجیرەیەك بێ لە تاریکی؟

جگە لەمە پێدەچێ تاڵیس دانایەکی ڕاستەقینە بێ: پیاوێك کە نەك تەنها بەقووڵی لێدەهزرێ، بەڵکو هەروەها ژیان و شتە شازەکانیشی دەناسێ، ئەمەش لە لایەن پیاوانی متمانەپێکراوی ئەنتیکەوە بە چیرۆکی جوان نیشان دەدرێ: دایکی دەیەوێ قەناعەتی بۆ ژنهێنان پێبهێنێ، بەڵام ئەو وەڵام دەداتەوە: "جارێ کاتی ئەوە نەهاتووە"“ بەڵام دوای ئەوەی بەتەمەنتر دەبێ و دایکی هەمیشە پتر بۆ ئەم مەبەستە سەر دەکاتە سەری، ئەو وەڵام دەداتەوە: "ئێستا کاتی ئەوە بەسەر چووە". بەڵام چیرۆکێکی دیکە لەمەش قووڵمەغزاترە: سەبارەت بەو پرسیارە، کە بۆچی نایەوێ منداڵ دروست بکات، وەڵام دەداتەوە: "لە خۆشەویستییەوە بۆ منداڵان".

بێگومان پێدەچێ حەزەرکردن لە مەسەلەکانی هاوسەرێتی و باوکایەتیدا بە مۆرکێکی شایانی ستایش دابنرێ، بەڵام ئەمانە بەس نین بۆ ئەوەی مرۆڤێك بکەن بە فەیلەسوف. بەڵام ئەوەی پلاتۆن دەیگێڕێتەوە، بەڕاستی فەلسەفییە: "کاتێك تاڵیس چاودێریی

ئەستێرەکانی دەکرد و دیدی خۆی ئاراستەی سەرەوە کردبوو، ئینجا دوای ئەوەی لەم حاڵەتەدا کەوتبووە نێو بیرێکەوە، ئیتر وەك دەگێڕرێتەوە، ژنێکی تراکیایی نوکتەچی و هۆشزەنگین پێی ڕابواردبوو: ئەو دەیەوێ بزانێ چی لە ئاسماندایە، کەچی ئەوەی لێ شارراوەیە کە لەبەردەمی و بەر پێیەکانیدایە". فەیلەسوفی نێو بیرەکە دیاردەیەکی سەیرە. بەڵام پلاتۆن وەرچەرخانێکی جیدی بەم چیرۆکە دەدات و دەنووسێ: "هەمان پێڕابواردن سەرجەم ئەوانە دەگرێتەوە کە لەنێو فەلسەفەدا دەژین. چونکە لە هەقیقەتدا ئەویدی و دراوسێ بۆ کەسێکی بەم چەشنە شارراوە دەمێننەوە، ئەویش نەك تەنها لەوەدا، کە ئەو پێی هەڵدەستێ، بەڵکو نزیکەی لە ئەوەشدا، کە داخۆ ئەو مرۆڤێك بێ یان زیندەوەرێکی دیکە (...). گەر ئەو پێویست بێ لەبەردەم دادگادا یان لە هەر جێیەکی دیکە لەبارەی ئەوە بدوێ، کە لە بەرپێی یان لە پێش چاوەکانیایەتی، ئەوا لێرەدا دەبێ بە مایەی هاتنەئارای پێکەنین، ئەمەش نەك تەنها لە لای ژنانی تراکیا، بەڵکو هەروەها لە لای باقیی گەل" ئەو لە نائەزموونییەوە دەکەوێتە نێو بیر و هەر شێوەیەکی سەغڵەتبوونەوە" ناشارەزاییەکەی مایەی سڵەمینەوەیە و هەستێك سەبارەت بە سادەیەتی بێدار دەکاتەوە". بەڵام ئێستا لە لای پلاتۆن ئەوە دێ کە بناغەییە: "بەڵام کە داخۆ مرۆڤ چی بێ و چ پێهەستانێك و هەروەها چ خەمچێژییەك بە پێچەوانەی زیندەوەرەکانی دیکەوە مۆرکی ئەم زیندەوەرە بێ، ئەمە ئەوەیە کە ئەو بۆی دەگەڕێ و هەوڵی لێتوێژینەوەی دەدات". کەواتە ئێستا مەسەلەکە هەڵدەگەڕێتەوە. پلاتۆن دەیەوێ بڵێ: گەر مەسەلەکە روو بکاتە دادپەروەری و پرسیاری جەوهەرییانەی دیکە، ئەوسا ئەوانی دی شارەزاییان نییە و دەبن بە مایەی پێکەنین" پاشان ئیتر لێرەوە ساتی فەیلەسوف هاتووە.

ئێستا مرۆڤ تێدەگات، کە بۆچی پلاتۆن و ئەریستۆتێلیس، هەروەها زۆر کەسانی دیکەی پاش ئەوان، بە تایبەتی ئەم تاڵیسی میللەتییە بە یەکەم فەیلەسوف دادەنێن. نەك شتەکان، بەڵکو کرۆکی شتەکان کێشەی تاڵیسن. ئەو دەیەوێ بگات بە پاشینەی ئەو شتانە، کە بە شێوەی هەمەلایەنی لەنێو جیهاندا هەن، (...): با و ئەستێرەکان، مرۆڤ، هەروەها کردار و هزری مرۆڤ. تاڵیس دەپرسێ: ئایا جەوهەری هەموو ئەم شتانە چییە؟ پاشان لە پرسیارکردندا بەردەوام دەبێ: ئایا لە کوێوە هەموو ئەم شتانە دێن و لە کوێوە سەرچاوە دەگرن؟ ئایا سەرچاوەی هەموو ئەم شتانە چییە؟ ئایا "یەك" چییە، کە سەرجەم لەخۆ دەگرێ، واتا ئەو پرنسیپە کە وا دەکات سەرجەم ئەمانە ببن و هەن و لە ئارادان؟ ئەمانە پرسیارە بناغەییەکانی تاڵیسن، جا گەرچی لە لایەن ئەو خۆیەوە بەم چەشنە دەربڕرابن. ئینجا کە ئەو وەك "یەکەم" کەسێك ئەم پرسیارانە دادەنێ، دەبێ بە سەرەتاگری فەلسەفە. چونکە پرسیارکردن دەربارەی کرۆك و بناغە لەو کاتەوە هەتا ئەمڕۆ مەبەستە سەنترالییەکەی فەلسەفەیە.

بێگومان تاڵیس وەڵامێکی سەیری ئەم پرسیارە دەداتەوە. وەك دەگێڕدرێتەوە، تاڵیس دەبێژێ، ئاو سەرچاوەی هەموو شتەکانە. چۆن؟ ئایا سەرجەم ئەو شتانە، کە وەك بڕی شێوەکانی جیهان لەبەرچاوماندایە، واتا ئەو کێوانە، ئەو ئەستێرە و ئاژەڵانە، ئێمە خۆیشمان، هەروەها ئەو هۆشەی لەنێو ئێمەدایە، ئایا سەرجەمی ئەمە لە ئاوەوە

هاتووەو بەپێی ناخیترین کرۆکی هیچی دیکە نییە جگە لە ئاو؟ ئەم فەلسەفەیەی سەرەتا بەڕاستی سووڕهێنەرە.

لەوە دەچێ کە تالیس بەهۆی ئەم هزرۆکە بناغەییەوە بێ کە وەك ماتەریالیستێکی پەتی دادەنرێ. ئاو، کەرەسەیەکی ئەستوویی، دەکرێ بە یەکەم پرنسیپ. کەواتە گەر ئەمە ئاوها بێ، ئەوا ئەم فەیلەسوفە دەیەوێ لە ئەستووەوە هەموو شتێك بباتەوە. مرۆڤ دەتوانێ ئەم تێڕوانینە لە هەندێکی کتێبە فێرکارییەکانی مێژووی فەلسەفەدا بخوێنێتەوە. بێگومان هاوکات ئەوەیش دەخرێتە سەر ئەم تێڕوانینە، کە گوایە تالیس جارێ ماتەریالیستێکی پریمیتیڤە. هۆی ئەمە گوایە لەوەدایە، کە توێژینەوەی هەرە پێکهاتە سەرەتاییەکانی ڕوودانگە بە هیچ شێوەیەك تێزەکەی ئەوی تەسدیق نەکردووە" پرسیار سەبارەت بە سەرچاوەییترین پێکهاتەکانی جیهان زۆر ئالۆزترە لەوەی کە بتوانرێ بە گریمانەیەکی سادە وەڵام بدرێتەوە و بگوترێ، گوایە ئاو یەکەم پرنسیپە. کەواتە تالیس ماتەریالیستە، بەڵام هێندە نەبێ، کە چیدی پێویست نییە ئەم تالیسە بە گریمانە بەسەرچووەکەیەوە بە جیدی وەربگیرێ.

بەڵام لەم تێڕوانینەدا بێڕێزییەك بەرانبەر سەرەتای فەلسەفە هەیە و بۆ ئێمە مایەی لێهزرینە. ئایا مرۆڤ لەو ڕستەیەی ئاو وەك یەکەم پرنسیپ بە ڕاستی تێگەیشتووە، گەر وەك نیشانەی ماتەریالیزمێکی فەلسەفی ڕاڤەی بکات؟ گومانەکە بەهێزتر دەبێ، گەر مرۆڤ بۆ پاڵ ئەو ڕستەیە ڕەچاوی ئەوەیش بکات، کە وەك ڕستەیەکی دیکەی تالیس دەگێڕدرێتەوە و بە هیچ شێوەیەك لەتەك ڕاڤەیەکی ماتەریالیستیدا ناگونجێ. ڕستەکەش ئەمەیە: "خواوەندەکان سەرجەم شتەکانیان تەنیوە". ئێستا مەسەلەکە بە ئاشکرا ئەوە نییە کە سەرجەم ڕوودانگە لە یەکەمین کەرەسەیەکی سەرەتاییەوە ڕاڤە بکرێ، بەڵکو ئێستا دەگوترێ: ئەوەی ئێمە لە بەردەم خۆماندا دەیبینین، سەرجەم ئەم جیهانە دیارە، بریتییە لە مەنزڵگای ئامادەیی خواوەندەکان. مرۆڤ بەڕاستی لە جیهان تێناگات، گەر تێڕوانینێکی ئەوتۆی هەبێ، کە ئەو شتانەی ئەو لە دەوری خۆی دەیانبینێ، هەروا سووك و ئاسان شتی هەبوون" ئەو دەبێ ببینێ، کە خواوەندێتی لەنێو جەوهەری شتەکاندا سەروەرە.

کەواتە ئایا تالیس بە دوو ڕستەکەی سەبارەت بە ئاو و خواوەندەکان دوو دەربڕینی دژ بە یەکی داناوە؟ ئاخر وەك ئاشکرایە ئەم دوو ڕستەیە نەسازن بە یەکتری: یان ڕوودانگە کەرەسەی پەتییە یان پڕە لە ژیانی خوایانە. کەواتە گەر لێرەدا یان-یان-ێکی زەق خۆی بنوێنێ، ئەوا ڕاستی لە کام لایاندایە؟ ئەم پرسیارە هەتا بناغەی ڕاڤەی جیهان بڕ دەکات و هەتا ئەمڕۆ بە کۆتایی نەگەیشتووە. مەسەلەکە هێشتا هەنووکە لە دانوستاندنە فەلسەفییەکاندا ڕوو لەوە دەکات، کە داخۆ جیهان لە پرنسیپێکی ئەستوویی پەتییەوە شیاوی تێگەیشتن بێ یان داخۆ ئێمە گەرەك بێ گریمانەی ئەوە بکەین، کە شتەکان هێمای دیاری قووڵترێکن" یان داخۆ جیهان نیشانەی پرنسیپێکی خوایانە بێ کە لەنێو خودی جیهاندا کاریگەرە، بەڵێ تەنانەت دروستکراوی خوایەکی ئەفرێنەر بێ.

بەڵام ئایا مەسەلەکە لەم ڕووەوە لەتەك تالیسی فەیلەسوفی سەرەتادا چۆنە؟ ئایا ئەو

بەڕاستی، وەك تا ئێستا دەردەکەوێ، شتی دژ بە یەکی بەبێ لکاندن بەپاڵ یەکترییەوە داناوە، ئایا ئەو نوێنەرایەتیی پێکەوەنەگونجاندنی کردووە، بەبێ ئەوەی هەست بە دژبێژییەکە بکات؟ یان ئایا دەربڕینەکەی سەبارەت بەوە، کە هەموو شتێك لە ئاوەوە هەڵقوڵاوە، پەیوەستە بەو دەربڕینەی دیکەیەوە، کە دەڵێ شتەکان سەراپا پڕن لە خواوەندان؟ ئایا پێکەوەنەگونجانەکە تەنها لەوێوە دێتە ئاراوە، کە مرۆڤ تێزی ئاو وەك سەرچاوە لە مەغزایەکی مۆدێرنی زانستی-سروشتیدا راڤە دەکات و ئەمەیش وەك هیپۆتێزێك سەبارەت بە یەکەم کەرەسەی ئەستوویی، ئیتر مرۆڤیش لێرەوە لە مەغزا راستەقینە هاوچەرخییەکەیدا لێی تێناگات؟ چونکە پرسیارەکە خۆی زۆر لەوەدا دەبینێتەوە، کە داخۆ تیۆرییەکی زانستی-سروشتییانەی بەم چەشنە لەتەك ئەو جیهاندیدییەدا بگونجێ، کە مرۆڤانی سەدەی شەشەمی پێش زایین هەیان بووە. کەواتە گەرەکە مرۆڤ جارێکی دی لە دەربڕینەکەی تالیس سەبارەت بە واتای ئاو وەك سەرچاوەی سەرجەم شتەکان لێبهزرێ.

لێرەدا ئێستا ئەوە یارمەتیمان دەدات بەرەو پێش بڕۆین، کە ئەرپستۆتێلیس دەربارەی تالیس دەیگێڕێتەوە. بێگومان ئەرپستۆتێلیس بە پوختی نازانێ، کە ئەو یەکەم باوکەی فەلسەفە دەیەوێ لە ڕاستیدا چی ببێژێ، چونکە هەرچۆنێك بێ هەتا کاتی ڕۆژەکانی ئەو نزیکەی سێسەد ساڵ تێپەڕیون. بەلام کاتێك ئەرپستۆتێلیس هەوڵ دەدات بۆ ئەوەی ئەو گوتە تاریکەی ئاو ڕوون بکاتەوە، ئەوا دەبێژێ، کە تالیس لەمەدا بیر لە ئۆکیانۆس دەکاتەوە، واتا لەو لێشاوە سەرەتاییە، کە بەگوێرەی داستانی دێرین بە دەوری زەمیندا دەلێشاوێ و بە باوکی دروستبوونی سەرجەم شتەکان دادەنرێ" هەروەها ڕەنگە تالیس ئەوەش ببینێ، کە لە دێرزەمانەوە دەگێڕدرێتەوە: گەر خواوەندەکان سوێند بخۆن، ئەوا بانگەوازی ستینکس (*Stynx*): ڕووباری مەرگ، دەکەن، ئەو ڕووبارەی مەرگ کە جیهانی زیندەوەرەکان لە جیهانی سێبەرەکان جیا دەکاتەوە. پاشان ئەرپستۆتێلیس بەردەوام دەبێ و دەبێژێ، کە ئەو سوێندە پیرۆزترینە. کەواتە کاتێك ئەرپستۆتێلیس هەوڵ دەدات ڕاڤەی ڕستەکەی تالیس بکات، ئەوا زانینی هەرە دێرینی ئەفسانەیی بێدار دەکاتەوە: هزرۆکەی ئۆکیانۆس و ستینکس، لێشاوە (*Fluß*) هەرە سەرەتاییە ئەفسانەییەکان و پیرۆزیی جادووییانەی سوێندەکە. ئێستا ئەوە ڕوونە، کە ئەرپستۆتێلیس دەیەوێ ڕووەو کوێمان بەرێ. گەر تالیس دەربارەی ئاو بدوێ، ئەوا ئەو سەبارەت بە کەرەسەیەکی هەرە سەرەتایی ئەستوویی ناهزرێ، بەڵکو سەبارەت بە دەسەلاتی ئەفسانەیی ئەو شتە کە سەرچاوەییە" تالیس سەبارەت بە خواوەندێتیی سەرچاوە دەهزرێ. ئینجا ڕستەکەی دووەمی تالیس، کە دەڵێ هەموو شتێك پڕە لە خواوەند، بەبێ کەلێن دێتە پاڵی. بەلام کە ئەمە ئاوهایە، ئەوا واتایەکی ئەوتۆ ناگەیەنێ، کە گوایە لێرە پارچەیەك ئەپۆلۆن و لەوێ پارچەیەك زیوس هەبێ، بەڵکو ئەو واتایە دەگەیەنێ، کە: هەر شتێك کە هەیە (*ist*)، بە هێزی خواوەندییانە تەنراوە. ئێمە لە هەر کوێ بفەلسەفێنین، ئەوا بۆمان نییە هەر وا ئاسان لە جیهان بڕوانین، کە ئیتر هەر وەك جیهان لە بڕێك شتی پاڵیەکی

پێکهاتبێ، بەڵکو (...) لەنێو جیهاندا پرنسیپێکی یەکایەتی، خواوەندێتییەکی بەهێز، کاریگەرە، هەر لە ئەویشەوە سەرجەم ئەو شتانەی کە هەن سەرچاوە و هەبوونی خۆیان وەردەگرن.

بەڵام ئایا بۆچی تاڵیس لە وێنەی ئاودا لە خواوەندێتیی سەرچاوە دەڕوانێ؟ بناغەی ئەمە، هەر وەك ئەریستۆتێلیس بۆی دەچێ، لەوەدایە، کە سەرجەم زیندوویەتیی نێو جیهان خۆی بەڕێی ئاودانەوە لە ژیاندا دەهێڵێتەوە. هەرە بناغەی خواوەندییانە، بە هەمان شێوەی ئەم ئاوە، زیندوویەتی لەنێو شتەکاندا دەهێنێتە گۆڕێ: کاتێك بناغەی خواوەندی هەموو شتێك دەتەنێ، ئەوا ئیتر بەم تەنینە زیندوویەتی بە هەموو شتێك دەدات. بەم شێوەیە ڕستەکەی تاڵیس، کە دەڵێ هەموو شتێك لە ئاوەوە هاتۆتە ئاراوە، دەیەوێ ئەم واتایە بگەیەنێ: لەنێو سەرجەم ڕوودانگەدا (فاکتیسێتیدا) کارانگەرییەکی خواوەندییانە سەروەرە و بە هەمان شێوەی ڕوبارە هەرە سەرەتاییەکانی (*Urströme*) ئەفسانە خاوەنی پڕهێزییەکی سەرچاوەییە و بە هەمان شێوەی ئاوی ژیانهێڵەرەوە هەموو شتێك دەتەنێ.

ئێمە بەم پێیە شتێکی چەسپێنەر بۆ تێگەیشتن لە کرۆکە سەرەتاییەکەی فەلسەفە دەستگیر دەکەین. ئەم فەلسەفەیە بە پرسیارکردن و تیۆریی زانستی–سروشتییانەی سەرەتایی (پریمیتیڤ) سەرەتا ناگرێ. کێشەی ئەم فەلسەفەیە بەتایبەتی لەوەدایە، کە دەیەوێ لە سەردەمێکدا، کە هێزی ئەفسانە خەریکە لەکار بکەوێ، ئەوە بهێڵێتەوە، کە ئەفسانە لەبارەی دەیزانێ: بێگومان لە فۆرمێکی گۆڕدراودا بیهێڵێتەوە، ئەمەش بریتییە لە فۆرمی پرسیارکردنی تایبەتی سەبارەت بە سەرچاوەیەتی و خواوەندێتی.

بەڵام ئایا ئەوە چییە، کە فەلسەفاندن لە سەرەتاکەیدا دەتوانێ لە ئەفسانەوە وەریبگرێ؟ ئەمە ئەوەیە، کە تاڵیس دەیەوێ بە وشە مەتەڵئاساکانی دەریببڕێ: جیهان خاوەنی قووڵییە. گەر مرۆڤ ئەو ئەفسانە هەرە دێرینانەی گریکەکان تەنها وەك چیرۆکی سەرسووڕهێنەر لەبارەی گیاندارە ئەفسانەییەکان (*Fabelwesen*)، کە ناو دەنرێن خواوەند، وەربگرێ، ئەوا زۆر بەڕواڵەتی لێیان تێگەیشتووە. کاتێك گریکەکان لەبارەی خواوەندەکانیان دەدوێن، ئەوا بەمە مەبەستیان لە قووڵایی پاشینەیی رودانگەیە (*das Wirkliche*). ئەوان ئەزموونی ڕوودانگەی ناکۆکی دەکەن، کە سەرجەم کایەکانی جیهان دەگرێتەوە، ئینجا ناوی خواوەند ئارێس–ی لێدەنێن. ئەوان ئەزموونی کشوماتیی پڕسامی (دێمونیانەی) نیوەڕۆ دەکەن و ناوی خواوەند "پان"ی لێدەنێن. ئەوان دەیانەوێ بەم ناولێنانە ببێژن: خواوەندێتی بریتییە لە پاشنەی سەرجەم رودانگە. ئامادەیی خواوەندێتی بریتییە لە رودانگەی ڕاستەقینەی رودانگە.

ئێستاش فەلسەفەی سەرەتاگر ئەم بنەمایە دەکات بە پنتی دەرچوون. ئەم فەلسەفەیە بێگومان چیدی ناتوانێ لەنێو ڕاستەوخۆیەتیی چیرۆکە ئەفسانەییەکانەوە ئەوە وەربگرێ، کە لەو چیرۆکانەدا دەبێژرێ. فەلسەفە لە سەردەمێکدا سەرچاوە دەگرێ، کە تێیدا پێشبینییە ئایینییەکان لەلای مرۆڤ گومانشیاویان لێدەرچووە و مرۆڤیش لەم سەردەمەدا دەبینێ، کە ئەو دەبێ خۆی پرسیار

بکات و لێبهەزرێ. بەڵام ئێستا فەلسەفە هەوڵ دەدات، کە لەنێو ئەم پرسیارکردن و لێهزرینەدا ئەوە بهێڵێتەوە کە لەنێو زانینی ئەفسانەیی و ئایینیـــدا وەك هەقیقـــەتی ڕاســـتەقینە شاردراوەتەوە. لێرەشدا فەلسەفە ئەمە ئاشکرا دەکات: ڕاستیی دێرین و ماوە ئەوەیە، کە سەرجەم ڕوودانگە نەك تەنها ڕوخسارێکی پێشینەیی هەڵدەگرێ، بەڵکو هەروەها لە پاشینەیدا بە قووڵترێك تەنراوە.

لێتوێژینەوەی ئەم کێشەیە لەو کاتە بەدوواوە بریتییە لە سۆزی پرسیارکردنی فەلسەفی. چونکە ئەمڕۆش فەلسەفە لە هەمان ئەو دۆخەدایە کە ئەوسا لە سەرەتاکاندا تێیدا بوو، ئەمڕۆش هێشتا هەر لە خەریکبووندایە لەتەك زانینی ئایینیدا، ئەمڕۆش هێشتا هەر، بەڵێ بە تایبەتی ئەمڕۆ، مەترسییەك بۆ ئەوە لە ئارادایە، کە فەلسەفە لەنێو ئەم هەڵوێستە بەرهەڵستیکەرەیدا بکەوێتە ڕاڤەیەکی پەتیی ئەمدنیاییانەی جیهان و بۆ ئەم ڕاڤەیەش بێگومان هیچی دیکە جگە لە شتە ئەستوورییەکان نییە. بەڵام گەر فەلسەفە بخزێتە نێو ئەم کارەوە، ئەوسا ئەوە دەدۆڕێنی، کە لە سەرەتادا خاوەنی بوو: زەرووڕەی پرسیارکردنی ڕۆچوو بۆ نێو قووڵایی و بۆ نێو بناغە هەرە سەرەتاییەکان. هەتا ئەمڕۆ هێشتا هەر ئەرکی فەلسەفە لەوەدایە، کە ئەم جۆرە پرسیارکردنە بۆ خۆی بهێڵێتەوە و سەرباری ئەمەیش تەسلیمی بڕوا (ئیمان — و) ی پەتی نەبێ، بەڵکو خۆی ساغکردنەوەی پرسیارکەرانەی سەرچاوە بمێنێتەوە.

بێگومان ئەمە ئەرکێکی مەزن و گرانە. چونکە جیهان هیچ سەرچاوەیەك لە خواوەندێتییەوە پیشانی یەکەم دید نادات. ئەوەی ئێمە سەرەتا دەیبینین، بریتییە لە دژەوازییەکی تراژیدییانەی زایین و مەرگ، دروستبوون و لەناوچوون. ئایا ئیتر چۆن مرۆڤ بتوانێ گریمانەی ئەوە بکات، کە بناغەی ڕودانگەیەکی ئاوها داوەشاو لەنێو خواوەندێتیدایە، ئێمەش بە هزرینمان وەك ئەزەلی و بەدەر لە سەرجەم ناکۆکیی دروستبوون و لەناوچوون وەریبگرین؟ ئایا چۆن دەشێ ئەزەلییەت بناغەی لەناوچوون بێ؟

لێرەوە پرسیارکردنی فەلسەفی سەرچاوە دەگرێ، ئەمەیش هەر لە سەرەتاکەیەوە. ئەوە ئەزموونی بناغەیی گریکییانە و هاوکات ئەندێشەی قووڵی مرۆڤی گریکییە بەهۆی جیهانەوە، ئەویش کاتێك ئەو دەبینێ، کە ڕوودانگە لەنێو سەرجەم جوانییەکەیدا کەوتوتە بەر مەترسیی بەردەوامی مەرگ و هیچێتییەوە. بەڵام هۆشی گریکی لەنێو چۆکدادانێکی (ڕێزیگناسیۆنێکی) کپدا بەرانبەر ئەم لێڕوانینەی جیهان سست نابێ" هۆشی گریکی بە هەوڵێکی سۆزمەند هەڵدەستێ، تاکو لە ئەسپێکتی خواوەندێتییەوە قووڵتر لە نهێنیی جیهانی تایبەتمەند بە لەناوچوون تێبگات.

بەڵێ ئەمەیە کە لە فەلسەفاندنی سەرەتایی گریکیدا ڕوودەدات. گەر تالیس سەرچاوەی خواوەندییانەی جیهان لەنێو وێنەی ئاودا ببینێ، ئەوا بەم هەڵوێستەی دەیەوێ لە ئەزەلییەتەوە وەڵامی پرسیارەکە سەبارەت بە هۆی لەناوچوون بداتەوە. چونکە با ئاو هەمیشە هەر ئەوە بمێنێتەوە، کە ئەو ئەوەیە، واتا هەر ئاو بێ، بەڵام ئاو خۆی هەمیشە لە شێوەی جیاوازدا پێشان دەدات: جارێك وەك هەڵم، جارێك وەك سەهۆڵ و بەفر، جارێك وەك چەم و دەریا. گەرچی ئاو خۆی بۆ شێوە جیاوازەکانی

دیارددانی وەردەگۆڕیٚ، بەڵام ئاو هیٚشتا هەر هەمان شت دەمیٚنیٚتەوە. ئەم مەسەلەیە لەتەك خواوەندیٚشدا هەر بەم چەشنەیە. خواوەندیٚتی ئەزەلییە و هەمیشە خۆیەتی، بەڵام ئەو سەرباری ئەمەیش خۆی وەردەگۆڕیٚ، هەر لەبەر ئەم هۆیەشە کە پیٚی دەکریٚ سەرچاوەی ئەوە بیٚ، کە بەردەوام دروست دەبیٚ و لەناو دەچیٚ: سەرچاوەی جیهانی ڕودانگەیی بیٚ.

ئەناکسیماندەری شاگردی تالیٚس قووڵتر سەبارەت بەمە لیٚدەهزریٚ. گەر ئیٚمە بۆمان هەبیٚ لەو هەواڵە کەمانەوە، کە سەبارەت بە ئەو ماونەتەوە، دەرەنجام دەربکیٚشین، ئەوا دەبینین کە دروستبوون و لەناوچوون بریتین لە پنتی سەرەتاگریی فەلسەفاندنەکەی ئەناکسیماندەر سەبارەت بەوە، کە شتیٚك دیٚتە نیٚو لیٚرەبوونەوەو سەرلەنویٚ دیار نامیٚنیٚ، کە ئیٚمە خۆمان دروست دەبین و لەناو دەچین، کە سەرجەمی جیهان بریتییە لە جیٚگەیەکی مەزنی ڕووداوی زایین و مەرگ. ئایا چۆن مرۆڤ لەوە تیٚبگات و سەرباری ئەمەیش روانگەیەکی ئەوتۆ وەربگریٚ، کە بناغەی جیهان لەنیٚو ئەزەلییەت و خواوەندیٚتیدایە؟

کاتیٚك ئەناکسیماندەر لەم کیٚشەدا قووڵ دەبیٚتەوە، دەگات بە ڕاڤەیەکی مەزنی ڕودانگە. ئەو دەبیٚژیٚ، لەناوچوونی شتیٚك ڕوودانیٚکی بەڕیٚکەوت نییە، بەڵکو بریتییە لە پەشیمانی و هەقدانی تاوانیٚك (گوناهیٚك – و). مردن واتای هەقدانی تاوانیٚك دەگەیەنیٚ. بەڵام ئایا ئەم تاوانە چییە؟ ئەم تاوانە خۆی لەوەدا دەبینیٚتەوە، کە هەموو شتیٚك دەخوازیٚ، سەرباری ئەو سنوورەی بۆی دانراوە، خۆی لەنیٚو لیٚرەبووندا ڕابگریٚ، بەڵام بەم کارەی بە تاوان لە دژی شتانی دیکە هەڵدەستیٚ، ئەویش چونکە شویٚنی ئەو شتانەی دیکە دەگریٚ و بەمەش شیمانەی هاتنە نیٚو لیٚرەبوونیان لیٚ دەسیٚنیٚ. سەرجەمی جیهان لە ڕوانگەی ئەناکسیماندەر شەڕیٚکی گەورەیە لە پیٚناوی بووندا. خۆڕاگر ڕیٚ لە هاتوو دەگریٚ بە لیٚرەبوون بگات، بەڵام لەبەرئەوەی بەم کارە، کە لە دژی هاتنی ئەو ئەنجامی دەدات، تاوانبار دەبیٚ، ئەوا زەرروورەی مەزن ریٚ بۆ لەناوچوونی خۆش دەکات و هەر بەم ڕیٚیەشەوە شویٚن بۆ سەرەتای شتە نویٚکان دەهیٚنیٚتە ئاراوە.

دۆخی جیهان ئاوهایە. بەڵام بۆ ئەناکسیماندەر هیٚشتا هەر ئەسپیٚکتیٚکی قووڵتر هەیە. کیٚشەکە لە کۆتاییدا ڕووناکاتە تاوانی شتیٚك لە دژی شتیٚکی دیکە، بەڵکو ڕوو دەکاتە تاوانیٚك لە دژی خودی سەرچاوەی خواوەندیٚتی. گەر هۆی دروستبوونی سەرجەم هەبووەکان (*das Wirkliche*) بۆ ئەم سەرچاوە خواوەندییە بگەڕیٚنریٚتەوە، ئەوا ئیٚمە دەبیٚ لە ئەو وەك پرنسیپی زیندوویەتی و هەمیشە بەردەوام و داهیٚنەرانە تیٚبگەین، یان، وەك چۆن ئەناکسیماندەر ناوی دەنیٚ، وەك بیٚسنووری و بیٚدوایەکیٚتی لیٚیتیٚبگەین. ئیٚستاش گەر شتەکان خۆیان لەنیٚو لیٚرەبووندا بسرەوتیٚنن و لیٚرەشەوە ریٚ لە شتانی دیکە بگرن بیٚنە نیٚو لیٚرەبوونەوە، ئەوا ئەمە واتایەکی ئەوتۆ دەگەیەنیٚ، کە بیٚدوایەکیٚتی چیدی ناتوانیٚ ئەوە بیٚ کە ئەو خۆی لە کرۆکەوە ئەوەیە: زیندوویەتیی داهیٚنەرانە و زاییٚنەری بەردەوام نویٚ لەنیٚو خودی خۆیەوە. ئەو خۆی ئەوسا نەبزۆك و مردوو دەبیٚ. کەواتە نەمانی شتەکان، واتا ئەم لایەنە سەرسووڕهیٚنەرەی ڕوودانگە، لە رووی خواوەندیٚتییەوە رووداویٚکی ڕەوایە. شتەکان کە واز لە خۆڕاگرتنیان ناهیٚنن، دەبیٚ

بمرن، ئەویش بۆ ئەوەی بێدوایەکێتی بتوانێ زیندوویەتییەکەی خۆی بهێڵێتەوە. لەناوچوون، کە مەتەڵە مەزنەکەیە چ بۆ فەلسەفاندن و چ بۆ مرۆڤ، مەغزاکەی خۆی لە لەناونەچوونی زیندوویەتیی خواوەندییانەوە وەردەگرێ. ئەمەش بریتییە لە هزرۆکە قووڵمەغزاکەی ئەناکسیماندەر، کە لە تاکە فراگمێنتێکی گەورەدا، کە وەك بەرهەمی ئەو ماوەتەوە، دەریدەبڕێ: "سەرچاوەی شتەکان بریتییە لە بێدوایەکێتی. بەڵام لەکوێدا دروستبوونی شتەکان دێتە ئاراوە، هەر لەوێشدا بە زەروورە لەناودەچن، چونکە ئەوان بۆ یەکتری بەپێی ڕێکخستنی کات هەقی بێدادییەکەیان دەدەن".

بێگومان فەلسەفە، لە مێژووی درەنگتریدا، لە ڕاڤەکانی تالیس و ئەناکسیماندەر تاکە وەڵامێکی گونجاو بۆ پرسیارەکانی خۆی تێناگات، بەڵکو بە شێوەیەکی هەمەلایەنی هەوڵ دەدات چارەسەری نوێ بۆ ئەو کێشانە بدۆزێتەوە. بەڵام لێرەدا پرسیارەکەی سەرەتا هەر دەمێنێتەوە. هەر بۆیە فەلسەفە هەمیشە لەنوێوە، لە پنتە گرنگەکانی وەرچەرخانی مێژوویی خۆیدا، سەرەتاکەی خۆی دەهێنێتەوە یاد و بە ڕاستەوخۆییەکی نوێ پرسیارەکە لەبارەی بناغەی ڕەهای ڕوودانگە و سەرهەڵدانی لەناوچوون لە لەناونەچوونەوە دەکات. ئاخر ئەمە بریتییە لە پرسیارە بناغەییە مەزنەکەی فەلسەفە و هەر ئاوهایش دەمێنێتەوە. چونکە فەلسەفە لە جیهان و شتەکان و مرۆڤ دەڕوانێ. بەڵام ئەوەی فەلسەفە لە کۆتاییدا دەربارەی دەپرسێ، بریتییە لە قووڵایی جیهان.

گەر مرۆڤ ڕەچاوی ئەوە بکات، کە هزری فەیلەسوفەکان لە کاتی تالیسەوە: لە کاتی ئەو یەکەم مێتافیزیکییەوە، بەبێ وەستان بە دەوری سەرچاوەدا دەسووڕێتەوە، ئەوا ئیتر ئەو کێشەیە چیدی بۆ ئەو مایەی ورمان نابێ، کە مرۆڤانی بەم چەشنەی وەك تالیس هەندێك جار ناتوانن ئاگامەندییەکی پڕ و گشتی ئاڕاستەی ئەم جیهانە بکەن، هەر بۆیە دەشێ ئەوەیان بەسەردا بێ، کە بەسەر ئەودا هاتووە: ڕەنگە ئەوان ئەو چاڵە نەبینن، کە لەبەر چاویاندایە و بۆیە دەکەونە نێوییەوە. تەنانەت دەشێ مەسەلەکە بە چەشنێك بکەوێتەوە، کە ئەو کەسەی لە قووڵایی جیهان دەکۆڵێتەوە، ئیتر زەوی ژێر پێیەکانی خۆی بدۆڕێنێ. جا با ژنانی تراکایی بەو حاڵەتە هەر پێبکەنن. بەڵام کێ موجازەفەی ئەوە نەکات، کە ئەو بناغەیە بدۆڕێنێ کە ئەو خۆی لە سەری وەستاوە، ئەمەش بێگومان بەو هیوا جەسوورەوە، کە بە بناغەیەکی قووڵتر و جەختتر بگات، ئەو کەسە هەرگیز نازانێ کە فەلسەفاندن لە هەرە سەرەتاکانییەوە چ واتایەکی هەیە.

**سەرچاوە:**

*Wilhelm Weischel: Die philosophische Hintertreppe München 2003*

# پرۆژەی تێگەیشتن و راڤەکردنی ئاین (سۆسیۆلۆژیا و ئاین)

دانیال هیرڤیۆلێژی و ژان پۆل ویلیەم

لە فەرەنسییەوە: عادل باخەوان

## بەشی چوارهەم

### ماکس ڤێبەر
(1920-1864)

**1- پێکهاتەی ئاینی مۆدێرنیتێی رۆژئاوا، عەقلاَندن و کاریزما:**

ڤێبەر ساڵی 1864 لە شاری *Erfurt* لەدایکبووەو لە نێو خێزانێکی بۆرژوادا گەورە بووە. باوکی، کە قازی/ دادوەر بوو، یەکێك بوو لە کەسایەتیە ناودارە سیاسیەکان و وەك ئەندام پەرلەمان کاریکردووەو، پیاوێکی بۆرژواو دەوڵەمەند بووە. دایکیشی ئافرەتێکی رۆشنبیرو خاوەنی کولتورێکی فراوانبووە.

پاش تەواوکردنی ناوەندی و ئامادەیی، ڤێبەر بەوردی دەست دەکات بە خوێندنی ماف، مێژوو، ئابوری سیاسی، فەلسەفە، تیۆلۆژی. سەرەتا لە شاری *Heidelberg* و پاشان لە *Strasbourg* و *Berlin* و *Gottingen* کاروانی خوێندنی دەخاتە سەر رێگای درێژی زانست.

ساڵی 1889 دوکتۆرایەك لەسەر مێژووی کۆمەڵگە بازرگانیەکان لە چاخەکانی ناوەڕاستدا بەدەست دەهێنێت. ساڵی 1892 دەستدەکات بە وانە وتنەوە لە زانکۆی بەرلین. ساڵی 1894 لە زانکۆی *Fribourg* دەبێت بە مامۆستای ئابوری سیاسی. ساڵی 1869 هەمان وانە لە زانکۆی *Heidelberg* دەڵێتەوە.

لە ساڵی 1888 وە ئەندامی (رێکخراوی سیاسەتی کۆمەڵایەتی/ *Association pour la politique sociale*) بووە. لەسەر داوای ئەم رێکخراوە، ساڵی 1892 توێژینەوەیەکی 900 لاپەرە لەسەر هەلومەرجی جوتیاران

لــــه ئــــەڵمانیادا، لــــه ڕۆژهــــەڵاتی *Elbe*، ئامادە دەکات.

ساڵی 1903 پاش هەڵچون و تورەبونێکی توند، واز لە وانە وتنەوە دێنێت و لەگەڵ *Edgar Jaffe* و *Werner Sombart* دا دەست دەکات بە بڵاوکردنەوەی گۆڤارێك لەسەر زانستە کۆمەڵایەتیەکان. هەر لەم گۆڤارەدایە کە ماکس ڤێبەر بابەتە بەناوبانگەکەی لەسەر "بابەتیبوونی وشیاری لە زانستە کۆمەڵایەتی و زانستە سیاسیەکاندا" بڵاودەکاتەوە[1].

هەر لەم گۆڤارەدا و بۆ یەکەمجار توێژینەوە بەناوبانگەکەی لەسەر (ئەخلاقی پرۆتیستانت و ڕۆحی کەپیتالیسم) بڵاوکردەوە، (1904–1905). بەشی دووەمی ئەم توێژینەوەیە دوای سەفەرێك بەهاوڕێیەتی *Ernst Troeltsch* بۆ وڵاتە یەککگرتووەکانی ئەمەریکا، لە دێسەمبەری 1904 دا، دەنووسێت.

لە ساڵی 1906دا، ڤێبەر لە گۆڤاری *Die Christeliche Welt* توێژینەوەیەك لەسەر "سێکت"ەکانی ئەمەریکای باکور بڵاودەکاتەوە. ساڵی 1906 لەگەڵ جۆرج زمیل و فێردیناند تۆنی (سۆسیۆلۆژیای کۆمەڵگەی ئەڵمانی) دادەمەزرێنێت. لە نێوان 1911–1914 دا ڤێبەر توێژینەوەیەك لەسەر (ئەخلاقی ئابوری ئاینە جیهانیەکان) ئامادە دەکات و لە گۆڤاری *Archiv fur Soyialwissenschaft* دا بڵاودەکاتەوە. لە نێوان 1917–1919 دا توێژینەوەیەکی دیکە لەسەر (جودایسمی ئەنتیك) بڵاودەکاتەوە.

تا لە ژیاندا بوو، ماڵی ماکس ڤێبەر هەمیشە ژوانگەی گەورە زانایانی وەك جۆرج زمیل و ڤێرنەر زۆمبارت و کارل یاسپرس و جۆرج لۆکاش و ئێرنست ترۆلتش بوو. ڤێبەر لە هەلومەرجێکی تەواو تایبەتی خێزانیدا پەروەردەبوو. باوکی زۆر بە کەمی گرنگی بە ئاین دەدا، بەڵام دایکی، بە پێچەوانەوە، ئافرەتێکی پابەند بوو بە ئاینەوە. لە نێوان ئەم دوانەشدا دێباو دیالۆگ لەسەر ئاین کردەیەکی نەوەستاو بوو. ڤێبەر لە نێو ئەم پرۆسێسەدا گەورەبوو.

هەروەها ڤێبەر هاتوچۆی (کۆنگرەی کۆمەڵایەتی پرۆتیستانت)ی دەکرد. ئەم ڕێکخراوە لەلایەن هەموو ئەو تیۆلۆگ و سۆسیۆلۆگ و ئابورینا سانەوە دروستبوو بوو کە گرنگیان بە ئیشکالیەتی "کۆمەڵایەتی" دەدا. پاش هەڵوەشانەوەی یاسای ئەنتی – سۆسیالیست، بارەگای ئەم کۆنگرەیە دەبێت بە مەڵبەندی دیالۆگی بەنرخ لەسەر ئیشکالیەتی "سۆسیال – دیمۆکراسی".

ڤێبەر پەیوەندی نزیکی هەبوو لەگەڵ چەندین پیاوی ئاینیدا، بەتایبەتی لەگەڵ فردریك نۆمان (1860–1919)دا. کە دواتر دەبێت بە یەکەم سەرۆکی پارتی دیمۆکراتی ئەڵمانی. لە نامەیەکیدا بۆ نۆمان، ساڵی 1909، دەنووسێت:

"گومانی تێدا نیە کە من خاوەنی (گوێی) ئاینی نیم، هەروەها نە دەتوانم و نە پێویستیشم بە بیناکردنی عەرشێکی ڕۆحیە لە هەناومدا. بەڵام بەپێی تاقیکردنەوەی خودی خۆم، دەزانم کە من نە دژە – ئاینم و نە بێ – ئاینیشم"

تەواو بە پێچەوانەی جۆرج زمیلەوە، هەست بەوە دەکەین کە پەیوەندی ڤێبەر بە ئاینەوە لەسەر بنەمای نائاینی و دژە ئاینی

دانەمەزراوە، بەڵکو جۆرێك لە هەواداری هەیە لە نێوانیاندا. بەبێ ئەوەی ئەم هەوادارییە کارایی دابنێت لەسەر میتۆدۆلۆژیای خوێندنەوەو ڕاڤەکردن و تێگەشتنی ڤێبەر لە "فاکتی" ئاینی و ڕۆڵی ئاین لە نێو چینە جیاوازەکانی کۆمەڵگەدا.

ڤێبەر پێیوایە "فاکت"ی ئاینی:

–ڕەهەندێکی لکاوە بە هەلومەرجی مرۆڤەکانەوە.

–ئەم ڕەهەندە لە ڕووبەڕووبونەوەی بەردەوامدایە لەگەڵ ناعەقلانیەتی جیهاندا.

–هەروەها ئەم ڕەهەندە لە چەندین "فۆرم"ی ئێکسترێمدا دەردەکەوێت.

–ئەوەی چوارچێوەی ئەم "فۆرمانە" دیاری دەکات قۆناغە جیاوازەکانی شارستانیەت و کۆمەڵگەکانە.

–واتە ئەم ڕەهەندە لەنێو مێژوودا دروست دەبێت نەك لە ئاسمان.

ڤێبەر وەك چۆن لە مەیدانی زانستدا کاری دەکرد، ئاواش لە مەیدانی سیاسەتدا چالاکبوو. لە یەککاتدا بەرگری لە بەرژەوەندییەکانی ئەڵمانیا دەکرد و دەیشیویست وەك دیموکراتخوازێك خۆی بخاتە سەر شانۆ، تا ئەو ئاستەی کە بوو بە ئەندامی پارتی دیموکراتی ئەڵمانی و بەشداریکرد لە ئامادەکردنی دەستوری جمهوریەتی ڤایمەردا. بەڵام لە کۆتاییدا، لای ڤێبەر، زانست دەیباتەوەو سیاسەت دەیدۆڕێنێت.

ماکس ڤێبەر بە دوو کۆنفرانس لە زانکۆی میونخ کۆتایی بە کاروانی زانستی دێنێت. یەکەمیان لەسەر (زانست وەك پیشە[2]) و دووەمیشیان لەسەر (سیاسەت وەك پیشە). ساڵی 1920 لە میونخ ماکس ڤێبەر کۆچی دوایی دەکات. پاش خێزانەکەی، ماریان، ئەرکی لە چاپدانی بەرهەمەکانی دەگرێتە ئەستۆی خۆی.

## 2- پێشوازیکردنێکی درەنگ وەخت لە سۆسیۆلۆژیای ماکس ڤێبەر لە فەرەنسادا:

ڕاستە چەند سۆسیۆلۆگێکی "جێرمۆنۆفۆن"ی وەك مۆریس ئەلڤاکس و رایمۆن ئەرۆن ڕاستەوخۆ بەشێك لە شەریکە فیکریەکی ڤێبەریان بە فەرەنسا ناسان. بەلآم ئەوەش ڕاستە کە لە قوتابخانەی ڤێبەر، بە شێوەیەکی تێروتەسەل، لە ڕێگای وەرگێڕانەوە گەشتە فەرەنسا.

ساڵی 1925 و بۆ یەکەمجار لە فەرەنسادا، مۆریس ئەلڤاکس، لە سیمینارێکدا توێژینەوە بەناوبانگەکەی ماکس ڤێبەری لەسەر پەیوەندی نێوان پرۆتیستانتیسم و کەپیتالیسم پێشکەشکرد. رایمۆن ئەرۆنیش لە کتێبی (سۆسیۆلۆژیای نوێی ئەڵمانی)دا کە ساڵی 1935 بلآوبووەوە بە وردی باس لە کارگە فیکریەکەی ماکس ڤێبەر دەکات. خوێنەری فەرەنسی دەبوو چاوەڕوانبێت تا ساڵی 1959 بۆ ئەوەی بتوانێت یەکەم کتێبی ماکس ڤێبەر بە فەرەنسی بخوێنێتەوە:

–زاناو سیاسی، وەرگێڕانی جولیا فرۆند، 1959.

–ئەخلاقی پرۆتیستانت و رۆحی کەپیتالیسم، وەرگێڕانی جاك شاڤی، 1964.

-جودایسمی ئەنتیك، وەرگێڕانی فرێدی رەفایل، 1965.

-تویژینەوە لەسەر تیوری زانست، وەرگێڕانی جولیا فروند، 1965.

-ئابوری و کۆمەڵگە، وەرگێڕانی گروپێك وەرگێر بە سەرپەرشتی جاك شاڤی و ئریك دو دامپیەر، 1971.

پاشان وەرگێڕانی ڤێبەر پشوو دەدات تا سەرەتاکانی 1990. لەم ساڵەوەو بە سەرپەرشتی زانای گەورەی فەرەنسی ژان - پیەر گرۆسیان، ماشینی وەرگێڕانی ڤێبەر دەکەوێتەوە کار، بەڵام بەشێوەیەکی وردتر و بەهێزتر و کاراتر. لێرەوەو لە کتێبێکی بەنرخدا بە ناوی (سۆسیۆلۆژیای ئاین) بەشێکی زۆری وتارەکانی ماکس ڤێبەر لەسەر ئاین کۆدەکرێتەوەو پێشکەش بە خوێنەری فەرەنسی دەکرێت.

لەو دوو چرکەوە کە رایمۆن ئەرۆن و مۆریس ئەلڤاکس لەسەر ماکس ڤێبەر قسەیانکرد، تا ئەمڕۆ ئەم سۆسیۆلۆگە ئەڵمانیە دەبێت بە سەرچاوەی هەموو ئەو فەرەنسیانەی کە لە بواری زانستە کۆمەڵایەتی و مرۆییەکاندا کاردەکەن. هەروەها ڤێبەر بوو بە سەرچاوەیەکی گرنگی هەموو ئەو کەسانەش کە لەسەر ئاینەکان کاردەکەن. چەمکەکانی ڤێبەر لەسەر ئاین خۆیان فەرزدەکەن بەسەر هەر کەسێکدا کە بیەوێت رۆژێك لە رۆژان دوو قسە لەسەر تێگەشتنی زانستیانەی ئاین بکات.

وەك بینیمان پێشوازیکردن لە سۆسیۆلۆژیای ماکس ڤێبەر لە فەرەنسادا کارێکی ئاسان نەبوو، هەر ئەمەش یەکەم هۆکاری دواخستنی وەرگێڕانی بەرهەمەکانی بوو بۆ زمانی فەرەنسی. گرۆسیان دەپرسێت:

-بۆچی فەرەنسا تا ساڵی 1959 لە چاوەڕوانی یەکەم وەرگێڕانی ماکس ڤێبەردا بوو؟

-چی وایکرد تا ئەم ساڵە، کولتوری زانکۆی فەرەنسی فیکری ڤێبەر هەرس نەکات؟

دەکرێت بۆ تەواوکردنی ئەم پرسیارانە، پرسیارێکی دیکەیش بخەینە ڕوو:

-کێ و چی لەنێو سۆسیۆلۆژیای فەرەنسیدا رێگای لە دەرگاکردنەوە بەسەر ماکس ڤێبەردا دادەخست؟

بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانە ئێمە چەندین کۆسپ تێبینی دەکەین: فەلسەفی، سیاسی، ئەکادیمی، میتۆدۆلۆژی، عەلمانی، ئاینی.

**کۆسپی فەلسەفی:**

ماکس ڤێبەر گۆڕانێکی ڕادیکاڵی بەسەر سۆسیۆلۆژیادا هێنا. بە تایبەتی لەو چرکەوە پێیگوتین کە: سۆسیۆلۆژیا زانستی واقیعە و بە هیچ شێوەیەك ماکینەی بەرهەمهێنانی نۆرم بۆ خزمەتکردن بە "کردە" نیە. بەم پرانسیپە، ڤێبەر سۆسیۆلۆژیای دابڕی لە هەموو ئەو فیکرانەی کە دەیانویست بەکاری بێنن بۆ ڕیفۆرمکردن لە نێو کۆمەڵگەدا. واتە سۆسیۆلۆژیا کەرەسەی دەستی ریفۆرمکاران نیە، بەڵکو زانستێکە لەسەر ئەوەی لە واقیعدا ڕوودەدات.

**کۆسپی سیاسی:**

بۆماڵیکردن و کردنەوەی دەرگا لەسەر

سۆســـیۆلۆژیای مـــاکس ڤێبـــەر، دەبـــوو لـــە فەرەنـــسادا سۆســـیۆلۆژیا بازبـــدات بەســـەر سۆسیۆلۆژیای چەپ و سۆسیۆلۆژیای ڕاستدا. ئەمەش کارێکی ئاسان نەبوو.

**کۆسپی ئەکادیمی:**

قووتابخانـــە سۆســـیۆلۆژیە فەرەنـــسیەکان هـەوڵیان دەدا مـاکس ڤێبـەر کورتبکەنـەوە لـە یـەکێك لـە قووتابخانەکانـدا، یـاخود پـەراوێزی بکەن. بەڵام وەك دواتـر دەرکـەوت، زۆر ئەستەمە ڤێبـــەر لـــە قووتابخانەیـــەکی سۆســـیۆلۆژیدا کورتبکرێتـەوە، باشـترین بەڵگـەش ئەوەیـە کـە سۆسیۆلۆگە هـەرە بەناوبانگـەکانی فەرەنسا کـە سـەدوو هەشـتا پلـە لـە یەکتریـەوە دوورن، وەك رایمـۆن بـودۆن و پیـەر بۆردیـۆ، هەریەکـە و لـە کارگەکـــەی خۆیـــدا گرنگیـــەکی بـــەرفراوانی بەخـشیوە بـەم زانایـە و چـەندین توێژینـەوەی گرنگیان لەسەر بەرهەم هێناوە.

**کۆسپی میتۆدۆلۆژی:**

ئـــەو چـــەمکە میتۆدۆلۆژیانـــەی کـــە ڤێبـــەر پێـــشنیاری دەکـــرد تـــا ماوەیـــەکی زۆر لـــە فەرەنـــسادا هـــەرس نـــەدەکرا. بـــۆ نموونـــە: ئیـــــدیالتیپ، بێلایـــــەنکردنی بـــــەهاکان، "موقارەبەی" تێگەشتن و ڕاڤەکردن.

**کۆسپی لایکۆ-ئاینی[3]:**

ئەم کۆسـپە لـە مەیـدانی ئـەم توێژینەوەیـەی ئێمـەدا لـە هـەموو کۆسـپەکانی دیکـە گـرنگترە، چونکە بەشێکە لە باسەکەمان.

سەرەتا هەر لەبەرئەوەی کە ئاین پێگەیـەکی بـــەهێزی هـــەبوو لـــە سۆســـیۆلۆژیای مـــاکس ڤێبـەردا گرفتێکـی بـۆ هـەموو ئـەو سۆسـیۆلۆگە فەرەنـــــــسیانە دروســـــــتدەکرد کـــــــە لـــەنێو کۆمەڵگەیـــەکی ســـێکیولێردا گـــەورە بووبوون[4].

مـاکس ڤێبـەر لـە کارگـە سۆسـیۆلۆژیەکەیدا قسەی لە پێکهاتەی ئاینی مۆدێرنیتێی ڕۆژئاوا دەکرد، لێرەوە هەموو ئەو زانایانەی تورە دەکرد کـە ڕاهـاتبوون لەسـەر خـستنە سـەر شـانۆی مـۆدێرنیتێ و ئـاین وەك دوو دژ. ئـەو زانایانـەی کە بەرهـەمی جـەنگی هـەردوو فەرەنسا، لایك و ئاینی، بوون، نەیاندەویست بە ئاسانی خۆیان بـدەن بـە دەست کارگـە سۆسیۆلۆژیەکی ماکس ڤێبەرەوە کە وەك مەترسیەك تەماشایان دەکرد، مەترســـی ســـڕینەوەی ســـنورەکانی نێـــوان ئایدیالیسم و ماتریالیسم، ئـاین و مـۆدێرنیتێ، عەقڵانیەت و ناعەقڵانیەت.

ماکس ڤێبـەر بە ئاسـانی پێشوازی لێنـەکرا، چـونکە ئـەو، بـە پێـچەوانەی سۆسـیۆلۆگەکانی دیکـــەوە، ماکینـــەی ڕاڤـــەکردنی لەســـەر کاتۆلیسیـسم و پەیوەنـدی نێـوان تاکـەکان بـە دەزگاکـــانی ئاینـــەوە نەخـــستبووە کـــار، بـەڵکو گرنگـی دەدا بـە ڕەفتـاری تاکـەکان و "ئیتـۆس"ەکانیـان. فەرەنـسایەك کـە کولتـوری کاتۆلیـــك مێژووەکـــەی دروســـتکردبوو، فەرەنسایەك کە تیادا کاتۆلیسیسم بە دەزگایی کرابوو، ئەم جۆرە سۆسیۆلۆژیایەی بە ئاسانی بـۆ قووتنـەدەدرا کـە زیـاتر وەك کولتـوری پرۆتیستانتەکان وێناکرابوو.

تەنانـەت ئـەو سۆسـیۆلۆگانەش کـە لـە فەرەنـسادا لەسـەر ئـاین کاریـان دەکـرد و بـە کولتـور کـاتۆلیکبوون زۆر بـە کـەمی ڤێبـەریان وەك سەرچـــاوە بـــەکاردەهێنا (گابریـــەل

لوبرا، ئیمیل پولا)، بەڵام ئەو سۆسیۆلۆگانەی کە بە کولتور پرۆتیستانت (جان سێگی، جان بوبێرۆ) یان جولەکە (فرێدی رەفایل، میکایل لوی) بوون، گرنگیەکی تەواویان بە ڤێبەر دەدا.

### 3-میتۆدۆلۆژیای ماکس ڤێبەر:

سەرەتا دەبێت دان بەوەدا بنێین کە لە بەشێکی کورتی وادا هەرگیز ناتوانین روناکی بخەینە سەر کۆی میتۆدۆلۆژیای ماکس ڤێبەر کە یەکێکە لە میتۆدۆلۆژیا هەرە گرنگ و هەرە قوڵەکانی زانستە کۆمەڵایەتیەکان. ناتوانین ئەم کارە بکەین چونکە لێرەدا بابەتی سەنترالی ئێمە نیە، بەڵام هەوڵدەدەین فیکرەیەکی گشتی لەسەر چۆنیەتی کارکردنی ڤێبەر و جیهانە میتۆدیەکەی بخەینە ڕوو.

### بێلایەنکردنی بەهاکان[5]:

باشترین کارێك کە لەسەر ئەم چەمکە کرابێت توێژینەوەکەی جولیا فرۆند دە. ئەو دەڵێت:

"بێلایەننکردنی بەهاکان بریتیە لەو پرانسیپەی کە ڕێگامان پێدەدات بۆ پارێزگاریکردن لە شەرعیەتی توێژینەوەی زانستی بەپێی سیستەمە تایبەتەکەی و پارێزگاریکردن لە زانستیبوونی هەڵسەنگاندنی پراکتیك و ململانێ و ڕێکەوتنەکان[6]".

بێلایەنکردنی بەهاکان هەوڵدانە بۆ خستنەکاری ماکینەی توێژینەوە لەسەر پەیوەندیە واقیعیەکان بە "بەهاکان"ەوە. ئەوەی گرنگە تێبینیکردنی چۆنیەتی دەرکەوتنی پەیوەندی تاکەکانە بە بەهاکانەوە و چۆنیەتی گۆڕانی ئەم دەرکەوتنانەیە لە شارستانیەت و کۆمەڵگە جیاوازەکاندا.

بۆ سۆسیۆلۆگ، بێلایەنکردنی بەهاکان میتۆدی کارکردنە. واتە سۆسیۆلۆگ بۆی نیە بە هیچ شێوەیەك بەهایەك لە بەهاکان، لە چرکەی ڕاڤەکردندا بەکاربهێنێت. سۆسیۆلۆگ لە ساتی ڕاڤەکردندا کەسێکی بێ بەهاو بێلایەن و سەربەخۆیە لە هەموو ئینتیماکان. کەسێکی ڕووتووقووتە لەبەردەم بابەتی توێژینەوەکەیدا. ئەو سۆسیۆلۆگەی کە بەهایەك لە بەهاکان بەکاردەهێنێت بۆ ڕاڤەکردنی فاکتە کۆمەڵایەتیەکان لە زانست دوور دەکەوێتەوەو میسداقیەت لەدەستدەدات.

### -ڕاڤەکردن/ تێگەشتن[7]:

لای ماکس ڤێبەر تێگەشتن چرکەیەکی گرنگی ڕاڤەکردنە. بە پێچەوانەی دۆمنیك شانپێر کە پێیوایە تێگەشتنی سۆسیۆلۆژی لای ڤێبەر: "تێگەشتنە لە ڕەفتاری مرۆڤەکان بەشێوەیەکی لەتیفانە"، ئێمە پێمانوایە بریتیە لە دروستکردنی چوارچێوەیەکی "مەفهومی" بۆئەوەی بتوانین لە ڕێگایەوەو بە شێوەیەکی عەقلانیانە لە ڕەفتاری مرۆڤەکان تێبگەین. لەم پێناسەیەدا بەهیچ شێوەیەك ڕاڤەکردنی "سەبەبی/ کۆزال" پەراوێز ناخرێت. خودی ڤێبەر لە چرکەی پێناسەکردنی سۆسیۆلۆژیادا حساب بۆ ئەم ڕەگەزانە دەکات:

"ئێمە پێمانوایە سۆسیۆلۆژیا بریتیە لەو زانستەی کە دەیەوێت لە ڕێگای لێکدانەوەوە تێبگات لە چالاکیە کۆمەڵایەتیەکان و لە ڕێگای ڕاڤەکردنی "سەبەبیەوە" تێبگات لە چۆنیەتی کارکردن و کاراییان". (ئابوری و کۆمەڵگە، 4)

ڤێبەر بە توندی تاکرەهەندی لێکدانەوەی مێژوو ڕەددەکاتەوە. ئەو گرنگی دەدات بە فاکتەری ئابوری، بەلام بە پێچەوانەی مارکسیسمەوە، بە تاکە هۆکاری لێکدانەوەی داهاتووی کۆمەڵگەکانی نازانێت. ڤێبەر پێیوایە، بۆ ڕاڤەکردنی ڕەوتی مێژوو، دەبێت تێبگەین لەو مانایانەی کە مرۆڤەکان بە کردەکانیان دەبەخشن، دەبێت تێبگەین لەو سەرچاوانەی کە مرۆڤەکان بەکاردەهێنن بۆ دەستنیشانکردنی مانای ڕەفتارەکانیان.

لێرەوە ڕوانینی ڤێبەر بۆ سۆسیۆلۆژیا نزیکدەبێتەوە لە ڕوانینی مێژوونووسان و ئەنترۆپۆلۆگەکان کە پێگەیەکی گرنگ دەدەن بە بڕیار و هەڵسەنگاندن و ڕەفتاری ئەکتەرە کۆمەلایەتی و مێژوویەکان. بێگومان ئەمەش پەیوەندی بە پێکهاتە زانستیەکەی ڤێبەرەوە هەیە.

**-ئیدیالتیپ**[8]:

ئیدیالتیپ دەروازەی تێگەشتنی دروستە لە میتۆدۆلۆژیای ڤێبەر. لە چوارچێوەی ئەم چەمکەدا، تیپی ئیدیالی "سەرمایەداری رۆژئاوا" زیاتر لە تیپ ئیدیالی "ئاین" یان "سێکت" ئیجابیتر یان سەلبیتر نیە. لەسەر ئاستی کۆنسێپت، هەریەکێك لەوانە ئیدیالن.

بۆ روونکردنەوەی ئیدالتیپ، ژولیان فرۆند نموونە بە خەیاڵدانی سانۆیی مۆلێر دەهێنێتەوە. ئەو بۆ ئەوەی ڕەزیلێك بخاتە سەر شانۆ، دێت و لە ڕێگای خەیاڵدانی شانۆییەوە کەسایەتیەکی ڕەزیل بە چەند کارەکتەرێکەوە دروست دەکات و دەیکات بە تیپ ئیدیالی ڕەزیلی. لەسەر هەمان ڕێگاش، بۆ قسەکردن لە ئیدیالتیپ، ڤێبەر دەڵێت:

"بۆ بەدەستهێنانی ئیدیالتیپێك ئێمە بەشێوەیەکی تاکرەوانە دێین و لە چەند ڕەگەز و خاڵێك تابلۆیەکی تیۆری دروستدەکەین. پاشان بۆ تێگەشتن لە واقیعێکی دەستنیشانکراو، دێین و بەراوردی دەکەین بەم تابلۆیە. واتە، ئاستی نزیکی و دووری ئەو واقیعە لە تابلۆکەوە دەبێت بە مەیدانی کارکردنی توێژەر. بێگومان ئەم تابلۆیە لەسەر ئاستی واقیع بوونی نیە، چونکە بیناکردنێکی تیۆریە. پراکتیزەکردنی ئەم چەمکە، بەشێوەیەکی ورد، ڕێگامان پێدەدات تا بەشێوەیەکی دروست و روون لە شتەکان بگەین[9]"

**-ئەخلاقی بەرپرسیاری و ئەخلاقی ئیمان:**

دەرەنجامەکانی کردەیەك یان گوتارێك هەمیشە لەگەڵ خواستی بکەرەکەیدا یەکناگرێتەوە، بەڵکو دەکرێت تەواو پێچەوانەشی بێت. واتە دەرەنجامەکانی ڕەفتارێك سەد لە سەد چاوەڕوانکراونین و ناکرێت هەر لە سەرەتاوە بزانین چۆن خۆیان مانیفێست دەکەن، چونکە لە چرکەی بەرهەمهێنانیدا تێکەڵ دەبێت بە ڕەفتاری دیکە و هەموویان پێکەوە ئاوێزانی یەکتری دەبن و دواتر دەبن بە شتێکی دیکە. واتە هەمیشە خواستێکی باش دەرەنجامێکی باشی لێناکەوێتەوە، هەروەك هەمیشە خواستێکی خراپ دەرەنجامێکی خراپی لێناکەوێتەوەو ڕەنگە پێچەوانەکانیان راستبن.

## 4-سۆسیۆلۆژیای هه یمه نه ی ئایینی:

لـه کارگـه سۆسـیۆلۆژەکەی مـاکس ڤێبـەردا ئاین بریتیه لە: "جۆرێکی تایبـەتی مامەڵـەکردن لـە نێـو کۆمینۆتیـدا". ئـەوەی گرنگـە بـۆ ڤێبـەر توێژینەوەیـە لەسـەر هەلومـەرج و کـاریی ئـەم مامەڵەیە. لێرەوە، ڤێبەر خۆی دوور دەگرێت لە وێنـاکردنی ئـاین وەك سیـستەمی ئیمـان، بـە پێچەوانەوە، ئـەو وێنـای ئاینـدەکات وەك چـەند سیـــستەمێکی رێکخـــستنی ژیـــان. چـــەند سیـــستەمێك کـــە زیرەکانـــە توانیویانـــە جـــەماوەرێکی زۆر لـــە ئیمانـــداران لـــە دەوری خۆیان کۆبکەنەوە.

لـــەم پرانـــسیپەوە، ڤێبـــەر توانـــا سۆسـیۆلۆژیەکانی خـۆی کۆدەکاتـەوە لەسـەر تێگەشـتن لـە پراکتیکـی تاکـەکان و هـەموو ئـەو مانایانەی کە دەیدەن بە سلوکی رۆژانەیان. ئەم جـۆرە لـە کـارکردن رێگـا بـە ڤێبـەر دەدات بـۆ ئـەوەی باشـتر لـە دەرەنجامـە کۆمەڵایەتیـەکانی سـلوکی تاکـەکان لـە نێـو پانتاییـە ئـابوری و سیاسیەکاندا راڤە بکات.

مەیـدانی چـالاکی ئـاینی کلیکردنـە لەسـەر رێکخـستنی پەیوەنـدی نێـوان هێـزە مەزنـە ناسروشتیەکان (خوداوەند) و مرۆڤەکان. بەڵام دەبێت ئاماژەش بەوە بدەین کە ڤێبەر بەوپـەڕی حـەزەرەوە بـاس لـە چالاکی ئـاینی دەکـات و بـە توونـدی ئەوە رەددەکاتـەوە کـە "جەوهـەرێکیان" پێببەخـــشێت. ئـــەو پێیوایـــە گـــرفتی ناعەقلانیـەتی جیهـان بـە گـشتی و دژایـەتی نێـــوان "ئیختیـــار" و "قـــەدەر"، بـــوونی "عــەزاب" و واقیعــی "مــردن" بــە تایبــەتی، سەرچـاوەی یەکـەمی گەشـەکردنی ئاینـەکانن. پێویـــستی عەقلانیانـــەی تیوریـــەك لەســـەر "ئیلاهیـات"ی "عـەزاب" و "مـردن" کاراییـەکی بەهێزی داناوە لەسـەر درێژەبوونـەوەی تەمـەنی ئاینەکان.

ڤێبـەر پێیوایە هەرچەند ئاینەکان بەشداری زینـدویان کـردووە لـە سیستەماندنی تیۆلۆژیاو بەردەوام روناکیـان خستوەتە سـەر قیامـەت وەك دونیایـەکی تـر، بـەلأم لەگـەڵ ئـەم واقیعەشـدا، بەشــــێکی زۆری ئــــەو ســــلوك و ڕەفتــــارو پراکتیکانــەی کــە تاکــەکان لــە ژێــر کــاریی ئاینەکانـدا بەرهـەمی دەهێـنن ئاڕاسـتەی زەوی دەکرێت و لە جیهانی ئێستاماندا دەسوڕێتەوەو لـــە پێنـــاوی بەدەســـتهێنانی بـــەختیاری دونیاییدایـــە. ئـــەم گۆشـــەنیگایەی ڤێبـــەر، بـــازدانێکی گەورەیـــە بەســـەر هـــەموو ئـــەو راڤەکردنانەدا کە بە تەنها ئاین دەبەستنەوە بە قیامەتەوە. ئەو رونـاکی دەخاتـە سـەر کـۆی ئـەو بەرژەوەندیانەی کە ئاین و ژیانی ئێرە بەیەکەوە دەبەستن:

"هەموو ئەو پێشنیارانەی کە بۆ رزگاربوون و بـەختیاری مرۆڤـەکان ئـاین پێـشنیاری دەکـات، نابێـــت تـــەنها وەك رزگـــاربوون و بـــەختیاری قیامـــەت تەماشـــا بکرێـــت.. بـــە پێـــچەوانەوە پەیوەندیـەکی زینـدویان بـە ژیـانی دونیاییـەوە هەیەو لەگەڵ ئێرەی مرۆڤەکانـدا مامەڵـە دەکـەن: تەندروسـتی، تەمـەن درێـژی، دەوڵەمەنـدی، ئـەو بەڵێنانـــەن کـــە ئـــاینی چـــینی و ڤێـــدیك و زەردەشتی و یـەهودی و ئیسلام بەسـەر خەڵکدا دابەشیان دەکردن. هـەمان ئـەم بەڵێنانـە لەلایـەن ئاینـــــە فینیقـــــی و میـــــسری و بـــــابلی و جەرمەنیەکانیـــــشەوە بەســـــەر خەڵکـــــدا دابەشکراون". (*SR, 346-345*)

کـــاترین کۆلیـــۆت تێلـــێن ڕاســـتدەکات کاتێـــــك دەڵێـــــت، لای مـــــاکس ڤێبـــــەر، ئۆپۆزیـــسیۆن لـــە نێـــوان ڕێکخـــستنی ژیـــانی هـــەموو ڕۆژێـــك و "ئیستیـــسنا" لـــە ژیـــانی هـەموو ڕۆژێکـدا گـرنگترە لـە ئۆپۆزیـسیۆن لـە نێوان ژیانی دونیای و ژیانی قیامەتدا. ڤێبەر لەمـــــە دورتـــــریش دەڕوات و هەوڵـــــدەدات بیسەلمێنێت کە چۆن چەند گوزارشتێکی ئاینی ڕۆڵیـــان بینیـــوە لـــە کـــردەی عەقلانـــدنی "ڕاسیۆنالیزاسیۆن" جیهاندا.

لە باسکردنی "ئاینداری – ڕۆلیـژیزیتی"دا، ڤێبەر کلیك دەکات لەسەر نایەکسانی لە نێوان ئاینداری جەماوەر و ئاینداری "زیرەکـەکان"داو ئـــەم دوو جـــۆرە لـــە ئاینـــداری لـــە یـــەکتری جیادەکاتـەوەو پێیوایـە بەشێوەیەکی نایەکسان بەسەر مرۆڤەکاندا دابەشبوون و هـەموویان وەك یەك ئاینداری ناکەن:

"لـە سـەرەتای مێـژووی هـەموو ئاینەکانـدا ئێمـە تێبـینی ئـەزموونێکی گـرنگ دەکـەین کـە بریتیە لە: ئامادەبوونی نایەکسانانەی ئاین لای مرۆڤەکان.. شتە چاکەکانی ڕزگاربوونی ئاینی کـە خـاوەنی بەهایـەکی گـەورەبوون، تـەنها لای چـــەند کەســـایەتیەك ڕۆحـــی کاریزمیـــان دروســـتکرد، نـــەك لای هـــەموان. تـــەنها چـــەند کەســێك توانیــان بــەکاریان بێــنن بــۆ دامەزرانـــدنی کەســـایەتی کاریزماتیکیـــان نـــــەك هـــــەموو مرۆڤـــــەکان.. لێـــــرەوە ئاینـداری زیرەکـەکان خـۆی جیادەکاتـەوە لـە ئاینـداری جـەماوەر. مەبەسـتم لـە جـەماوەر هەموو ئەو کەسانەیە کە خاوەنی گوێچکەیەکی مۆســیقی نــین بــۆ گــوێگرتن لــە ئــاین" (*SR, 359-358*)

بەمـشێوەیە تێدەگـەین لـەوەی کـە، بۆچـی ڤێبـــەر هێنـــدەی بایـــەخی داوە بـــە پرســـیاری هەیمەنـەی ئـاینی و گردبوونـەوەی ئـاینی وەك ژانرێکی تایبـەت تەماشای کردوەو ناوی ناوە: "گردبوونەوەی هیرۆکراتیك"[10]. ڤێبـەر پێیوایە "گردبوونـــەوەی هیرۆکراتیـــك" بریتیـــە لـــەو گردبوونەوەیـــەی کـــە لـــە ڕێگایـــەوە مـــۆدێکی تایبـەت لـە هەیمەنـە خـۆی فـەرزدەکات بەسـەر مرۆڤەکاندا. ڤێبەر سۆسیۆلۆژیای خۆی لە نێو دەفتـــەری سۆســـیۆلۆژیای هەیمەنـــەدا تۆمـــار دەکات و لـەم سەرشارەوەش ئەو دێت ڕێگا بە خـــۆی دەدات کـــە چـــاودێری کـــارایی مـــۆدە جیاوازەکانی دەسەلاتی ئاینی بکات.

شـێوەیەکی تایبـەتی مامەڵـەکردن لـە نێـو کۆمینۆتێـدا، شـێوەیەکی تایبـەتی هەیمەنـە لەسەر مرۆڤەکان، ڤێبەر والێدەکەن کە وریایانە لەگـەڵ هـەردوو پرانـسیپە گرنگەکـەی ئاینـدا بجوڵێتەوە:

–پرانسیپی پەیوەندی کۆمەڵایەتی.

–پرانسیپی مۆدەکانی دەسەلاتی ئاینی.

هـــەر ئەمەشـــە وا لـــە ڤێبـــەر دەکـــات کـــە سۆســـیۆلۆژیا ئاینیەکـــەی لـــە دوو ڕەهەنـــددا کۆبکاتەوە:

–ڕەهەندی هاوبەشاندنی ئاینی[11].

–ڕەهەندی دەسەلاتی ئاینی.

لـە چـرکەی قسەکردن لەسـەر ئاینـدا ڤێبـەر دێـت دیـالۆگێکی دوو جەمـسەر دادەمـەزرێنێت: جەمــسەرێك لەســـەر کەنیـــسە و جەمــسەرێکی دیکـە لەسـەر "سێکت" وەك دوو مـۆدی ژیـانی کۆمەڵایەتی ئاین.

لەســـەر کەنیـــسەدا دەڵێـــت: بریتیـــە لـــە دەزگایـەکی بیرۆکراتیـزەی ڕزگـاربوون. ئیـدارەی

"چـــاكه"كـــانى ڕزگاربوونـــه و بـــه وردى مومارەسەى دەسەلاَتى "بەڕێوەبردن" دەكات و لە پەيوەنديەكى دامەزراو لەسەر "هاريكارى" دايە لەگەڵ كۆمەڵگەدا.

ڤێبەر پێيوايە كە لە كاتێك كەنسيەدا پرۆگرامێكى هيرۆكراتيك دروست دەبێت كە ئەم چوار ڕەگەزەى خوارەوە ئامادەبن:

ا-ئامادەبوونى ڕێكخراوێك لە قەشەى پيشەيى (پرۆفيسيۆنێل). ئەم قەشانە بەپێى بەرنامەيەكى تايبەت پێگەشتوون و مووچەى مانگانەى خۆيان هەيەو لە دەرەوەى پيشەكەشيان ژيانێكى تايبەتى خۆيان هەيە.

ب-ئامادەيى هيرۆكراسيەك كە بانگەشە بۆ هەيمەنەى جيهانى بكات و بازبدات بەسەر هەموو سنورەكاندا و كۆى پەيوەنديە خێزانى و تيرەى و ئيتنى و نەتەوەييەكان تێپەڕێنێت.

ج-ئامادەيى لێكدانەوەو ڕاڤەكردنێكى عەقلانيانەى هەموو ئەو دۆگمانەى كە لە دەقە پيرۆزەكاندا پارێزراون. واتە ڕاسيۆناليزەكردنيان.

د-ئامادەيى دەزگايەكى كاراو چالاك بۆ لە خۆگرتن و بەدەزگايى كردنى هەر سێ خاڵى پێشوو.

هەروەها پێيوايە كە "سێكت"يش بريتيە لە كۆبوونەوەى "ئيرادەى" ئەو باوەڕدارانەى كە لە دابڕاندا دەژين لەگەڵ ناوەندە كۆمەلاَيەتيەكاندا. لە پانتايى "سێكت"ێكدا هەميشە دەسەلاَتێكى ئاينى خاوەن كاريزم خۆى فەرزدەكات. جياوازيەكى گرنگ لە نێوان كەنيسە و سێكتدا ئەوەيە كە: ئەندامى كەنيسەيەك هەر لە لەدايكبوونيەوە ئەندامە، بەلاَم ئەندامى "سێكت"ێك لە نێو پرۆسێسێكدا دەبێت بە ئەندام[12].

"سێكت دەيەوێت پێكهاتەيەكى ئەرستۆكراسى بێت: ڕێكخراوى چەند كەسێكى پەروەردەكراو لەسەر ئاين. سێكت نايەوێت كەنيسەيەك بێت، نايەوێت ئەو دەزگايە بێت كە خەيرو شەڕ و دادپەروەرى و نادادپەروەرى و ڕاست و ناڕاست لە يەكترى جودادەكاتەوە. سێكت بەرهەمهێنەرى بيرۆكەى گەڕانەوەيە بۆ ڕەگوڕيشەى شتەكان، ڕوناكى دەخاتە سەر كۆبوونەوەى شتە پيرۆزە هەستپێكراوەكان. سێكت بە توندى بيرۆكەى لێبوردنى دەزگايى و كاريزمى بەڕێوەبردن ڕەددەكاتەوە" (***SR, 318***)

لە ميتۆدۆلۆژياى ڤێبەردا، كەنيسە و سێكت دوو "ئيديالتيپ[13]"ن. واتە دوو مۆدێلى ئامادەكراوى توێژينەوەن و لە واقيعدا بەو شێوەيە بوونيان نيە كە ئەو باسيان دەكات. بەو مانايەى كە ئەم دووانە زياتر دوو سەرچاوەى ئيديالن بۆ ئەوەى توێژەر لە ڕێگايانەوە توێژينەوە لەسەر واقيع بكات.

ڕاستە ڤێبەر ئەم دوو "ئيديالتيپ"ەى لەسەر گردبوونەوەى ئاينى بە مۆدێلە مەسيحيەكەى خستوەتە ڕوو، بەلاَم ئەوەش ڕاستە كە ئيديالتيپ لە كريستيانيسمدا كورتنەكراوەتەوە، چونكە كەرەسەيەكى سۆسيۆلۆژيە بۆ تێگەشتن لە واقيع. واتە هەروەك چۆن دەكرێت ئيديالتيپ لەسەر مۆدێلى كريستيانيسم دروستبكرێت ئاواش دەكرێت لەسەر ئاينەكانى ديكە دروستبكرێت، ئەو دەڵێت:

"لە ئيسلام و بودايسم و مەهاديسم و جودايسم و تەنانەت لە هيرۆكراسى ميسرى

کۆنـدا، ئێمـە تێبـینی گردبوونـەوەی ئـاینی دەکەین" (*SR, 252*)

هەروەها مۆدێلە سۆسیۆلۆژیەکەی سێکتیش "ڕێکخراوی ئیرادی باوەڕدارە دابڕاوەکان لەگەڵ ناوەنـدە کۆمەڵایەتیەکانـدا و کۆبوونـەوەیان لـە دەوری ڕابـەرێکی کاریزمی" بە ئاسانی لە نێو ئاینەکانی دیکەدا دەدۆزرێنەوە.

بـۆ بینـاکردنی ئیـدیالتیپی دەسـەڵاتی ئـاینیش، ڤێبـەر دەگەڕێتـەوە سـەر فۆرمـە جیاوازەکانی شەرعیەتدان بە دەسەڵات لە ژیانی کۆمەڵایەتیـدا. واتـە ڕاڤـەکردنی ئـاین لـە قووتابخانـەی مـاکس ڤێبـەردا کـارکردنێکی بەردەوامـە لـە چوارچـێوە گـشتیەکانی سۆسیۆلۆژیادا نەك لە دەرەوە.

ڤێبـەر جیاوازی دەخاتـە نێوان دوو تیپ لە دەسـەڵاتەوە: دەسـەڵاتێکی خـۆ سـەپێنەر و دەسـەڵاتێکی شـەرعی. دەسـەڵاتێك کـە لـە نێـو کـردەی خـۆ سـەپاندندا بینادەکرێـت و دەسـەڵاتێکیش لـە نێـو کـردەی شـەرعیەتدا سـەرهەڵدەدات. لـەم ناوەنـدەدا پرسـیاری گرنگ بۆ ماکس ڤێبەر دەبێت بە: چۆنیەتی بیناکردنی کۆمەڵایـەتی دەسـەڵاتی شـەرعی لای بـاوەڕدان. ڤێبـەر پێیوایـە هـەموو دەسـەڵاتێ دەتوانێـت لـە ڕێگـای عەقڵانیـەت – یاسایی، ترادیسیۆن یـان کاریزماوە شەرعیەت بە خۆی ببەخشێت.

–شـەرعیەتی عـەقڵانی –یاسایی: بریتیـە لە دەسەڵاتی بەڕێوەبردن و لە دەرەوەی نا–کەس و لە نێوە باوەڕ بە کۆمـەڵێك یاسای بەڕێوەبردنـدا دروست دەبێت و کاردەکات.

–شەرعیەتی ترادیسیۆنێل: ئەو دەسەڵاتەیە کـە لـە نێـو بـاوەڕ بـە عـادات و تەقالیـددا دروستدەبێت و کاردەکات.

–شـەرعیەتی کـاریزم: ئـەو دەسـەڵاتەیە کـە لەسـەر کەسـایەتی کـاریزمیی کەسـێك دروستدەبێت و لە دەوری کەسێك دەخولێتەوە.

لـە بـواری ئاینـدا، ڤێبـەر پێیوایـە، ئـەم سـێ مـۆدی شەرعیەتبەخشینە چوارچێوەکانی سـێ ئیـدیالتیپ دەستنیـشان دەکـەن: ئیـدیالتیپی قەشـە، ئیـدیالتیپی جادوگـەر، ئیـدیالتیپی پێغەمبەر.

–قەشـە ئـەو دەسـەڵاتە ئاینیەیـە کـە لـە نێـو دەزگایـەك لـە لێبـوردنی – غـوفرانی بیرۆکراتیزەکراودا کاردەکات.

–جادوگـەر ئـەو دەسـەڵاتە ئاینیەیـە کـە لـە نێـو ئـەو "زەبـون"نانـەدا کاردەکـات کـە دانـدەنێن بـە زانـستی ئـەوداو باوەڕیـان بـەوە هەیـە کـە ئـەو دەتوانێـت حەقیقـەتی شـتەکان بدرکێنێت.

–پێغەمبـەریش ئـەو دەسـەڵاتە ئاینیەیە کـە لەنێو "وەحی"دا کاردەکات.

دەسـەڵاتی دەزگـایی قەشـە بریتیـە لـە ئیدارەکردنی شتە ئاینیەکان لە ژیانی ڕۆژانـەدا، بـۆ ئـەوەی بـەردەوامیان پێببەخـشێت. بـەڵام دەسـەڵاتی کـاریزمیی پێغەمبـەر دابڕانـە لەگـەڵ ڕۆتـینی ژیـانی ڕۆژانـەداو پێـشنیارکردنی شتێکی دیکەی جیاوازە.

ڕاسـتە ژمارەیـەکی زۆر لـەو زانایانـەی کـە لەسـەر ئـاین کاردەکـەن ئـەم تیپۆلۆژیـەی دەسـەڵاتی ئاینیـەی مـاکس ڤێبـەریان بەکارهێناوەو تا ئێستاش بەکاری دەهێنن، بەڵام لـە ڕاسـتیدا توێـژەر دەبێـت بەوپـەڕی وریـای و زیرەکیـەوە مامەڵـەی لەگەڵدا بکات و لە سیاقی خـۆی نەیباتـە دەرەوە. بـۆ نموونـە گـەر ئێمـە دورتـر بـڕۆین، وەك یوهـاکیم ڤـاخ(14)، ئـەوا

دەتوانین نۆ تیپ لە دەسەڵاتی ئاینی دیاری بکەین:
-دامەزرێنەری ئاین
-ریفۆرمکار
-پێغەمبەر
-داهاتووبین
-ساحیر
-عەڕاف
-قدیس
-قەشە
-ئاینی، بەلاتینی: رۆلیژیۆسوس.
ئێمە دەتوانین هەمان تیپۆلۆژی ماکس ڤێبەر بەکاربهێنین بۆ ئاینەکانی دیکەش. بۆ نمونە دەتوانین لەبری قەشە ئیمام یان حاخام دابنێین و توێژینەوە بکەین لەسەر پەیوەندیەکانی نێوان مامۆستا و قوتابی لە ترادیسیۆنە جیاوازە ئاینیەکاندا.
مێژویەکی درێژی ژیانی کۆمەڵگەکان لەلایەن دوو مۆدێلەوە هەیمەنەی بەسەردا کرابوو. مۆدێلی هەیمەنەی کاریزمیی و مۆدێلی هەیمەنەی ترادیسیۆنێل. لە هەردوو مۆدێلەکەدا ماشێنی پیرۆزکردن لە کاردایە، بەلاّم لەسەر دوو ئاستی جیاواز: لە یەکەمدا ئەوەی پیرۆز دەکرێت نا- رۆژانەیە، لە دووهەمدا، بە پێچەوانەوە، ئەوەی پیرۆزدەکرێت رۆژانەیە. لە هەلومەرجێکی ئاوادا گۆڕانکاری تەنها لەو چرکەیەدا بەدیدێت کە دەسەڵاتێکی کاریزمیی بڕیاری دەستکاریکردنی شتەکانی "ژیانی هەموو رۆژێك" بدات. ڤێبەر دەڵێت:
"مافێکی نویٚ بەبیٚ ئامادەی و پشتیوانی دەسەڵاتێکی کاریزمی ناتوانێت لە سیستەمی ژیانی رۆژانەدا جێگای ببێتەوە. ئەم گۆڕانکاریە دەکرێت لە ڕێگای پێغەمبەرێکەوە یان جەنگی کەسایەتیەکی کاریزمییەوە ئەنجامبدرێت. واتە وەحی و شمشێر وەك دوو هێزی نا - رۆژانە دەتوانن گۆڕانکاری بکەن". *(SR, 372)*
لێرەوە و بەپێی ماکس ڤێبەر، گۆڕانکاریە سیاسی و ئاینیەکان ئامادەیی خواستی دەسەڵاتێکی کاریزمیی سیاسی یان ئاینی بۆ گۆڕان، دەکات بە مەرجێکی سەرەکی. بۆ گۆڕینی رۆتینی رۆژانە، بۆ پێشنیارکردنی شتێکی نویٚ، بۆ هەڵوەشانەوەی ئەوەی کە تا ئێستا هەبووە، ئەم خواستە نەك هەر پێویستە بەڵکو مەرجی یەکەم و سەرەکیە.
هەر لەم گۆشە نیگایەوەیە کە ماکس ڤێبەر دێت و بەراوردکردنێکی سۆسیۆلۆژیانە دەکات لە نێوان پێغەمبەر و جەنگاوەرو وەحی و شمشێرداو، وەك دوو دەسەڵاتی کاریزمیی گۆڕانکاری و نوێکردنەوە دەیانخاتە سەر شانۆ. هەر لەسەر هەمان ڕیتمی بیرکردنەوەو ڕاڤەکردن، ڤێبەر پێماندەڵێت: سیاسەت دەتوانێت دەستکاری شتە ئاینیەکان بکات و مونافەسەیان لەگەڵدا بکات، بەتایبەتی لە چرکەی جەنگدا کە چەمکی خۆبەشین و خۆفیداکاری بەوپەڕی هێزەوە ئامادەیە و مانایەك بە مردن دەبەخشێت:
"کۆمینۆتێی سوپا لە چرکەی خۆ ئامادەکردندا بۆ جەنگ زیاتر وەك کۆمینۆتێی بالاّ دەکەوێتە بەر هەستی سەربازەکان. ئەمە ئەو کیانەیە کە ئامادەیە ڕوبەڕوی مردن ببێتەوەو تەنانەت ئامادەیە گیانی خۆشی ببەخشێت بە مردن.. ئەو تاکەی کە لە مەیدانی جەنگدا دەمرێت، پرسیاری مانای مردن لە

خۆی ناکات، چونکه هەست بەوە دەکات کە لە پێناوی شتێکدا دەمرێت.. لە چرکەی جەنگدا هەردوو چەمکی برایەتی و مردن دەبن بە خاوەنی سیفەتی نا –ڕۆژانە. لێرەوە چرکەی جەنگ دەبێت بە پانتایی کۆبوونەوەی کاریزمی پیرۆزێنراوو ئەزموونی کۆمینۆتیٚ لەگەڵ خودا". (*SR, 427*)

ماکس ڤێبەر زۆر بە وردی هەردوو مەیدانی سیاسی و ئاینی لە یەکتری جیادەکاتەوەو دەریدەخات کە هەر لایەکیان بەپێی چەند بەهاو یاسا و نۆرمێکی ناوەکی ڕێکدەخرێن و دەبرێن بەڕێوە، بەلأم لەگەڵ ئەم جیاکردنەوە بە نرخەشدا، کاتێک باس لە هەیمەنە دەکات روناکی دەخاتە سەر ئەو پەیوەندیانەی کە ئەم دوو مەیدانە بەیەکەوە گرێدەدەن. سیاسی، کە لە ڕێگای زەبرو زەنگی شەرعیەوە پێناسەکراوە، لە دوو ناوەندا بە ئاینی دەگات:

–وەك ئاینی، سیاسیش دەتوانێت چەمکی قوربانیدان و ژیان بەخشین مۆبیلیزە بکات.

–وەك ئاینی، سیاسیش دەتوانێت لە ڕێگای دەسەلأتی کاریزمیەوە شەرعیەت دروستبکات و بیشیبەخشێت.

لەم سەرشارەوە ڤێبەر دەڵێت:

"ئێمە لە نێو هەموو دەسەلأتێکی سیاسی شەرعیدا، چەند ڕەگەزێکی تیۆکراسی دەدۆزینەوە، چونکە هەموو کاریزمێك، بە جۆرێك لە جۆرەکان، دەیەوێت باوەڕمان پێبێنێت کە ڕەگوریشەیەکی سیحراوی هەیە. واتە خزمایەتیەکی لەگەڵ دەسەلأتی ئاینیدا هەیە و خاوەنی لێخۆشبونی غەیبیە"

کاریزمی بەڕێوەبردن (باوەڕهێنان بە ڕزگاربوونی دەزگایی. واتە دەزگایەکی کۆمەلأیەتی وەك کەنیسە کە دەتوانێت لێبوردنی خوایی ببەخشێت و مرۆڤەکان ڕزگار بکات و پاکیان بکاتەوە لە گوناه)، ڤێبەر پێیوایە ئەمە بە تەنها دیاردەیەکی تایبەت بە کەنیسە نیە. بەڵکو سیاسەت و دەوڵەتیش دەتوانن هەمان رۆڵ ببینن.

ڤێبەر تەواو وشیارە بە لەرزۆکی دەسەلأتی سیاسی و ڕەهەندە ناعەقلأنیەکەی، بۆیە دەگەڕێت بە دوای ئەو پەیوەندیە بەهێزەی کە دەسەلأتی سیاسی لەگەڵ فاکتە ئاینیەکاندا هەیەتی و لە ڕێگایانەوە درێژە بە تەمەنی خۆی دەدات.

## 5-ئاین و پانتاییە جیاوازییە مرۆییەکان:

ماکس ڤێبەر یەکێکە لەو زانایانەی کە گرنگیەکی تەواو بە حسابکردن بۆ ئەو سیستەمە ناوەکیانەی کە هەر یەکێك لە پانتایەکان بەڕێوە دەبات: ئابوری، سیاسی، ئاینی، ئیستێتیك، هتد. ئەو روناکی دەخاتە سەر ئینسیجامی ناوەکیان و ڕێز لە سنورە ئۆتۆنۆمەکانیان دەگرێت(15).

ئێمە دەبێت لەم چوار چێوەیەوە ڕامبێنین لە هەموو ئەو پەیوەندیانەی کە ماکس ڤێبەر لە نێوان ئاین و پانتاییەکانی دیکەی وەك ئابوری، سیاسی، هونەری، ئیرۆتیك، زانستیدا دروستی دەکات. بێگومان ئەم پەیوەندیانەش لەلایەن سروشتی هەر ئاینێکەوە چۆنیەتی و چەندایەتی سنورەکانی دیاری دەکرێت. ڤێبەر پێیوایە لە هەندێك ئایندا ئەم پەیوەندیە زیاتر لەسەر تەوەتور دادەمەزرێت و لە هەندێك ئاینی دیکەشدا ئەم تەوەتورە ئەوەندە لاوازە کە بڵێین

بوونی نیە. بە سنوری سیستەماتیزەکردنی ئاینی رزگاربوون و گردبوونەوەی لە دەوری ئەخلاقی ئیعتیقاد، پەیوەندی لەگەڵ پانتاییەکانی دیکەدا لەسەر تەوەتور خۆی دادەمەزرێنێت. هەروەها بە پێچەوانەوە، بە سنوری گردبوونەوەی ئاین لە دەوری ریتیوّل، ئەم تەوەتورە کەمدەبێتەوە.

ماکس ڤێبەر، لە توێژینەوەیەکی تایبەتدا، بایەخێکی فراوانی داوە بە "پاڵنەر – مۆتیڤ"انەی کە ڕێگایان خۆشکردووە بۆ سەرهەڵدانی ئەو ئەخلاقە ئاینیانەی کە کار لەسەر نەفیکردنی جیهان دەکەن. توێژینەوە سۆسیۆلۆژیای ئاینەکان، لای ماکس ڤێبەر، زیاتر وەك کردەی بیناکردنی تیپۆلۆژیا و وەك سۆسیۆلۆژیای عەقلانیەت دەردەکەوێت. ڤێبەر روناکی دەخاتە سەر کردەی عەقلانیەتێك کە لەو چرکەیەدا ماکینەکەی بە گڕکەوتوەو تەنانەت پانتایی ئاینیشی گرتوەتەوە. هەر لەم توێژینەوەیەدا دوو هەڵوێستی ئاینی وەك دوو دژ ڕوبەڕوی یەکتری دەکاتەوە:

–هەڵوێستێکی زوهدگەرا کە بەشێوەیەکی عەقلانی لە نێو جیهاندا مامەڵە دەکات.

–هەڵوێستێکی ئەفسوناوی کە بە شێوەیەکی ناعەقلانیانە لە دەرەوەی جیهاندا مامەڵە دەکات.

ئەمەش مانای ئەوە نیە کە بە شێوەیەکی هەمیشەیی زوهدگەرا ئەکتیڤ بێت و لە نێو جیهاندا مامەڵە بکات و ئەفسوناویش پاسیڤ و لە دەرەوەی جیهان بێت. ئێمە دەتوانین تێبینی زوهدگەراییەك بکەین کە لە جیهان ڕادەکات و بە تەنها لەسەر ئاستی تاك خۆی دەردەخات. لێرەدا ئەم زوهدگەراییە تێکەڵ بە ڕامانی ئەفسوناوی دەبێت و سەربەخۆیی خۆی لەدەست دەدات. تێکەڵبوون بە کۆمەڵگە یاخو دووره پەرێزی، جوڵانەوە لە نێو کۆمەڵگەدا یاخود ڕامان لێی لە دەرەوە، ئەو دوو حاڵەتەن کە ڕێگا بە توێژەر دەدەن بۆ ئەوەی سلوکی کۆنکرێتی ئەو کەسانە ڕاڤە بکات کە لە ژێر کارایی ئاینێك لە ئاینەکاندا ژیانی رۆژانەیان ڕێکدەخەن.

لە درێژەی توێژینەوەکانیدا لەسەر ئاینەکان، ماکس ڤێبەر روناکی دەخاتە سەر ئەخلاقی ئابوریانەی ئاینەکان و لەم مەیدانەشدا کتێبێکی بەناوبانگی بەناوی ئەخلاقی پرۆتستانت و رۆحی کەپیتالیسم بلاّوکردۆتەوە.

سەرەتا دەبێت تێبینیەکی گرنگ تۆمار بکەین: لۆژیکی ئابوری، بە شێوەیەکی گشتی، وا باوە کە دژی لۆژیکی هەموو ئاینە ئەخلاقیەکانە، چونکە "کۆسمۆس"ی ئابوری نویّ و عەقلانی و سەرمایەداری کە هەڵگری لۆژیکێکی نا –کەسیە هەمیشە وەك دژە – جەمسەری ئەخلاقە ئاینیەکەی چەمکی برایەتی و دۆستایەتیە. لە لۆژیکی ئابوریدا کەسەکان وەك کەسایەتی پێگەیان نیە و کارایی دانانێن بەسەر ڕەوتی روداوەکانەوە. واتە پەیوەندیەکانی بازاڕ و کڕین و فرۆشتن بە توندی بەرەنگاری هەر دەستێوەردانێك دەبنەوە کە لەلایەن ئەخلاقی ئاینیەوە ئاڕاستەیان بکرێت.

لێرەدا ماکس ڤێبەر و کارل مارکس بەیەکدەگەن و پێکەوە بایەکۆتی ئەو لۆژیکە دەکەن کە نرخ بۆ کەسایەتی مرۆڤ دانانێت و کورتیدەکاتەوە لە لۆژیکی کڕین و فرۆشتندا.

بەهۆی ئەم بەریەککەوتنەی نێوان لۆژیکی سەرمایە و لۆژیکی ئەخلاقی خۆشەویستیەوە، بەردەوام بەها ئاینیەکان هەوڵدەدەن ئەو شتە ڕەدبکەنەوە کە ناوی دەنێین "ئابووری جیهانی".

بەلاّم دەبێت تێبینیەکی دیکەش تۆمار بکەین: ڕەدکردنەوەی لۆژیکی بازاڕ، زۆر جار لەلایەن ئەو ئاینانەوەی کە "بەدەزگایی" کراون، تەواو کاڵدەبێتەوە. چونکە ئەوانیش وەك هەر دەزگایەك، بۆ ئەوەی بەردەوام بن، پێویستیان بە کەرەسە ئابوریەکان هەیە. بێگومان لە هەلومەرجێکی ئاواشدا ئەو کەرەسانە کارایی دادەنێن بەسەر کردەی ئایندارییەوە.

ململانێی نێوان لۆژیکی برایەتی ئاینی و لۆژیکی ئابوری نا-کەس پارادۆکسێکی دیکەش بەدوای خۆیدا ڕادەکێشێت، واتە لە هەندێك هەلومەرجدا دەبێت بەهۆی دروستکردنی سەرمایەی ئابوریەك کە لە بناغەوە دژایەتی دەکات. کەمنین ئەو پەرستگا و دێر و خانەقایانەی کە بوون بە پانتایی ئابوری عەقلاّنی! ئابوری ڕوهبانەکان ئابوریەکی تەواو عەقلاّنیە. "زوهد"ی روهبانەکان ئەو کەرەسە باشەیە کە لە نێو "کۆنترادیکسیۆنەکانەوە - لێکدژیەکان"و بە سیفەتە عەقلاّنیەکەی جۆگەلەیەك دەدۆزێتەوە بۆئەوەی بگات بە سەرمایەی کەڵەکەبوو.

لە باسکردنی کەلڤانیسم دا، باس لەوە دەکات کە چۆن ئەم ڕێبازە ئاینیە ریفۆرمخوازە "میسداقیەتی" ئاینی بەخشیوە بە چالاکیە ئابوریەکان و لە ڕێگای ئەم هەڵوێستەشیەوە چۆن بەشداریکردووە لە گەشەپێدانی لۆژیکی ئابوریەکدا کە دواتر "دەوافیعە" ئاینیەکان دوردەخاتەوەو بەشێوەیەکی ماتریالیستانەی روت خۆی دەخاتەوە سەر شانۆ.

هەروەها لە چرکەی گفتوگۆکردن لەسەر پەیوەندی ئاین بە سیاسەتەوە، ماکس ڤێبەر پێیوایە کە ئێمە یەك هەڵوێستی جێگر و هەمیشەیی ئاینمان لەسەر سیاسەت نیە، بەڵکو ئەم هەڵوێستە بە چەندین رەنگ خۆی دەردەخات و بەپێی گۆڕانی هەلومەرجەکان ئەویش دەگۆڕێت. هەندێکجار ئەم پەیوەندیە بە سیاسەتەوە لە شێوەی ئۆپۆزیسیۆنێکی ڕادیکاڵدا خۆی دەخاتە سەر شانۆ، هەندێکجاریش وەك کۆیلەیەکی گوێڕایەڵی دەسەلاّت. هەندێکجار وەك ڕەقیبێك بەسەر دەسەلاّتەوە کاردەکات، هەندێکجاریش وەك دورە پەرێزێکی گۆشەگیر!

لێرەدا گرنگە ئێمە تێبگەین لەوەی کە یەکەم پەیوەندیەکی جێگیرمان نیە و دووەمیش ئەم پەیوەندیە تەواو ئاڵۆزە. بە تایبەتی لەو هەلومەرجانەدا کە ئاین بەشێوەیەکی رادیکالاّنە واقیع ڕەد دەکاتەوە و لە ڕێگای شۆڕشێکی تایبەتەوە دێت و بەها ئەخلاقیەکانی نمایشدەکات. کاتێك ئاین واقیعی بێ رۆح و بێ بەها مرۆییەکان ڕەفز دەکات و چەمکی برایەتی ئینسانی پێشنیار دەکات، ئیتر دەبێت چاوەڕێی کارایی بەهێزی سروشتی ئەو پەیوەندیە بین کە بە سیاسەتیەوە گرێدەدات.

هەروەها ئەو پێیوایە کە دوو جۆر پەیوەندی لە نێوان ئاین و ئیستێتیکیشدا هەیە:

-پەیوەندیەك کە لەسەر لێکتێگەشتنی نەرم دادەمەزرێت. هەموو ئەو ئاینە ئەفسوناویانەی

کە دەیانەوێت ڕێگاکان بگرنە بەر بۆ ئەوەی بڕۆنە پەیوەندی نزیکەوە لەگەڵ جیهانی غەیبدا، بەوپەڕی بەهاوە لە کەرەسە ئیستیتیکەکان نزیکدەبنەوەو هەوڵدەدەن بەکاریان بێنن بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانیان. بۆ نمونە ئەوان پەیوەندیەکی توندوتۆڵیان لەگەڵ ئەم کەرەسانەدا هەیە: مۆسیقا، سەما، ئەرشیتێکت، جەزبەگرتن، تابلۆ، هتد.

—پەیوەندیەکی دیکەش کە لەسەر بەگژیەکداچوون دادەمەزرێت. هەموو ئەو ئاینانەی کە کاردەکەن لەسەر ئەخلاقی برایەتی و پەیوەندی عەقلانیانە بە خواوە، جیهانی ئیستێتیک و هونەر وەك گومانلێکراوێك تەماشا دەکەن و پێیانوایە کارایی خراپ دادەنێت بە سەر پەیوەندی عەقلانیانەی مرۆڤ بە خواوە. بەلاّم کاتێك ئەم ئاینانە دەبن بە ئاینی جەماوەری و جیهانی، ناچارن بۆ وەلاّمدانەوەی پێویستیەکانی جەماوەر و لە پێناوی پروپاگەندەکردن بۆ خۆیان، نەرمتر لەگەڵ جیهانی ئیستێتیك و هونەردا مامەڵە بکەن.

کاتێك ڤێبەر باس لە پەیوەندی نێوان ئاین و سێکسیش دەکات، هەر لە سەرەتاوە پێماندەڵێت: خۆشەویستی سێکسی گەورەترین هێزی ناعەقلانیە. ئەو پێیوایە ئەم پەیوەندیە زۆر جار لەسەر بەگژیەکداچوونەوەو لەیەکتری توڕەبوون و هەندێکجاریش لەسەر دۆستایەتی و لێك نزیکبوونەوە دامەزراوە. سێکسیوالیتیّ و ئاین لە فجوری ئەفسوناوی و مەستبوونی سیحراویدا بەیەکدەگەن. ئەزموونی تێکەڵبوونی ڕۆحی دوو کەس لە کردەیەکی سێکسیدا تەواو نزیکە لە ئەزموونی ئەو کەسەی کە دەیەوێت لە کردەیەکی ئاینیدا تێکەڵ بە جیهانی غەیب ببێت:

"مەستبوونی سێکسی هاوئاهەنگە لەگەڵ ئەو خەڵوەتگە ئاینیانەدا کە لە شەوەکانی فجور دەچن و چەند هۆکارێکی سایکۆلۆژی و ماناکانی فجور پێکەوە کۆیان دەکاتەوە".

ژیانی سێکسیۆل هەستێکی تایبەتی سەرکەوتن بەسەر عەقلانیەتدا دەبەخشێت بەو کەسانەی کە پراکتیکی دەکەن. لێرەداو دیسانەوە پانتایی سێکسی و پانتایی ئاینی بەیەکدەگەن، چونکە ئاینیش دەیەوێت باس لە ئامادەبوونی گەردوونێکی دیکە لە دەرەوەی عەقلانیەت بکات. بەلاّم لە هەمانکاتدا و بە پێچەوانەی مەستبوون لە ئەزموونی سێکسیداو لەدەستدانی تەواوی عەقلانیەت، ئاین نایەوێت هەموو فاکتەکانی بەناعەقلانیەت و مەستبوون و لەدەستدانی وشیاری ببەخشێت. هەر ئەمەشە وایلێدەکات کە لە ڕێگای زوهدی عەقلانیەوە، خۆی بە بەرەی دژە سێکس و دژە ئیستێتیك بزانێت. بە پێچەوانەی شەهوەتەوە، ئاین دەیەوێت جڵەوی چرکەکان لە دەستنەدات و کۆنترۆڵی واقیع بکات.

زیاتر لە هەموو مەیدانەکانی تر، جەنگی ئاین بە پلەی یەکەم لەگەڵ مەیدانی ئەو شتەدایە کە ناوی دەنێین وشیاری "ڕێفلێکسیف[16]". سەرەتا دەبێت بزانین کە قوتابخانەی "گوومانی ئەنتی – ئاینی" لە ئەمڕۆدا سەری هەڵنەداوەو مێژوویەکی درێژی هەیە. ڤێبەر دەڵێت:

"ئەم گوومانە، هەر لە ولاّتی چین، میسر، ڤێداس، لە ئەدەبی جودایسمدا بەوپەڕی هێزەوە

ئامادەیەو ئێمە لە ئەمڕۆدا شتێکی زیاترمان نەوتوە لەوەی کە هەبووە"

لەسەر وشیاری عەقلانی و پەیوەندی بە ئاینەوە دەڵێت:

"لە هەر جێگایەکی جیهاندا وشیاری عەقلانی توانیبێتی بە شێوەیەکی سیستەماتیک جیهان لە وەهم رزگار بکات و بیخاتە نێو چوارچێوەیەکی تێگەشتنی "سەبەبی"یەوە، راستەوخۆ ڕووبەڕوو بووەتەوە لەگەڵ ئەو گۆشەنیگایەدا کە پێیوایە جیهان دەبێت لە سەرشاری مانایەکی ئەخلاقیەوە ئاراستە بکرێت و لێکبدرێتەوە. لە ڕاستیدا ئەو فیکرەی کە جیهان دەخاتە نێو چوارچێوەیەکی ئەزموونیەوەو لەو چوارچێوەیەدا لێی تێدەگات، بە توندی ئەو پرانسیپە رەفزدەکات کە دەیەوێت هەموو ڕوداوەکانی جیهان لە ئاسۆی "مانایەکەوە" ببینێت. لێرەوە لەگەڵ هەر پێشکەوتنێکی عەقلانیانەی زانستە ئەزمونیەکان، ئاین دوور دەخرێتەوە لە پانتاییە عەقلانیەکان و بەرەو دورگەی ناعەقلانیەت پاڵی پێوە دەنرێت. لە بارودۆخێکی ئاوادا ئیتر ئاین دەبێت بە هێزێکی ناعەقلانی و عاتیفی".

لەم پەرەگرافەدا ماکس ڤێبەر ئێمە دەخاتە بەردەم دەرەنجامێکی تاقانە: ناعەقلانی بوونی ئاین دەرەنجامی عەقلانیکردنی زانستەکانی تێگەشتنە لە جیهان! ئەم تێبینیە زۆر گرنگە بۆ تێگەشتن لە قوتابخانە فیکریەکەی ماکس ڤێبەر، چونکە بە درێژایی ژیانی هەرگیز ئاینی وەك هێزێکی ناعەقلانی نەخستوەتە سەر شانۆ، بە پێچەوانەوە، هەمیشە لە ئایندا ئەو لۆژیکانەی بەدیکردووە کە لەسەر بنەماکانی عەقلانیەت کاردەکەن.

لەبری ئەوەی وێنای بەعەقلانیکردنی (ڕاسیۆنالیزاسیۆن) جیهان بکەین وەك پرۆسێسێکی هەڵمژینی هەموو شتە ناعەقلانیەکان کە ئاین نوێنەرایەتیان دەکات، ماکس ڤێبەر داوامان لێدەکات کە وێنای بەعەقلانیکردنی جیهان بکەین وەك ئەو پرۆسیسەی کە نەعەقلانیەت بەرهەم دەهێنێت. بەم پێیە، ڕاڤەکردنی ئەم پرۆسێسە ناچارمان دەکات بە ڕاڤەکردنی دوو رەگەزی گرنگ کە بریتین لە:

–گەشەکردنی کردەی بەعەقلانیکردن (ڕاسیۆنالیزاسیۆن).

–گۆڕینی ئاین لە شتێکەوە بۆ شتێکی دیکە (ترانسفۆرماسیۆن).

لە بەرامبەر هێرشی ڕۆشنبیریدا، هێڵی بەرەنگاری ئاین، بەپێی ڤێبەر، دەبێت بریتی بێت لەوەی کە ئاین پێمان بڵێت: هەموو ئەو شتانەی کە دەیڵێت، دوا مەعریفەی ڕۆشنبیری نین لەسەر نۆرمەکان، بەڵکو هەڵوێستێکی مەعریفیە لەسەر جیهان و بە مەبەستی بەرهەمهێنانی مانایەکی هەنووکەییە. لە ڕێگای هەرسکردنی هەلومەرجە کۆمەڵایەتی و ئێپیستیمۆلۆژییەکانیەوە، ئاین دەتوانێت بڵێت کە ئەو مانایە بەرهەمی ڕامان و دەرککردن نیە، بەڵکو بەرهەمی کاریزمی "ئیشراقاتە".

ئەم کردەیەی ناوی دەنێین "ناعەقلاندنی ئاین" یەکێکە لە کارەکتەرەکانی مەساری ئاینی نوێ و ماکس ڤێبەر ڕێگامان بۆ خۆشدەکات تا باشتر لێی تێبگەین. بەڵام هەرگیز نابێت ئەوەمان لەبیر بچێت کە لە پەنای ئامادەبوونی بەهێزی ناعەقلانیەتی ئاینیدا، چەند پەیوەندییەکی بەهێزیش لە نێوان ئاین و

ڕۆشنبیری عەقڵانیدا هەیە. لەو ساتەوەی کە ئاین دەبێت بە ئاینی کتێب، بەشداری زیندوش دەکات لە "گەشەکردنی فیکریکی کارای عەلمانی و عەقڵانیدا". هەروەها بەشداریشی کردووە لە بەرهەمهێنانی بزوتنەوەیەك لە ناوخۆی خودی ئایندا کە دەکرێت ناوی بنێین بەعەقڵانیکردنی فاکتە ئاینیەکان.

بە درێژایی ڕەوتی ململانێی نێوان ئاین و عەقڵ، ئێمە تێبینی ئەوە دەکەین، وەك ڤێبەر دەڵێت، هەندێکجار بۆ ئەرگیومۆنتهێنانەوە، عەقڵ پەنا دەباتە بەر کەرەسەکانی ئاین و ئاینیش پەنادەباتە بەر کەرەسەکانی عەقڵ. بۆ نموونە عەقڵ بۆ دروستکردنی ئەرگیومۆنتێك "ئیشراق" بەکاردەهێنێت و ئاینیش بۆ هەمان مەبەست دەستدەبات بۆ ڕاسیۆنالیزەکردنی بەڵگەکانی.

سەرەڕای هەموو ئەو شتانەی کە لەسەر دابڕانی نێوان ئاین و عەقڵ وتراوە، ماکس ڤێبەر پێماندەڵێت کە تا ئێستاش چەندین تۆڕی بەهێز ئەو دوو جیهانە بەیەکەوە گرێدەدات.

### 6-ئاین و ناوەندە کۆمەڵایەتیەکان:

ڤێبەر پێیوایە ئاینەکان لەسەر چەندین ئاستی جیاواز مامەڵە لەگەڵ چینە جیاوازە کۆمەڵایەتیەکاندا دەکەن و هەندێکجار ئەم مامەڵانەش دژ بەیەکتر دەوەستنەوە. لێرەوە جیاوازییە کۆمەڵایەتیەکانی ئاینداری دەبن بە یەکێك لە مەیدانە هەرە گرنگەکانی کارکردن. ئەو شتەی کە ئەو گرەوی لەسەر دەکات، پرسیاری کەرامەتی تاکەکانە لە بەرامبەر هەلومەرجی کۆمەڵایەتیاندا.

پێویستی مرۆڤ بە ڕەحمەتی خودا گوزارشتە لەو هەلومەرجە سەختە ئابوریەی کە تیایدا دەژی. ڤێبەر بەشێکی گەورەی ڕەگوڕیشەکانی ئیمان دەباتەوە سەر کۆی زەبرو زەنگی ئەو ستراکتۆرە ئابوری و کۆمەڵایەتیانەی ئەژنۆیان خستۆتە سەر سنگی مرۆڤ. ئەمە یەکێکە لە سەرچاوەکانی ئیمان، بەڵام هەموو سەرچاوەکان نیە[17]. چینە خاوەن ئیمتیازە کۆمەڵایەتی و ئابوریەکان، بە پێچەوانەی دارزاو هەژار و دورخراوەو پەراوێزکراوەکان، پێویستیان بە ڕەحمەت و لێخۆشبوونی خودایی نیە. بە پێچەوانەوە، ئەوان هەوڵدەدەن خودی ئاینیش بەکاربهێنن بۆ ئەوەی شەرعیەت بدەن بە هەلومەرجە کۆمەڵایەتیە خاوەن ئیمتیازەکانیان.

گرنگی ئاین لەوەدایە کە هەروەك چۆن دەبێت بە کەفارەتی گوناهی هەژار و دورخراوەو پەراوێزکراو و بێ نەواکان، ئاواش دەبێت بە دەزگای شەرعیەتدان بە ژیانی کامەران و ئیمتیازاتی دەوڵەمەند و دەسەڵاتدارو هەیمەنەدار و سەرئاوکەوتوەکان. ڕاستە هەموو خاوەن ئیمتیازەکان وەك یەك پێویستیان بە شەرعیەتی ئاینی نیە، بەڵام ئەوەش ڕاستە کە بەختەوەرەکان گەر بتوانن شەرعیەت بەو بەختەوەریە بدەن کە هەیانە هەست بە بەختەوەری زیاتر دەکەن، چونکە خۆیان دڵنیادەکەنەوە لەوەی کە ئەوەی هەیانە ماف خۆیانە نەك کەسی تر.

دوور لە دێتێرمینێسم[18]، ماکس ڤێبەر پێیوایە تەنها لە سنورێکی دیاریکراودا ئێمە دەتوانین باس لە "ئاینداری" تایبەتی چینە کۆمەڵایەتیە دورخراوو کلۆڵەکان بکەین. ڕاستە ئاین زۆر جار باشتر پێگەی بۆ خۆی لە نێو

خانــەوادە پــەراوێز کراوەکانــدا دەدۆزێتــەوە، بەتایبــەتی ئــەو خانەوادانــەی کــە پێویــستیەکی رۆحیــان بــە کــەفارەتی گوناهــەکانیان هەیــە و هەمیشە دەستیان بەرزکردوەتەوەو چاوەڕوانی ڕەحمەتی ئاسمان دەکەن، بەڵام ئێمە هەڵەیەکی میتۆدۆلــۆژی دەکــەین گــەر ئەمــە بگــشتێنین و پێمانوابێت بە تەنها ئەم خانەوادانە پێویستیان بە ڕەحمەتی خواو لێخۆشبوونی ئاسمان هەیە. ماکس ڤێبەر پێیوایە ئاین دەتوانێت بەهێزترین پێگــە لــە نێــو چــینە کۆمەڵایەتیــە خــاوەن ئیمتیازەکانیشدا دروستبکات.

بەشــێوەیەکی گــشتی لــە فیکــری ڤێبــەردا هەرگیز ئابوری بە تەنها چوارچێوەکانی گوتار و رەفتــار ئاینیــەکانی مرۆڤــەکان دیــاری ناکــات. هــــەروەها مرۆڤـــە دورخـــراوەو پـــەراوێزکراو زەحمەتکێـــشەکانیش هەمیـــشە لـــە ڕێگـــای ڕەحمــەتی خــواوە گوزارشــت لــە خۆیــان ناکــەن، بەڵکو چەندین ڕێگای دیکە دەگرنە بەر، یەکێك لەوانــە ڕێگــای پرۆلیتاریــای نوێیــە کــە لەســەر عەلمانیـــەت خـــۆی دادەمـــەزرێنێت و هـــیچ پەیوەندییەکی بە ئاینەوە نیە.

لەگـــەڵ ئـــەم حەزەرکردنەشـــدا، ڤێبـــەر ســەرلەنوێ دان بــەوەدا دەنێــت کــە جۆرێــك لــە پەیوەندی تایبەت هەیە لە نێوان پێگەی چەند پرۆفیــسیۆن/ پیــشەیەك و ئاینداریــدا[19]. بــۆ نموونــە بازرگانــەکان بــەهۆی پیــشەکەیانەوە کــە زۆر بەکــەمی ملکەچــی بنــەما ئەخلاقیەکانــە، هەوڵــدەدەن خۆیــان زیــاتر دورەپــەرێز بگــرن لــە ئاینە ئەخلاقی و پێغەمبەریەکان:

"ئاشــکرایە کــە ژیــانی وردە بۆرژواکــان، بــە تایبـــــــەتی وردە پیـــــــشەسازەکان و وردە بازرگانـــەکان، بـــە پێـــچەوانەی جوتیـــارە لادێییەکانــەوە کــە هەوڵیانــدەدا بــۆ لێکدانــەوەی سروشت پەنا بەرنە بەر سیحر و ئاین، کــەمتر لــە ژێــر کــاریی سروشــتدا بــووە. لــە دۆخێکــی ئاواشـــدا بێگومـــان ئـــاین کـــەمتر لای وردە بۆرژواکان دەبێتە مەیدانی کاردانــەوە. هــەروەها تــەواو بــە پێــچەوانەی جوتیارەکانــەوە، وردە بۆرژواکـــان، ئـــابوری خۆیـــان لەســـەر بنـــەما عەقڵانیەکان دادەمەزرێنن و لە جیهانی غەیبانی دوور دەخەنەوە".

دیــسانەوە ڤێبــەر لەســەر پەیوەنــدی وردە بۆرژواکان بە ئاینەوە دەڵێت:

"پێویــستی وردە بــۆرژوا بــە ئــاین کــەمتر لــە ڕێگای ئەفسانەی پاڵەوانیەوەو زۆرتر لە ڕێگای ئەفسانەی عاتیفیەوە گوزارشت لە خۆی دەکات. ئەم جۆرە مامەڵە کردنــە لەگــەڵ ئاینــدا تیپێکــی تایبەت لە ئاشتی بەرقەرار دەکات و ئارامی بە ژیانی خێزانی دەبەخشێت".

ئـــەم ئولفەتـــە بـــەهێزەی نێـــوان چـــەند ناوەندێکی کۆمەڵایــەتی دیــاریکراوو فۆرمــەکانی ئاینداری وا لــە مــاکس ڤێبــەر دەکــات کــە لەســەر ئاســتی سۆســیۆلۆژیای مێــژوویی بگاتــە ئــەو قەناعەتـــەی کـــە گەشـــەکردنی کریستیانیـــسم ببەســتێتەوە بــە چــینی ســەنعەتکارەکانەوە، بــە تایبــەتی ئەوانــەی کــە لــە شــارەکاندا پێگــەی کارایان هەبوو.

### 7- عەقڵاندنی رۆژئاوایی سلوك:

یــەکێك لــە کــارە ناوازەکــانی مــاکس ڤێبــەر بریتیـــــە لـــــە خـــــستنە ســـــەر شـــــانۆی چـــەندایەتی تیپـــەکانی عەقڵانیـــەت، واتـــە بـــوونی عەقڵانیـــەت لەســـەر ئاســـتی کـــۆ

(پلوریـــــال) نـــــەك تــــاك (ســــانگیولیە). لـــەم سەرشـــارەوە ڤێبـــەر دێـــت و گڵـــۆپ دادەگیرســـێنێت لەســـەر کـــردەی عەقڵانـــدنی ئـــاین وەك فاکتـــەرێکی ســـەرەکی پێکهاتـــەو گەشەکردنی مۆدێرنیتیٚ.

بـۆ تێگەشـتنێکی تەندروسـتانە لـە مـاکس ڤێبەر، دەبێـت تێبگـەین لـەوەی کـە ئـەو هـەرگیز نایـەوێت پەیوەندیـەکی ئۆتۆمـاتیکی لـە نێـوان عەقڵاندنی جیهـان و چەمکی بەرەو پێشچووندا دروستبکات. هەروەها بە توونـدی ئـەو تێـزە ڕەد دەکاتەوە کە دەیەوێت ڕاڤەکردنی سۆسیۆلۆژی بە یۆتۆپیایەکی کۆمەڵایەتیەوە ببەستێتەوە.

ڤێبەر وەك موفەسیرێکی رزگارکردنی جیهـان لـــە وەهـــم، پێـــشنیاری سۆســـیۆلۆژیایەکی رزگارکراویش لە هـەموو ئایـدۆلۆژیاکان دەکات. ئەم پێشنیارەش لـەوەوە سەرچاوە ناگرێـت کـە گوایـــە ڤێبـــەر پیـــاوێکی "ڕێژەگـــەرا" یـــان "رەشـــبینە"، بـــەڵکو لـــەو میتۆدۆلۆژیـــا چـەمکگەرایەوە سەرچـاوە دەگرێـت کـە ڤێبـەر بەکاریـــدەهێنێت بـــۆ تێگەشـــتن لـــە جیهـــانی کۆمەڵایـەتی. واتـە ئـەو پێیوایـە ئـەم جیهانـە لـە کۆمـەڵێك بـەهای ئەنتاگۆنیـست (دژیـەکتر) و لـە یـەکجیاواز پێکهـاتووەو هەمیـشە لـە ململانـیٚ و زۆرانگـرتن و کێبڕکێـدان و داهـاتووی ململانێـی ئـــەم بەهایانـــەش بـــە تـــەنها لەبـــەردەم یـــەك "مـــومکین"دا نیـــە، بـــەڵکو لەبـــەردەم چـــەندین "مومکین"دایە.

ماوەیـەکی کـەم پـێش مردنەکـەی لـە سـاڵی 1920دا، مـاکس ڤێبـەر بـەم شـێوەیە لەسـەر سۆسیۆلۆژیای ئاینەکانی نووسی:

"چـــی وایکـــرد کـــە رۆژئـــاوا بـــە تـــەنها ببێـــت بـــە ســـەرزەمینی ئـــەو فینۆمێنـــە کولتوریانـــەی کـــە بـــارکران لـــە رەهەنـــدی ئیونیڤێرسێل جیهانی؟"

ماکس ڤێبـەر لـە کردەی عەقڵاندنی سلوکدا ئـــەم تایبەتمەندیەتـــە رۆژئاواییـــە لـــە هـــەموو مەیدانەکاندا دەبینێتەوە. واتە مەیـدانێك نەماوە لـە رۆژئـاوادا کـە سـلوك تیایـدا عـەقڵانیزە نـەکرابێت: ئـابوری، سیاسـی، ئـاینی، مـاف، دەوڵەت، هتد.

لێـرەدا ڤێبـەر بـە درێـژی لەسـەر دەوڵـەت دەوەستێت و دەڵێت:

"دەوڵەت بە مانای ئامادەبوونی:

-دەزگایەکی سیاسی

-دەستورێکی عەقڵانی

-سیستەمێکی ماف و یاسای عەقڵانی

-ئیدارەیەکی عەقڵانی

ئەم دەوڵەتە بە تـەنهاو بۆ یەکەمجار لە نێو مـۆدێرنیتیی رۆژئاوایـدا دروسـتبووەو لـە هـیچ جێگایەکی دیکە بوونی نەبووە"

سـاڵی 1902 مـاکس ڤێبـەر لـە ڕۆمـای پایتەختی ئیتالیادا و لە کاتێکدا لە پەیمانگای مێـژوو وانـە دەڵێتـەوە، بـۆ یەکـەمجار چـەمکی عەقڵانیـەت (راسـیۆنالیتیٚ)، بێگومـان بـە مانـا ڤێبەریەکـــەی، بینادەکـــات و دواتـــر وەك دەبیـنین پانتاییـەکی گـەورەی لێکدانـەوەکانی داگیر دەکات.

ڤێبـــەر پێیوایـــە بـــە تـــەنها لـــە رۆژئـــاوادا سەرمایەداری توانیویـەتی مرۆڤێك دروستبکات کـە لـە رێگـای کـارەوە خـۆی بـەدی بهێنێـت و شووناسی خۆی دروستبکات. رۆژئاوا هـەروەك توانیویـــــەتی کەپیتالیـــــسمێکی عـــــەقڵانی دروســـــتبکات، ئـــــاواش توانیویـــــەتی سۆسیالیـسمێکی عـەقڵانی بینابکـات. کـارل

مارکس لە نێو مێژووی سیاسی و کۆمەڵایەتی ڕۆژئاوادا تیۆریەکانی خۆی بەرهەم هێنا. ڕۆژئاوا هەروەك چۆن عەلمانیەتێکی عەقڵانی بەرهەم هێنا، ئاواش ئاینی عەقڵانی بەرهەم هێنا.

ئەم گۆشەی نیگایە تەواو گرنگە بۆ هەموو ئەو کەسانەی کە چۆنیەتی دروستبوون و گەشەکردن و ململانێی کۆنترادیسیۆنەکانی نێو مێژووی ڕۆژئاوا دەکەن بە سەرچاوەی تێگەشتن لە مێژووی بەشەریەت.

بە کورتی ڤێبەر پێیوایە کە ڕۆژئاوا سەرزەمینی عەقڵاندنی هەموو سلوکەکانە، هەر لە سلوکی سیاسیەوە بیگرە تا دەگاتە سلوکی ئاینی. هەر ڕۆژئاواشە کە عەقڵانیەت وەك بەهایەکی ئیونیڤێرسێل – جیهانی بەسەر هەموو لایەکدا دابەشدەکات.

### 8-جیهان لە ئەفسانەوە بەرەو عەقڵانیەت:

لێکجیاکردنەوەی ئاینی ئەفسوناوی و ئاینی ئەخلاقی قولآیی سۆسیۆلۆژیای ئاینەکانی ماکس ڤێبەر پێکدەهێنێت. ئەو پێیوایە کە کردەی بەئەخلاقیکردنی ئاین یەکێکە لە هۆکارە هەرە بەهێزەکانی پێنانە نێو گەردوونی عەقڵانیەتەوە. بزوتنەوەی پاککردنەوەی ئاین لە ئەفسانەکان، وەك کردەیەکی ناوەکی خودی ئاین، ئەو مەیدانە گرنگەیە کە ڤێبەر کاری لەسەر دەکات و دەیگەیەنێتە ئەو باوەڕەی کە بەشێکی زۆر لە گوزارشتە ئاینیەکان بەشداری زیندوویان کردووە لە ڕزگارکردنی جیهان لە ئەفسانەکان و لە عەقڵاندنیشیدا.

لە کاتی توێژینەوەیدا لەسەر هەردوو ئاینی هیندۆیسم و بودایسم، ماکس ڤێبەر پێماندەڵێت: ئێمە دەستمان گیرنابێت لە سلوکی عەقڵانی لەم ناوچانەدا لەبەرئەوەیە کە ئەم دوو ئاینە نەیانتوانیوە خۆیان لە ئەفسانەکان ڕزگار بکەن و پێ بنێنە نێو کردەی بەئەخلاقیکردنی بەهاکانیانەوە کە سەرەتای نزیکبوونەوەیە لە سنورەکانی عەقڵانیەت. ڤێبەر دەڵێت:

"ئاسیاویەکان لەبەرئەوەی کە لە جیهانی سیحر و ئەفسانەکاندا ڕۆچوون و مەستبوون، نەیانتوانیوە گەشە بە سیستەمێك لە سلوکی عەقڵانی بدەن.. سیحر بە تەنها خۆی وەك دەسەڵاتی چاکردنەوەو لەدایکبوونی منداڵ بە گشتی و کوڕ بەتایبەتی و سەرکەوتن لە تاقیکردنەوەکان و هەموو شتە چاکەکان نیە، بەڵکو کەرەسەی سەرکەوتنیشە بەسەر دوژمندا، بردنەوەی پرۆسەیەکە لە دادگا، بەدەستهێنانی پارەی زیاترە، ماڵیکردنی خۆشەویستیەکە. سیحر لەم ناوچانەدا کەرەسەی کارایی دانانە بەسەر خوداوەندەوە بۆ ئەوەی لایەنگری تەرەفێك بێت دژی تەرەفێکی دیکە.. لە هەلومەرجێکی ئاوادایە کە جەماوەرێکی بەرفراوانی ئاسیایی نەخوێنەوار و بگرە خوێنەواریش خۆیان دەدەنە دەست قەدەری هێزی سیحراوی" (*SR, 471*)

ڤێبەر پێیوایە:

"ئەوەی جیهانی لە ئەفسانەکان ڕزگار کرد و بنەماکانی زانستی مۆدێرن و تیکنی و کەپیتالیسمی دارشت پێغەمبەرەکانن"

پێغەمبەر لە هەردوو حاڵەتەکەدا (نوێکەرەوە یان دامەزرێنەری ئاین) کەسایەتییەکی کاریزمی بەهێزەو توانای سەرکردایەتی و گۆڕانکاری

هەیە. ئەو بەناوی مەزهەبێکی ئاینیەوە یان جیهانی غەیبەوە، مرۆڤەکان بە ڕزگاریەوە گرێدەدات. لێرەوە ڕێگا دەگرێت لە هەموو کەرەسەکانی دیکەی پەیوەندی بە ڕزگاریەوە.

لای ڤێبەر "پێغەمبەرە عەقلانیەکان" دوو کاری گرنگیان ئەنجامداوە. یەکەم جیهانیان ڕزگار کردووە لە ئەفسانەکان و دووەمیش پاش کردەی پاککردنەوە جیهانیان خستوەتە نێو پرۆسێسێکی عەقلانیەوە:

"پێغەمبەرایەتی خولقێنەری ئاڕاستەکانی سیستەمێکە لەو سلوکانەی کە بەپێی پەیژەیەك لە بەهای ناوەکی دەردەکەوێت. پێغەمبەر دێت و ژیانی هەموو رۆژێك بەپێی نۆرمە ئەخلاقیەکانی ئەم سیستەمە رێکدەخاتەوە" (*SR, 390-391*)

هەرچەندە ڤێبەر پێیوایە کە جودایسم بەشداریەکی زیندوی نەکردووە لە لەدایکبوونی کەپیتالیسمدا، بەڵام بە رەدکردنەوەی هەموو جۆرە کەرەسەکانی سیحر بەشداریکردووە لە گەشەکردنیدا، بەتایبەتی لە گەشەکردنە مۆدێرنە عەقلانیەکانیدا. لەم هەڵوێستەشیدا لەگەڵ کریستیانیسمدا یەکتری دەگرێتەوە.

لە کتێبی "جودایسمی ئەنتیك"دا ماکس ڤێبەر باس لەوە دەکات کە چۆن وێناکردنی غەیب لەلایەن جودایسمەوە بووە بە هۆکاری سەرەکی گۆڕانی گەورەی ژیار لە مێژووی جیهاندا:

ئێمە لە جودایسمدا تێبینی ئەخلاقێکی ئاینی سلوکە کۆمەڵایەتیەکان دەکەین کە هیچ پەیوەندیەکیان بە سیحرەوە نیە و بەشێوەیەکی زۆر ورد عەقلانی کراوە. ئەمە ئەو ئەخلاقەشە کە دواتر کریستیانیسم لە جودایسمی وەردەگرێت.

ئەم عەقلانیەتەی کە باسی لێوەدەکات سەرەتا لە دەستکاریکردنی پەیوەندی نێوان مرۆڤەکان بە خواوە دەستپێدەکات. لەم پەیوەندیە نوێیەدا خوا ئیتر هێزێکی سیحراوی نیە و پەیوەندی مرۆڤەکانیش لەگەڵ ئەودا لە ڕێگای سیحرەوە دانامەزرێت، بەڵکو خوا وەك هێزێکی عەقلانی خۆیمان پێدەناسێنێت و پەیوەندیشی لەگەڵ مرۆڤەکاندا بە پێی چەند فۆرمێکی عەقلانی رێژەیی دادەمەزرێنێت.

لە هاوکێشەیەکی نوێی ئاوادا، تەنانەت موعجیزەکانیش وەك بیناکردنێکی عەقلانی و مەدلولدار و پڕ مانا دەردەکەون. واتە دەبن بە دەرگایەك بۆ تێگەشتن لە جیهانی غەیب و مانادان بە ئیشراقاتەکانی.

لە جودایسمدا خوا وەك گردبوونەوەیەکی سیاسی و وەك ئەکشن دەردەکەوێت نەك وەك یاسایەکی هەمیشەیی شتەکان. خوا کیانێکی ئەفسوناوی نیە، بەڵکو ئەو هێزەیە کە ئێمەی مرۆڤ دەتوانین لێی تێبگەین. لێرەوە باسکردن لە خوا وەك هێزێکی نا –سروشتی بە مانای "فەهمنەکراو" دروست نییە، چونکە چوارچێوە بەشەریەکانی تێگەشتن بە ئاسانی دەتوانێت وێنای خوا بکات. رەفتارەکانی خوا سنورەکانی تێگەشتنە مرۆییەکان تێناپەڕێنن.

لەمەش زیاتر، ڤێبەر پێیوایە پەیامی پێغەمبەران ئەوەیە کە:

"ئەو هۆکارانە ڕونبکەنەوە کە خوا وەك هێزێکی خولقێنەر دەخەنە نێو چوارچێوەکانی تێگەشتن و عەقڵەوە، بەرادەیەك کە خوا، لە جودایسمدا، ئامادەبووە کە لە دادگایەکی دونیایدا بەرگری لە پەیامەکانی بکات!" (جودایسمی ئەنتیك، لا 416)

پێغەمبەرەکان هەر لە موساوە تا عیسا، پێی لەسەر ئەوە دادەگرن کە:

"جیهـان لەسـەر بنەمایـەکی عـەقڵانی دەڕوات بـەڕێوەو بـە هـیچ شـێوەیەکی لەلایەن ڕێکەوتی کوێر و هێزە سیحراویەکانەوە دروسـتنەبووەو نابرێـت بـەڕێوە. بـە پێـچەوانەوە، جیهـان گوێڕایـەڵی سیـستەمێکی عـەقڵانی و یاسـای و مەفهومـە" (جودایـسمی ئەنتیك، لا 421)

پیـەر بـورتێز، لـە توێژینەوەیـەکی درێـژدا لەسـەر چـەمکی پێغەمبـەر لای مـاکس ڤێبـەر، ئامـاژە بـەوە دەدات کـە، لـە فیکـری مـاکس ڤێبـەردا، گۆڕانـەکانی ئـاین لـە چـەرکەی جودایـسمدا، بەسـەر دوو جەمـسەری گرنگـدا دابەش دەبن:

یەکەم: گۆڕانی پەیوەنـدی مرۆڤ بە خواوە. لێـرەدا هـەموو پەیوەندیـەکان بـە خـواوە لـە ڕوانگـەی ژیـانی ڕۆژانـەی مرۆڤەکانـەوە دادەمـەزرێت و هـەموو چـرکەیەکی ئـەو پەیوەندیەش لـە نێـو مـەدلول و مانـادا کـار دەکات. واتە ئەم پەیوەندیە ئیتر پەیوەندیەکی ماناداره نەك بێ مانا.

دووەم: پەیوەنـدی مـرۆڤ بـە مرۆڤـەوە. لێرەشدا مرۆڤ ئیتر وەك یەکێك لە مەخلوقەکانی خـوا تەماشـا دەکرێـت کـە دەبێـت ڕێـزی لێبگیرێتو نابێت بە هیچ شێوەیەك سنورەکانی ببەزێنرێت.

بـەڵام ڤێبـەر پێیوایـە عەقلەنـەی (ڕاسیونالیزاسـیۆن) جودایـسم تـەنها لـە سـنورێکی تەسـکدا ماوەتـەوەو نـەیتوانیوە پێبنێتە نێو پانتاییە ئابوریەکانەوەو بەشداری بکات لە پێکهێنانی کەپیتالیسمدا.

بۆ تێگەشـتنی زیـاتر لـە کارگـە فیکریەکـەی ماکس ڤێبـەر، باشـوایە کـە ئێـستا پێناسـەیەکی ڕاسـیۆنالیتیّ / عەقڵانیـەت لـە گۆشـەنیگای ئەوەوە بکەین و بزانین چۆن تەفسیری دەکات. لـە سـەرەتای دەستنیـشان کردنـی شووناسـی عەقڵانیەتـدا، ڤێبـەر بـەم شـێوەیە گوزارشـت لـە خۆی دەکات:

"عەقڵانیـەت بریتیـە لـە بڵاوکردنـەوەی کەرەسـە عەقڵانیـەکان لـە نێـو هـەموو پانتاییـەکانی چـالاکیە مرۆییەکانـدا. واتـە بـۆ پێکـانی ئامانجێـك هـەموو کەرەسـە بـەکارهێنراوەکان دەبێـت "عەقلەنـە" بکـرێن. لێرەوە عەقڵانیـەت دەبێت بە ڕێکخستنی ژیـان لەسـەر بنـەمای دابەشـکردنی پانتاییـەکان و دروسـتکردنی هـارمۆنی لـە نێـوان کـۆی چـالاکیەکاندا. ئەمـەش بێگومـان دەبێـت دەرەنجـامی توێژینـەوە زانـستیەکان لەسـەر پەیوەندی نێوان مرۆڤ بە مرۆڤ و مرۆڤ بە ئامێرو مرۆڤ بە ناوەندە کۆمەڵایەتیەکانەوە بێت"[20].

ئەم تیپە لە عەقڵانیەت بەشداری دەکات لە هەڵوەشانەوەی کارایی نۆرمەکان لەسەر ژیانی کۆمەڵایـەتی و کەمکردنـەوەی کاراییـە کۆمەڵایەتیـەکانی ئاینـە ئەخلاقیـەکان لـە ژیـانی ڕۆژانـەی کۆمەڵگـە بەرکەوتوەکانـدا. لـەم تیپـەدا هـەموو فاکتـە کۆمەڵایـەتی و ئـابوری و سیاسـیەکان ملکەچـی لـۆژیکی ماتماتیـك و ژماردن دەکرێن و بـە حاسیبە وردەکان زەرب و تەقـسیم و کۆدەکرێنـەوەو هـەموو شـتەکان کۆنترۆڵدەکرێن.

ڤێبەر پێیوایە ژیان لـە سێبەری ئـەم تیپـە لـە عەقڵانیـەدا مانـای ئـەوە نیـە کـە ئێمـە هـەموو شـتێك لەسـەر ژیـانی هەنووکـەیمان دەزانین، بـە

پێچەوانەوە، ئەو پێیوایە کە مرۆڤی پریمیتیڤ لە ئێمە زیاتر زانیاری هەبوو لەسەر ژیانی هەموو رۆژێکی. ئەم مرۆڤە خۆی بە دەستی خۆی هەموو شتەکانی ژیانی خۆی ریکدەخست، بەلأم ئێمە بۆ هەر شتێك تایبەتمەندیەکمان هەیە و بەبێ پرسی ئەو پەنجە ناکەین بە ئاودا! واتە لەسەر هەر مەیدانێکی ژیانمان چەند خەبیرێك هەیە و بەردەوام دەگەڕێینەوە لایان و پرسیان پێدەکەین.

گومان لەوەدا نیە کە ئەم بۆچوونانەی ماکس ڤێبەر بەهاو نرخێکی زۆریان هەیە لە جیهانی زانستدا، بە تایبەتی بۆ تێگەشتن لە چۆنیەتی کارکردنی جیهانی کۆمەلأیەتی. بەلأم لە هەمانکاتدا دەبێت بزانین کە ناکرێت بەشێوەیەکی رەها وەریانبگرین، چونکە سنوردارن. واتە تا سنورێکی دیاریکراو بڕدەکەن و دواتر دەکرێت نیشانەی پرسیاریان بخەینە سەر.

## 9-ئەخلاقی پرۆتستانت و رۆحی سەرمایەداری:

ئەمە ناونیشانی بەناوبانگترین کتێبی ماکس ڤێبەرە. کتێبێك کە هەر پەرەگرافێکی دەکرێت چەندین لێکدانەوەو ماناو شیکردنەوەی جیای بۆ بکرێت. کتێبێك کە چەندین دۆست و دوژمنی هەیە و بە چەندین شێوەی دژەیەك راڤەکراوە. لەم کتێبەدا سێ گرفتی گەورە خۆیان دەخەنە سەر شانۆ: یەکەمیان پەیوەندی بە گوزارشتی "ئەخلاقی پرۆتستانت"ەوە هەیە. دووەمین پەیوەندی بە گوزارشتی "رۆحی کەپیتالیسمەوە هەیە و سێیەمیشیان بریتیە لە پەیوەندی نێوان ئەم دووانە.

بۆچی گوزارشتی ئەخلاقی پرۆتستانت گرفتێکی گەورەیە؟

وەلأمدانەوەی ئەم پرسیارە رامانەکێشێتە نێو وردکردنەوەی شتەکان. لێرەدا ئاماژە بە وشەی "ئەخلاق/ ئیتیك" کراوە، بەلأم لە راستیدا ئەوەی ڤێبەر باسی دەکات "ئیتۆس"ە نەك "ئیتیك". واتە ڤێبەر باس لە مەزهەبێکی ئەخلاقی ناکات، باس لە ئەخلاقێك ناکات کە لەنێو سیستەمێکی چەمکگەرا (کۆنسێپتیول) و تێوریدا دروستبووبێت، بەلکو باس لە ئەخلاقێکی پراکتیزەکراو دەکات. واتە باس لە فۆرمێکی کۆنکرێتی چۆنیەتی ژیان دەکات.

ئیتۆس بریتیە لە سیستەمێکی ئامادەباشی کە ئاراستەکردنێکی تایبەتی کردە – ئەکشن بەرهەمدەهێنێت و پاشان وەریدەگێڕێتە سەر سلوکێکی کۆنکرێتی ژیانی هەموو رۆژێك.

بێگومان لێرەدا ڤێبەر باس لە هەموو جۆرەکانی "ئیتیك"ی پرۆتستانت ناکات، بەلکو لە نێو هەموویاندا یەکێکیان هەلدەبژێرێت کە لە قوتابخانەی "پوریتین[21]"نی کەلڤانیەکانەوە وەرگیراوە. ئەم قوتابخانەیەش بەتایبەتی لە نێو پرۆتیستانتیسمی ئەنگلۆ-ساکسۆندا گەشەی کردووە. پیوریتانیسم بریتیە لە پێناسەکردنی ستیلێکی تایبەت لە ئایینداری و سلوك و بیرکردنەوە و خۆی جیادەکاتەوە لە ئەوانی دیکە.

گوزارەی "پوریتین" هاتووە بۆ ئەوەی لە نێو پرۆتستانتیسمدا دەستنیشانی چوارچێوەیەکی توندڕەوی ئاینداری و ئەخلاقگەرایی بکات. بەلأم لەدایکبوونی قوتابخانەی "پوریتانیسم"

لــــە مێژوویـــەكی تـــەواو تایبەتدایـــە. ئـــەم قوتابخانەیە دەمانباتەوە سەر ئەو بزوتنەوەیەی كـــە لـــە بـــەریتانی ســـەدەی شـــازدەهەم و حەڤدەهەمـدا دەیویـست سـەرلەنوێ ڕیفـۆرمی ئاین بكاتەوەو بیگەیەنێتە لووتكە.

لایـەنگرانی ئـەم بزوتنەوەیـە دەیانویـست ژیـانی ئـاینی ئیمانـدارەكان دوور بخەنـەوە لـە دەســـەڵاتی پـــاپ و هەرمگـــەرایی قەشـــەكان و "وەســـــاتەكردن" لــــــە نێـــــوان خـــــواو مرۆڤەكانـــدا. ئـــەوان دەیانویـــست تاكـــە ئیمانـــدارەكان ڕاســـتەوخۆو بـــێ "وەســـیت" پەیوەستبكەن بە خواوە. سەرەتا لە فەرەنسادا زۆر بـە توونـدی ڕەدكرانـەوەو تووشـی ئـازار و ئەشـــكەنجە بـــوون و دەرگـــای زیندانـــەكانیان لێكرایـەوە. دواتـر ڕێگـای بـەریتانی گـەورەیان گرتـە بـەر. لـەوێ دەسـتیانكرد بـە دەعـوە بـۆ بانگەوازەكـــەیان و جـــەماوەرێكی زۆریـــان لـــە دەوری خۆیان كۆكردەوە.

لە ڕاستیدا ئەم قوتابخانەیە نە مەزهـەبێكی تایبەتـە و نـە كەنیـسەشە. باشـتر وایـە بـە بزوتنەوەیـەكی ریفۆرمخـوازی ئـاینی نـاوزەدەی بكـــەین. بزوتنەوەیـــەك كـــە دواتـــر كارایيـــە كولتـوریو ئـابوری و سیاسـی و كۆمەڵایـەتی و ئاینییـــەكانی بەســـەر تـــەواوی كۆمەڵگـــەوە بەجێدەهێڵێت.

لەســـەر ئاســـتی كولتـــوری: كەڵڤانیـــستەكان توانیان كولتوری ئینگلیزی بۆ مێژوویەكی درێژ ڕەنگبكـــەن و هـــەژاران و زەحمەتكێـــشانی ئـــەم نیشتمانە قەناعەت پێبكەن كە ڕەحمەتی خواو هەڵبـژاردن و ئاینـداری ئیمتیازێـك نیـە كـە بـە دەوڵەمەنـدەكان بەخـشرابێت، بـەڵكو هـەمووماں لەبەردەم ئەم بەهایانەدا یەكسانین.

لەســـەر ئاســـتی سیاســـی: كۆچـــبەران كـــە دەگەشتنە ئەوبەری ئەتلەنتیك (ئەمەریكا)، وەك گەشـــتبێتنە شـــاری قـــودس، هەســـتیان بـــە كامـــەرانی دەكـــرد كـــە لێـــرە، لـــە ئەمـــەریكادا، دەتـــوانن مومارەســـەی ئیـــدیالی ئاینـــداری خۆیـان بكـەن. مـاكس ڤێبـەر، كـە سـاڵی 1904 ســــــەردانی ئەمــــــەریكا دەكــــــات، ئــــــەم فێنۆمێنـــە دەخاتـــە ژێـــر چـــاودێریەوە. ئـــەم كۆچـبەرە كەلڤانیستانە دواتـر چوارچـێوەكانی سیاســـــەتی ئەمـــــەریكی دادەڕێژنـــــەوە. هـەروەها لـەبیرمان نەچـێت كـە لـە بەریتانیـشدا كارایيـــە سیاســـیەكانی ئـــەم بزوتنەوەیـــە زۆر بـــەهێز بـــووە، بەڕادەیـــەك كـــە میكایـــل والـــزەر شـۆڕشـی بـەریتانی بـە شـۆڕشـی قەدیـسەكان ناودەبـــات. هەنـــدێكیش بـــە شـــۆڕشـــی كەلڤانیـستەكان نـاوی دەبـەن. هـەروەها لەسـەر ئاستی پەروەردە و ژیانی سێكسی و هونـەریش كارایيـــەكانی ئـــەم بزوتنەوەیـــە بـــە ڕوونـــی دەبینرێت.

ماكس ڤێبەر گوزارشتی ڕۆحی كەپیتالیسم لــە ڤێرنـــەر ســـۆمبارتەوە وەردەگرێـــت، بـــەڵام ڕەهەندێكی تازەی پێدەبەخشێت. بەو مانایـەی كە ڤێبـەر پەیوەندیـەكی گرنگ دروستدەكات لە نێـــوان دروســـتبوون و گەشـــەكردنی ڕۆحـــی كەپیتالیسم و كارایی بەهێزی كەلڤانیسم دا. لە هەمانكاتدا پارێزگـاریش دەكات لـەو مانایانـەی كـــە ســـۆمابرت بـــە ڕۆحـــی كەپیتالیـــسمی دەبەخشێت.

هـــەروەها ئـــەو پەیوەندیـــەی كـــە لـــە نێـــوان ئیتـۆس و ڕۆحـی كەپیتالیـسمدا هەیـە، وەك لـە ناونیـــشانی كتێبەكـــەدا ئامـــاژەی پێكـــراوە، پەیوەندیەكی ئۆتۆماتیكی و سەبەبی نیە، بەڵكو

کارلێکردنی نێوان دوو سیستەم لە بیرکردنەوەو مۆنتالیتێ و دوو ئامادەبەشی رۆحیە. واتە پەیوەندیەکی ناوەکی و دەوڵەمەند و مەدلولداری نێوان دوو دەسەڵاتی بیناکارە.

ماکس ڤێبەر بایەخێکی فراوان دەدات بە رەفتارە فەردیەکان و ئەو لۆژیکانەی کە دەیانبەن بەڕێوە. ئەو دەیەوێت لەو هۆکارانە تێبگات کە سلوکێکی عەقڵانی کەسی تاك بەرهەم دەهێنن. لێرەوە کلیك دەکات لەسەر کاراییەکانی فیکری پوریتانیسم لەسەر ئەو کاتیگۆریە لە سلوکی تاك، بەبێ ئەوەی بەهیچ شێوەیەك ڤێبەر کارایی ڕەهەندی ئابوری لەسەر چارەنووسی چەمکە ئاینیەکان رەدبکاتەوە:

"پێویستە ئێمە روناکی بخەینە سەر ئەو هەلومەرجە کۆمەڵایەتی و کولتووری و ئابوریانەی کە کاراییان داناوە بەسەر رەوتی بەرەوپێشچوون و تایبەتمەندیەتی زوهدی پوریتانیسمەوە"

هەر لەسەر هەمان پەیوەندی نێوان ئاین و سلوکی ئابوری، ڤێبەر پێیوایە کە کردەی ریفۆرم دەیەوێت لەسەر ئاستێکی دیکە هەیمەنەی ئاینی بەرجەستە بکات. لەم رێگایەوە ئەم کردەیە دەیەوێت باشتر کۆنترۆڵی سلوکە فەردیەکان بکات و کۆی ژیانی تاکەکان لە قاڵب بدات. لە مەیدانێکی ئاوادا، ڤێبەر هەموو تواناکانی ڕاڤەکردن کۆدەکاتەوە بۆ تێگەشتن لە ئانفرا – ستراکتۆری ئەخلاقی ئەو کردە یەك لە دوای یەکانەی کە کەپیتالیستێك لە ژیانیدا بەرهەمی دەهێنێت.

ماکس ڤێبەر پێیوایە رۆحی کەپیتالیسم ململانێیەکی سەختی کرد تا خۆی بسەپێنێت. چونکە مرۆڤەکان لە سەرەتاوە نەیاندەویست تەماهی بکەن لەگەڵ ئەو پیشەیەدا کە مومارەسەی دەکەن و شوناسی خۆی لە نێو پیشەکانیاندا دروستبکەن. بە پێچەوانەوە، مرۆڤەکان دەیانویست ئەوەندە کار بکەن کە وەڵامی پێویستیە هەنووکەییەکانیان دەداتەوە. بۆ تێپەڕاندنی ئەم بیرکردنەوەیە، کەپیتالیسم دێت و هەوڵدەدات هەموو لایەك قەناعەت پێبکات کە کارکردن دەبێت خۆی لە خۆیدا بکرێت بە ئامانج و خۆشەویستی و حەزلێکردن. ئەوەش کە رێگای دا بە کەپیتالیسم ئەم سەرکەوتنە بەدەستبێنێت، ڤێبەر بە چەند مۆنتالیتێیەکی ئاینی ناوی دەبات. واتە ئەوە ئاینە کە چەك دەداتە دەست کەپیتالیسم بۆئەوەی ئەم جەنگە بباتەوە.

لێرەدا ڤێبەر باس لەو گوزەرە گرنگە دەکات کە لەسەدەی شازدەهەمدا و لە رێگای ریفۆرمی پرۆتستانتەوە لە رۆژئاوادا دروست دەبێت. ئەم ریفۆرمە خۆی وەك ریفۆرمی ژیانی رۆحی و ئیدیالی مەسیحی لە پێناوی قیامەتدا ناخاتە سەر شانۆ، بەڵکو وەك ڕیفۆرم لە پێناوی جیهانی ئێستادا، ئەمەش لە رێگای کلیکردن لەسەر بایەخە ئاینی و ئەخلاقییەکانی رۆڵی مرۆڤ لە نێو کۆمەڵگە ئینسانیەکاندا. لە هەلومەرجێکی ئاوادا، ڕیفۆرمی پرۆتستانت، پانتایی کارکردن دەکات بە پانتایی ئەنجامدانی ئەرکە ئاینیەکان.

لە ڕاستیدا ماکس ڤێبەر کەمتر گرنگی دەدات بە کەلڤانیسمی خودی کەلڤین و زیاتر گرنگی دەدات بە کەلڤانیسمی کۆتاییەکانی سەدەی شانزە و سەرەتای سەدەی حەڤدەهەم، بە تایبەتی لە هۆڵەنداو بەریتانیادا. کەلڤانیسمی ئەم دوو سەدەیە ئەو

بزووتنەوەیەیـــە کـــە دەیـــەوێت ڕادیکالأنـــە ریفـۆرمێکی پرۆتـستانتی لـە پەیوەنـدی مـرۆڤ بەئاینەوە بکات:

"مرۆڤـی گوناهبـار تـەنها لـە ڕێگـای ئیمـانی خۆیـەوە دەتوانێـت دەسـتی لـە ڕەحمـەتی خـوا گیربېێـت، نـەك لـە ڕێگـای وەسـیتەکانەوە. لـەم قوتابخانەیـەدا خـوا زاتێکـی ئـازادە و ملکەچـی هیچ جۆرە یاسایەك نییە"

مـرۆڤ بـۆ ئـەوەی باشـترین پەیوەنـدی لەگـەڵ خوادا هـەبێت دەبێت بە باشـترین شـێوە لـە نێـو کۆمەڵگەدا مامەڵە بکات:

"خوا لە فیکری کەلڤانیسمدا وەك ئەو زاتـە پێناسـە کـراوە کـە داوا دەکـات هـەموو ژیـانی مرۆڤێـك بـە دروسـتی ڕێکبخرێـت و بـەپاکی سەرفبکرێت. مرۆڤی باش کەسێك نیە کە دوورە پەرێز لە کۆمەڵگە کارێکی باش ئەنجامدەدات، بەڵکو ئەو کەسەیە کە لە نێو کۆمەڵگەدا بەپاکی ژیانی دەبات بەڕێوە"

ڤێبەر پێیوایە ئەم گۆشە نیگایە پۆزیتیڤانە دەمانباتەوە سەر پرسیاری کارکردن و بەهادان پێی. ئەمە دروستکردنی ڕۆحی کارکردنە لە نێو کۆمەڵگـەدا، کـارکردن وەك چـالاکیەکی عـەقلأنی کـــە دواتـــر دەبێتـــە هۆکـــاری ســـەرەکی بەرهەمهێنانی سەرمایە. لێرەوە "خۆبەدیهێنان/ خۆرایلیزەکردن" ئیتر لـە نێـو بـەها رۆحیەکانـدا ئـەنجامنادرێت، بـەڵکو لـە نێـو پانتاییـەکانی کارکردندا.

## 10-ماکس ڤێبەر و جەنگی خواکان:

کـاترین کۆلیـۆت تێلـێن پێیوایـە دژایـەتی بەهێزی نێوان جیهانی ڕابردوی چوارچێوە بۆ کێشراو لەلایەن ئاینەکانەوە و جیهانی ئێستای سـێکیولاریزەکراو، بـە شـێوەیەکی ڕاسـتەوخۆ دەمانباتـــەوە ســـەر میـــسداقیەتی ڕاڤەکردنـــە ڤێبەریەکان. لە ڕاستیدا چەمکی "پاکردنەوەی جیهـان لـە ئەفسانە"لای مـاکس ڤێبـەر، مانـای دورخـستنەوەو پـەراوێزکردنی ئـاین نییـە لـە جیهـانی عـەقلأنی ئەمڕۆمانـدا، هـەروەك مانـای کـــۆنترۆڵی ئـــاینی مـــۆدێرنیتێ نیـــە. بـــەڵکو بەشـداریکردنی زیندوانـەی ئاینـە ئەخلاقیەکانـە لە بیناکردنی جیهانی نوێدا.

عەقلەنـەکردنی ئـابوری و سیاسـەت ڕێگـا لـە هـــەر دەســـتێوەردانێکی نۆرمـــە ئاینیـــەکان دەگرێت. کەپیتالیسم و بیرۆکراسی دەرگاکانیان بەســـەر هـــەر بڕیـــارێکی نۆرمـــە ئاینیەکانـــدا دادەخەن. زانستەکان ئامادەنین بەهیچ شێوەیەك گـوێ لـە وەسـیەتە ئاینیـەکان بگـرن و ئـەوەی هـــەموو ئەمانـــە دەبـــات بـــەڕێوە لـــۆژیکێکی بابەتیانەیە نەك هەر شتێکی دیکە.

ڕاســـتە ئاینـــە ئەخلاقیـــەکان بەوپـــەڕی توانایانـەوە بەشـداریان کـرد لـە گەشـەکردنی هەموو ئەمانەدا، بەڵام لە ئێستادا هەموو کاراییە کۆمەڵایەتیەکانیان لەسەر هەریەکێك لەم کێڵگانە لەدەسـتداوە. لـە سـێبەری سێکیولاریزاسـیۆندا ئـــاین هـــەموو دەســـەڵاتە کۆمەڵایەتیـــەکانی لەدەســـتداوە، بەبێئـــەوەی لەســـەر ئاســـتی تاکەکەسی کۆتایی پێهاتبێ و مردبێت. ئەوەی لە ئێستادا گۆڕاوە، هەڵوەشانەوەی کۆمەڵایـەتی هـەموو ئـەو ڕێکخـستنە سیاسـی و ئـابوری و کۆمەڵایەتیانەیـە کـە جـاران لـە لایـەن نۆرمـە ئاینیەکانەوە ڕێکخرابوون.

لـە ئـەمڕۆدا پانتاییەکان، پانتـایی ئـابوری و پانتـایی سیاسـی و پانتـایی ئـەدەبی و پانتـایی

وەرزشی و هتد، وەکجاران یەك مانا پێکەوە گرێیان نادات. بە پێچەوانەوە هەر یەکەیان بۆ خۆیان ئۆتۆنۆمن و بەپێی یاسا و گرەوو ستراتیژیەتە ناوەکیەکانی خۆیان کاردەکەن. واتە ئەو یاسایانەی کە پانتایی ئەدەبی دەبەن بەڕێوە هەمان ئەو یاسایانە نین کە پانتایی سیاسی یان ئابوری دەبەن بەڕێوە. ئیتر پەیوەندیەکی ئۆتۆماتیکی ئەم پانتاییانە بەیەکەوە نابەستێتەوە.

لێرەوە ماکس ڤێبەر دەمانباتەوە سەر "فرەیی بەهاکان". واتە جیهانی ئێستامان دەرەنجامی بەریەککەوتنی چەندین سیستەمی بەهاکانە. بەریەککەوتنێك کە لەنێو ڕەوتی ململانێیەکی بێکۆتایدا ئەنجام دەدرێت. ئەمە ململانێی بێکۆتایی نێوان خوداوەندەکانە. ئەو خوداوەندانەی هەرگیز ناتوانن ڕۆژێك لە ڕۆژان کۆتایی بە نیزاعەکانیان بێنن. لە هەلومەرجێکی ئاوادا هەموو بەهاکان وەك یەك نرخیان هەیە. واتە هەموو بەهاکان ڕێژەیین. تەنانەت بەها ئاینیەکانیش. ئەوەی بۆ کەسێك بەهایەکی جیهانیە. بۆ کەسێکی دیکە هیچ مانایەکی نیە.

بەشێوەیەکی گشتی ئەمە ئەو چوارچێوە سۆسیۆلۆژیەیە کە ماکس ڤێبەر بۆ وێناکردنی ئاینی تەرخانکردووە.

## بیبلۆگرافی
## کتێبەکانی ڤێبەر


*Le savant et le politique, Paris, Plon, 1963.*

*Conomie et société, Paris Plon, 1971.*

*Le judaïsme antique, Paris, Plon, 1970.*

*L’éthique protestante et l’esprit du capitalisme, Paris, Flammarion, 2000.*


## پەراوێزەکان

1-پێموایە بەبێ تێگەیشتن لەو چەمکانەی کە لەم توێژینەوەیەدا بڵاوبووەتەوە، ئەستەمە بتوانین لە ماکس ڤێبەر تێبگەین. بە داخەوە کولتوری زانستی ئێمە تا ئێستاش نەیتوانیوە بیانکوردێنێت، بۆیە ئێمە ئەگەر وەك سەرەتایەکیش بێت هەوڵدەدەین لە فەرهەنگی کۆنسێپتەکاندا وردیان بکەینەوە، بە ئومێدی ئەوەی لە داهاتوویەکی نزیکدا کێڵگەی زانستی کوردی ئەم ئەرکە بە تەواوی بگرێتە ئەستۆی خۆی.

2-لە زمانی فەرەنسیدا بەم شێوەیە وەرگێڕدراوە: زانست وەك پیشە و دەعوە. بەڵام لە دەقە ئەڵمانیەکەدا وشەی "دەعوە" نیە و فەرەنسیەکان بۆیان زیاد کردووە چونکە وشەی "پیشە" بە تەنها مانا ئەڵمانیەکە نادات بە دەستەوە.

3-بۆ تێگەشتن لە چەمکی لایك ئامۆژگاری خوێنەر دەکەم بگەڕێتەوە بۆ فەرهەنگی کۆنسێپتەکان.

4-بۆ تێگەیشتن لە چەمکی سێکیولاریزاسیۆن، خوێنەر دەتوانێت بگەڕێتەوە بۆ سەر فەرهەنگی کۆنسێپتەکان.

5-ماکس ڤێبەر ئەم چەمکە بە ئەڵمانی ناو دەنێت: ڤێرتفرایهایت *WERTFREIHEIT* و فەرەنسیەکانیش وەریانگێڕاوەتە سەر: نۆترالیتێی ئەکسیۆلۆژی (بێلایەنی ئەکسیۆلۆژی). ئێمە بە: "بێلایەنکردنی بەهاکان" دەیکوردێنین. داوا لە خوێنەر دەکەم کە پێش خوێندنەوەی ئەم دێڕانەی خوارەوە بگەڕێتەوە بۆ

فەرهەنگی کۆنسێپتەکان، بۆ ئەوەی تێبگات لەوەی کە لێرەدا دەینووسین.

6–جولیا فرۆند، توێژینەوە لەسەر ماکس ڤێبەر، جنێف – پاریس، کتێبخانەی درۆز، 1990، لا 11.

7–لە فەرەنسادا تا ئێستاش ئەم جەنگە بەردەوامە: ئایا سۆسیۆلۆژیای ماکس ڤێبەر سۆسیۆلۆژیای تێگەشتنە یان ڕاڤەکردنە؟ ترادیسیۆنی سۆسیۆلۆژیا لە فەرەنسادا ماکس ڤێبەر وەك سۆسیۆلۆژیای تێگەشتن دەخاتە سەر سانۆ و ئیمیل دۆرکایمیس وەك سۆسیۆلۆژیای ڕاڤەکردن. (ع.ب)

8–ئیدیالتیپ یەکێکە لە چەمکە میتۆدۆلۆژیە هەرە بەهێزەکانی ماکس ڤێبەر و خوێندکارانی زانستە کۆمەلآیەتیەکان هەر لە سالّی یەکەمی زانکۆوە دەیخوێنن. لە زمانی فەرەنسیدا دەکرێت بەمشێوەیەش بنوسرێت: ئیدیال – تیپ، یان تیپ– ئیدیال. بگەڕێرەوە بۆ فەرهەنگی کۆنسێپتەکان.

9–ماکس ڤێبەر، "ئۆبژێکتیڤیتێی مەعریفە لە زانست و سیاسەتی کۆمەلآیەتیدا"، (1904)، لا 2".

تێبینی: ئیدیالتیپ کەرەسەی کارکردنی میتۆدۆلۆژی توێژەرانە نەك چەمکێکی تیۆری نەگۆڕ. توێژەر بۆ تێگەشتن لە کردە کۆمەلآیەتیەکانی تاکێك یان گروپێك دێت و ئیدیالتیپێك دروستدەکات و پاشان لە ڕێگایەوە هەوڵدەدات تێگەشتنێکی زانستیانە لەسەر واقیع وەك ئەوەی هەیە بەرهەم بێنێت. "عادل باخەوان"

10–بە فەرەنسی دەبێت بە: ***Groupement hierocratique***، بە ئەلّمانیش دەبێت بە: ***Hierokratischer Verband***.

11– من لە بەرامبەر "***cmmunalisation***"ی فەرەنسی و "***vergemeinschaftung***" ئەلّمانیدا وشەی "هاوبەشاندن" بە ناچاری بەکار دەهێنم و دەزانم کە سەد لە سەد لەیەکتری ناچن، بەلآم پێموایە لەیەکتری نزیکن. هاوبەشاندن کردەی بیناکردنی ئینتمای هەموو بەشەکانە بۆ بەشێك، دروستکردنی پانتاییەکی هاوبەشە بۆ بەشە جیاوازەکان..

12–من پێموایە ئەم ڕستەیە جێگای گفتوگۆیە، چونکە دەکرێت وەك چۆن ببین بە ئەندامی سێکتێك ئاواش ببین بە ئەندامی کەنیسەیەك و لە هەردوو حالّەتەکەدا مەرج نیە کە هەر لە لەدایکبوونەوە ئینتیمامان بۆیان هەبێت. بەلآم بەشێوەیەکی گشتی ماکس ڤێبەر ڕاستدەکات، چونکە کەم نین ئەو کەسانەی هەر لە چرکەی لەدایکبوونەوە تا مردنیان بە موسلّمان و مەسیحی و یەهودین. (عادل باخەوان)

13–گەڕانەوە بۆ فەرهەنگی کۆنسێپتەکان زۆر گرنگە، گەر نا ئەستەمە لە چەمکی ئیدیالتیپ تێبگەیت و بەبێ ئەم تێگەشتنەش زۆر ئەستەمە خوێنەر لەم ڕستەیە بگات.

14–یوهاکیم ڤاخ، سۆسیۆلۆژیای ئاین، پاریس، پایۆت، 1955، بەشی هەشتەم، لا 289–341.

15–لە قوتابخانەی ماکس ڤێبەردا و بە زمانی فەرەنسی ئەمە ناونراوە "تیۆری سفێر"، بەلآم لەبەر ئەوەی من هیچ وشەیەکی کوردیم لەبەردەستدا نیە کە لە بەرامبەر "سفێر"دا دایبنێم، ناچار وشەی "پانتایی" کە دەکاتە "ئیسپاس" بەکاردەهێنم. ئەم تیۆریە دواتر لەلایەن پیەر بۆردیۆوە کاری لەسەر دەکرێت و ناودەنرێت "تیۆری کێلّگە". (عادل باخەوان)

16–بگەڕێرەوە بۆ فەرهەنگی کۆنسێپتەکان.

17–لێرەدا دیسان ڤێبەر لەگەلّ مارکسدا یەکدەگرێتەوە لێشی جیادەبێتەوە. یەکدەگرێتەوە لەوەدا کە گرنگیەکی زۆر دەبەخشێت بە کارایی سەرچاوە ئابوریەکان لەسەر پرسیاری ئیمان، جیاشدەبێتەوە لەوەدا کە بە تاکە سەرچاوەی نازانێت. (عادل باخەوان)

18–بگەڕێرەوە بۆ فەرهەنگی کۆنسێپتەکان.

19–مەبەستی ئەوەیە بڵێت کە کاتێك ئەکتەرێکی کۆمەڵایەتی پیشەکەی دەگۆڕێت، جۆری ئایندارێشی دەگۆڕێت. (عادل باخەوان)

20–جولیا فرۆند، سۆسیۆلۆژیای ماکس ڤێبەر، پاریس، 1968، لا 16.

21–لە زمانی فەرەنسیدا وشەی "پیور" بەمانای پاك دێت، واتە شتێك کە هیچ شتێکی دیکەی تێکەڵ نەبووبێت. کەلڤانیستەکان ئەو مەسیحیانە بوون کە لە سەدەی حەڤدەهەمدا دەیانویست ئاینی مەسیحی وەك ئەوەی هەبووە مومارەسە بکەن، بەبێ زیا و کەم. دەکرێت بەراوردیان بکەین بە سەلەفیەکان لە ئیسلامدا. مەزهەبەکەیان پێی دەگوترێت "پیوریتانیسم" واتە گەڕانەوە بۆ سەرچاوە وەك ئەوەی هەبووە. سەرچاوەیەکی پاکی تێکەڵ نەبوو بە شتی دیکە. (عادل باخەوان).

# فەلسەفەی شۆڕشی خوێندکاران

ئیبراهیم حەیدەری

لە عەرەبیەوە: شوان ئەحمەد

ئەم مانگە (واتە مانگی ئایار)، ڕێکەوتی یادی چل ساڵەی شۆڕشی خوێندکاران و لاوان دەکات کە ساڵی 1968 لە ئەوروپادا تەقیەوە، بۆ خۆم لە نزیکەوە ئاگاداری هەندێ لە ڕووداوەکانی بووم. ئەم شۆڕشە بریتی بوو لە بزاوتێکی ناڕەزایەتی نیشاندان و ڕەتکردنەوەو ڕەخنەی کۆمەڵایەتی و شێوازێك لە شێوازەکانی پرۆسەی گۆڕان و گۆڕینی کۆمەڵایەتی و کلتوری، خەسڵەتی سەرەکیشی بریتی بوو لە گەشەکردنی هۆشیاری خوێندکاری، کە کەمتازۆر هاوشێوەی (هۆشیاری چینایەتی)یە لای کرێکاران لە سەدەی نۆزدەدا. بەم پێیە گەنجان و خوێندکاران بوون بە میراتگری ئەو ڕۆڵەی پرۆلیتاریا دەیگێڕا. ئەم قسەیەش لەو بۆچوونەی سۆسیۆلۆگی ئەڵەمانی "هربرت مارکۆزە"وە نزیکە کە جەختی لەسەر توانای ڕۆشنبیران و خوێندکاران دەکردەوە، بۆ ئەنجامدانی گۆڕانکاری ڕیشەیی لە کۆمەڵگەدا.

سەرەتاکانی ئەم ئاقارە ڕەخنەییە لە ناوەڕاستی سەدەی پێشوودا دەستی پێکردو، ئەویش بە هەوڵی هەندێ سۆسیۆلۆگەوە دیار بوو کە دەیانویست لە جیهانی دوای دووەم جەنگی جیهانی بکۆڵنەوەو شرۆڤەی بکەن، جیهانێك کە بەهۆی کەڵەکەبونی پێشکەوتنی زانستی و تەکنۆلۆژیەوە، هێزی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بەرەو هەڵکشانی زیاتر دەچوو، لە پای ئەمەش کۆمەڵگەی ئەمریکی وەرگۆڕا بۆ کۆمەڵگەیەکی بەرخۆری.

ئەو تیۆریە ڕەخنەییە شانی دا دابووە سەر زیادبوونی سانسۆر و نەمانی جیاوازی، لە نێوان چەپ و ڕاست و دەرکەوتنی سەرەتاکانی ئاوابونی سوسیالیزم و زاڵبونی کۆمەڵگە بەسەر زۆرێك لە کێشە جەوهەریەکانیدا، ئەمەش مانای وا بوو کە شوێنێك بۆ ململانێی ئایدۆلۆژی نەماوەتەوە، بەلام هەر هێندەی سەرەتای شەستەکان دەستی پێکرد، ئەو تەوژمی ئومێدو

گەشـبینیەی بیرکردنـەوەی هەنـدێ تیۆرسـینی پـەنجاکانی داگـیر کردبـوو، بـەرەو کاڵبونـەوە چوو، لەبەر ئەوەی هێزگەلێکی تازە دروست بوو کـە دژی هێرشـە سـێ قۆڵیەکـەی سـەر وڵاتـی میسر و جـەنگی ڤێتنـام و جـەزائیر وەستانەوە، لەگـەڵ هەڵوێـست وەرگـرتنی کرێکـاران و رۆشنبیران دژی ستالینیەت، سەرەنجام ئەمانە بوونە هێزێکی ئۆپۆزسیۆنی تازە و بوونە خاڵی دەسپێك بۆ دروستبونی بزاوتێکی چەپی نوێ لە ئەوروپادا.

لـە ئـەمریکایش جوڵـە و بزاوتـی رەش پێـستەکان کـە بـە بزاوتـی مافـە مەدەنیەکان ناسرابوون، بە رابەرایەتی "مارتن لۆتـەر کیـنگ" و شۆڕشـی کۆبـا و بـیرو بۆچونەکانی "گیڤارا" سەبارەت بە شۆڕشی نێو دەوڵـەتی و سیاسـەتی دەرەوەی وڵاتـە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە باشوری خۆرهەڵاتی ئاسیا، کاریگـەری زۆری لەسـەر دروسـتبوونی بزاوتی چەپی نوێ هەبوو، ئەمە سەرەڕای ئەو هەلومەرجە کۆمەڵایەتی و ئابووری و کلتوریەی رۆژبـەرۆژ هەسـتی نـامۆیی لای گـەنجان و خوێنـدکاران زیـاتر دەکـرد و زەمینـەی پەیوەنـدیکردن و تێکـەڵبونی بـە بزاوتـە خوێندکاریـەکان خۆشتر دەکرد، تـا لـە رێگـەی ئەوەوە بتوانن گوزارشت لەو ڕك و بێزاریە بکەن کـە دەرهـەق بـە چـۆنیەتی مومارەسـەکردنی سیاسەتی ئەو سەردەم و قۆناغە هەیانبوو.

بـیرو بۆچـونی بیریـارانی قوتابخانـەی فرانکفـۆرت و شـیکاریەکانیان لـە بـواری کۆمەڵناسـی رەخنەییـدا، بـە تایبـەتیش "ئادۆرنۆ" و "مارکۆزە"، ڕۆڵێکی بەرچاویان لە جۆشـدانی خوێنـدکاران و وروژانـدنی پرسـیارگەلێکی رەخنـەیی و بـیرو بۆچـونی کۆمەڵایـەتی نوێـدا بـینی، کـە بـە ئاشـکرا ناڕەزایی و بێـزاری خوێنـدکارانی بەرامبـەر بەو سـستمە کۆمەڵایـەتی و ئایدۆلۆژیـەی لـە ئـارەدابوو نیـشان دەدا، هـەروەها هۆشـیاریان دەرهەق بەو مەترسیە قوڵانەی کە رەنگە چەکە ئەتۆمیەکان و هەڕەشەی بەردەوامی بەرپابوونی شـەڕ دروسـتی بکـەن. ئـەم شـتانە لـەو دروشـم و داخوازیانـەدا رەنگـی دایـەوە کـە خوێنـدکاران بـەرزیان کردبـووەوە، وەکـو (بالـەبری شـەڕ خۆشەویستی بکەین).

کـۆی ئـەم رووداووکێـشانە، خوێنـدکاران و لاوانـی بەخۆیـەوە خـەریك کردبـوو، لـە مەشـدا زۆرێك لە رۆشنبیران و مامۆستایانی زانکۆکان بـە تایبـەت لـە بەشـەکانی کۆمەڵناسـی و سیاسـەت و ئەنسرۆپۆلۆژیا هاوخـەمیان بـوون، بە تایبەت دوای ئەو گۆڕانکاریانەی لە زۆربەی وڵاتـانی خۆرئـاوادا بەسـەر سـەندیکاکانی کرێکارانـدا هـات و بـوون بـە رێکخراوگـەلێکی بیرۆکراسـی و بەشـێوەیەکی ڕاسـتەوخۆ و ناڕاسـتەوخۆ، لـەدامودەزگا سـەرمایەداریەکاندا بوونـە شـەریکە بەشـی قـازانج و هەڵپـەکردن. هـەروەها مەسـەلەی ئازادیـەکان و یەکـسانی و سـەربەخۆیی زانکـۆ و داخـوازی بـۆ چاکسازیکردن و بەشداریکردنی خوێندکاران لە بـەڕێوەبردنی زانکـۆ و رەخـساندنی هـەل لەبەردەمیانـدا بـۆ ئـەوەی دەسـتیان لـە دیـاریکردنی چارەنوسـی خۆیانـدا هـەبێت، لـە گـرنگترین ئـەو داواکـاری و دروشمانـە بـوون کە شۆڕشـی خوێنـدکاران بـەرزی کردبوونـەوە، ئەمـەش دەسـپێکی هاتنـە ئـارای هۆشـیاریەکی نوێ و گرتنە بەری تیۆریایەکی جیهانی بوو کە پێداگری لەسـەر خواسـتی ئازادی و ئـازادبوون دەکـردەوە، بـۆ ئـەوەی خوێنـدکاران ڕۆڵێکـی

سیاسـی و رۆشـنبیری تازەیـان لـە زانکـۆ و کۆمەڵگەدا هەبێت و لە ڕێی گۆڕینی کۆمەڵگەوە بتوانن جیهان بگۆڕن و چارەنوس لە دەستی خۆیاندا بێت، هیچ یەك لە مانەیش نایەتەدی، تەنها لە ڕێی ڕەتکردنەوەی ئەو سستمە باوو بونیادە کۆمەڵایەتی و ئایدیۆلۆژیەوە نەبێت کە پشتیوانی لێ دەکەن. هەروەها بیروبۆچونە شۆڕشگێڕیەکانی "هربرت مارکۆزە"، بوون بە سیمبول و دروشم و خوێندکاران بەرزیان دەکردنەوە و لە خۆپیشاندان و ناڕەزایی دەربڕینەکانیاندا بەکاریان دەهێنان، ئەمە نەك هەر لە ئەڵەمانیادا بە تەنها بەڵکو لە ئەمریکا و فەرەنسا و وڵاتانی دیکەی ئەوروپیدا. چونکە "مارکۆزە" گوزارشتی لە بۆچون گەلێك کرد کە ئەوانی دیکە نەیانتوانی باسی لێ بکەن، ئەویش لە ڕێی ئازادکردنی فینۆمینۆلۆژیای مارکسیزم، لەم کارەشیدا پشتی بە "هیگڵ" و "سارتەر" بەستبوو، وەك چۆن پشتی بە "هۆسێرل"یش بەستبوو، بەتایبەت لە ڕەخنەگرتنیان لە زانست و تەکنۆلۆژیا، چونکە بەرەو پێشچونی زانست و تەکنۆلۆژیا نیشانی دەدات کە ڕەوتی کۆمەڵایەتی لەسەر بنەمای سەرمایەداری دامەزراوە. هاوکات لە دۆخێکی وادا زانست و تەکنۆلۆژیا شەرعیەت بە پەیوەندیەکانی دەسەڵاتخوازی دەدەن، کارێك کەوا دەکات دروستبوون و هاتنە ئارای هەر ئەلتەرناتیڤێکی نوێ پەکبخات. تەنها ڕێگایەکیش کە لەبەردەم تێپەڕاندنی ئەم دۆخەدا بێت، ناڕەزایی خۆبەخۆی تاکە پەراوێز نشینەکانە لە دژی ئەو سستمە سیاسی و کۆمەڵایەتیەی لە ئارەدایە. ئەم دیدو بۆچونانە "مارکۆزە"یان کردە فەیلەسوفی شۆڕشی خوێندکاران و سەرکردەی فیکری ئەو بزاوتە و تێزەکانیشی بوونە دروشمی شۆڕشگێڕانە. کاری ڕێکەوت نەبوو ئەو خوێندکارو لاوانەی لە واقعی کۆمەڵایەتی خۆیان یاخی بوون، درك بەوە بکەن کە دید و بۆچوونەکانی "مارکۆزە"، بە تایبەت ڕوی ئەوان دەگرێتەوە و ئەمەش وایان لێدەکات هەست بکەن ڕێگای ئازادی بەڕویاندا کراوەیە.

بەمجۆرە دید و بۆچونەکانی "مارکۆزە"، زۆر بەخێرایی لە نێوان گەنجان و خوێندکاراندا بڵاوبووەوە و بوو بە ڕێنیشاندەری شۆڕش و ڕاپەڕینەکەیان کە یەکەمجار لە هەردوو زانکۆی (بێرکلی) و (کالیفۆرنیا) لە ساڵی 1965 دەستی پێکرد، دوای ئەوەی پۆلیس ڕێی لەو خۆپیشاندانانە گرت کە لە دژی شەڕی ڤێتنام ئەنجام دەدرا. دواتر ساڵی 1968 لە پاریس لە مانگی ئایاردا شۆڕش تەقیەوە و دواتر لە هاوینی هەمان ساڵدا فرانکفۆرت و بەرلینی گرتەوە، تا گەیشت بە ئیتالیا و ئیسپانیاو چیکۆسلۆڤاکیا و وڵاتی ئەوروپی دیکە.

خۆپیشاندانی گەورە شەقامەکانی پاریس و فرانکفۆرت و بەرلینی خۆرئاوای گرتەوەو پشێوی و تێکدان و کاری توندوتیژی لێکەوتەوە، خوێندکاران لە ڕێی ئەو کارانەوە داوای ئازادی و خۆشەویستی و دیموکراسیان دەکرد. چەند گروپێکی بچوکیش لە کرێکاران و پەراوێزخراو و زەحمەتکێش و پەناهەندە و ژینگە پارێزەکان و.. هتد، بەشداری ئەو خۆپیشاندانەی خوێندکارانیان کرد. کاتێك دەسەڵاتداران نەیانتوانی تورەیی و یاخی بوونی ئەوانە کۆنترۆڵ بکەن، بە توندی ڕووبەڕویان بوونەوەو وەکی کۆمەڵە چەتەیەکی ئاژاوەگێر کە ئامانجیان تێکدان و ئاژاوە نانەوەیە، مامەڵەیان لەگەڵ کردن.

"رۆدی دۆتـــشکە" ڕابـــەری بزوتنـــەوەی خوێنـدکاران لـە ئەڵـەمانیا و هـەروەها "کـوهن بندێت" سەرکردەی شۆڕشی ئایار لە پاریس، بۆچـونیان دەربـارەی شۆڕشـی نێـو دەوڵـەتی سەرچاوەکەی "هربرت مارکۆزە"ی مامۆستایان بوو. چونکە "مارکۆزە" تەئکیدی دەکردەوە کە بزاوتی خوێندکاران شۆڕشێکە دژ بە دەسەڵاتو سـەرکوتکردن، لەبـەر ئـەوە پێویـستە شۆڕشـی خوێنـدکاران شۆڕشـێکی ڕادیکالانـە بێـت، بـۆ بەگژاچـــوونەوەی ســـتەم و چەوســـاندنەوەو دەسەڵاتی کۆمەڵگەی سەرمایەداری کە وەك یەك ئازادی تاکە کەس و کۆمەڵگە پێشێل دەکات.

هەروەها ڕەخنەشی ئاڕاستەی سوسیالیزمی تەقلیـدی کـرد و داوای دەسـت بـەرداربونی چـــەمکە تەقلیدیـــەکانی کـــرد. "مـــارکۆزە" سوسـیالیزم وەکـی خـۆی ڕەتناکاتـەوە، بـەڵکو ئەوەی ڕەتـی دەکاتـەوە سوسیالیزمی تەقلیدیـە لـە ئـەوروپاو ئەمریکاشـدا ئـەوەی ڕەخنـەی ئاڕاستە دەکرد هەر بە تەنها زانکۆ نەبوو، بەڵکو کۆی کۆمەڵگەی سەرمایەداری بوو. "مارکۆزە" لەو قۆناغەدا لە نێوان بەرلین و فرانکفۆرتدا لە هاتوچۆدا بـوو، لـە نـاو زانکۆکـانی ئەڵـەمانیادا لێکـــچەر و وتارەکـــانی دەدا و هـــەر خۆشـــی ڕابەرایەتی خۆپیشاندانی خوێندکارانی دەکرد، لـە دژی دامودەزگاکـانی ئـەمریکا لـە ئەڵـەمانیا، وەك نارەزاییەك لە دژی شەڕی ڤێتنام.

لەلایـــەکی تـــرەوە "لـــە ڕۆدی دوتـــشکە" بـەردەوام جـەختی لەسـەر گـۆڕینی چـەمکە تەقلیدیـە باوەکـان دەکـردەوە، ئـەویش لـە ڕێـی ڕەخنـــەگرتن و نـــاڕەزایی نیـــشاندانە دژی دەســـەڵاتی خۆســـەپێنەرانەی کۆمەڵگـــەی ســـەرمایەداری بـــە تایبـــەتی، ئـــەو دەســـەڵاتە خۆسـەپێنەرەی ئـازادی تاکەکـەس و کۆمـەڵ سـنوردار دەکـات. هاوکـات "دوتـشکە" وەهـا سەیری مەسەلەی ئازادی و ڕزگاربوونی دەکرد کـــە مەســـەلەیەکی جیهـــانی سەرتاســـەریەو، دوپاتی دەکردەوە کە ناکرێت ئازادی لە ئەوروپا جیابکرێتـەوە لـە ئـازادی لـە وڵاتـانی دیکـەی جیهاندا. هەروەها پێی وابوو زانکۆ تەنها بۆتە دەزگایەکی بیرۆکراتی و خۆی خستۆتە خزمەت کۆمەڵگـە و ئـەو سـستمەی لـە ئارەدایـە، بـەبێ ئەوەی ئاگاداری قەیرانـەکانی خـۆی بێـت و بـە قـوڵی تێـی بگـات. ئەگـەر گەنـدەڵی زانکـۆی گرتبێتـــەوە، ئـــەوا ڕەنگدانـــەوەی گەنـــدەڵبونی کۆمەڵگـــە و دامودەزگاکانیـــەتی. بزاوتـــی خوێنـدکاران و لاوانـیش هـیچ نییـە جگـە لـە هـــەوڵێك بـــۆ گـــۆڕینی کۆمەڵگـــە، لەبەرئـــەوەی پەرچەکردارەبەرامبەر ئەو دیاردەی نیگەرانی و تێئاوارەبونـــەی گـــەنجان دوچـــاری بـــوون و کۆمەڵگەی بەرخۆری دەیسەپێنێت بەسەریاندا.

هەرچـــی "کـــوهن بنـــدێت"ی ســـەرکردەی شۆڕشی خوێندکارانی شاری پاریسیشە، ئەوا دوای تـەنگ و پێهەڵـچنینی لەلایـەن پۆلیسەوە، پاریـسی بـەجێ هێـشت و ڕوویکـردە شـاری فرانکفۆرت لە ئەڵـەمانیا. ئەم پێیوابوو شۆڕش لـــە زانکۆکانـــەوە دەســـت پێـــدەکات و بـــە شۆڕشـــکردن بەســـەر ســـستمی کۆمەڵایەتیـــدا کۆتـایی دێـت. بەبۆچونی "کۆهن بندت" زانکۆ دوو ڕۆڵی دژبەیەك دەگێڕێت، یەکەمیان ئەوەیە کە مەعریفە و زانینمـان دەداتـێ و مەڵبەندێکە تیایـــدا تیۆریـــا زانـــستیەکان بەشـــێوەیەکی سـەربەخۆ گەشـەی تیا دەکـەن و بـرەو دەکـەن، بـــەڵام ڕۆڵـــی دووەمیـــان ئەوەیـــە کـــە دەبێتـــە دەزگایـــەکی بیرۆکراتـــی و دەســـتی کـــار و فەرمانبـەر ئامادەدەکـات، بـۆ ئـەو سـستمە کۆمەڵایەتیـەی پێویـستی پێیانـە. لـە ئێـستادا

سـستمی سـەرمایەداری و بـازاڕی ئـازاد و وایکردووە، ڕۆڵی ئابووری زانکۆ گرنگی زیاتری پێبـدرێت، ئەمـەش لەسـەر حـسابی زانـست و زانینە.

دوا جـار دەبێـت بڵـێین، لـە ناوەڕاسـتی شەسـتەکانەوە بزاوتـی خوێنـدکاران و لاوان، تەواوی وڵاتانی ئەوروپای گرتەوە، بە تایبەت فەرەنسا و ئەڵەمانیا و ئیتاڵیاو تەنانەت وڵاتانی سوسیالـستی و هەنـدێ لـە وڵاتـانی جیهـانی سێهەمیش لەو پرۆسەیە بێبەش نەبوون. بەهۆی ئـەو هەسـتی تـرس و نیگەرانیـە لـە ئاینـدە، خوێندکاران و لاوان ئەو کەرەسە شل و نەرمەی جـاران نـەمابون کـە بـە هـەموو ئـەو شـتانەی دەخرایە بەردەستیان و پێیان دەوترا ڕازی بن و پەسـەندیان بکـەن، بـەبێ ئـەوەی هۆکارەکانیـان بزانن.

ئەمڕۆ و بەبۆنەی تێپەڕبونی چل ساڵ بەسەر مردنـی "دۆتـشکە"دا، لـە ئـەڵمانیا شـەقامێکیان بـەناوی ئـەوەوە ناونـا، ئـەو شـەقامە لـە شـاری بەرلینەو چل ساڵ لەمەوبەر یەکێك لە پیاوانی ئاسـایش لـە کـاتی خۆپیـشاندانەکاندا، لەسـەر ئەو شەقامە سێ فیشەکی نا بەسەریەوە، بەڵام وا ئـــەمڕۆ شـــەقامەکە بـــە نـــاوی "ڕۆدی دۆتشکە"وە ناودەنرێت.

**سەرچاوە:**

**الحياة** 2008/5/20

# بەشداریکردن لە نیوان رۆشنبیری و پەروەردەکردندا

لە عەرەبییەوە: کنێر عەبدوڵڵا

**یەکەم: چەمکی رۆشنبیریی سیاسی:**

هەر کۆمەڵگەیەك خاوەن تایبەتمەندیی خۆیەتی کە ڕەنگدانەوەی ڕۆشنبیریی باوە لەنێو تاکەکانیدا، ئەو ڕۆشنبیرییەی کۆمەڵێك بەها، چەمك و زانیاری گەشەی پێدەدات کە لە ڕێگەی میراتی میژوویی و شارستانی و واقعی جوگرافی و پێکهاتەی کۆمەڵایەتی و سروشتی سیستەمی سیاسی و ئابوورییەوە بەدەستیهێناون، ئەمە وێڕای ئەو کارتێکەرە دەرەکیانەی کە شارەزایی و ئینتما جیاوازەکانیان پێکهێناوە.

ڕۆشنبیریی سیاسی بەشێکە لە ڕۆشنبیریی گشتیی کۆمەڵگەو لە وولاتێکەوە بۆ یەکێکی دیکە جیاوازە، تەنانەت ئەگەر هەردوو میللەتەکەیان پێرەویی هەمان شێوازی ژیان بکەن و سەر بە هەمان شارستانیەت بن و خاوەن بایەخدان و دەروەستییە هاوبەشەکان بن.

**1- پێناسەی ڕۆشنبیریی سیاسی:**

مەبەست لە ڕۆشنبیریی سیاسی، کۆمەڵێك زانیاری و تێڕوانین و ئاڕاستەی باوە سەبارەت بە کاروباری سیاسی وحوکمڕانی، دەوڵەت و دەسەلاَت، دەروەستی و ئینتما، ڕەوایەتی و بەشداریکردن. هەروەها سیستەمێکی ئەو بڕوا، سمبول و بەهایانەیە کە کۆمەڵگەیەکی دیاریکراو ڕۆڵی گونجاوی حکومەت و مەرجەکانی ئەو ڕۆڵەی پێ دەگێڕن، هەروەها بەهۆیەوە دەڕواننە پەیوەندیی گونجاوی نێوان حوکمڕان و حوکمڕانیکراو. کەواتە ڕۆشنبیریی سیاسی دەوروخولی ئەو بەها، ئاقارو بڕوا درێژخایەنانە دەدات کە تایبەتن بە دیاردە سیاسییەکان. هەر کۆمەڵگەیەك کۆمەڵێك سمبول، بەهاو نەریتی سەرەکیی خۆی دەگوێزێتەوە بۆ تاکەکانی میللەتەکەی و بەوەش تاکەکان کۆمەڵێك بڕوا سەبارەت بە ڕۆڵەکانی سیستەمی سیاسی بەگشت دامەزراوە ڕەسمی و ناڕەسمییەکانیەوە و ماف و ئەرکەکانیان بەرامبەر بەو سیستەمە سیاسییە پێکدێنن. جا

لەبەرئـەوەی ڕۆشـنبیریی سیاسـیی کۆمەڵگـە بەشێکە لـە ڕۆشـنبیرییە گشتییەکەی، بۆیـە بـۆ خۆیشی پێکدێت لـە چەندین لقی ڕۆشنبیریی و ئەو لقە ڕۆشنبیرییانەش بریتین لـە: ڕۆشنبیریی لاوان، دەسـتـەبژێری حـوکمڕان، کریکـاران، جوتیاران و ژنان...هتد. بەوجۆرەش ڕۆشنبیریی سیاسی کۆمـەڵێك ئاقار، بڕواو هەست وسۆزە کـە سیـستەم و مانایـەك دەبەخـشنە کـاری سیاسی و ئـەو ڕێسا جێگیرانـە دەخەنـەڕوو کـە ڕەفتـاری تاکـەکان لـەنێو سیـستەمی سیاسـیدا جڵەودەکـەن. بۆیـە پـشتبەستوو دەبێـت بـەو نموونـە بـەرزو پێوانانـەی ئەندامـەکانی کۆمەڵگـەی سیاسی پابەنددەبن پێوەیـان و ئـەو چوارچـێوەیە دەستنیـشان دەکـات کـە هەڵـسوکەوتی سیاسـی لـە سـنووریدا ئەنجامـدەدرێت. واتـە ڕۆشـنبیریی سیاسـی لـە دەوری ئـەو بـەهاو بڕوایانـە دەسوڕێتەوە کە لـە کۆمەڵگەدا باڵادەستن و کاریگەریان هەیە لەسەر ئەندامـەکانی، جـا حـوکمڕان بـن یـان حوکمڕانیکراو.

بـەو شـێوەیە دەتـوانین توخمـەکانی چەمکی ڕۆشنبیریی سیاسی بەم شێوەیە دیاری بکەین:

– ڕۆشـنبیریی سیاسـی کۆمـەڵێك بـەها ، ئاقـار، ڕەفتـارو زانیـاریی سیاسـیی تاکـەکانی کۆمەڵگەیە.

– ڕۆشـنبیریی سیاسـی لقـە ڕۆشـنبیرییە و بەشـێکە لـە ڕۆشـنبیریی گـشتیی کۆمەڵگـە کاریگـەریی لەسـەرکۆمەڵگە هەیـە و کاریگـەریی ئەویـشی لەسـەردەبێت، بـەڵام ناتوانێـت لـە دەرەوەی چوارچـێوەی گـشتیی ڕۆشـنبیریی کۆمەڵگە بێت.

– ڕۆشنبیریی سیاسی بەوە جیادەکرێتەوە کـە لەگۆڕاندایـەو جێگیربـوونی ڕەها ناناسـێت. لێرەشدا قەبارە و ڕادەی گۆڕان گرێدراوی چەند هۆکارێکـە، لەوانـە: ڕادە و تێکـڕای گـۆڕان لـە بونیـادی ئـابوری و کۆمەڵایـەتی و سیاسـیدا، پلـەی بایەخـدانی دەسـتەبژێری حـوکمڕان بـە مەسـەلەی گـۆڕانی ڕۆشـنبیری، قـەبارەی ئـەو بایەخـەی دەوڵـەت تـەرخانی دەکـات بـۆ هێنانـە ئـارای گۆڕانکـاری لـە ڕۆشـنبیریی کۆمەڵگـەداو ڕادەی چەسـپینی ئـەو بەهایانـە لـەناخی تاکەکاندا.

– ڕۆشنبیریی سیاسی لە کۆمەڵگەیەکەوە بۆ ئەوی دیکە جیاوازە، هـەروەها لـە تاکێکەوە بـۆ یـەکێکی دیکـە جیـاوازە، ئـەو جیاوازییـەش هۆکارگەلی دیاریکراو دەیسەپێنن، وەك: بنەچە، شوێنی نیشتەجێبوون، پیشە، ئاستی ئابوری و باری خوێندن.

## 2- پێکهێنەرەکانی ڕۆشنبیریی سیاسی:

دەشـێت باسـی کۆمـەڵێك تـوخم یـان پێکهێنـەری ڕۆشـنبیریی سیاسـی بکـەین، جـا ئەوانـە بـن کـە دەوڵـەت پێڕەوەیـان دەکـات (ڕۆشـنبیریی حوکمڕانـەکان)، یـان ڕۆشـنبیریی ڕەسمی و ئەوانە بن کە لای تاکەکانی کۆمەڵگە بـاون (حوکمڕانیکراوەکـان) کـە بـە ڕۆشـنبیریی ناڕەسمی ناودەبرێت. لەو پێکهێنەرانەش:

### أ- مەرجەعیەت:

مەبەسـت چوارچێوەی فیکـری و فەلـسەفیی کامڵ یان مەرجەعی سەرەکیی کاری سیاسییە، چـونکە ئـەوە مێـژوو ڕاڤـە دەکـات و تێـڕوانین و ئامانجەکان دیاریدەکات، بەهانە بۆ هەڵوێست و ڕەفتارەکـان دێنێتـەوە و ڕەوایـەتی دەبەخـشێتە سیـستەمەکە. هەمیـشە جێگیربـوون ئـەنجامی چـەند شتێك دێتـەدی ، لەوانـە: یـەکانگیربوونی ئەندامـەکانی کۆمەڵگـە لەسـەر ڕازیبـوون لـە

مەرجەعیەتی دەوڵەتو بوونی بڕوا بە گرنگێتی دەوڵەتو گوزارشتکردنی لە بەهاو ئامانجەکانیان. کاتێك جیاوازیی سەبارەت بە مەرجەعیەت لەنێوان توخمەکانی سیستەمدا ڕوودەدات، دابەشبوون دێتەئاراوە و ئەو قەیرانانە دەستپێدەکەن کە هەڕەشە لە ڕەوایەتیی سیستەمو مانەوە و جێگیربوونی دەکەن. نموونەی ئەو مەرجەعیاتانە، دیموکراسی، سۆشیالیزم، سەرمایەداریو عەلمانیەت...هتد. بێگومان کاریگەرییەکی هەستپێکراو نییە بۆ جیاوازیی نێوان توخمەکانی کۆمەڵگە لە دیموکراتییە ڕۆژئاواییەکاندا، چونکە ڕێککەوتنێکی گشتی هەیە لەسەر فۆڕمە گونجاوەکانی شێوەی سیستەمی سیاسیو کۆمەڵایەتیو ئابوریی، بەڵام لە وڵاتە تازەپێگەیشتوەکاندا مەسەلەکانی تایبەت بە شێوەی سیستمی حوکمڕانیو سروشتی سیستەمی ئابوریو سنووری پەیوەندیی نێوان ئاینو دەوڵەت هێشتا یەکلایی نەکراوەتەوە و تا ئیستا هەڵگری ناکۆکیو ململانێن.

### ب- ڕووکردنە کارکردنی گشتی:

جیاوازییەك هەیە لەنێوان مەیلی تاکخواز، کە هەوڵدەدات بۆ پایەدارکردنی پلە وپایەی تاكو زاڵکردنی بەرژەوەندیی تاکەکەسیی خۆی، لەگەڵ مەیلی گشتی یان بەکۆمەڵدا، کە مانای باوەڕبوونە بە گرنگیی کاری هەرەوەزیی هاوبەش لە هەردوو بواری کۆمەڵایەتیو سیاسیدا. ڕووکردنە کارکردنی گشتیو هەستکردن بە بەرپرسیارێتی کۆمەڵایەتی بەرامبەر بە کۆمەڵگەو مەسەلەکانی، بە گرنگترین پێکهێنەرەکانی ڕۆشنبیریی سیاسی دادەنرێت، چونکە ئەم هەستکردنە بە بەرپرسیارێتی پاڵ بە هاووڵاتیەوە دەنێت بەرەو مامەڵەکردنی ئیجابیانە لەگەڵ مەسەلەو بابەتەکانداو لەسایەی ڕۆشنبیرییەکی هاوشێوەدا کە بریتییە لە هەستکردن بە دەروەستبوون بۆ گرووپ.

### ج- ڕووکردنە سیستەمی سیاسی:

ڕووکردنە سیستەمی سیاسیو باوەڕبوون بە گرنگیی دەروەستبوون پێیەوە و هۆگربوونی، یەکێکە لە پێداویستییەکانی هەستکردن بە هاووڵاتیبوونو ئەو مافو ئەرکانەی لێی دەکەونەوە ، چونکە هەر ڕۆشنبیرییەکی سیاسی پێویستە چوارچێوەی گشتیی گونجاو بۆ کاری سیاسی دیاریبکاتو سنووری ڕەوای نێوان ژیانی گشتیو ژیانی تایبەتی دەستنیشان بکات. ئەو چوارچێوەیەش دەستنیشانی ئەو تاکانە دەکات کە ڕێگەپێدراون بەشداربن لە پرۆسەی سیاسیو پۆستەکانی دامەزراوە سیاسیەکاندا. هەروەها ڕۆشنبیریی سیاسی زانینی سنووری بەشداریکردن لەو سیستەمەدا دەسەپێنێت، وەك: تەمەن، ڕەگەز، پێگەی کۆمەڵایەتیو باری خیزانی. سەرەڕای ئەوە، هەندێك ڕۆشنبیریی سیاسی سوورن لەسەر دیاریکردنی بنەماو پۆستە سیاسیەکان لە دەوڵەتداو دەستنیشانکردنی ئەو دامودەزگایانەی دەبێت ئەو ئامانجانە بهێننەدی کە دەوڵەت دیاریان دەکات، چونکە ئەوە ڕۆشنبیریی سیاسییە کە پشتگیریی سیستەم دەکاتو چوارچێوەکانی دیاریدەکاتو ئەو زانیاریانەی پێدەبەخشێت کە لە واقعی ژینگەو تایبەتمەندییەوە بەدەستدێنو دەیپارێزنو مانەوەی مسۆگەردەکەن.

### د- هەستکردن بە ناسنامە:

هەندێك پێیانوایە هەستکردن بە ئینتیما گرنگترینی بڕوا سیاسییەکانە، چونکە هەستکردنی تاکەکان بە دەروەستبوون بە سیستەمی سیاسییەوە یاریدەدەرە بۆ بەخشینی ڕەوایەتی بە سیستەم، هەروەها یاریدەدەرە بۆ مانەوەی سیستەمەکەو تێپەڕاندنی ئەو قەیران و دژواریانەی ڕووبەڕووی دەبێتەوە. ئەمە بێجگە لەوەی هەستکردن بە دەروەستبوون و ئینتما بۆ نیشتمان یارمەتیدەرە بۆ خەملاندن و پەرەپێدانی هەستکردن بە ئەرکی نیشتمانی و گرتنەئەستۆی ئەرکەکان ، هەروەها یاریدەدەرە بۆ تێگەیشتن لە مافەکان و بەشداریکردنی چالاکانە لە پرۆسە سیاسیەکاندا، لە ڕێگەی هاوکاریکردنی دامودەزگا حکومیەکان و دامەزراوە سیاسیەکانەوە و قبوڵکردنی بڕیارەکانی دەسەڵاتی سیاسی و باوەڕبوون بە ڕۆڵی چالاکانەیان لە گشت بوارەکانی ژیاندا.

### 3- کاریگەریی ڕۆشنبیریی سیاسی لەسەر سیستەمی سیاسی:

هەر سیستەمێکی سیاسی پێویستی بە ڕۆشنبیرییەکی سیاسی هەیەو دەیپارێزێت. بۆ نموونە دەسەڵاتی سەڵتەزەلامی ڕۆشنبیرییەکی سیاسیی وەها لەگەڵیدا گونجاوە کە توخمەکانی بریتین لە ترس لە دەسەڵات، ملکەچبوون بۆ دەسەڵات، لاوازیی مەیلی بەشداریکردن، کەمبڕوایی بە شکۆمەندیی و خودێتی مرۆڤ و ڕێگەنەدان بە ڕەخساندنی دەرفەت بۆ دەرکەوتنی ئۆپۆزسیۆن. کەچی دەسەڵاتی دیموکراتیانە ڕۆشنبیرییەك دەخوازێت کە باوەڕی بە مافەکانی مرۆڤ هەیەو دان بەپێویستیی پاراستنی مرۆڤ و شکۆمەندیی هەیە، لە ڕووبەڕووبوونەوەی هەر دەستدرێژییەکدا بۆ سەر ئازادییەکان، تەنانەت ئەگەر لەلایەن خودی دەسەڵاتەکەیشەوە بێت. هەروەها پێیوایە بۆ بەردەوامبوون و پاراستنی مانەوەی سیستەمەکە، پێویستە هەستی متمانەکردنی دوولایەنە و لەسایەی کەشوهەوایەکی کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیریی وەهادا لەئارادابێت کە بیرۆکەی بوونی بیروڕاو ڕای ئەوی دیکە قبوڵ دەکات و ڕێگەدەدات بەبوونی جۆرێك ئۆپۆزسیۆن لە چوارچێوەی ڕیساگەل و چوارچێوەگەلی سیاسیدا کە وردەکارانە دانراون بۆ ڕێکخستنی پەیوەندیی نێوان تاکەکانی کۆمەڵگەی سیاسی.

هەروەها ڕۆشنبیریی سیاسی باو لە کۆمەڵگەدا، تا ڕادەیەکی زۆرو لە گەلێك وڵات بەشداری دەکات لە دیاریکردنی شێوەی سیستەمی حوکمڕانیدا، بەڵکو دەشێت بەشداری بکات لە دیاریکردنی توخمەکانی سەرکردایەتیی سیاسیدا. لەوانەیە سەرکردایەتیی سیاسی لەلایەن خێزانێکی دیاریکراو یان گرووپێکی بچووکی خاوەن دۆخی ئایینی، مەزهەبی، ئیتنیکی یان فێرکارییەوە قۆرخ کرابێت، بەوپێیەی کۆمەڵگە ڕێزی کەسانی بەتەمەن دەگرێت و نێرینەکان دەسەپێنێت بەسەر مێینەکانداو پێی باشترە سەرکردایەتی بداتە نێرینە بەتەمەنەکان. لە زۆربەی سیستەمە سیاسیەکاندا توێژێکی دیاریکراو بەشیاوتر دادەنرێت بۆ جڵەوکردنی ئاستە بەرزەکانی دەسەڵات. ئەو توێژە دەشێت پیاوانی ئایینی بێت یان سەربازەکان و پارێزەران...هتد. لەم دۆخەدا وا چاوەڕوان

دەكرێت سیاسەتی گشتی بەپلەی یەكەم بەرژەوەندییەكانی ئەوان بخاتەڕوو. هەروەها ڕۆشنبیریی سیاسی كاردەكاتە سەر پەیوەندیی تاك و كاری سیاسی، چونكە هەندێك لە كۆمەڵگەكان بەوە جیادەكرێنەوە كە هەستی دەروەستیی نیشتیمانی و هاووڵاتیبوونی بەرپرسیار تیایاندا بەهێزە. لێرەدا چاوەڕوانی ئەوە دەكرێت تاك بەشداربێت لە ژیانی گشتیداو خۆبەخشانە بەشداربێت لە پەرەپێدانی كۆمەڵگەكەی خۆیدا. لە وڵاتانی دیكەدا تاكەكان خەمساردو نامۆن و هەست بە بەرپرسیارێتی ناكەن، بەرامبەر بە هەركەسێك لە دەرەوەی سنووری خێزان. هەندێك جار هاووڵاتی پێیوایە سیستەمی سیاسی لە لەدایكبوونەوە تا مردنی نوێنەرایەتی ئەو دەكات و كاردەكات بۆ زامنكردنی خۆشگوزەرانیی كومەڵەكە. بەرامبەر بەوەش دەشێت تاكەكان بە گومان بن لە دەسەڵاتی سیاسی و تەنها بەئامرازی بەدیهێنانی بەرژوەندییەكانی جڵەوكارانی بزانن. بۆیە دەشێت بوترێت جێگیربوونی سیاسی پشت بە ڕۆشنبیریی سیاسی دەبەستێت، چونكە تەبایی ڕۆشنبیری وكۆكبوونی ڕۆشنبیریی دەستەبژێرو جەماوەر یارمەتیدەرن بۆ جێگیری، بەڵام پارچەپارچەبوونی ڕۆشنبیری و جیاوازیی نێوان ڕۆشنبیریی دەستەبژێرو ڕۆشنبیریی جەماوەر سەرچاوەی هەڕەشەكردنە بۆ جێگیربوونی سیستەمی سیاسی.

## 4-كێشەی ناسنامە:

دەشێت بوترێت، ئەم قەیرانە دواشێوەی ئەو گەشەكردنانەیە كە دەوڵەتە تازەپێگەیشتووەكان پێی گەیشتوون و لە ناوەرۆكدا مانای: سەرلێشێواویی گرووپی سیاسییە لە پێناسەكردنی خۆی و دیاریكردنی هەستی بەكۆمەڵ بەرامبەر بە ناسنامەی شارستانیانەی خۆی، لە ڕوانگەی مێژووییەوە. واتە ئایا ئێمە درێژەكراوەی ڕابردووین یان دەبێت ڕوو لەو داهاتووە بین كە خۆی لە ڕێگەیەكدا بەرجەستەدەكات خەڵكانی دیكە گرتویانەتە بەر، یاخود ئێمە تەنیا نەوەی ئێستاین و هیچی تر!! ئەو قەیرانەش بریتییە لە سەرلێشێوایی لە كاتی هەڵبژاردنی ئەو مۆدێلە شارستانیەی گرووپی سیاسی بۆ نوێكردنەوەی ڕۆشنبیری و پەرەپێدانی هەمەلایەن هەوڵی بۆ دەدات.

لە گۆڕەپانەكەدا چەندین مۆدێل و بیرۆكەی دەربڕراو و ناكۆك هەن، هەر لە مۆدێلە توركییەكەوە بیگرە كە خۆرئاوابوونی تەواوەتی هەڵبژاردوە تا دەگاتە مۆدێلی تاوانباركردنی كۆمەڵگەی میسری بەوەی كۆمەڵگەیەكی جاهیلییەو پێویستە بەكافر بناسرێت و جێبهێڵرێت و شێوازەكانی ژیانی ڕەتبكرێتەوە. دەشێت ئیشكالیەتی ڕەسەنایەتی و هاوچەرخیبوون بە سێ جۆر ئەڵتەرناتیڤ بخرێتەڕوو: خۆبەستنەوە بە ڕەسەنایەتیەوە، گرتنەبەری هاوچەرخیبوون یان هەوڵدان بۆ پێكەوە گونجاندنی تەوفیقیانەی هەردووكیان، بەڵام تەنیا خۆبەستنەوە بەم جۆرە دەربڕینەی شیكردنەوەی قەیرانی ناسنامەوە ئیشكالیەتگەلی تر دەوروژێنێت كە مەسەلەكە ئاڵۆزتردەكەن و گەیشتن بە ڕایەكی بڕیاردەر مەحاڵ دەكات. بۆیە بۆ زاڵبوون بەسەر ئەو لێكئاڵانەدا هەندێك بیریار شێوازێكی تریان پێشنیازكرد، ئەوەش شێوەی (پەیڕەوكردن

یان داهینان)ە. بەو مانایەی کە ئەو شێوە شارستانیەی ڕووبەڕووی دەبینەوە بریتیە لە: ئایا هەتا سەر لاساییکەرەوەی شوێنپێهەڵگر دەبین (بۆ باووباپیران یان بۆ بێگانەکان)و شوێنپێی ئەوانی دیکە هەڵدەگرین‌و خۆمان بە کلکێکی گەشەکردنەوە دەبەستینەوە کە خۆمان دروستمان نەکردوە، یان دەبینە داهێنەرو چارەسەرە تایبەتیەکانی خۆمان دادەهێنین‌و بە بیروباوەڕە داهێنەرەکانمان بەرەنگاری ئەوانی دیکە دەبینەوە. لە کاتی گەڕاندا بە دوای ڕەچەڵەکی قەیرانی ناسنامەدا، دەشێت بوترێت قەیرانی ناسنامە لە شێوەی قەیرانێکی خودخوازدا لای کوڕێکی هەرزەکار سەرهەڵدەدات.. خودیش ئەو چەمکەیە کە تاك دەربارەی خۆی پێکیدێنێت، بەو پێیەی سەرچاوەیەکە بۆ کارکردنە سەر ژینگەی دەوروبەرو کەوتنە ژێر کاریگەرییەوە. لەو تەمەنەدا لەناخی تاکدا ململانێ لەنێوان دووجۆر بەهادا ڕوودەدات: ململانێ لەنێوان پاڵنەرێکدا بۆ بەدیهێنانی وێنەیەکی خود کە لە ڕووی کۆمەڵایەتیەوە قبوڵکراوبێت‌و لایەنێکی خود کە چەسپاوو جێگیرە و ماناکانی کەمتەرخەمی، پەککەوتەیی، لاوازی، ناهاوتایی‌و شکستەخواردن لەخۆدەگرێت. بەوەش هەرزەکار دەکەوێتە ناو گێژاو، سەرلێشێواوی‌و شڵەژانەوە کە کۆمەڵێك هۆکار ڕۆڵیان تیایدا هەیە کە پەیوەندیان بە دیاریکردنی (خودخوازی)یەوە هەیە، واتە ئەو خەسڵەتە جیاکارانەی هەرزەکار ڕازییە بەهۆیانەوە خودی خۆی دیاریبکات. لەم بارەدا قەیرانێکی خودخوازانە ڕوودەدات، کاتێك تاك ناتوانێت بەهاکان‌و ئامانجەکان‌و تواناکانی خۆی پێکەوە گرێبدات، واتە کاتێك شکست دەخوات لە دیاریکردنی "ناسنامە"کەی خۆیدا.

بەهەمان شێوە دەشێت بوترێت، نەتەوە تازەپێگەیشتووەکان‌و دەوڵەتە دەوڵەمەندەکان پێش قۆناغی گواستنەوە یان گەشەکردن دەبنە نێچیری قەیرانێکی خۆیی لەو جۆرەوە، لەکاتێکدا کە سەرکەوتوونابن لە دیاریکردنی ناسنامەی شارستانیانەی خۆیاندا.

زانایانی دەروونناسی باس لەوە دەکەن، کاتێك تاك شکست دەخوات لە هاوسەنگی دروستکردندا لەگەڵ خودی خۆیدا، پەنادەبات بۆ شێوازێکی نەسازان کە لەنێوان دوو باردا هەڵبەز و دابەز دەکات: نامۆبوون یان توندڕەوی. هەمیشەش نامۆکان بایەخدانەکانی خۆیان ئاڕاستەی ناوەوە دەکەن، کەچی توندڕەوەکان بایەخدانەکانیان ئاڕاستەی دەرەوە دەکەن. ئەمەش هەمان ڕەوشتی سیاسیی هەندێك وڵاتە کە لەنێوان داخران بەڕووی ناوەوە (گۆشەگیری)و توندڕەویی دوژمنکارانەدا هەڵبەزودابەز دەکات. ئەمە وێڕای هەستکردن بە کەموکوڕی، لاوازی، دەستەوستان، ناهاوتایی‌و زیادبوونی هەستکردن بە بێمتمانەیی بە جیهانی دەوروبەر.

ڕەگ و ڕیشەی قەیرانی ناسنامە دەگەڕێتەوە بۆ چەند هۆکارێك، دیارترینیان دەسەڵاتی بێگانە و پاشکۆیەتی‌و ئەو شێواندنە ئابوری، کۆمەڵایەتی، شارستانی‌و دەروونیەی بەدوایدا دێن. هەروەها قوڵبوونەوەی وابەستەیی، بەمانای چڕبوونەوەی پشتبەستنی حکومەتەکان بەهێزە دەرەکیەکان بۆ بەدیهێنانی ئامانجە نیشتمانیەکان‌و زۆربوونی پشتبەستنی میللەتەکان بە حکومەتەکانیان بۆ بەدیهێنانی خواستە جەماوەرییەکان، ئەمە سەرەڕای

تێڕوانینی یەکلابینانە بۆ مەسەلەکان، بەمانای ئەوەی گشت شتو دیاردە و هەڵوێستەکان ئاستی مامناوەندیان نییە، بەڵکو ڕەشن یان سپی، ئەمەش ڕێژەییبوونی ڕاستیو داوەرییەکان لەدەستدەداتو هانی دەمارگیری ، قبوڵ نەکردنی چارەسەری میانڕەوانە دەدات.

پوختەی قسەکە، قەیرانی خودخوازی لەوەدایە کە کێشەکە قەیرانی مەعریفە نییە، بەڵکو قەیرانی هەڵسەنگاندنە، بەشێوەیەك دەستەوسانین لەئاست هەڵسەنگاندنی پێگەمان لە نەخشەی خێزانی هاوچەرخی نێونەتەوەییداو دیاریکردنی پلەوپایەمان بەدرێژایی ڕۆژگار، کە بە سێ خاڵدا تێدەپەڕێت، لە ڕابردووەوە بۆ ئیستاو داهاتوو. لە چوارچێوەی گەڕاندا بە دوای ئەو خود یان ناسنامەی شارستانیەدا، مەیلی تێکەڵکردنی دوو هەڵوێست سەرهەڵدەدات: گەڕان بە دوای خودداو گەڕانەوە بۆ خود. مەبەست لە دووەمیان، گەڕانەوەیە بۆ ناوەوە و بەرەو ڕابردوو. بەو جۆرە لایەنگرانی ئەم مەیلە وەك نەتەوەیەکیان لێ دێت کە ئاوێنەیەکی مەزنیان بەدەستەوەیەو سەیریدەکەن بۆ ئەوەی بەهۆیەوە ڕێگە بدۆزنەوە. ئەوانە لە واقیعدا جگە لە خۆیان کەسی دیکە نابینن، بەو جۆرەش دەشێت ڕێگەی ڕاست ونکەن.

کێشەی دیاریکردنی ناسنامە لە دەستنیشانکردنی پێناسەی خوددایە، چونکە ئەو کێشەیە پێگەمان لە بەرەنگاربوونەوەی ئەوانی دیکەدا دیاریدەکات، چونکە بۆ دیاریبوونی ناسنامە پێویستە پەیوەندیی کەسەکان بە یەکەوەو ڕادەی دەروەستیو نزیکیان دەستنیشان بکرێت. لێرەدا کێشەی ناسنامە لای لاوان، وەك گرووپێکی کۆمەلایەتی جیاواز، دەردەکەوێت. چونکە لاوان گرووپێکی کۆمەڵایەتیی خاوەن ڕۆشنبیرییەکی تایبەتی لاوەکین و درێژیی ماوەی خوێندن بۆتە هۆی دەستەبەربوونی کاتی زۆر بۆ لاوان، ئەمەش ئەوەی لێکەوتۆتەوە کە دەشێت ناوی بنێین هەرزەکاریی درێژپێدراو کە ناسنامەی پەرتەوازەبوو دەخاتەوە.

سەرهەڵدانی کێشەی ناسنامە لای لاوان دەگەڕێتەوە بۆ چەند هۆکارێك:

**أ-خێرایی گۆڕان لە کۆمەڵگەدا :**

باری گشتیی ژیان و خێرایی جووڵە تیایداو هەستکردنی مرۆڤ بەم ژیانە لە گۆشەنیگای تێگەیشتنەوە بۆ شوێنو کاتو پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانەوە دووچاری داچڵەکینی توند دەبێتەوە، بەڵکو خودی چەمکەکانی کۆمەڵگەو ڕۆشنبیری گۆڕانیان بەسەردا هاتووە.

**ب-نوێکردنەوە :**

کێشەی نوێکردنەوە لەو گۆڕانکارییە گەورە هەمەلایەنەدایە کە لە گشت شوێنێك ڕوودەدات، بەشێوەیەك کە لەم سەدەیەدا هیچ گرووپێك ناتوانێت خۆی لە گۆڕان دەربازبکات. ئەنجامی بێتوانایی لەئاست مامەڵەکردنێکی سەرکەوتوانە لەگەڵ کۆمەڵگەیەکی دینامیکیدا، زۆرێك لە گۆڕانو ئاژاوە و ناڕەزایی بەرهەمهاتوونو لەکۆتاییشدا ئەنجامی شۆکەکانی گۆڕانکاری، هەژانی ناسنامە لای گەنجان هاتۆتەئاراوە

**ج- پەرتەوازەبوونی دەروونی :**

ئەم پەرتەوازەبوونە لەنێوان کۆنە ڕەسەنەکانو تازە هاوردەکان، بەهای کارکردنی دەستو بەرهەمەکەیو فرمانەکەدا ڕوودەدات. ئەنجامی ئەو کێشانە، گەنجان بەهۆی ساردیی

پەیوەندییــــە مرۆییـــەکانو شـــێوەکانی لـــە هەمووشــتێکدا هەسـت بـە نـامۆبوون دەکـەن، ئەمـەش دەبێتـە هـۆی دروسـتبوونی ململانـێ لـەنێوان ناسـنامەی نەتـەوەیی یـان نیشتمانیو شارســــتانێتی نوێـــداو قبـــوڵکردن یـــان قبوڵنـــەکردنی ڕاســـتکردنەوەی شارســـتانیی نیشتیمانیمان لەلایەن شارستانیی ڕۆژئاواوە و قبـــــوڵکردن یـــــان قبوڵنـــــەکردنی بــــەهاو سمبولــــەکانیو شــــێوازی ژیــانی میللەتەکـــەمان. لـــەم چوارچـــێوەیەدا دەشــێت جیــاوازی بکـــەین لـــەنێوان چـــەندین ناســـنامەدا، وەك: ناســـنامەی نیـــشتمانی، عەرەبی، ئیسلامیو جیهانی.

**1-ناسنامەی نیشتمانی:**

بازنــەی نیـشتمانی بـە سـنووری سیاسـیی دەوڵـــەت دیاریـــدەکرێت.. ئـــەو تەوژمـــەی بانگەشەی بۆ ئینتمابوون بۆ نیشتمان (میسر) و دەوڵــەت دەکــردو بەســـەر بازنـــەکانی دیکـــەدا زاڵبـــوو. ئـــەو تەوژمـــە لـــە مـــاوەی خـــەبات لـەپێناو سـەربەخۆییدا بـەهێزبوو، ئینجـا پـاش شۆڕشـــی ڕزگـــاریو دامەزرانـــدنی دەوڵـــەتی سەربەخۆدا لاوازبوو، بەڵام جاریکی دیکە پاش جـــەنگی حـــوزەیرانی 1967 بـــەهیزبۆوە و دواتریش پاش واژۆکردنی پەیماننامەی ئاشتی لـەنێوان میـسرو ئیـسرائیلو بـایکۆتی عـەرەبی میسر بەهێزتربوو.

**2- ناسنامەی عەرەبی:**

ناســـنامەی عـــەرەبی جـــەخت لەســـەر ئینتمابوون بۆ بازنەیەك دەکاتەوە کە نیشتمانی گەورەی عەرەب دەگرێتەوە– لە ئۆقیانوسەوە تا کەنـــداوو پەیوەندییـــە عەرەبیـــەکانی میـــسر دەکاتــەوە کــە خــۆی لــە زمــان، ڕۆشــنبیری، شارســـــتانیو ڕەچـــــەڵەکی ســـــامی دووپات دەکاتەوە. هەروەها چەسپینی دەوڵەتی نیـــشتمانی ڕەتدەکاتـــەوە و تایبەتمەنـــدیی ڕۆشـــنبیریی هاوبەشـــی نـــاو وولاتـــەکانی نیـــشتمانی عـــەرەبی فـــەرامۆش دەکـــاتو ســـووره لەســـەر هێنانـــەدیی یـــەکگرتنی عەرەبی.

**3-ناسنامەی ئیسلامی:**

تەوژمی ئیسلامی جەخت لەسەر ئینتمابوون بۆ بازنەی شارستانیی ئیسلامی دەکاتەوە کە عەرەب لە بنیاتنانیدا بەشداربووە. لەم تەوژمەدا ئینتمـــابوون بـــۆ بـــڕوا زاڵبـــووە بەســـەر نیـشتمانپەروەریو ئینتمـابوون بـۆ نەتـەوەداو کۆشـشیکردوە بـۆ پێکگەیـشتن لەگـەڵ ئـەو ڕێکخراوانەی لە جیهانی ئیسلامیدا گوازرشتی لــێ دەکـــەن. ئـــەو تەوژمـــە کـــاریکردوە بـــۆ ڕاکێـشانی زۆرێـــك لـــە گـــەنجان، ئـــەوەش بەجەختکردنەوە لەسەر تێکشکانی ڕۆشنبیریو شارستانی.

**4-ناسنامەی مرۆڤانەی جیهانی:**

تێڕوانینی جیهانی تێڕوانینێکە بۆ توخمی مرۆیی وەك یەك خێزان کە لەسەر پەرەپێدانی بەرژەوەندییـــە هاوبەشـــەکان دەوەســـتێت، بـــە بـــەکارهێنانی سەرچـــاوەکانی ســـامانی سروشـــتیو ئاڕاســـتەکردنی کۆمەڵگـــە بـــەرەو خۆشـــگوزەرانی. گـــەنجان خواســـتی لاســـایکردنەوەی ئـــەو شـــێوازانەی ڕەفتـــاری دوولایەنـــەیان هەیـــە کـــە شارســـتانیە جۆربـــەجۆرەکان لـــە قۆناغـــەکانی یـــەکگرتنو بەرکـەوتنی ڕاسـتەوخۆدا بەرهـەمیان دەهێنـا، وەك تـــــەعبیرکردن لـــــە پەیوەندییـــــە گەشەکردوەکانی نێوانیـان. هـەروەها ئـەنجامی ئـــەوە ململانـــێ لـــەنێوان شارســـتانیەکاندا بەرهەمـــــدێتو گـــــەنجانی ولاتـــــە

تازەپێگەیــشتووەکان پارچەپارچــە دەکــات لـــــەنێوان بــــەها بـــــەمیرات بۆمـــــاوە و خۆشویستەکان و پێداویستی و داخوازییەکانی شارستانیەتی جیهانیی پیشەسازیدا، چونکە ناکرێت خۆ لە ڕووداوانی ئەو گۆڕانکارییە شارستانیە لابدرێت کە تیایدا پەیوەندییە فیکری و مادییەکان فراوانبوون، ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی گەنجان ببنە نێچیری ململانێی ڕۆشنبیری و کێبڕکێی ناسنامەکان، بەتایبەتی لە بارودۆخی گۆڕان بەرەو جیهانیبونی ئـــابووری، پێکگەیــــشتن، ڕاگەیانـــــدن و ڕۆشـــنبیریدا، ئـــەو مەســـەلەیەی کاریگـــەرە دەرەکیــــەکان زاڵـــــدەکات بەســــەر بــــەها سیاسییەکانی گشت هاووڵاتیاندا، لەپێش هەموویانەوە گەنجان. لەگەڵ ئەوەشدا دەشێت بوترێــت قـــەیرانی ناســـنامەی شارســـتانی و ڕۆشنبیری لای گەنجان نابێت بێزارمان بکات، چـــونکە لـــەو مەســـەلەیەدا لەگـــەڵ زۆربـــەی دەوڵەتەکانی جیهاندا هاوبەشین.. بەڵام ئەوەی لێرەدا جێی دڵەڕاوکێیە مەترسیی یەکلایی نەکردنەوەیەتی و خۆی لەوەدا دەبینێتەوە کە نـاتوانین بگەینـەوە بـە شـەمەندەفەری خێرای جیهانی کە پێویستە شوێنێکی گونجاوی تیادا بەدەستبێنین. چارەسەری خواستراو دەشێت ناتەقلیـــدی و داهێنەرانـــە نـــەبێت و دەبێـــت کۆشـــشبکەین بـــۆ ڕاکێـــشانی گـــەنجان و تێکـەڵکردنی بـە مەسـەلەکانی کۆمەڵگەکـەی و داهێنـانی شێوازو کۆششەکان بۆ پەرەپێدانی دەروەســـتییەکانی گـــەنجان بـــە ناســـنامەی نیشتمانیانەوە، بەپشتگوێ نەخستنی تەوژمە نەتـــــــەوەیی و جیهانیـــــەکان، هـــــەتا بتـــــوانین ڕووبـــــەڕووی بەرەنگارییـــــەکانی داهاتوو ببینەوە...

## دووەم: پرۆسەی پەروەردەکردنی سیاسی:

کۆمەڵگە هاوچەرخەکان- بە پلەی جیاواز- قـەیرانی کامـڵ نـەبوونی نەتـەوەیی بـەخۆوە دەبیـنن، چـونکە ئاشـکرایە زۆربـەی وڵاتـە تازەپێگەیشتوەکان زۆرێك لە گرووپی جیاواز لە ڕووی ئیتنیکی، زمان و ئاینەوە لەخۆدەگرن. ئەم مەسەلەیەش وایکرد پرۆسەی بنیاتنانی نەتەوە ببێتە داواکارییەکی گرنگ... زیاتر لە دەوڵـەتێکی پێـشکەوتوو ڕووبـەڕووی هـەمان کێشە بوونەتەوە، بەڵام بە ڕادەی خاوتر، چونکە چەندین کەمایەتی لەخۆدەگرن کە هێشتا لە جەستەی کۆمەڵایەتیدا قبوڵ نەکراون، بۆیە پـــەروەردەکردنی سیاســـی، پێویـــستە بـــۆ خوڵقانـــدنی هەســـتکردنی گـــشتی بـــەهێز بەناسنامەی نەتەوەیی.

وڵاتــــە تازەپێگەیـــــشتوەکان پـــــاش بەدەستهێنانی سەربەخۆیی دەستیانکردوە بە پرۆسەی نوێکردنەوەی ئابوری، کۆمەڵایەتی و سیاسی. پەرەپێدان لە ڕەهەندە سیاسییەکەیدا گەشـــــەکردنی دامـــــەزراوە سیاســــــیەکان لــــــەخۆدەگرێت، هــــــەروەها بــــــەدیهێنانی جۆرێــك لــە جیاکــاریی پــسپۆڕیی وەزیفــی تیایــدا، بــەواتای دروســتکردنی دامــەزراوە سیاســی و دەســتوریيە تایبەتمەنــدەکانی وەك پارتــــەکان و پەرلــــەمان...هتــــد و دانـــــانی کۆمــەڵێك بــەهای سیاســی نــوێ لــەجێی سیـــــــستەمی بـــــــەها تەقلیدییـــــــەکان. لێرەشدا پەرەپێدانی پلان بۆ دانراوو بەردەوام ڕێگەیەکی گرنگە بۆ گەشەپێدانی ڕۆشنبیریی خواستراو.

چـــەندین پێناســـە لەلایـــەن توێژەرانـــەوە پێـــشنیازکراوە بـــۆ چـــەمکی پـــەروەردەکردنی

سیاسی و تەنها پێناسەیەك نییە كە لەسەری ڕێكەوتبن، ئەوانەی ئێستا باسیاندەكەین كۆمەڵێك لەو پێناسانەیە. سەرەتا بەشێوەیەكی گشتی تاوتوێی چەمكی پەروەردەكردن دەكەین. پەروەردەكردنی سیاسی پرۆسەی كارلێككردنی كۆمەڵایەتیە كە لە ڕێگەیەوە مرۆڤ پێكدەهێنرێ و چەكداردەكرێت بە پێوەرە كۆمەڵایەتیەكان، هەتا شوێنێكی دیاریكراو لە سیستەمی ڕۆڵە كۆمەڵایەتیەكاندا وەربگرێ و كەسایەتی خۆی بەدەستبهێنێت، یان ئەو پرۆسەیەیە كە لە ڕێگەیەوە تاك لەگەڵ ژینگەی كۆمەڵایەتی خۆیدا دەگونجێت، بەشێوەیەك كە ببێتە ئەندامیكی بڕواپێكراو و یاریدەدەری ئەوانی دیكە. ئەوە چەمكێكە بەكاردێت بۆ ئاماژەكردن بۆ ئەو شێوازەی منداڵان بەهۆیەوە فێری بەهاو ئاراستەكانی كۆمەڵگەكەیان دەبن و فێری ئەو ڕۆڵانە دەبن كە كاتی گەورەبوون چاوەڕوان دەكرێت بیگێڕن. هەندێكی تر بەوە پێناسەی دەكەن ئەو پرۆسەیەیە كە تاك بەهۆیەوە ڕۆشنبیری و پێوەرەكانی ڕەفتاری كۆمەڵایەتی كۆمەڵگەكەی بەدەستدێنێ. ئەوەش پرۆسەیەكە لە ماوەیەكی دیاریكراودا ڕوونادات و پاشان بوەستێت، بەڵكو بەردەوامەو درێژە دەكێشێت.

كەواتە دوو ئاقاری ڕوانینە چەمكی پەروەردەكردن هەیە:

یەكەم/ وەك پرۆسەیەك سەیری پەروەردە دەكرێت كە لە ڕێگەیەوە مرۆڤ فێری كۆمەڵێك بەهاو پێوەری جێگیر دەكرێت كە لە ویژدانی كۆمەڵگەدا هەن و مانەوەو بەردەوامیی بۆ مسۆگەردەكەن.

دووەم/ وەك پرۆسەیەك سەیری پەروەردەكردن دەكرێت كە لە ڕێگەیەوە مرۆڤ وردە وردە ئەو ناسنامەی كەسایەتیەی خۆی بەدەستدێنێت كە ڕێگەی پێدەدات تەعبیر لەخۆی بكات و داواكارییەكانی بەوشێوەیە بەدەستبێنێت كە پێی باشە.

دەشێت توخمەكانی چەمكی پەروەردەكردنی سیاسی بەم شێوەیە پوختكەینەوە:

1-پەروەردەكردنی سیاسی بەسادەیی پرۆسەی فێركردنی بەهاو ئاراستە سیاسیەكان و بەهاو بایەخە كۆمەڵایەتیە خاوەن مانا سیاسیەكانە.

2-پەروەردەكردنی سیاسی پرۆسەیەكی بەردەوامە، بەو واتایەی كە مرۆڤ بە درێژایی ژیانی، لە منداڵیەوە تا پیربوون، ڕووبەڕووی دەبێتەوە.

3-پەروەردەكردنی سیاسی سێ ڕۆڵی سەرەكی دەگێڕێت:

-گواستنەوەی ڕۆشنبیریی سیاسی لە نەوەیەكەوە بۆ ئەوی دیكە.

-پێكهێنانی ڕۆشنبیریی سیاسی.

-گۆڕینی ڕۆشنبیریی سیاسی.

4-زۆرێك لە ڕەوتی كۆمەڵایەتی و دامەزراوەی كۆمەڵایەتی جۆربەجۆر هەن كە هەڵدەستن بە گێڕانی ڕۆڵی پەروەردەكردنی سیاسیی تاك.

5-ئەم پرۆسەیە دیاریكەری ڕەفتاری سیاسیی تاكە، جا ئەوە بە قبوڵكردن یان ڕەتكردنەوەی سیستەمی سیاسی بێت یاخود بە قبوڵكردن یان ڕەتكردنەوەی كۆمەڵگە بێت بەگشتی و دامەزراوەیەك بێت بەتایبەتی.

## 1-ڕەهەندەکانی پەروەردەکردنی سیاسی:

### أ- پەروەردەکردن و بەشداریکردنی سیاسی:

بەشێوەیەکی ڕێژەیی بەشداریکردنی تاك لە ژیــانی سیاســیدا گرێــدراوی چــەندایەتی و چۆنایەتی ئەو وریاکەرەوە سیاسیانەیە کە بەر مــرۆڤ دەکــەون، بــەڵام بەرکــەوتنی وریاکــەرەوە سیاسیەکان بەتەنیا بەس نییە بۆ ئەوەی تاك ڕوو لــە بەشــداریکردنی سیاســی بکــات، بــەڵکو پێویــستە ئــەو تاکــە ئاســتێکی گونجــاوی بایەخدانی سیاسی هەبێت، ئەوەش گرێدراوی جــــۆری ئەزموونــــەکانی ســــەرەتای پــەروەردەکردنێتی. چــونکە ئــەو ئــەزموون و شــارەزاییانەی لــە قۆنــاغی منداڵیــدا ڕوودەدەن، ڕۆڵێکی گرنگ دەگێڕن لە پێکهێنانی ئاقارەکانی تاکەکان و ئاڕاستەکردنی ڕەفتاری بەکردەوەیان لەدواییـــداو، کاریگـــەریی ئـــەو ئـــەزموون و شــارەزاییانەش لەســەر تاکــەکان بــە درێــژایی ساڵەکانی هەرزەکاری و پیری بەردەوام دەبێت. جـــا لەبەرئـــەوەی پـــەروەردەکردن تـــەنیا قۆناغەکانی سەرەتای تەمەن ناگرێتەوە، بەڵکو بە درێژایی ژیانی تاك ڕوودەدات، ئەوا دەشێت بوترێــت هــەموو ئــەو شــتانەی تــاك فێریــان دەبێت و هەموو ئەو ئەزموون و شارەزاییانەی تاك بە درێژایی تەمەن فێریان دەبێت و پیایاندا تێدەپــەڕێ، هــەر لــە منداڵیــەوە تــا پیربــوون، بەڕادەیــــەکی زۆر کاردەکەنــــە ســــەر ڕادەی بەشداریکردنی سیاسی.

### ب- پێگەیاندن و خستنەگەڕی سیاسی:

مەبەســـت لـــە خـــستنەگەڕی سیاســـی گرتنەئەســتۆی پۆســتە سیاســییەکانە لەلایــەن تاکەکانەوە، جا بەهاندەری تایبەتی هەوڵیان بۆ بــدەن یــان ئەوانــەی دیکــە ئاڕاســتەیان بکــەن. ئەوانەی پۆستە سیاسیەکان پڕدەکەنەوە سەر بـــە لقەڕۆشـــنبیریی جیـــاوازن، بۆیـــە پـــەروەردەکردنی سیاســـیی کاریگـــەر دەبێتـــە پڕۆســەیەکی زینــدوو بــۆ دەوڵەمەنــدکردنیان بــە زانیــاری و بــەهرە سیاســییەکان. شــایانی باســە، ئەو بەهاو ئاقارانەی تاك ئەنجامی تێکەڵبوون بە گرووپــە ســەرەتاییەکان بەدەســتیاندێنێ، پــاش خــستنەگەڕی لــە هــەر پۆســتێکی سیاســیدا کاریگەرییان دەمینێ.

### ج- پەروەردەکردن و جێگیریی سیاسی:

جێگیربوونی ئاماژەیە بۆ توانای سیستەم بۆ خۆپاراستن بەدرێــژایی ڕۆژگار، واتــە لــە دۆخــی کامڵبوونــدا بمێنێتــەوە. ئەمــەش مەیــسەرنابێت لــەو کاتــەدا نــەبێت کــە بنــەما جۆربــەجۆرەکانی سیــستەم فرمانــەکانی خــۆی بەچاکی جێبــەجێ نــەکات، یــەکێك لــەو فرمانانــە پــەروەردەکردنی سیاســـییە. پـــەروەردەکردنی سیاســـی وەك فرمــانێکی گــرنگ بــۆ بــەردەوامیی سیستەم دوو ڕەهەنــدی هەیــە: یەکــەمیان ڕەهەنــدی ئاســۆیی و ناوەڕۆکەکـــەی ئەوەیـــە کـــە نـــەوەی ئێـــستا ڕۆشــنبیرییەکەی خــۆی دەگوێزێتــەوە بــۆ نــەوەی دوای خــۆی. دووەمیــان ڕەهەنــدی ســتوونیە، مانای ئەوەیە هاوسەنگییەك هەیە لەنێوان بەهاو ئاقــارو ڕەفتارەکــانی تاکــەکانی نــەوەی بــاودا، بەشــێوەیەك بڕێــك یــەکگرتووی و پەیوەنــدی بــۆ جەستەی سیاسی مسۆگەربێت.

هەنـــدێك هێمـــا بـــۆ ئـــەم ئەرکانـــەی پەروەردەکردن دەکەن:

1- فێربوونی زمان.
2- پێکهێنانی ڕەفتاری مرۆیی تاك.
3- پێکهێنانی ڕەفتاری کۆمەڵایەتی تاك.
4- بەخشینی ڕۆشنبیریی کۆمەڵگە بە تاك.

5- پاراستنی شێوازی بەها باوەکان لە کۆمەڵگەدا.

6- فێرکردنی شارەزاییەکان.

7- پێکهێنانی کەسایەتی تاك.

### 2- قۆناغەکانی پەروەردەکردنی سیاسی:

پرۆسەی پەروەردەکردن بە چەند قۆناغێکدا تێدەپەڕێت کە پەیوەندیان بەپێگەیشتن و گەشەکردنی تاکەوە هەیە، ئەوانەش قۆناغی منداڵی و ئینجا هەرزەکاری و لەکۆتاییدا پێگەیشتن. تاڕادەیەکی دیاریکراو ڕەفتاری سیاسیی تاك لە قۆناغی پێگەیشتندا بە شارەزایی ئەو پەروەردەکردنە دیاریدەکرێت کە لە هەردوو قۆناغی منداڵی و هەرزەکاریدا بەدەستیهێناوە. تاك لە هەریەکێك لەو قۆناغانەدا بەشێك لە پرۆسەی پەروەردەکردن بەدەستدێنێت، هەروەها لەهەر قۆناغیکدا دووچاری ئامرازێك یان زیاتری پەروەردەکردن دەبێتەوە کە یەکتری تەواودەکەن یان دەشێت ناکۆکبن بەیەکتر. مرۆڤ لە قۆناغە جیاوازەکانی ژیانیدا لەگەڵ زۆر دامەزراو ژیان دەباتەسەر، هەندێکیان سەپێنراون بەسەریدا، وەك خێزان یان قوتابخانە، هەندێکی تریان ئیرادەگەرانەیە مرۆڤ بە خواستی خۆی و بێ فشار دەچێتە ناوییەوەو لەهەریەکێك لەو دامەزراوانە ئەزموون و بەهاو ئاقارو بیروباوەڕەکان وەردەگرێت و لە یادەوەری و ویژدانیدا کۆیاندەکاتەوە، هەتا دواتر ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ بەشداری بکەن لە دیاریکردنی هەڵوێست و ڕەفتارەکانیدا.

### 3-ئامرازەکانی پەروەردەکردنی سیاسی:

ئەو ئامرازانەی ڕۆڵی سەرەکی دەگێڕن لە پرۆسەی پەروەردەکردندا زۆرو جۆربەجۆرن، چونکە لەژێر کاریگەریی خێزان و قوتابخانەو گرووپەکانی هاوڕێیان و ئامرازەکانی ڕاگەیاندندا تاك بەهاو پێوەر وئاقارەکان بەدەستدێنێت، هەندێك لەوانە کۆمەڵایەتین و ئاسەواری سیاسیان هەیە، هەندێکی دیکەشیان سیاسین. بەم شێوەیەش تاوتوێی ئەو ئامرازانە دەکەین:

#### أ-خێزان:

خێزان بەگرنگترین ئامرازەکانی پەروەردەکردنی سیاسی دادەنرێت و گەورەترین کاریگەریی هەیە لەسەر ژیانی تاکەکان، چونکە خێزان یەکەم گرووپە تاك تیایدا دەژی و بەهۆیەوە لە قۆناغەکانی سەرەتای ژیاندا پێداویستیە بایەلۆجی، دەروونناسی و کۆمەڵایەتیەکان تێردەکات، هەروەها ئەوە خێزانە گشت ئەو زانیاری و شارەزایی و ئاقارو بەهایانەیان بۆ دەگوێزێتەوە کە یارمەتیان دەدات ژیانێکی کۆمەڵایەتی سەرکەوتوو لە کۆمەڵگەدا بەسەربەرن. زۆربەی ئەو نووسینانەی تاوتوێی پەروەردەکردنیان کردوە، جەختیان لەسەر ئەوە کردۆتەوە کە خێزان گرنگترین ئامرازەکانی پەروەردەکردنە، ئەوەش لەبەر ئەو کاریگەرییە هەیەتی و درێژدەبێتەوە بۆ ئەوەی گشت ئامرازەکانی دیکە بگرێتەوە، وەك گرووپی هاوڕێیان، قوتابخانە، دەسەلات، ئامرازەکانی ڕاگەیاندن و ئەوانی. خێزان بە قوتابخانەیەکی سەرەکی هەر منداڵێك دادەنرێت، چونکە ئەوەی تیایدا فێردەبێت بەدرێژایی ژیانی لەگەڵیدا دەمێنێتەوە،

بەوپێیـــــەی لەڕێگـــــەی خێزانـــــەوە بـــەها کۆمەڵایەتیـــەکان و پێوەرەکـــانی ڕەفتـــارکردن بەدەســـتدێنێت و ئـــەو ویژدانـــە فرمانکـــەرو یاســـاخکەرە وەردەگرێـــت کـــە بەهۆیـــەوە بـــۆ چـــاکە پاداشـــت دەکرێـــت و بـــۆ خراپەکاری سزای دەدات. هەروەها لە ڕێگەیەوە منداڵ ئەو پێوەرە گشتیانە بەدەستدێنێت کە شێوازەکانی ڕۆشـنبیریی بـاو لـە کۆمەڵگـەدا دەیسەپێنن.

**ب- قوتابخانە:**

قوتابخانـە بـە دوو ڕێگـە پـەروەردەکردنی سیاسی ئەنجامدەدات:

1-**ڕۆشنبیرکردنی سیاسی:**

ئـــەو ڕۆشـــنبیرکردنە لـــە ڕێـــی بابـــەتی دیـــاریکراوەوە دەبێـــت، وەك پـــەروەردەی نیـــشتمانی و مێـــژوو. ئامـــانجی پـــەروەردەی نیـــشتمانی ئەوەیـــە خوێنـــدکار ئاشـــنابکات بـــە حکومـــەتی وڵاتەکـــەی و دیاریکردنی ئەو ڕەفتارەی چاوەڕوانکراوە لێی. هـــەروەها چـــاندنی هەســـتی خۆشەویـــستی و دەروەســـتیی نەتـــەوەیی لەناخیـدا. خوێنـدنی میـــژوویش، بـــەو ســـەرکەوتن و شكـــستانەی لـــەخۆیان دەگرێـــت، مەبەســـتی قوڵکردنـــەوەی هەســـتکردنی خوێنـــدکارە بـــە شـــانازی و دەروەستیی نەتەوەیی.

2-**سروشتی سیستەمی خوێندن:**

قوتابخانـــە یەکەیـــەکی کۆمەڵایەتیـــە کـــە سروشـتێکی تایبـەتی هەیـە و تـا ڕادەیـەکی زۆر یارمەتیـــدەرە بـــۆ پێکهێنـــانی هەســـتکردنی خوێنـدکار بـە چـالاکبوونی کەسـایەتی و بـۆ دیـاریکردنی تێـڕوانینی خوێنـدکار بەرامبـەر بە بینای کۆمەڵایەتیی سەقامگیر.

3-**گرووپی هاوڕێیان:**

گرووپی هاوڕێیـان گرووپێکە پیکهاتووە لە هاوڕێکـانی منداڵەکـە کـە لـە ڕووی تەمـەن و مـەیل و ئارەزووەکانـەوە لێـك نـزیکن. هـەروەها ئـەو گرووپەیـە کـە تـاك ڕەفتـاری کۆمەڵایـەتی خۆی بۆ دەگێڕێتەوە و لە چوارچێوەی پێوەرو بەهاو ئاقارو شێوازە جۆربەجۆرەکانی ڕەفتاری ئـــەودا ڕەفتـــاری کۆمەڵایـــەتی خـــۆی هەڵدەسەنگێنێ. گرووپـەکانی هاوڕێیـان ڕۆڵیـان هەیـە لـە پـەروەردەکردنی سیاسـیدا، ئـەوەش لـەڕێی هانـدانی ئەندامـەکان یـان فشارخـستنە سـەریانەوە بـۆ ئـەوەی بـەپێی ئـەو ئاڕاسـتەو شـێوازانەی ڕەفتـار سیاسـی کاربکـەن کـە گرووپەکە قبوڵی دەکات، چونکە دەشێت تاك بایـەخ بـە سیاسـەت بـدات یـان بەدواداچـونی هـەبێت بـۆ ڕووداوە سیاسـیەکان، لەبەرئـەوەی یەکێك یـان چـەند هاوڕێیـەکی نزیـك ئـەو کـارە دەکەن.

4-**ڕۆڵی دامەزراوە ئایینیەکان:**

دامـــەزراوە ئایینیـــەکان ڕۆڵێکـــی گـــەورە دەگێـڕن لـە پرۆسـەی پەروەردەکردنـدا، ئەوەش لەبـەر ئـەو خەسـڵەتە دەگمەنانـەی هەیـەتی، گرنگترینیـان: تـەنراویی بـە خەرمانەیـەك لـە پـــیرۆزی، جـــێگیری و باشـــیی ئـــەو پێـــوەرە ڕەفتاریانەی فێری تاکەکانی دەکات و کۆدەنگی لەســەر پــشتیوانیکردنی. ئــایین دامەزراوگــەلی خۆی هەیە کە کاردەکەن بۆ بەدیهێنانی ئامانج ومەبەستگەلی پایەبڵندو ئایین تـەنها لـە سنوری پەرستکارییەکان و سروتە ئاینیەکاندا قـەتیس نابێـت، بـەڵکو ئـەو ڕۆڵـەی لـە پـەروەردەکردنی تاکەکانـدا دەیبینـێ کاریگـەریی لەسـەر ئـەو دامەزراوانـەی دیکـەش هەیـە کـە کـار لـە بـواری جڵـەوکردنی کۆمەڵایەتیدا دەکـەن. بۆیـە ئایین و

ئـــەو دامـــەزراوەی کـــار بـــۆ بـــەدیهێنانی ئامانجـەکانی دەکـات بـە تـوخمێکی بنـچینەیی پەروەردەکردن دادەنرێت.

دامــەزراوە ئایینیــەکان لەرێگــەی ئەمانــەی خــوارەوە ڕۆڵــی خــۆی دەبینــێ لــە پرۆســەی پەروەردەکردندا:

–ئاشـناکردنی تـاك و کۆمـەڵ بـە فێرکارییـە ئایینیەکان و پێوەرە ئاسمانیەکان کە ڕەفتاری تاك جڵەودەکەن و بەختەوەریی تاك و کۆمەڵگە مسۆگەردەکەن.

–چـــەکدارکردنی تـــاك بـــە ڕەفتـــارە ئەخلاقییەکان.

–پەرەپێدانی ویژدان لای تاك و کۆمەڵ.

–بانگەشـــەکردن بـــۆ ئـــەوەی فێرکارییـــە ئاسمانییـــە پایەبـــەرزەکان بکرێنـــە ڕەفتـــاری بەکردەوە.

–یەکخـستنی ڕەفتـاری کۆمەڵایـەتی و لێـك نزیککردنـــــەوەی چـــــینە کۆمەڵایەتیـــــە جۆربەجۆرەکان.

## 5–ڕۆڵی دامەزراوەکانی کارکردن:

دامــەزراوەکانی کــارکردن کاردەکەنــە ســەر پـــەروەردەکردن، ئـــەوەش لەرێگـــەی ئـــەوەی لەناویانـــدا ڕوودەدات، واتـــە پەیوەنـــدیی و پێکگەیـشتن و مامەڵـەکردنی نێـوان بـەرپرس و کارمەنـــدان و نێـــوان کارمەنـــدانی ئـــەو دامەزراوانەدا، بەجۆرێك هەتا ئەو پەیوەندییە لە بـەڕێوەبردنی کارەکـانی دامەزراوەکـەدا خـاوەن خەســڵەتی دۆســـتایەتی و هاریکـــاریکردن و بەشـداریکردن لـە بڕیارسـازیدا بێـت، ئـەوا تـاك مەیلی زیـاتری دەبێـت بۆ کـارکردن لـە دەرەوەی سـنووری کـارکردن. هـەتا ئـەو پەیوەندییـەش خاوەن خەسڵەتی ڕقلێبوونـەوە و خراپـەکاریی و دەسـەڵاتخوازی بێـت، ئـەوا تـاك زیـاتر مـەیلی خراپـەکاریی و خەمـساردی دەبێـت لـەناوەوە و دەرەوەی ژینگەی کارکردن.

## 6–ڕۆڵی پارتە سیاسییەکان:

پارتە سیاسییەکان ڕۆڵـی گـەورە دەگێـڕن لـە پرۆسـەی پەروەردەکردنـدا، ئـەوەش لـە ڕێگـەی چەسپاندنی بەهاو چەمك و بڕواگەلی سیاسیی دیـــاریکراوەوە لـــەناو تاکـــدا، بەمەبەســـتی ئاڕاســـتەکردنی تاکـــەکان ڕووەو سیاســـەتێکی دیـاریکراو کـە تەبایـە لەگـەڵ ئاڕاسـتەکانی ئـەو پارتانـەدا. پارتـەکان ئـەو ڕۆڵـە دەگێڕێت لـەڕێی پێـــــشکەشکردنی زانیارییـــــەکان و ئـــــەو کاریگەریانـــەی دەیانبێـــت لەســـەر تێـــڕوانین و بەهاو ئاقارە ڕەفتارییە سیاسیەکانی جەماوەر. بـۆ ئـەوەش گـشت ئامڕازەکـانی پەیوەنـدیکردن بەجـەماوەرەوە بـەکاردەهێنرێت، جـا ئەوانـە ئـــامڕازە جەماوەرییـــەکان بێـــت، وەك ڕادیـــۆ، تەلـــەفزیون، ڕۆژنامـــە، گۆڤـــار، کتێـــب و بڵاوکراوەکـان و ئـەوانی تـر، یـان ئامڕازەکـانی پێکگەیـــشتنی ڕاســـتەوخۆ بێـــت، وەك کـــۆڕ، کۆنگرە، موحـازەرات، کۆبونـەوە، گفتوگـۆو ئـەو چاوپێکەوتنانەی پارتـەکان ڕێکیـان دەخـەن بـۆ گەیشتنە گـەورەترین بەشـی شـیاوی جەماوەر. پارتە سیاسییەکان ڕۆڵێکی دووجەمسەری لە پرۆسـەی پـەروەردەکردنی سیاسیدا دەگێڕێت، ئـەویش خـۆی لـە پـشتگیریکردنی ڕۆشـنبیریی سیاســـی بـــاوو خوڵقانـــدنی ڕۆشـــنبیرییەکی سیاسیی نوێدا دەبینێتەوە.

## 7–ڕۆڵی ئامڕازەکانی پێکگەیشتن:

ئەم ئامڕازانە، وەك ڕۆژنامـە، گۆڤـار، ئێزگـەو تەلـــەفزیۆن، ڕۆڵێکـــی گـــرنگ لـــە پرۆســـەی

پەروەردەکردنی سیاسیدا دەگێڕن، بەوپێیەی تاك چەکداردەکات بە زانیارییە سیاسیەکان‌و بەشداریدەکەن لە پێکهێنان‌و سەقامگیربوونی بەها سیاسیەکانی. لە کۆمەڵگە پێشکەوتووەکاندا، ئامرازەکانی ڕاگەیاندن لەسەر ئاستێکی فراوان تەشەنەدەکەن‌و هەڵدەستن بەگواستنەوەی زانیارییەکان دەربارەی بڕیارو سیاسەتەکانی دەستەبژێری حوکمڕان بۆ جەماوەرو گواستنەوەی زانیارییەکان لەسەر داخوازی‌و کاردانەوەی جەماوەر بۆ دەستەبژێر. ئەو دەرپەڕینە بەردەوامەی زانیارییەکان لە سەرەوە بۆ خوارەوەو بەپێچەوانەوە جەخت لەسەر بەها ڕۆشنبیرییە سیاسییە باوەکان دەکاتەوە.

سەرکردایەتیە سیاسیەکانی وڵاتە تازەپێگەیشتووەکان هەوڵدەدەن بۆ گەشەپێدانی ئامرازەکانی پێکگەیشتنی جەماوەری، بۆ ئەوەی بەشداربێت لە پێکهێنانی ڕۆشنبیرییەکی سیاسیی نوێدا، بەڵام کۆمەڵێك هۆکار هەن کە ڕێگرن لەبەردەم ئەوپەڕی سوودوەرگرتن لەو ئامرازانە، وەك نەخوێندەواری، خراپبوونی ئاستی بژێوی، هەژاری، نەخۆشی، غیابی تەزووی کارەباو گۆشەگیریی لادێکان. بۆ باشکردنی سوودوەرگرتن لە ئامرازە جەماوەرییەکان، بوونی جۆرێك لە هاریکاریکردن‌و هاوکاریکردن لەو کۆششانەی دامەزراوەکانی تر دەیکەن، پێویستە.

**سەرچاوە:**

السياسة موسوعة الشباب- موقع "مركز الدراسات السياسية و الاستراتيجية".






- مافی مرۆڤ نوێنەرایەتیکردن، هاولاتیبوون
- مافەکانی مرۆڤ
- مارکس و مافەکانی مرۆڤ
- مافی مرۆڤ مافی جیهانگیر
- ئایا ئەخلاقێکی جیهانی بوونی هەیە؟
- مافەکانی مرۆڤ
- پەیوەندییەکان و مافەکانی مرۆڤ
- چەند ئاماژەیەك لەبارەی رەوایەتی لەرێگەی مافەکانی مرۆڤەوە
- هەلومەرجی یاسایی و ئەخلاقیی "جارنامەی گەردوونی"

# مافی مرۆڤ، نوێنەرایەتیکردن، هاوڵاتیبوون

ئالان تۆرین

لە عەرەبییەوە: د. شاهۆ سەعید

**پەناگای دیموکراسی:**

پێویستە لەنێوان دوو دیوی تازەگەریی سیاسیدا جیاکاریی بکرێ. ئەو تازەگەرییە بەدیویێکدا دەوڵەتی مافەکان دێنێتە ئاراوە کە بانگەشە بۆ یەکێتیی و یەکانگیریی سیستمی یاسایی دەکا لەپێناو سنورداركردنی دەسەڵاتی دەوڵەتی ستەمكارو پێكهێنانو پاراستنی ژیانی کۆمەڵایەتیدا. بەڵام مەرج نیە دەوڵەتی مافەکان هەمیشە دەوڵەتێکی تەواو دیموکرات بێ، چونکە بەهەمان ئەو ئەندازەیەی دیموکراسی دەسەلمێنێ دەشێ دژایەتیشی بکا. بەدیوی دووەمدا، تازەگەریی سیاسی بیرۆکەی سەروەریی گەل دێنێتە ئاراوە، کە ڕێگەخۆشدەکا بۆ سەقامگیرکردنی دیموکراسیی و وەرچەرخان لە ئیرادەی گشتییەوە بۆ ئیرادەی زۆرینە، ئیدی کۆدەنگی دەبێتە بەرەنجامی مشتومڕو ململانێی و ڕێکخستنی پەیوەندییەکانی زۆرینەو کەمینە. کەواتە دەوڵەتی مافەکان فۆرمەکانی ژیانی کۆمەڵایەتیی و سیاسیی و یاسایی لێک جیادەکاتەوە، بەڵام بیرۆکەی (سەروەریی گەل) ژیانی سیاسی دەکاتە پاشکۆی پەیوەندییەکانی نێوان بکەرە کۆمەڵایەتییەکان.

بۆئەوەی بیرۆکەی سەروەریی گەل بە دیموکراسی کۆتایی بێ؟ پێشمەرجێك پێویستە کە نابێ سەروەریی گەل ببێتە بەشێکی دانەبڕاو لە دەسەڵاتی سیاسی، بەڵکو دەبێ ببێتە پرنسیپی نەیاریکردنی ئەو هێزانەی کە دەسەڵات دەگرنەدەست. سەروەریی گەل ڕێگە بۆ دیموکراسی خۆشدەکا بەو مەرجەی ڕەوایەتی بێسنور نەبەخشێتە دەسەڵاتی میللی، بەڵکو پێویستە وەك پەناگایەکی مەعنەوی بۆ ئەو کەسانە بمێنێتەوە کە دەسەڵات لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا پێڕەوناکەن، لەپێناو پاراستنی بەرژەوەندییەکانیانو بەجێهێنانی ئاواتو

خواستەکانیان. گەر ئەو فشارە کۆمەڵایەتیو مەعنەوییە بەردەوامە لە ئارادا نەبێ هەر زوو دیموکراسی لە دەسەڵاتی خەڵکییەوە دەبێتە دەسەڵاتی نوخبەی ئۆلیگارشی، بەتایبەتی کاتێ دەسەڵاتی سیاسی گرێ دەدرێتەوە بەهەموو فۆرمەکانی تری چاودێری کۆمەڵایەتییەوە. دیموکراسی بەرهەمی دەوڵەتی مافەکان نیە، بەڵکو زادەی بانگەشەکردنی بەردەوامە بۆ پرنسیپە مەعنەویەکانی وەك ئازادیو یەکسانی بەناوی زۆرینەیەکەوە کە دەسەڵاتی راستەقینەی بەدەستەوە نیە دژی بەرژەوەندییە سەپێنراوەکان. لەکاتێکدا گروپی باڵادەست، هەروەك مارکس دەڵێ، هەوڵدەدا پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکان لەپشت چەند وتەزایەکی مەبەستگەرەوە بشارێتەوە، کەچی باس لە بەرژەوەندیو سروشتی شمەکە ئابوریەکان دەکا. بەپێچەوانەوە جیاکردنەوەی وتەزا ئابورییە ئەبستراکتەکانو گەڕانەوە بۆ ژێدەرە ئەقلانیەکان کارێکی وادەکا گروپە بندەستەکان پێناسەیەکی ئەخلاقی بۆ دۆخی خۆیان بدۆزنەوە، کە گوزارشت لە ملکەچپێکردنو بەپاشکۆکردنیان بکا، واتە بەناوی دادپەروەریو ئازادیو یەکسانیو هاریکاریی هاوبەشەوە باس لە دۆخی خۆیان دەکەن. ژیانی سیاسی لەسەر کۆدژییەك دادەمەزرێ، کۆدژیی نێوان بڕیارە سیاسیو یاساییەکان، کە پێگەی گروپە باڵادەستەکان بەهێزتر دەکا، لەگەڵ بانگەوازکردن بۆ ئاکارێکی کۆمەڵایەتی کە داکۆکی لە بەرژەوەندیی توێژە بندەستو کەمینەکان دەکا، ئەڵبەتە بانگەشەی لەو جۆرە هەمیشە بیستراوە چونکە پەیوەندیی کۆمەڵایەتی پتەوتر دەکا. کەواتە دیموکراسی تەنها رێوشوێنی رەسمیو دامودەزگایی ناگرێتەوە، بەڵکو هێزێکی کۆمەڵایەتیو سیاسییە هەوڵدەدا دەوڵەتی یاسا بەئاقارێکدا بەرێ کە لە بەرژەوەندیی توێژە بندەستو حوکمکراوەکاندا بێ. بەڵام پابەندبوون بە رواڵەتی یاساو سیاسەتەوە دەوڵەت بەئاراستەیەکی تردا دەبا، کە ئاراستەیەکی ئۆلیگارشییە، بۆشایی دەخاتە نێوان دەسەڵاتی سیاسیو داواکارییە کۆمەڵایەتیەکانەوە کە دەشێ دەسەڵاتی گروپە باڵادەستەکان بخاتە بەر مەترسی. لە رۆژگاری ئەمڕۆماندا جیاوازیی نێوان فیکری دەسەڵاتخوازیو فیکری دیموکراتی خۆی لەوەدا دەبینێتەوە کە یەکەمیان بە رواڵەتی بنەما یاساییەکانەوە دەنوسێتەوەو جەختیان لەسەر دەکاتەوە، بەڵام دووەمیان هەوڵدەدا ئەو داواکاریو ململانێ کۆمەڵایەتیانە ئاشکرابکا کە لەپشت رواڵەتی مافەکانو زمانی دەسەڵاتە پەنهاندراوە.



گەر زیاتر قووڵ ببینەوە دەکرێ بڵێین یەکسانی سیاسی، کە زامنی دیموکراسییە، تەنها مافی یەکسان نابەخشێتە هاوڵاتیان، بەڵکو ئامرازێکیشە، بەناوی مافە ئەخلاقیەکانەوە، بۆ قەرەبووکردنەوەی ئەو جیاوازیو ستەمە کۆمەڵایەتیانەی کە لەنێوان

تاك‌و گروپەكاندا هەن. واتە پێویستە لەسەر هەر دەوڵەتێكی دیموكرات ماف ببەخشێتە هاوڵاتیە بندەستەكان تا بۆیان هەبێ لە چوارچێوەی یاسادا نارەزایی دژی هەر سیستمێكی زاڵمانەی دەوڵەت دەربڕن كە جیاوازیی دەخاتەوە. واتە ئەركی دیموكراسی تەنها سنورداركردنی دەسەڵاتی دەوڵەت نیە، بەڵكو ناچاركردنیەتی كار بكا بۆ بەرتەسككردنەوەی جیاوازییەكان‌و قەرەبووكردنەوەی ستەم. "رۆناڵد دوركن"، كە دیارترین نوێنەری قوتابخانەی لیبراڵیزمە، زۆر بەئاشكرا گوزارشت لەم پرسە دەكا كاتێ دەڵێ: دەبێ بەگوێرەی پرنسیپی یەكسانیی سیاسی "حساب بۆ ئەوە بكرێ كە ئەندامە هەرە لاوازەكانی كۆمیونیتی سیاسی، وەك ئەندامە هەرە بەهێزەكان، مافیان بەسەر حكومەتەوە هەیە كە رێزو حورمەتیان بگرێ.. چونكە هەروەك چۆن كەسانێكی دیاریكراو مافی بڕیاروەرگرتنیان هەیە لەبواری گشتیدا، جا ئیتر بڕیارەكانیان لە بەرژەوەندیی گشتی بێ یان نا، دەبێ هەموو تاكەكانی تریش خاوەنی ئەو ماف‌و ئازادییانە بن"[1].

كاتێ "دۆركن" تێزەكانی قوتابخانەی سوودگەری‌و پۆزەتیفیزمی رەواگەر رەخنەدەكا، جەختدەكاتەوە لەسەر كۆدژیی نێوان مافە بنەڕەتیەكان‌و ئەو مافانەی كە یاسا سنورداریان دەكا. مافە بنەڕەتیەكان، كە زادەی دامودەزگاكانن، كار بۆ سازاندنی ماف‌و پرنسیپە ئەخلاقیەكان دەكەن. ئیدی هەرچەندە دەوڵەت ئەو مافە بنەڕەتیانە دەسەلمێنێ، بەڵام لەهەمان كاتدا دەكرێ ئەو مافانە دژی دەوڵەت بەكاربهێنرێنەوە. تیۆرسازە دیموكراتەكان، لە لۆك-ەوە بۆ رۆسۆ تا تۆكفێل، هوشیارن بەرامبەر ئەوەی دیموكراسی لە مافە پەتیەكاندا یەكسانی بەدی ناهێنێ، بەڵكو لەڕێگەی هەڵگرتنی ستەم‌و لەناوبردنی جیاوازییە واقعیەكانەوە ئەو كارە دەكا، بەتایبەتی ئەو جیاوازیانەی كە كەلێن دەخەنە نێوان خەڵكی‌و نێوەندەكانی بڕیاری گشتی. كاتێ دیموكراسی نابێتە دالدەو پەناگە بۆ هەڵگرتنی ئەو جیاوازییانە، ئەوە جگە لە نیفاقێكی گەورە هیچی تر نیە. بۆ ئەوەی یاسا ئەو رۆڵە بگێڕێ كە "دۆركن" پێی سپاردووە پێویستە ئەو پەناگەیە، زۆر چالاكانە، خەڵكانی سەر بە كۆمیونیتییە لاوازەكان دالدە بدا. پێویستە زۆرینە مافی كەمینەكان بسەلمێنێ‌و ناچاریان نەكا بەرگری لە بەرژەوەندیەكانی وی بكەن، یان وەك زۆرینە قسەبكەن، نابێ كەمینەكان ناچار بكرێن هەمان ئەو رێگەچارانە بگرنەبەر كە تەنها بۆ زۆرینەو گروپە بەهێزەكان گونجاوە. بیرۆكەی دیموكراتی لە بیرۆكەی مافەكان ناترازێ، هەربۆیە ئەو بیرۆكەیە لە وتەزای حوكمی زۆرینەدا كورت نابێتەوە. ئەو تێگەیشتنەی "دۆركن" گوزارشتی لێدەكا جیاوازە لە هەموو ئەو تێگەیشتنانەی كە پرنسیپی دادپەروەری بە بیرۆكەی بەرژەوەندی گشتی پێناسەدەكەن‌و دەیپێون، وەك تێگەیشتنی "راوڵز" كە لە كتێبی (تیۆرەیەك دەربارەی دادپەروەری)[2]دا هاتووە، ئەو تێگەیشتنە -بۆ نمونە- كار بۆ كەمكردنەوەی ستەمی سەر توێژە بێدەرەتانەكان دەكا، كە بەدەربڕینێكی سوودگەرانە كار بۆ بەرژەوەندیی تەواوی كۆمیونیتی دەكا. بەڵام بیرۆكەی مافە بنەڕەتیەكان یان مافە ئەخلاقیەكان، بەپێچەوانەوە، پشتئەستور نیە بە بەرژەوەندی

ناوەکیی کۆمەڵگا، بەڵکو پشتئەستورە بە پرنسیپێکی دەرەکی دەربارەی رێکخستنی ژیانی بەکۆمەڵ. کەواتە دیموکراسی لە چەند دامودەزگایەکی گشتیدا کورت نابێتەوە، تەنها سنورداركردنی دەسەڵاتەکان نیە، تەنانەت دیموکراسی بریتی نیە لە هەڵبژاردنی ئازادانەو دەوریی فەرمانڕەواکان بەتەنها، بەڵکو دیموکراسی {سەرباری هەموو ئەو شتانە} گرێدراوە بە تیۆرەی مافەکان‌و پراکتیزەکردنیانەوە.

## بیرمەندە کۆنەکان‌و بیرمەندە نوێیەکان:

ئەو رووبەرەی کە دەکەوێتە نێوان دەوڵەتی مافەکان‌و پەناگەی دیموکراتی، یان دەکەوێتە نێوان کۆماری هاوڵاتیان‌و پاراستنی مافە تایبەتەکانەوە، هەمان ئەو رووبەرەیە کە دەکەوێتە نێوان ئازادیی بیرمەندە کۆنەکان‌و ئازادی بیرمەندە مۆدێرنەکان، کە کاتی خۆی "بنیامین کۆنستان" لە دەقە کورت‌و بەناوبانگەکەیدا باسی کردووە. چونکە بانگەشەکردن بۆ ئیرادەی گشتی، بۆ زەینیەتی نیشتمانی‌و کۆماری‌و دەسەڵاتی میللی، کە لە جان جاك رۆسۆ-وە تا شۆڕشگێڕەکانی سەدەی بیستەم بەرگوێمان دەکەوێ، هیچ نیە جگە لە دووبارەکردنەوەی هەمان بانگەوازی کۆنەکان لە بەرگێکی نوێدا. بەڵام بەرلەوەی بەراورد لەنێوان ئەم دوو تێگەیشتنە هاودژەدا بکەین، پێویستە خاڵە هاوبەشەکانیان بسەلمێنین، چونکە گەر مرۆۋ داوای زەینیەتی نیشتمانی بکا یان داوای بەرگریکردن لە مافە بنەڕەتیەکان بکا، ئەوا داواکەی ناکۆکە لەگەڵ ئەو دیدەی کە پێناسەی رژێمی سیاسیی باش دەبەستێتەوە بە دادپەروەریی دابەشکاری. کاتێ هەریەکێک لە ئێمە داوادەکا ئەو شتەی چنگ بکەوێ، کە بەپێی توانا‌و لێهاتوییەکانی، یان بەپێی سوودو پێداویستیەکانی، بەڕەوای خۆی دەبینێ..، ئەوا وێنەیەکی ئابوری دەبەخشینە پرسەکە، واتە مەرجی بەشداریکردن دەبەستێتەوە بەو بەرامبەرەی چنگی دەکەوێ.

هەرچەندە ئەم هاوسەنگی راگرتنە رەزامەندیی بکەرەکان‌و داخوازیەکانیان دەخاتەڕوو، بەڵام لەتواناییدا نیە پێناسەی رژێمی سیاسی بەگشتی‌و رژێمی دیموکرات بەتایبەتی بکا، چونکە دیموکراسی تەنها بەخۆی، بەپێی تێگەیشتنێکی دیاریکراوی دادپەروەری، پێناسەدەکرێ. وردتر دەبێ بڵێین: دیموکراسی هیچ پەیوەندییەکی بە دادپەروەریی دابەشکارییەوە نیە. "ئەرستۆ" ئەو کەسە بوو کە زۆر بەتوندی دژی ئەم جۆرە کورتکردنەوەیەی سیاسەت بوو، دژی چڕکردنەوەی سیاسەت بوو بەجۆرێك تەنها گوزارشت لە داخوازی‌و بەرژەوەندیەکان بکا.

ئەوانەش کە بەرگری لە مافی سروشتی دەکەن، هەروەك ئەرستۆ، پێیانوایە نابێ تێگەیشتنێکی ئابووری پێشکەش بە سیاسەت بکەین. ئیدی ناتوانین خۆمان لە ئەرکێك بدزینەوە کە بریتییە لە بیرکردنەوە دەربارەی سروشتی دەسەڵات‌و رێکخستنی ژیانی بەکۆمەڵ.

جگە لە رێکەوتنێکی لەم جۆرە دەربارەی سروشتی تایبەتی کاروباری سیاسی، بیرمەندە کۆنەکان‌و بیرمەندە نوێیەکان، پێڕەوانی ئەرستۆو لیبراڵیزم، لەنێوان خۆیاندا کۆك نین‌و جیاوازی گەورە لەنێوانیاندا هەیە. بیرۆکەی تایبەتی ئەرستۆ لەو بارەیەوە هەمان ئەو بیرۆکەیە نیە کە سروشتی رژێمی سیاسی بە سروشتی فەرمانڕەوایی پێناسەدەکا، جا ئیتر

ئەو فەرمانڕەواییە تەنها کەسێك نوێنەرایەتی بکا یان کەسانێك یان زۆرینەیەك. واتە هەمان ئەو بیرۆکەیە نیە کە سیستمی شانشینی لە سیستمی ئۆرستۆکراتی جیادەکاتەوە، یان ئەوەی کە هەروا ناومان ناوە سیستمی دیموکرات، یان ئەوەی کە هاوچەرخەکانی ئەرستۆ ناویان نابوو ئیزۆنۆمیا *Isonomie* واتە یەکسانی لەبەردەم یاسادا. بەڵکو بیرۆکەی وی بیرۆکەی لێکترازانی سێ رژێم بوو، کە بەرگری لە بەرژەوەندی سێ جۆر خەڵکانی ناو دەسەڵات دەکەن: ستەمکار، ئۆلیگارشی، هێزی میللی..، لە سێ جۆری تری رژێم، کە گەر خاوەنی هەمان هێزیش بن، هەر بەرگری لە بەرژەوەندی گشتی دەکەن، واتە سیاسەت پێڕەودەکەن بەمانای وشە. ئەمە ئەو مانایەیە کە لە نەسکی حەوتەمی کتێبی سێیەمی "سیاسەت" چنگمان دەکەوێ، لەو نەسکەدا ئەرستۆ رژێمە سیاسییەکان پۆلێندەکا..، کۆدژی لەنێوان حاکمو مەحکومەکاندا نابینێ، بەگوێرەی پەیوەندییە سیاسییەکان پێناسەی هاوڵاتیان دەکا، بەو پێیەی هەر یەکێك لای خۆیەوە برێك لە دەسەڵاتی بەردەکەوێ، جا ئیتر دەسەڵاتی دادوەری بێ یان راوێژکاری. چونکە "هیچ شتێك پێناسەی وردی هاوڵاتی ناکا جگە لەو پێناسەیەی کە پێیوایە دەبێ بەشدار بێ لە دەسەڵاتی دادەور یان فەرمانڕەوا"(کتێبی سێیەم، 1، 6). هەربۆیە بایەخدان بە خەڵکیو دەربڕینی خۆشەویستی بۆیان دوو بنەمای سەرەکیی هەر رژێمێکی پەسەندو باشن، کە ئەرستۆ ناوی نا (پۆلیتیا *Politeia*)[3]. واتە رژێمی سیاسی هەڵکەوتو، کە گوزارشت لە سەروەریی گەل دەکاو تەنها لەپێناو خەڵکانێکی بێدەرەتاندا پراکتیزەی دەسەڵات ناکا، بەڵکو لەپێناو بنیاتنانی کۆمەڵگەیەکی سیاسیدا ئەو کارە دەکا.

ئەمە تێگەیشتنی نەوەی کۆنە بۆ ئازادی، کە وەك ئەرستۆ دەڵێ، لە ئازادیی ئەستێرەکان دەچێ، چونکە لە یەکەیەکی گشتیدا شتەکان پێکەوە دەبەستێتەوە. مەبەست لە بنیاتنانی شار بریتیە لە دابینکردنی کامەرانی بۆ هەموان. شار تەنها حەشامەتێك نیە کە ژیانی تاکەکان پێکەوە گرێ بدا، بەڵکو شوێنێکە بۆ بەسەربردنی ژیان بەشێوەیەکی باشتر، ئەرستۆ لە کتێبی یەکەمی "سیاسەت" بەدواوە ئەم خاڵەی روونکردۆتەوە کاتێ لە پێناسەی مرۆڤدا دەڵێ "بونەوەرێکی سیاسی"یە. بەڵام کامەرانی چیە جگە لە یەکێتیەکی نیشتمانی کامڵ؟ یەکێتییەك کە تەنها کار بۆ تواندنەوەی خەڵکی لە قەوارەیەکی بەکۆمەڵدا ناکا، بەڵکو زۆرترین رایەڵی پەیوەندیش دروستدەکا. بڕیاری سیاسی، هەروەك ئەرستۆ دەڵێ، بالاترە لە بڕیاری فەردیی تاکەکان، چونکە سیاسەت پەیوەندیی بە دیدو بۆچوونو شارەزاییەوە هەیە بەرلەوەی پەیوەندیی بە مەعریفەوە هەبێ، واتە پێویستی بە حیکمەتی پراکتیکیو زیرەکی هەیە، پێویستی بە (فرۆنیزیس *Phronesis*)[4] هەیە، کە وتەزایەکە "پییێر ئۆبانك" شییدەکاتەوەو پێیوایە بایەخێکی پراکتیکیی لای ئەرستۆ هەیە، لەپێناو گەیشتن بە یەکێتییەکی تا ئەندازەیەك کامڵ، لەپێناو پێکەوەگونجاندن لەنێوان دیدە مەعریفیەکانو راوبۆچوونە فەردیەکان. بیرمەندە کۆنەکان ئەرستۆ بە ئیلهامبەخشی سەرەکیی "ئازادی" دادەنێن، لەگەڵ ئەوەشدا ئەرستۆ رەخنە لە دیموکراسی دەگرێو پێیوایە دەچێتە خزمەتی زۆرینەیەکی خۆپەرستەوە، دەترسێ ئەو جۆرە

دیموکراسییە پێکهاتەی شار لەناوبەریٚ و ببێتە هاودژی رژێمی دەستوری، وەك هاودژیی نێوان رژێمە شانشینەکان و ستەمگەرو تاکرەوەکان. ئەڵبەتە جیاوازی لەنێوان هاولاٌتی و مرۆڤی تایبەتدا هەیە، چونکە "دەشیٚ مرۆڤ هاولاٌتیەکی باش بیٚ، بەلاٌم مەرج نیە مرۆڤێکی باش بیٚ"(کتێبی سێیەم، 4، 4). جیاکارییەکی لەو جۆرە لەنێوان ژیانی گشتی و ژیانی تایبەتدا، کە دەچێتەوە خزمەتی ژیانی گشتی، ئاماژەیەکی ئاشکرایە بۆ تێگەیشتن لە چەمکی ئازادی مەدەنی، بۆ تێگەیشتن لە ئایدیۆلۆجیای کۆماری و شۆرشگێرەکان کە لە دنیای مۆدێرندا پشتی پێدەبەستریٚ.

چ جیاوازییەك لەنێوان ئازادیی بیرمەندانی نویٚ لەگەڵ ئەو تێگەیشتنە نیشتمانی و کۆمارییەدا بۆ دیموکراسی هەیە؟ جیاوازییەکە لەوەدا خۆی دەبینێتەوە کە چیتر سیاسەت، لە



جیهانی مۆدێرندا، بریتی نیە لە گوزارشتکردن لە پێویستییەکانی گروپێکی دیاریکراو، بەڵکو بریتییە لە کارکردن لەسەر کۆمەڵگاو لەناو کۆمەڵگەدا. دروستکردنی کۆدژیی لەنێوان دەولٌەت و کۆمەڵگادا، بەو مانایەی کە لە کۆتاییەکانی چاخی ناوەراستەوە هاوکات لەگەڵ دامەزراندنی رژێمە شانشینییە رەهاکاندا هاتەئاراوە، کە گوایا یەکێك لەو دوانە (دەولٌەت و کۆمەڵگە) کاریگەریی لەسەر ئەوی تر هەیە..، دوا دابرانی لەگەڵ مانای شاردا

دروستکرد. تەنانەت ئەم دۆخە دەولٌەت-شارەکانی وەك "ڤینیسیا"ش دەگرێتەوە، کە لەهەردوو سەدەی چواردەو پازدەدا، بوونە دەولٌەتگەلێکی مۆدێرن لەبابەتی فەرەنساو ئینگلتەرا.

هاوزەمان لەگەڵ دروستبوونی دەولٌەتدا، هێزگەلێکی کۆمەلاٌیەتی- سیاسی چالاك توانیان دەولٌەت دژی نەیارە کۆمەلاٌیەتیەکانی خۆیان بەکاربێنن، یان بەپێچەوانەوە دژایەتی دەولٌەتیان کرد لەپێناو دابینکردنی زۆرترین سەربەخۆیی بۆ هێزە کۆمەلاٌیەتییە چالاکەکاندا. بەلاٌم گەر رێگەچارەی شۆرشگێرانە پێرەوبکەین، یان رێگەچارەی لیبرال، ئەوا دەکریٚ بلٌێین سیاسەت تەنها کار لەسەر کاریگەریی دەسەلاٌت لەسەر کۆمەڵگا دەکا نەك دروستکردنی کۆمیونیتییەکی دیاریکراو.

هەر لەبەر ئەم هۆیە، ئەو کەسانەی کە تێگەیشتنی نیشتمانیی بۆ دیموکراسی و چەمکی ئازادیی بیرمەندە کۆنەکانیان بۆ دنیایی مۆدێرن گواستەوە، رێگەیان خۆشکرد بۆ لەناوبردنی ئازادی. لەکاتێکدا بەرگریکردن لە ئازادییە کۆمەلاٌیەتیەکان، تەنانەت بەکارهێنانیان بۆ چەند بەرژەوەندییەکی خۆپەرستانە، بووە هۆی پاراستنی دیموکراسی بگرە بووە هۆی پتەوکردنی. گەر ئێمە لیبرالٌیزم وەك هاوواتای ئازادی لای بیرمەندە مۆدێرنەکان پێناسەبکەین،

گــەر وەك هاوواتــای بــەرگریکردن لــە هێــزە کۆمەڵایەتییـە چالاکەکان دژی دەوڵـەت پێناسـە بکـەین..، ئـەوە مانـای وایـە ئـەو کەسـانەی کـە لیـبراڵ نــین، بەشــێوەیەکی راســتەوخۆ یــان ناڕاســتەوخۆ، بەرپرســیارن لـــە نـــاوبردنی سیــستمی دیمــوکراتی، ئــیتر لــە ژێــر نــاوی ئـازادکردنی نەتـەوەدا بـێ، یـان لـەژێر چەتری (وەڵا)دا بێ بۆ سـەرکردەیەکی تاكو تـەنها، یان بـەناوی بەرژەوەنـدیی گەلـەوە بـێ. ئەمـە هـیچ شــتێکی جەوهــەری لــە مەســەلەکە نــاگۆڕێ، چـونکە نـاکرێ مـرۆڤ لـە دنیـای دەوڵەتـسازیدا باس لـە دیموکراسـی بکا بەبێ بوونی سانسۆر لەلایەن هێزە کۆمەڵایەتییە چالاکەکانەوە لەسەر دەسەڵاتی سیاسی.

دامەزرانـدنی دەزگـای دەوڵـەت لـە جیهـانی نوێـدا، بەشـێوەیەکی ناراسـتەوخۆ، چـەمکێکی هێناوەتــە ئــاراوە کــە چــەمکی کایــەی کۆمەڵایەتییـە. کۆمــەڵگا چـیتر رەوتێـك، یـان پلەبەندییـەکی کۆمەڵایـەتی، یـان دەزگایـەکی ئۆرگانیك نیە، بەڵکو لەیەك کاتدا بریتییە چەند رایـەڵو پەیوەندییـەکی کۆمەڵایـەتیو چـەند هێزێکـی چـالاکیش کـە خـاوەنی پاشـخانی کولتورینو هەندێ جار دەچنە دۆخی ململانێو هەندێ جاریش دەچنە دۆخی هاریکاری. ئیدی ناکرێ پێناسەی دیموکراسی بکرێ بەوەی بڵێین دامەزراوەیەکی سیاسییە بۆ شار، بەڵکو بریتیە لە بەشداریکردنی زۆرترین بکەری کۆمەڵایـەتی، بەتاكو کۆ، لە دروستکردنی بڕیاری سیاسیدا، بـە ئەندازەیـەك، هـەروەك "کلـۆد لۆفـۆر" ووتـی "شوێنی دەسەڵات دەبێتە شوێنێکی بەتاڵ"[5]. لێرەوە بەئاسـانی لـەوە ناگـەین کـە بۆچـی ئـەم نوســـەرە هێنـــدە خـــۆی پابەنـــدکردووە بەسیاســـەتەوە، بەوپێیـــەی سیاســـەت "دروستکردنی بواری کۆمەڵایەتییە، یان فۆرمی کۆمەڵگایـە، یـان کرۆکـی ئـەو شـتەیە کـەکاتی خۆی ناونرابوو شار"، بەهەمان شێوە ئاسانیش نییـە لـە خـودی بیرۆکـەی سـەروەریی میللـی تێبگەین.

وێنـاکردنی گـەل کـە بووبێتـە سـەردارو جێنـشینی پادشـا مانـای وانیـە کـە بـەرەو دیموکراسـی هـەنگاودەنێین. تـەنها ئـەو کاتـە دیموکراسـی مـۆدێرن ئامـادەیی هەیـە کـە چیتر دەسـەڵاتی {رەهـای} پادشا نەمابێو دەسـەڵات مـوڵکی کـەس نـەبێ، چـیتر دەسـەڵات قـۆرخ نـــەکرێو بـــەگوێرەی هەڵبژاردنـــەکان دەستاودەســت بکــا. لــە دنیــای مۆدێرنــدا کۆمەڵگەی ئایدیاڵ بوونی نیە، هیچ کۆمەڵگایەك لـە کۆمەڵگـەی کـراوە باشـتر نیـە کـە پڕاوپـڕی مێـژووی خـۆی بـێ. بـەڵام کۆمەڵگـەی دژ بـە دیموکراسـی، وردتـر کۆمەڵگـەی سـتەمگەرو تۆتالیتار، ئەو کۆمەڵگەیەیە کە "کلۆد لیڤۆر" ووتـەنی: کۆمەڵگەیـەکی گیرخـواردووی دژ بـە مێـژووە. چـیتر نـاکرێ، وەك "هانـا ئارێنـت" ووتـــی، سیاســـەتمەدار بخەینـــە ســـەروو کۆمەڵناســـەوە. "ئارێنـــت" زۆر پەرگیرانـــە دژبــوونی خــستە نێــوان جیهــانی ئــابوریو کۆمەڵایــەتی، کــە مەحکومــە بــە پێویــستییە مادیـەکان، لـە بەرامبـەر جیهـانی سیاسـەتدا کـە جیهـــانی ئازادییـــە. گـــەر نـــزیکترو رونـــتر قسەبکەین دەکـرێ بڵـێین ئـەوە بیرۆکـەی مافـە کۆمەڵایەتیەکانـە کـە هێـزو زەخـم دەبەخـشێتە جیهانی مۆدێرن. بەڵام هەموو هـەوڵو کۆششێك بۆ بەگژ یەکدا کردنی بواری سیاسیی گشتگیرو هێزە کۆمەڵایەتییە چالاكو تایبەتەکان هیچی لێ سـەوز نابـێ جگـە لـە دوو شـت: یـان ئـەوەتا داوادەکـرێ مـافی دەسـەڵاتو ئیمتیـازی زیـاتر

بدرێ بەو نوخبە دەسەڵاتدارەی، کە گوایا ئاقڵترن و نایانپەرژێتە سەر کاروبارو کێشەو ئازاریی بکەرە ئاساییەکان..، یان مەیدانی سیاسەت کورتدەکرێتەوە بۆ شوێنێك کە تیایدا بەرژەوەندییە تایبەتەکان تێکەڵ یەکتر دەبن و بەیەکدا دەکێشن.

### سێ رەهەندەکە :

پێناسەکردنی دیموکراسی بەوەی بریتیە لە "هەڵبژاردنی ئازادانەی فەرمانڕەواکان لەلایەن فەرمانڕەواییکراوەکانەوە بەشێوەیەکی دەوریی رێکوپێك" زۆر بەڕوونی ئەو میکانیزمە دامودەزگاییە ڕووندەکاتەوە کە بوون دەبەخشێ بە دیموکراسی. بۆ شیکردنەوەی دیموکراسی پێویستمان بەم پێناسەیە هەیەو نابێ لە جوغزی ئەم پێناسەیە دەربچین. هیچ دەسەڵاتی میللی لەئارادا نیە، کە ناوی دەسەڵاتی دیموکراتی لێبنرێ، گەر هەمیشە لەڕێگەی هەڵبژاردنی ئازادەوە نەبەخشرێ و تازەنەکرێتەوە. هەروەها دیموکراسی بوونی نیە گەر کەرتێکی گرنگی خەڵکی مافی هەڵبژاردنیان نەبێ، ئەو مافەی کە زۆرجار زەوتکراوەو تا سەردەمانێکی نزیکیش بە ژنان بەڕەوا نەبینراوە، تا ئێستاش بەو کەسانە ڕەوا نابینرێ کە نەگەیشتوونەتە تەمەنی یاسایی، ئەوەش وادەکا تای تەرازووی جەستەی هەڵبژێردراو لە بەرژەوەندی بەتەمەن و خانەنشینەکاندا بشکێتەوە لەسەر حسابی ئەوانەی کە هێشتا نەچوونەتە شەڕی ژیانی پیشەییەوە. کاتێ هەڵبژاردنی دەنگدەرە ئازادەکان هەڵبژاردنێکی سنوردار دەبێ لەنێوان چەند حزبێکی دیاریکراودا کە ئامرازە سیاسیەکان دەبزوێنن و دەنگدەران ناچاردەکەن لەنێوان دوو تیمی دەسەڵاتخواز یان زیاتردا یەکێکیان هەڵبژێرن، بەبێ ئەوەی نەیارییان بۆ هەندێکیان لەگەڵ پشتیوانییان بۆ هەندێکیان پێکەوە گونجاو بن..، لە کاتێکی ئاوهادا دیموکراسی دەبێتە سیستمێکی سنوربەندو هەندێ جاریش بنەماکانی لەناودەچن. چۆن دەکرێ قسە لە دیموکراسی بکرێ لە کاتێکدا دەسەڵاتی شەرعی لەکاردەکەوێ، یان توندوتیژی و پاشاگەردانی باڵ بەسەر کەرتێکی گەورەی کۆمەڵگادا دەکێشێ. بۆ ناسینەوەی دیموکراسی تەنها پێویستمان بە ناسینی دژەکەی نیە. دیموکراسی کاتێ دێتەبوون کە مەودایەکی سیاسی دروستدەبێ بۆ پاراستنی مافی هاوڵاتیان دەرهەق بە هێزو زەبری دەوڵەت. ئەم تێگەیشتنە ناکۆکە بە بیرۆکەی رێککەوتنی راستەوخۆ لەنێوان گەل و دەسەڵاتدا، چونکە گەل پراکتیزەی فەرمانڕەوایی ناکا، بەڵکو کەسانێك فەرمانڕەوایی دەکەن کە بەناوی گەلەوە دەسەڵات دەگرنەدەست. لەبەرامبەردا دەوڵەت تەنها گوزارشت لە هەست و سۆزی میللی ناکا، چونکە پێویستە یەکێتی کۆمەڵی سیاسی دابین بکاو نوێنەرایەتی بکاو لەئاست جیهانی دەرەکیشدا بەرگری لێبکا. دیموکراسی ئەو کاتە بوونی هەیە کە بۆشاییەکی جیاکەرەوە لەنێوان دەوڵەت و ژیانی تایبەتیدا هەیە، پێویستە دان بەو بۆشاییەدا بنرێ و دەزگا سیاسی و یاساییەکان دەستەبەری بکەن. دیموکراسی، جارێکی تر، تەنها چەند رێوشوێنێکی کردەیی نیە، بەڵکو رستێك نێوەندە لەنێوان یەکێتی دەوڵەت و فرەیی هێزە کۆمەڵایەتییە چالاکەکاندا. واتە دەبێ مافە بنەڕەتیەکانی تاکەکان زامن بکرێن، پێویستە

هەموویان هەست بەهاوڵاتیبوونی خۆیان بکەن‌و بەشداری لە بنیاتنانی ژیانی بەکۆمەڵدا بکەن. کەواتە دەبێ دوو فاکتەر (دەوڵەت‌و کۆمەڵگەی مەدەنی) بەجیا بمێننەوە، بەڵام لەرێگەی شێوازی نوێنەرایەتیکردنی سەرکردە سیاسییەکانەوە بگەنەوە بەیەك. بەم جۆرە سێ رەهەندەکەی دیموکراسی یەك تەواو دەکەن: رێزگرتن لە مافە بنەڕەتیەکان، هاوڵاتیبوون‌و شێوازی نوێنەرایەتیکردن لەلایەن فەرمانڕەواکانەوە. واتە بە پەیوەندیی یەکتەواوکاری ئەو سیانە دیموکراسی دێتەبوون.

دیموکراسی، بەپلەی یەکەم، پێویستی بەوەیە کە فەرمانڕەواکان بە نوێنەرایەتی خەڵکی دەسەڵات بگرنەدەست، واتە پێویستە چەند هێزێکی کۆمەڵایەتی چالاك هەبن کە ئامرازو کەرەستەکانیان بریتی بن لە بکەرە سیاسیەکان، واتە نوێنەرەکان. دیموکراسی گەر لەسەر بنەمای فرەیی دروست نەبووبێ، ئەوا پێویست دەکا سیفەتی نوێنەرایەتیکردن بەرجەستەبکا، چونکە کۆمەڵگەی مەدەنی لەسەر بنەمای فرەیی بکەرە کۆمەڵایەتیە چالاکەکان پێکدێ. هەندێ لە کەسە دیموکراتەکان بڕوایان بە ململانێی بەرژەوەندییەکان هەیەو هەندێکیان بڕوایان بە بوونی تەوەرێکی مەرکەزی هەیە کە بەدەوریدا هەموو پەیوەندییەکانی هەژموون‌و پاشکۆیی دەسوڕێنەوە. بەڵام هەموویان لەسەر بەرەنگاربوونەوەی ئەو تێگەیشتنە کۆکن، کە پێیوایە یەکێتی‌و هاوجۆری لە کۆمەڵگادا هەیە، ئەوەش دەسەلمێنن کە نەتەوە لە دەستەیەکی سیاسییەوە نزیکترە تا هێزگەلێکی کۆمەڵایەتی چالاك، بەجۆرێك ناتوانین وێنای نەتەوەیەك لە نەتەوەکان بکەین، بەپێچەوانەی گەلێك لە گەلەکان، بەبێ بوونی دەوڵەت، لە کاتێکدا تا ئێستا چەندین نەتەوە هەن کە دەوڵەتیان نیەو لەو بارەیەوە ئازار دەنۆشن. فرەیی هێزە سیاسییە چالاکەکان لە سەربەخۆیی پەیوەندی‌و چالاکییە کۆمەڵایەتیەکان‌و رۆڵە تایبەتەکانیان ناترازێ. کۆمەڵگەی سیاسی، کە ئەم فرەییەی پەیوەندی‌و چالاکییە کۆمەڵایەتیەکان ناسەلمێنێ، پێویستدەکا کۆمەڵگەیەکی دیموکرات بێ، تەنانەت گەر حکومەت یان حزبی فەرمانڕەوا پشتئەستور بن بە زۆرینەو جەخت لەسەر ئەوەش بکەنەوە کە هەڵگری بەرژەوەندیی باڵان.

خەسڵەتی دووەمی کۆمەڵگەی دیموکرات، هەروەك لە پێناسەکەیدا دیارە، بریتییە لەوەی کە دەنگدەران هاوڵاتی بن‌و هەست بە هاوڵاتیبوونی خۆیان بکەن. چونکە هەڵبژاردنی ئازادانەی فەرمانڕەواکان هیچ مانایەکی نامێنێ، گەر خەڵکی خەمسارد بن بەرامبەر حکومەتەکەیان، گەر هەست نەکەن ئەوان سەر بە کۆمەڵگەیەکی سیاسین‌و تەنها بە وابەستەی بنەماڵەیەك، یان گوندێك، یان تاقمێکی پیشەوەر، یان گروپێکی ئیتنی یان مەزهەبێکی ئاینی نین؟ هوشیارییەکی لەوجۆرە بە ئینتما لە هەموو شوێنێکدا ئامادەیی نیەو رەنگە هەموو کەس بایەخی نەزانێ‌و داوای مافەکانی هاوڵاتیبوون نەکا، چونکە دەشێ ئەو خەڵکە قەناعەتیان بە پێگەی خۆیان هەبێ‌و خەمسارد بن بەرامبەر بڕیارو یاساو هەموارکردنیان، یان دەشێ لە بەرپرسیارێتی هەڵبێن کە پێویستی بە قوربانیدانی زۆرە. رەنگە کەسانێك پێیان وابێ دنیای فەرمانڕەوایی پەیوەندیی بە دنیای خەڵکە ئاساییەکانەوە نیە. بۆیە زۆرجار ئەو

قسەیە دێتە بەرگوێمان کە ئەو خەڵکە لە هەمان ئەو جیهانەدا ناژین کە ئێمەی تێدا دەژین.

هاتنەئارای یموکراسی هاوزەمان بوو لەگەڵ دروستبوونی دەوڵەتە نەتەوەییەکاندا، بۆیە گومان لەوە دەکرێ کە لە سەردەمی ئێستاماندا، لە دەرەوەی دەوڵەتی نەتەوەیی، توانای درێژبوونەوەی هەبێ، تەنانەت گەر هەر یەکێکیش لە ئێمە ئەوەمان سەلماندبێ کە پێویستە دیموکراسی ئاستی نەتەوەیی ببەزێنێ و شۆڕببێتەوە بۆ هەرێم و شارۆچکەکان، هەروەها هەڵبکشێ بەرەو دەوڵەتگەلێکی فیدراڵیی وەك ئەورووپا، کە لە دۆخی لەدایکبووندایە، یان هەڵکشێ بەرەو ڕێکخراوێکی نێودەوڵەتیی وەك نەتەوە یەکگرتووەکان. بیرۆکەی هاولاتیبوون تەنها بەند نیە بە بیرۆکەی دیموکراسییەوە، بەڵکو دژی ئەو بیرۆکەیە دەوەستێتەوە کاتێ هاولاتیان دەبنە ئەندامانی نەتەوەو پێناسی ناسیۆنالیستییان بەسەر پێناسیاندا، وەك دەنگدەران، زاڵدەبێ، بەتایبەتی کاتێ داوای چەك هەڵگرتنیان لێدەکرێ و بەوە ڕازی دەبن کە ئازادیەکانیان سنوردرا بکرێ. بەلام لەگەڵ ئەوەشدا ناتوانین وێنای سیستمێکی دیموکراسی بکەین کە پشتئەستور نەبێ بە پێناسەی گرووپی سیاسی یان لەدەرەوەی سەر زەمینێکی دیاریکراو بێ.

دواجار، ئایا دەکرێ باس لە هەڵبژاردنی ئازاد بکەین گەر دەسەلاتی فەرمانڕەواکان سنوردار نەبێ؟ پێویستە لە ڕێگەی هەڵبژاردنەکانەوە، بەتایبەتی لە ڕێگەی ڕێزگرتنی یاساگەلێکەوە کە سنوری پێڕەوکردنی دەسەلات ڕەنگرێژ دەکا، دەسەلاتەکان سنوردار بکرێن. سەلماندنی مافە بنەڕەتیەکان، کە لە یەك کاتدا دەسەلاتی دەوڵەت و دەسەلاتی کڵێسا و بنەماڵە و دامودەزگاکان سنوردار دەکا، دەستەبەری دیموکراسی دەکا. چونکە پێناسەی وردی دیموکراسی لەڕێگەی ڕوونکردنەوەی پێناسە سەرەتاییەکەیەوە پێویستی بە گردبوونەوەی نوێنەرایەتی هەموو بەرژەوەندییەکان و سنورداركردنی دەسەلات هەیە لە کۆمەڵگەی سیاسیدا.



ئایا ئەم سێ کۆڵەکەیەی دیموکراسی سێ ڕووی یەك پرنسیپی گشتیین؟ ڕەنگە کارێکی سروشتی بێ کە هاوشوناسی لەنێوان دیموکراسی و ئازادیدا ئەنجام بدەین، یان وردتر لەنێوان دیموکراسی و ئازادییەکاندا. بەلام ئەوەی مانای زیاترمان بۆ ئەم لێکدانەوەیە پێدەبەخشێ بریتیە لە گەڕانەوە بۆ پێناسەیەکی وردتر، چونکە بیرۆکەی ئازادی بیرۆکەی نوێنەرایەتیکردن و بیرۆکەی هاولاتیبوون لەخۆ ناگرێ. بەڵکو تەنها هۆکارێکە بۆ هەڵگرتنی دیاردەی ناچارکردن و بەزۆر پابەندکردن. ئاخاوتن دەربارەی ئازادی ئاخاوتنێکی ئاڵۆزو تەمومژاوییە. بۆیە ئێمە تەنها دەتوانین دەربارەی ئازادی لە هەڵبژاردنی فەرمانڕەواکاندا قسە بکەین، واتە هەڵبژاردنی ئەو کەسانەی کە دەسەلاتی سیاسی

دەگرنەدەست، چ جای ئەوەی هەندێ جار ڕەوایەتی پێڕەوکردنی زەبروزەنگ دەبەخشنە خۆیان.

لە ڕاستیدا سەربەخۆیی کۆڵەکەکانی دیموکراسی و تایبەتمەندیی هەریەکێکیان، بەجیا لەوانی تر، زۆر گەورەیە، بەجۆرێك دەتوانین دەربارەی ڕەهەندو مەرجەکانی دیموکراسی قسەبکەین وردتر لەوەی بتوانین دەربارەی توخمە پێکهێنەرەکانی بدوێین. چونکە لە یەك کاتدا دەشێ ئەو ڕەهەندانە پێکەوە بگونجێن و لەگەڵ یەکیشدا ناکۆك بن.

هاوڵاتیبوون پێویستی بە یەکێتی کۆمەڵایەتی هەیە، پێویستی بە هوشیاریی ئینتما هەیە، تەنها بۆ شار یان دەوڵەتی نیشتمانی یان دەوڵەتی فیدراڵی نا، بەڵکو پێویستی بە گردبوونەوەیەکی مێژوویی و کولتوریی هاوبەشیش هەیە، لەناو جوغزێکی سنووربەندا کە لە دەرەوەی دوژمن یان ڕکابەر یان هاوپەیمان ئامادەیی هەیە، هەرچەندە دەشێ ئەم هوشیارییە لەگەڵ گشتگیریی مافەکانی مرۆڤدا یەك نەیەتەوە. خەسڵەتی نوێنەرایەتیکردن ڕێگەخۆشدەکا بۆ هەندێ بابەت، ژێدەر (مەرجەعیەت) بۆ بەرژەوەندییە فەردییەکان دەدۆزێتەوە کە بەندن بە تێگەیشتنێکی میکانیکی بۆ دەسەڵاتی سیاسی کە ئامرازی خزمەتکردنی بەرژەوەندییە تایبەتەکانە. دواجار دەکرێ سەلماندنی مافە بنەڕەتیەکان لە خودی دیموکراسی بترازێ. ئایا بیرۆکەی مافی سروشتی ناگەڕێتەوە بۆ ژێدەرە ئاینییە مەسیحییەکان کە لەسەر بنەمای بیرۆکەیەك هاتبووە ئاراوە، کە خۆی لەخۆیدا دیموکراتی نەبوو. واتە بیرۆکەی ڕێزگرتن کە پێویستە لەئاست هەموو بوونەوەراندا هەمانبێ، لەئاست بوونەوەرە مرۆیی و بوونەوەرە سروشتییەکاندا، زیندوو بن یان بێگیان، بەو پێیەی هەموویان ئەفرێنراوی یەزدانن، هەریەکێکیان ڕۆڵ و فەرمانی خۆی جێبەجێ دەکا لە سیستمێکدا کە ئیرادەی خوا هێناویەتە بوونەوە.

تەنها پێکەوەگرێدانی خەسڵەتی نوێنەرایەتیکردن و هاوڵاتیبوون و سنووردارکردنی دەسەڵات لەڕێگەی مافە بنەڕەتیەکانەوە بەس نیە بۆ دامەزراندنی دیموکراسی لە هەموو ئان و ساتێکدا. بەو پێیەی پرنسیپێکی گشتی بۆ ئەو سێ توخمە لەئارادا نیە، دەگەینە ئەو دەرەنجامەی کە بەزۆر پێکەوەگرێدان و پێکەوەگونجاندنی ئەو سیانە کارێکی نێگەتیڤە: پێکهاتنێکی لەو جۆرە بەدەر لە پرنسیپی مەرکەزیی دەسەڵات و مۆرکی شەرعی دێتەئاراوە. ڕەتکردنەوەی خەسڵەتی جەوهەریی دەسەڵات مەرجی پێشوەختی دیموکراسییە. یاسای زۆرینە زۆر ڕوون و ئاشکرا گوزارشت لەم مەسەلەیە دەکا. چونکە ناتوانین یاسای زۆرینە وەك ئامرازێکی دیموکراسی ئەژمار بکەین تەنها ئەو کاتە نەبێ کە دان بەوەدا دەنێین: زۆرینە تەنها لە سەدا پەنجا زائید یەکی دەنگدەران پێکدێنێ، ڕێژەیەك کە هەمیشە گۆڕانی بەسەر دێ، لە هەمان کاتدا دەشێ چەندین "زۆرینەی فکریی" لەئارادا بن کە بەپێی کێشە هەڵپەسێردراوەکان گۆڕانی بەسەر دێ. یاسای زۆرینە پێچەوانەی دەسەڵاتی میللییە، چونکە دەشێ پەنابردن بۆ ئیرادەی زۆرینە ڕژێمی ستەمگەر بخاتەوە، یان لەبری ئەوەی دیموکراسی بنیات بنێ دەشێ لەناوی بەرێ.

## سێ چەشنی دیموکراسی:

لەنێو ئەم سیستمی خۆپارستنەدا شوێنێك نامێنێتەوە بۆ راگرتنی هاوسەنگیەکی ئایدیاڵ لەنێوان سێ رەهەندەکەی دیموکراسیدا. هەرگیز دیموکراسی ئایدیاڵ بوونی نیە کە پێچەوانەی مۆرکی تایبەتی ئەزموونە دیموکراتییەکان بێ. بەڵکو بەپێچەوانەوە سێ چەشنی سەرەکیی دیموکراسی هەن کە بەپێی زاڵبوونی یەکێك لەو رەهەندانەو شوێنگرتنی پێگەیەکی بالاتر بەبەراورد لەگەڵ دوانەکەی تر دێنەئاراوە. چەشنی یەکەم بایەخێکی مەرکەزی دەبەخشێتە "سنوردارکردنی دەسەلاتی دەوڵەت" لەرێگەی یاسایەکەوە یان لەرێگەی سەلماندنی مافە بنەرەتیەکانەوە. رەنگە بتوانم بڵێم ئەم چەشنەیان گەر بالاتریش نەبێ، ئەوە لەرووی مێژوییەوە لە هەردوو چەشنەکەی تر گرنگترە. ئەم تێگەیشتنە لیبراڵییە بۆ دیموکراسی بەئاسانی لەگەڵ خەسڵەتی نوێنەرایەتیکردنی سنورداری فەرمانرەواکاندا یەکدێتەوە، چونکە بینیمان چەند رژێمێکی لیبراڵ لە سەدەی نۆزدەدا سەرکەوتنیان بەدەستهێنا. هەمان تێگەیشتن مافە کۆمەڵایەتی و ئابوریەکان دەرهەق بە هێرشەکانی دەسەلاتی رەها دەپارێزێ، هەروەك لە نمونەی دێرینی بەریتانیای مەزن بەدیمان کرد.

بەڵام چەشنی دووەم بایەخێکی گەورە بە هاولاتیبوون دەدا، بە دەستورو بیرۆکە ئەخلاقی و ئاینییەکان کە یەکێتی کۆمەڵگاو کامڵبوونی کۆمەڵگا دابین دەکا، یاساکان لەسەر بنەمایەکی پتەو بنیات دەنێ. واتە دیموکراسی بەپێی ئیرادەی یەکسانی پێشدەکەوێ، زیاتر لەوەی بەپێی ئارەزووی ئازادی پێشبکەوێ.

باشترین نمونە کە لەگەڵ ئەم چەشنەدا بگونجێ ئەزمونی ولاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکایە، هەروەها فیکری ئەو کەسانەی کە بەڵگەیان بۆ ئەو ئەزمونە هێناوەتەوە، چونکە لەو نمونەیەدا زیاتر کرۆکی کۆمەڵایەتی بەدی دەکەین نەك سیاسی. تۆکڤێل لەو بارەیەوە ئەمریکا بە نمونەی سەرکەوتنی یەکسانی لەقەڵەم دەدا، کە چیتر مرۆڤی پلەبەند *Homo Hierarchicue* نامێنێ، ئەو مرۆڤەی، کە "لویس دیمۆن" ووتەنی، تایبەتە بە کۆمەڵگا گشتگیرەکان.

چەشنی سێیەم جەخت لەسەر خەسڵەتی نوێنەرایەتیکردنی کۆمەڵایەتیی فەرمانرەواکان دەکاتەوە، درز دەخاتە نێوان دوو سیستمەوە: دیموکراسی، کە بەرگری لە بەرژەوەندیی توێژەکان دەکا...، لەگەڵ ئۆلیگارشی، کە هەندێ جار پەیوەندیی بە حوکمی شانشینی و ئیمتیازەکانیەوە هەیە، هەندێ جاریش پەیوەندیی بە مولکایەتیی سەرمایەدارییەوە هەیە. لە مێژووی سیاسیی فەرەنسای سەدەی بیستەم، نەك سەردەمی شۆرشی فەرەنسیی مەزن، ئازادییە گشتییەکان پەیوەندییەکی بەهێزیان بە خەباتی کۆمەڵایەتییەوە هەبوو، زیاتر لە ولاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکاو بگرە بەریتانیای مەزنیش.

بەلام مەحاڵە بتوانین لێکچوون بسازێنین لەنێوان هیچ چەشنێکی دیموکراسی، لەنێوان هیچ یەکێك لە ئەزموونە ناسیۆنالیستەکان. لە سەردەمی شۆرشی فەرەنسیدا بیرۆکەی هاولاتیبوون زاڵتر بوو، مارکس هەمیشە رەخنەی لە فەرەنسییەکان دەگرت و پێیوابوو ئەوان هەمیشە توێژە سیاسییەکانیان لە توێژە کۆمەڵایەتییەکان پێ گرنگترە. "فرانسۆ فۆرییە" بەم دواییانە حوکمێکی لەو جۆرەی، وەك

مێژونوسـێك، پـشتڕاستكردەوە كاتـێ ئـەوەی سـەلماند كـە شۆڕشـی فەرەنـسی تـەنها وەك شۆڕشـێكی سیاسـی لێكدانـەوەی بـۆ دەكـرێ. واتـە شۆڕشـی فەرەنـسی، وەك لـە تێزەكـەی ئـالبێرت مـاتییێس-دا هـاتووە، بـە شۆڕشـی كۆمەڵایـەتی ئـەژمار نـاكرێ، كـە پێیوابـوو ڕووداوەكانی ئەو شۆڕشە لە سەدەی هەژدەدا یەكەمین قۆناغی سەركەوتنی توێژە میللیەكان بوو، كە دەشیا لەگەڵ شۆڕشی سۆڤێتیدا تا ئەوپـەڕی بـڕوا. بـەڵام بـەریتانیای مـەزن، بەپێـچەوانەوە، بایـەخێكی گـەورەی بەخـشییە نوێنەرایـەتیكردنی بەرژەوەندییـەكان و تیـۆرەی سوودگەری و ڕۆڵی دەستە ناوەندییەكان.

بـەڵام مـشتومڕی سیاسـی، كـە لـە نیـوەی دووەمـی سـەدەی بیـستەمدا بەڕێوەچـوو، مـشتومڕ بـوو لـەنێوان دوو مۆدێلـدا: {یەكـەم} دیموكراسـیی ئینگلیـزی، كـە چـەند بیریـارێكی لیبراڵی دیار خستبوویانە ڕوو، بەهۆی كزبوونی ئایدیۆلۆجیای كۆمەنیستیشەوە لە بەریتانیای مـەزن بـەهێزتر بـوو بـوو...، {دووەم} ژیـانی سیاسـیی فەرەنـسی، كـە بـەهۆی كاریگـەریی زۆری پارتی كۆمەنیستەوە لە ڕیزی چەپەكان و بزاوتی سەندیكاییدا، كەوتبووە ژێر كاریگەریی بیرۆكـەی ململانێـی چـینەكان، بـەڵام لـەناو راسـتڕەوەكاندا كـەوتبووە ژێـر كاریگـەریی بیرۆكـەی بەرەنگاربوونـەوەی دیكتاتۆریـەتی كۆمۆنیستی. هەرچی ئەمریكایە، لای خۆیەوە، بایـەخێكی تایبـەت و بـەردەوامی بەخـشیبووە چاودێریكردنی دەستوریەتی یاساكان و پرسی بـەرگریكردن لـە ئازادییـەكان، بـەڵام لـە هـەمان كاتـدا هوشـیاریی ئینتمـای لـەناو گیـانی دانیشتوانەكەیدا چاندبوو، كە لەژێر كاریگەریی زۆری بزوتنـەوەی كۆچـدا بـوون، ئینتمـا بـۆ كۆمەڵگەیـەكی خـاوەن ڕێـسای ئـەخلاقی و یاسایی تەرخانكراو بۆ بەهاگەلێكی دیاریكراو و چەشنێكی دیاریكراو لە ژیان. لێرەوە دەتوانین باس لـە هەرسـێ نمونەكـە بكـەین، ئینگلیـزی و ئـەمریكی و فەرەنـسی، وەك سـێ چەشـنی مێـژوویی نـا، بـەڵكو وەك چـەند تـوخمێكی مشتومڕی سیاسی كە دوای جەنگی جیهانی دووەم هاتنەئاراوە.

پاشـان هـەر سـێ چەشـنەكە (ئینگلیـزی و ئەمریكی و فەرەنسی) وەك یەك بایەخدارن. نابێ لەم دەرفەتەدا باس لە تایبەتمەندیی فەرەنسایی بكـەین، لـە كاتێكـدا نمونـەی فەرەنـسا كاریگەرییەكی زۆری هەبووە، چ لە ئەوروپا و چ لـە ئـەمریكا، لـە كاتێكـدا لاسـاییكردنەوەی چەشـنی دیموكراسـیی ئـەمریكا لـە چوارچێوەیەكی بەرتەسكدا بووە سەرباری ئەو دەسەڵاتە سیاسییەی كە وڵاتە یەكگرتووەكانی ئـەمریكا پراكتیـزەی كـردووە و سـەرباری بڵاوكردنەوەی فۆرمە دەستورییەكانی ئەمریكا لە بەشێكی ئەمریكای لاتینی و ئاسیا.

ڕەنگـە مـرۆڤ دەربـارەی لایەنـە بـەهێز و لاوازەكانی هەر سێ نمونەكە لە دۆخە مێژووییە جیاوازەكاندا پرسیار بكا، بەڵام باشتر وایە دان بـەوەدا بنـێین كـە نمونـەی دیمـوكراتی خـاوەنی هـیچ فـۆرمێكی سیاسـی نیـە، ئێمـەش لای خۆمانـەوە نـاتوانین بـاز بدەین بەسـەر ئـەم سـێ نمونەیـەدا كـە خـاڵی هاوبەشـیان تـوخمی پێكهێنـەری هاوبەشـیان تێدایـە، هەرچـەندە هەریەكـەیان بەشـێوازی جیـاواز بایـەخ بـەو توخمانـە دەدەن. ئـەو دۆخـە جیـاوازیی گـەورە لـەنێوان هەریـەك لـە دیموكراسـیی لیـبراڵ، دیموكراسـیی دەسـتوری و دیموكراسـیی ململانێخـوازدا دروسـتدەكا، هەرچـەندە

دەرفەتێکیش دێنێتە ئاراوە بۆ دامەزراندنی چەندین نمونەی مێژوویی سەبارەت بە دیموکراسی. سنوری ئەم بوارە بەگوێرەی پەیوەندییەکانی نێوان مافی مرۆڤو هاولاتیبوونو نوێنەرایەتیکردنی بەرژەوەندییە کۆمەلایەتییەکان دیاریدەکرێ. کەواتە، بوارێکە بۆ دروستکردنی رایەڵ لەنێوان تاکە پرنسیپێکی گشتگیرو بەرژەوەندییە فەردییەکانو کۆمەڵی سیاسیدا. چونکە چەندین خاڵی هاوبەش لەنیوان هەرسێ رەهەندی ئەخلاقیو کۆمەلایەتیو نیشتمانی (یان سیاسی)دا هەیە. ئەمەش وادەکا دیموکراسی پێچەوانەی سیاسەتی پەتی بێ، پێچەوانەی سەربەخۆیی کاری ناوخۆی سیستمی سیاسی بێ.

## جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان:

ئەم تێگەیشتنەمان بۆ دیموکراسی جیاوازە لەو تێگەیشتنەی کە دەبێتە بەشێکی دانەبراو لە سیستمی سیاسیو دامودەزگایی، ئەو مۆدێلەی کە لە پێناسەکەی "رۆبرت داهڵ"دا بۆ دیموکراسی بەشێوەیەکی تەقلیدی گوزارشتی لێکراوە: فەرمانڕەواییەکی دەستەجەمعی لەسەر بنەمای هەڵبژاردن (پۆلیارشیی هەڵبژێردراو)[6]. وشەی دووەمی ئەم پێناسەیە مشتومڕ هەڵناگرێ، هەرچەندە زۆربەی ئەو رژێمانەی کە جیاکردنەوەی دەسەلاتەکان دەسەلمێنن، لەرێگەی هەڵبژاردنەوە ئەو کەسانە دەستنیشان ناکەن کە دەسەلاتی یاسایی (دادوەریی) پراکتیزەدەکەن، بەڵام دەسەلاتی جێبەجێکردن لەرێگەی دەسەلاتی یاسادانانەوە هەڵدەبژێرن، ئەو دۆخەی کە لە رژێمە لیبراڵەکاندا بەدیدەکرێ. بەڕای من ئەژمارکردنی مەسەلەی جیاکردنەوەی دەسەلاتەکان، وەك رەگەزی سەرەکیی دیموکراسی، جۆرێك لە پەرگیریی تێدایە، چونکە ئەم فۆرمەی رێکخستنی دەسەلاتەکان تێکەلدەکا بە سنوردارکردنی دەسەلات لەرێگەی مافە بنەرەتیەکانەوە، لە کاتێکدا پێویستە لەرێگەی یاساگەلێکی دەستورییەوە بەرگری لە خودی ئەو مافانە بکرێو دادوەرە یاساناسو سەربەخۆکان ئەو کارە ئەنجام بدەن. جیاکردنەوەی هەردوو دەسەلاتی یاسادانانو جێبەجێکردن دەرەنجامی باشو ئالۆزی لێدەکەوێتەوە، کە دەبێتە هۆی مشتومڕی نێوان ئەوانەی بانگەشە بۆ سیستمی پارلەمانی دەکەن..، بەهەمان ئەو ئەندازەیە جیاکردنەوەی هەردوو دەسەلاتی جێبەجێکردنو یاسادانان هەڵگری بایەخی خۆیەتی. جیاکارییەکی لەمجۆرە هێزێکی تایبەتی بەخشیوەتە دیموکراسیی ئەمریکی، بایەخێکی هاوشێوەشی لە فەرەنسا هەیە، ئەو ولاتەی کە بەهۆی مێژووە سیاسیو ئایدیۆلۆجییەکەیەوە ئامادە نەبوو ئەنجومەنێکی دەستوری لە پێکەوەگونجانی نێوان یاساکانو پرنسیپە گشتییەکانی دەستور بکۆڵێتەوە. چونکە ئەو پرنسیپانە بەشێوەیەك رێکخراون کە بچنە خزمەتی بەرگریکردن لە مافەکانی مرۆڤ، واتە ناکرێ قسە لە جیاکردنەوەی دەسەلاتەکان بکرێ، لە کاتێکدا لەبری ئەوەی پەیوەندیی نێوان نێوەندەکانی بڕیار لە کۆمەڵگەی سیاسیدا رێکبخرێ باس لە بەریەککەوتنی نێوان دەوڵەتو مافە بنەرەتییەکان دەکرێ. واتە بەرلەوەی مەسەلە مەسەلەی جیاکردنەوەی دەسەلاتەکان بێ مەسەلەی سنوردارکردنیانە.

له سەرەتای مێژووی دیموکراسیدا، بەپلەی یەکەم، باس لە جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان کراوە بەمەبەستی سنوردارکردنی دیموکراسیو سنوردارکردنی دەسەڵاتی زۆرینە، هەروەها لەپێناو پاراستنی بەرژەوەندییەکانی چینی ئۆرستوکرات. لە فیکری مۆنتیسکیۆ، یان بەگوێرەی بەرژەوەندییەکانی دەستەبژێری ڕۆشنگەر، باس لەم بابەتە کراوە، هەروەك لە دۆخی سەرەتای کۆماری ئەمریکیدا بەدی دەکرێ. بەپێچەوانەوە لە وڵاتە پاشکۆو تازە گەشەکردووەکاندا، کە لەژێر کاریگەریی دوالیزمی ئابوری لەلایەكو جیاوازیی کۆمەڵایەتیو لۆجیکیدان لەلایەکی ترەوە، دوو جیهانی تەواو جیاواز هاتنەئاراوە، کە لە ئەمریکای لاتین ناویان نرا جیهانی ئاخاوتنو جیهانی خوێن. ڕژێمە نیشتمانییە میللییەکان هەوڵیانداوە بۆ پڕکردنەوەی بۆشایی نێوان ئەو دوو جیهانە، هەرچەندە رکابەرانی نێوان هەردوو جیهانەکە هەوڵی هێشتنەوەی ئەو دوو جیهانەیان داوە. پارلەمانەکان بەرگرییان لە بەرژەوەندیی چینە ئۆلیگارشییەکان کردووە، تا ئەو کاتەی بزاوتە میللییەکان ڕژێمی سیاسییان بەرفراوان کردووە بەجۆرێك ژمارەیەکی زۆری شارنشینانو ژمارەیەکی کەمی گوندنشینەکان لەخۆبگرێ. بگرە بزاوتە سیاسییە شۆڕشگێڕەکان هەڵگری خواستی دیموکراتی بوون، ژمارەیەك لە ڕژێمەکانی پاش شۆڕش سەرەتا هەوڵی پێڕەوکردنی دیموکراسییان داوە، بەڵام دواتر دیموکراسییان سەرکوت کردووە. تەنانەت کات هەبووە بزاوتە شۆڕشگێڕەکان دەسەڵاتیان دامەزراندووە، پاشان هەر خۆیان لەناویان بردووە. "فەرهاد خەسرۆ کاڤار" باسی لەم بابەتە کردووە سەبارەت بە شۆڕشی ئێرانی لە ساڵی 1979دا، ئەو شۆڕشەی کە سەرەتا بریتی بوو لە بزوتنەوەیەکی کۆمەڵایەتی بۆ رزگاریی میللی، بەڵام پاشان وەرچەرخاو بووە دیکتاتۆریەتێکی ئاینی، ئەو وەرچەرخانە بەخێراییەك رووی دا کە هاوشێوەی وەرچەرخانی شۆڕشی ئۆکتۆبەری روسیای سۆڤێتی بوو بەرەو دیکتاتۆریەتی تاك حزبی. شۆڕش ئاراستەی بزوتنەوە دیموکراتەکان بەرەو ڕژێمی دژ بە دیموکراسی دەبا. بەڵام ئێستا هەست بە ئاسودەیی زیاتر دەکەین لە جیهانێکدا کە خەریك بوو بچێتە ژێر رکێفی ڕژێمگەلێکی تۆتالیتارییەوە پاش زنجیرەیەك شۆڕش. هەرچەندە ئەو ڕژێمانە روخان، بەڵام خەریکە ئەوە لەیاد دەکەین کە ئەو بزاوتە شۆڕشگێڕانە خۆیان بە نوێنەری بەرژەوەندیی زۆرینەی دانیشتوان زانیوە، بگرە خاوەن ئیرادەی لەناوبردنی ڕژێمە شانشینە رەهاکان بوون، ئومێدی رزگاربوونیان بەخشیوەتە کەسانێكو پەیمانیان داوەتێ کە لە کەسانی ملکەچی سەرکوتکردنەوە ببنە هاوڵاتی. بەپێچەوانەوە دەبینین جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکانو زاڵکردنی تێگەیشتنی دامودەزگایی پەتی بەسەر دیموکراسیدا..، دەبنە هۆی دروستکردنی پەردەیەك بۆ کۆنترۆڵکردنی بازاڕو تۆخکردنەوەی جیاوازیی نێوان مرۆڤەکان لەڕێگەی پێڕەوکردنی ڕێساگەلێکی سیاسیو چەند بنەمایەکی یاساییەوە، وەك ئامرازی پەرتکردنو لاوازکردنی نەیارانی دەسەڵاتی ئۆلیگارشی.

جیاکردنەوەی تەواوی دەسەڵاتەکان لەیەکتری مانای لەناوچوونی دیموکراسی

دەگەیەنێ، مانای لەدەستچوونی سیستمی سیاسی و داخران و نەمانی کاریگەرییەکانی دەگەیەنێ لەئاست دەوڵەت و کۆمەڵگەی مەدەنیدا. سەرەتا پێناسەی دیموکراسی بەوە دەکرا کە گوزارشت لە سەروەریی میللی دەکا. بەڵام ئەم سەروەرییە چی بەسەر دێ کاتێ دەسەڵاتەکان سەربەخۆیی تەواو لەیەکتری وەردەگرن؟ گەر بەبەردەوامی گۆڕانکاری لە یاسادا ئەنجام نەدرێ و هەموارنەکرێ، گەر دادوەرەکان هەمیشە حساب بۆ رای گشتی نەکەن، ئیدی یاسا زۆر بەخێرایی دەبێتە ئامرازی بەرگریکردن لە بەرژەوەندیی کەسە بەهێزەکان، بەهێزترینی ناو بەهێزەکان. بۆیە دەبێ دەسەڵاتی یاسادانان کاریگەری لەسەر دەسەلاتی جێبەجێکردن دابنێ، ئەو ئەرکەی کە لەرێگەی حزبەکانەوە ئەنجام دەدرێ. بەڵام بیری لیبراڵ، بەپێچەوانەوە، بەرەو تۆخکردنەوەی بیرۆکەی جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان هەنگاو دەنێ. بۆ نمونە "مایکڵ ڤالزەر" پێیوایە پێویستە بوارەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی سەربەخۆ بن، چونکە هەر یەکێك لەو بوارانە سوود و بەرژەوەندییەکی دیاریکراو لەخۆدەگرێ، هەمووشیان پێکەوە ژمارەیەکە هاوتای "بازنەکانی دادپەروەریی" پێکدێنن. ئازادیی تاکەکان پشتئەستوورە بەم جیاکارییەی نێوان سیستمە فەرعییەکان. بەڵام پراکتیزەکردن دوورە لەم جیاکارییە پەرگیرەی نێوان دەسەڵاتەکان، بەتایبەتی کاتێ دەوڵەت کۆمەڵگا دەجوڵێنێ، جا ئیتر لەپێناو گەشەکردندا بێ یان لەپێناو شۆڕش و یەکێتی نیشتمانیدا بێ. دیموکراسی بە جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان ناناسرێتەوە، بەڵکو بەسروشتی پەیوەندیی نێوان کۆمەڵگەی مەدەنی و کۆمەڵگەی سیاسی و دەوڵەت. گەر دەسەڵات تەنها لەسەرەوە بۆ خوارەوە پێڕەوبکرێ مانای نەمانی دیموکراسی دەگەیەنێ، لە کاتێکدا ئێمە ئاوەڵناوی دیموکرات بەو کۆمەڵگەیە دەبەخشین کە بکەرە کۆمەڵایەتییەکان ئاراستەی نوێنەرە سیاسییەکان دەکەن تا ئەوانیش، لای خۆیانەوە، چاودێری دەوڵەت بکەن. ئیدی دەبێ پرنسیپی سەروەریی میللی بخەینە پێش پرنسیپی جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان، چونکە نابێ ئاستی رێسا سیاسییەکان لە ئاستی بکەرە کۆمەڵایەتییەکان جیابکرێتەوە. بەڵام دیوی پێچەوانەی ئەم بیرۆکە گشتییە بریتییە لەو راستییەی کە دەڵێ: هەروەك چۆن لەسەر ئاستی سیاسی توخمێکی دەسەڵاتی ئۆتۆنۆم (سەربەخۆ)، لەئاست ئیرادەی دیللیدا لەئارادایە، پێویستە هەمان توخم لەسەر ئاستی دەوڵەتیش لەئارادا بێ. ئەو توخمە لەسەر ئاستی دەوڵەت بریتییە لە سەربەخۆیی و پیشەیی بوونی فەرمانبەرەکان، بەڵام لەسەر ئاستی رژێمی سیاسی بریتییە لە یاسا و میکانیزمی چاودێریکردنی دەستووری و شەرعیەتی یاساکان. ئەم پێکەوەگرێدان و یەکخستنە لەنێوان داواکاریی کۆمەڵایەتیی زۆرینە و پرنسیپەکانی سەربەخۆبووندا باشترە لە بەسیاسیکردنی ئیرادە و بەسیاسیکردنی هێزە کۆمەڵایەتیە چالاکەکان کە بە شێوەیەکی پرۆفیشناڵ دزەدەخاتە نێو جەستەی دەسەڵاتی سیاسی، یان دەسەڵاتی حیزبۆکراتی[7].

ئێستا دەبێ دوو شت، کە پێشتر پێناسەمان کردن، لێکتر جیابکەینەوە: {یەکەم} بنەمای دیموکراسی بریتییە لە سنورداركردنی دەسەڵاتی دەوڵەت، لەکاتێکدا ئەوانەی بەرگرییان لە ئازادیی نەرێخواز (نێگەتیڤ)

کـــردووە لەســـەر هـــەقن بەبـــەراورد لەگـــەڵ کەسـانێکدا کـە ململانێیـان لـەپێناو ئازادییـە ئەرێخواز (پۆزەتیڤ)ەکانـدا کـردووە بـەجۆرێك کۆڵەکـــە دامودەزگاییـــەکانی دیموکراســـییان لـەناوبردووە. {دووەم} تـەنها ئـەم هەڵوێـستە لیبراڵـــە بـــەس نییـــە بـــۆ ئـــەوەی ئاوەڵنـــاوی دیمـوکرات بخەینـە پـاڵ ئـەو رژێمانـەی کـە لەرێگـــەی دەســـەڵاتی ئۆلیگارشـــییەوە یـــان لەرێگـــــەی داب و نەریتـــــە لۆکاڵەکانـــــەوە سـنورداردەکرێن. چـونکە سـەلماندنی مافـە بنەڕەتیـەکان دەبێتـە هەڵوێـستێکی بـەتاڵ گـەر نەبێتـەهۆی دەستەبەرکردنی ئاسایش و ئارامی بۆ هەموان، گەر نەبێتەهۆی گشتاندنی زەمانەتە شەرعیەکان و بەکارهێنانی دەسەڵاتی دەوڵەت بۆ پاراســـتنی لاوازەکـــان. ئـــەم دۆخـــە واتـــە دەستەبەرکردنی مافی ژیان بۆ هەموان، تەنانەت لـەو وڵاتانەشـدا کـە لـە دۆخـی هـەژاری و پاشـکۆیەتیدا دەژیـن، بـەڵام لـە زۆر شـوێنی جیهاندا تاوەکو ئێستا نەهاتۆتەدی، بەتایبەتی لـە ئـەفریقیا. کـاری دیمـوکراتی لـە رۆژگـاری ئەمڕۆمانـدا پـشتئەستورە بـە پێکەوەگرێـدانی توندی نێوان دیموکراسی نەرێخواز، کە خەڵکی لە ستەمی رمێنەری دەسەڵات دەپارێزێ، لەگەڵ دیموکراسیی ئەرێخواز، کە بەشداری بەزۆرترین خەڵك دەکا سەبارەت بە چاودێریکردنی ژیانی تایبەتی زۆرترین خەڵك.

ســـــەردەمانێکە نازنـــــاوی دیمـــــوکراتی دەخەینـەپاڵ ئـەو رژێمـەی کـە دەوڵـەت تیایـدا دەستوەردەداتە کاروباری ئابوری و کۆمەڵایـەتی لــەپێناو بەرتەســـککردنەوەی جیاوازییـــەکان و دابینکردنی هاوکاریی پەروەردەیی و پزیشکی و ئابوری بۆ هەموان. چیتر ناتوانین ئەو پێناسەیە بەپێناسـەیەکی تـەواو لەقەڵـەم بـدەین، چـونکە پێویستە دەستێوەردانی دەوڵەت تەنها ئامرازێك بێ بۆ خزمـەتکردنی مەبەسـتێکی سـەرەکی کـە بریتیـە لـە بەخـشینی توانـای زیـاتر بـە هـەر مرۆڤێك تا خۆی دەستوەرداتە کاروباری ژیانی خـۆی. ئـەم تواناپەیداکردنـە، هـەر لـەخۆڕاو بەخۆڕسـك، زادەی دەوڵەمەنـدبوونی بەکۆمـەڵ نیـە، بـەڵکو بەهایەکـە مـرۆڤ فێـری دەبـێ و وەریـــدەگرێ، یـــان لەرێگـــەی هێـــزەوە یـــان لەرێگەی دانوستانەوە، یان لەرێگەی شۆڕشەوە یـــان لەرێگـــەی ریفۆرمـــەوە. بـــەڵام نابـــێ رەخنەگرتنمان لـە دەوڵـەتی پـاش شۆڕش خاڵی جەوهـــەریی مەســـەلەکەمان لەبیربەرێتـــەوە کـــە بریتیـە لـە {خـەبات} بـۆ فراوانکردنـی ئـازادیی هـــەر یـــەکێکمان و ئاراســـتەکردنی سیاســـەت بـــەجۆرێك نوێنەرایـــەتی زۆرتـــرین داخـــوازیی کۆمەڵایەتی بکا.

سـەرەتا بیرۆکـەی دیموکراسـی وابەسـتەی تێگەیـشتنی دیمـوکراتی بـوو بـۆ دەوڵـەت و لـــەدایکبوونی دەوڵـــەتێکی نەتـــەوەیی کـــە ئـــەقڵ حـــوکمی بکـــا. ئـــەو تێگەیـــشتنە دژی رژێمـــە شانـــشینییە رەهاکـــان هاتـــەگۆڕێ و تـوانی شکـست بـەو جـۆرە رژێمانـە بێنـێ لـە هەریـــەك لـــە ئینگلتـــەرا و هۆڵەنـــدا، پاشـــان لـــە ئـەمریکا و فەرەنـسا. نوخبەیـەکی لیـبراڵ، کـە پێکهـــاتبوو لـــــە چـــــەند هاوڵاتییـــــەکی رۆشنگەر، خۆیان یەکسان کردەوە بەم چەشنە دەســـەڵاتە کۆمارییـــە...، ئیـــدی کۆمـــەڵانی خەڵکییان لـە دەسـەڵاتی کۆماری دوورخستەوە پاش ئەوەی بە نەزان و نائارام ئەژماریان کردن. بـەڵام هێنـدەی نـەبرد گـەل ئـەو نوخبەیـەی لـە دەسەڵات دەرکرد، ئەمریکا بەر لە فەرەنسا ئەو نوخبەیـەی وەلانـا، بـەدیاریکراویش بـەر لـە ئینگلتـەرا کـە لـە چاکسازییەکانی هەڵبژاردنـدا،

لەنێوان ساڵانی 1832و 1867دا، لە سەردەمێکدا کە بەچاخی زێڕین ناسرا، ئەو کارەی کرد.

ئیدی بەرلەوەی بەرگریکردن لە بەرژەوەندییە تایبەتەکان جوغزی دنیای کار ببەزێنێ و باڵ بکێشێ بەسەر لایەنەکانی ژیانی کۆمەڵایەتیدا، کە بەهۆی بەرخۆری و بەرهەمێنانی جەماوەرییەوە گۆڕانیان بەسەر هات، حزب و بزاوتە چینایەتیەکان جێگەی نوخبە سیاسییەکانیان گرتەوە. ئیتر بۆشایی نێوان بواری دەوڵەت و بواری هاوڵاتیان زیاتر لێکترازا، هاوڵاتیان بەرەو فەردانیەتی زیاترو بەرخۆری و مەسرەفکردن هەنگاویان نا. وردە.. وردە دیموکراسی کۆتایی پێهات و بووە جۆرێکی سەربەخۆی رێکخستنی ژیانی سیاسی کە ناکرێ یەکسان بکرێتەوە بە دەوڵەت و داخوازیی بەرخۆرو مەسرەفگەرەکان. بگرە ئەو سەربەخۆییە بەجۆرێك تەشەنەی کرد کە زۆرجار ژیانی سیاسیی کردە ژیانێکی نامۆ، ژیانی سیاسیی، لە یەك کاتدا، لە کێشەکانی دەوڵەت و داواکانی کۆمەڵگەی مەدەنی دوورخستەوە. هاوکات لە وڵاتانێکی تردا بیرۆکەی کۆماریخوازی فۆرمی نوێی وەرگرت، سترێسێکی پڕ لە نەفەسی داواکاریی بەخشییە ئەقلانیەتی سیاسی، بگرە هەندێ جار نەفەسی شۆڕشگێڕانەی بەخشییە دۆزەکە کە لەڕێگەی سۆشیالیزمی چەپەوە کە باوەڕی بە دیموکراسیی پیشەسازی نەبوو، وردتر لەڕێگەی باڵی شۆڕشگێڕو بۆلشەفیکی سۆشیالیزمی دیموکراتی روسی و ئەڵمانییەوە. ئەم رێچکە کۆماریخوازە شۆڕشگێڕە زۆر بەتوندی پشتی لە دیموکراسی وەرگێڕا بە ئەندازەیەك مەحاڵە چیتر نازناوی دیموکرات بخرێتەپاڵ ئەو رژێمانەی کە لە هەناوی شۆڕشی کۆمۆنیستی و شۆڕشە هاوشێوەکانی جیهانی سێیەمەوە هاتنەدەرێ، بەڕادەیەك ناتوانرێ پێناسەی دیموکراسی لە رۆژگاری ئەمڕۆدا بکرێ بەوەی بریتیە لە رێکخستنی ئەو سێ توخمەی کە پێشتر روونمان کردنەوە.

## سەرنجێك دەربارەی جۆن راوڵز:

ئامادەنەبوونی پرنسیپێکی مەرکەزی بۆ پێناسەی دیموکراسی –واتە پێناسەی داپەروەری– بەرەنجامێکی لۆجیکیی جیاکردنەوەی سیاسەتە لە ئاین، بەو پێیەی ئەو جیاکارییە تازەگەری لە بواری سیاسەتدا دیاریدەکا. عەلمانیەت ناچارمان دەکا بەدوای چەند پرنسیپێکدا بگەڕێین بۆ رێکخستنی کۆمەڵگا کە وابەستەی لێکدانەوەی فەلسەفی و ئەخلاقی نیە بۆ کاروباری کۆمەڵگا تەنانەت گەر لەگەڵ ئەو لێکدانەوەیەشدا کۆك بێ. "جۆن راوڵز" ئاماژەی بەوە داوە کە ئەم بابەتە خاڵی پێویست و دەسپێکی هەر بیرکردنەوەیەکە دەربارەی مافەکان. لەو خاڵەوە دەرەنجامێکی چنگ کەوت بەوەی پێویستە تیۆرەی مافەکان لەسەر بنەماگەلێکی سیاسی دابمەزرێ نەك فەلسەفی. لێرەوە گوزارشت لە دادپەروەری دەکرێ بەوەی بریتیە لە گەڕاندنەوەی هەق بۆ خاوەن هەق. ئەم جۆرە لە دادپەروەری ناکرێ پەی پێ ببرێ مەگەر تەنها وەك رێکخستنی دوو پرنسیپ، کە جگە لەوەی سەربەخۆن، خاوەن دوو ئاراستەی پێچەوانەشن: ئازادی و یەکسانی. "راوڵز" لەوەڵامدا پێی وایە پێویستە پرنسیپی ئازادی لەبەرتر بێ تا یەکسانی، بەڵام پێویستە بکرێتەوە هاوتای یەکسانی بەوەی کە ئازادی دو رووی هەیە: یەکەم، یەکسانی

لەپێناو ڕەخساندنی دەرفەتی {ئازادانە} بۆ هەموو کەس. دووەم، ئاراستەکردنی ئازادی بەرەو نەهێشتنی جیاوازییەکان {بەمانای بەخشینی ئازادی بەهەموان بەشێوەیەکی یەکسان}.

لە ڕاستیدا بۆ تێگەیشتن لە ئازادی پێویستە ئازادی لە یەکسانی مارەبکرێ. من لێرەدا کارێکی لەو جۆرە دەکەم کاتێ جیاوازی لەنێوان سێ ڕەهەندی دیموکراسیدا دەکەم: ڕێزگرتنی مافە بنەڕەتیەکان، ڕێزگرتنێك کە ناکرێ بترازێ لە ئازادیو هاولاتیبوونو شێوازی نوێنەرایەتیکردن. بەلام ئەم بیرۆکانە، هەروەك "راولز" پێی وایە، پەیوەست نین بە هەمان ئاستی نوێنەرایەتیکردنی ژیانی کۆمەلایەتییەوە. چونکە لێك مارەکردنی ئازادیو یەکسانی، لای وی، یەکسانە بەکۆکردنەوەی نێوان دیدگای بکەرەکانو ڕوانگەی سیاسیی کۆمەلگا. خەلکانێك بەشێوەیەکی ئەقلانی دوای بەرژەوەندییەکانیان دەکەون، ئەمە بۆ ئەوان خێرە، هەربۆیە هاریکاری یەکتر دەکەنو کۆمەلگا پێکدێنن. ئەم تێگەیشتنە دەچێتە نێوکۆی ڕاستەوخۆی بیرۆکەی پەیمانیی کۆمەلایەتییەوە کە "راولز" لە کتێبی (تیۆرەی دادپەروەری)دا وەك نمونە دەیهێنێتەوە. کەواتە هەر تاکێك دوو پێناسەی هەیە: لەلایەکەوە بوونەوەرێکی ئابورییە {کە بەدوای بەرژەوەندیدا دەگەڕێ}، لەلایەکیشەوە بوونەوەرێکی سیاسییە کە خاوەنی کەسایەتییەکی ڕەمزییەو (خاوەن هەستێکی دیاریکراوە سەبارەت بە مانای عەدالەتو تێگەیشتن لە خێری گشتی)، دواجار خاوەنی هوشیارییە سەبارەت بە پێویستیەکانی ژیانی کۆمەلایەتی. ئەو بیرۆکەیەی کە لەم کتێبەدا دەیخەمە ڕوو لە تێگەیشتنی "راولز" جیادەبێتەوە. بیرۆکەی من زیاتر جەخت لەسەر بواری کۆمەلایەتی دەکاتەوە تا بواری سیاسی، واتە تاکی پابەندو گروپی ملکەچ بۆ پەیوەندییە کۆمەلایەتیەکان لە دەرەوەی یەکسانی دەگۆڕێ بۆ تاکی ئازادو یەکسان بەوانی تر. کاری کۆمەلایەتی هەولێك نیە تا خاوەن مافەکان مافی خۆیان وەرگرنەوە، بەلکو هەندێ جار هەولێکە بۆ بەهێزکردنی پێگەی فەرمانڕەواکان، هەندێ جاریش جۆرێکە لە پەنابردن بۆ بیرۆکەی یەکسانی لەسەر زاری خەلکی تا وەك چەکێك دژی نایەکسانی بەکار بهێنرێ. بەو پێیەی فۆرمەکانی ڕێکخستنی کۆمەلایەتی پلەبەندن، دادپەروەری پێویستی بە دژایەتیکردنی ئەو پلەبەندییە هەیە، لەوێدا پشتئەستورە بە پرنسیپێکی ئەخلاقیی "سروشتی" کە دەکرێ ناوی بنێین پرنسیپی یەکسانی. بیرۆکەی دادپەروەری، هەروەك بیرۆکەی دیموکراسی، شتێك دەگرێتەخۆی کە ناوم نا پەناگا. واتە دیموکراسی جۆرێك لە ناکۆکی لەخۆدەگرێ، بەجۆرێك کە لەڕێگەی ئیجماعەوە نایەتە دی، بەلکو لەڕێگەی دانوستانو سازشەوە دێتەبوون، ئەو دانوستانە هەمیشە لەسەر مێزی گفتوگۆی هێزە کۆمەلایەتییە چالاکەکانو لەڕێگەی هەموارکردنی مافەکانەوە گوزارشتیان لێدەکرێ. لە سەردەمی تۆکفێل-ەوە ئەوە دەزانین کە ڕەهەندی ئەخلاقیی لە دیدی "راولز"دا ڕەهەندێکی جەوهەرییە سەبارەت بە کۆمەلگەی ئەمریکی، کە تیایدا ئەو ڕەهەندە تێکەل بە چەشنێکی دیاریکراوی تاکگەریی (فەردانیەت) دەبێو لە پرۆژەی ئازاد-دا گوزارشتێکی ئابوریی لێکراوە. واتە بەرژەوەندیو دادپەروەری یەکتری تەواو دەکەن، هەروەك چۆن ئابوریو ئاین کارێکی لەوجۆرە دەکەن. بەلام مێژوی دیموکراسی کە

هەمیشە مێژووی خۆسازکردن و چاکسازی بووە، ناچارمان دەکا مەسەلەی یەکسانیی نێوان دەرفەتەکان و پێکەوەگونجاندنی تاکگەری و یەکێتی کۆمەڵایەتی بگۆڕین بە مەسەلەی نوێنەرایەتیکردن و فرەیی لە بەرژەوەندیەکاندا. چونکە پرنسیپی فرە بەهایی لە کۆمەڵگەی مۆدێرندا، پرنسیپێك کە "راوڵز" دەیهێنێتەوە یادمان، پێویستە بەشێوەیەکی ئەوتۆ ئاراستەبکرێ کە دەرەنجامی کۆمەڵایەتی بخاتەوە. ئەوەش پێویست دەکا دواجار بگەڕێینەوە بۆ دادپەروەری وەك دۆخی هاوسەنگی راگرتن و کۆك بوون. بۆیە بەڕای من مەحاڵە ئەو "پێگە رەسەن"ە بکرێتە دەروازە کە راوڵز دیاریی کردووە، ئەو پێگەیەی کە لێمان دەخوازێ بەرژەوەندی و بەها و ئامانجی تاکەکان بخەینە نێو دوو کەوانەوە، چونکە ئەو تاکانە بەپلەی یەکەم هاوڵاتی نین، بەڵکو هێزگەلێکی کۆمەڵایەتی چالاکن. ئەو ژاوەژاو و هاوارهاوارەی کە لە مێژوی هەموو کۆمەڵگەکاندا هەن، نامۆ نین بەو دۆخەی کە پێویستە دوور لە جیاوازی و ململانێ کۆمەڵایەتیەکان و بزاوتە کولتوریەکان پێناسە بکرێ. چونکە پێویست ناکا رژێمی سیاسی لە رایەڵە کۆمەڵایەتیەکان بترازێندرێن، ئەو راستییەی کە "فرانسوا تێری" خستییەوە یادمان لە کاتی پێشکەشکردنی سیمیناری "تاك و دادپەروەریی کۆمەڵایەتی" کە لە فەرەنسا بەمەبەستی لێکۆڵینەوە لە هزری "راوڵز" سازدرا.

هەر تیۆرەیەك دەربارەی دیموکراسی و دادپەروەری، هەروەك راوڵز پێشنیاری کردووە، پێویستە سیاسی بێ. بەڵام ناکرێ تیۆرەکان دەربارەی کاروباری سیاسی بەجیا لە شیکردنەوەی رایەڵە کۆمەڵایەتیەکان و کاری دەستەجەمعی تەماشا بکرێن، کە هەڵگری بەهای کولتورین و دەرهاویشتەی ململانێی کۆمەڵایەتین. چونکە هەمیشە دیموکراسی چوارچێوەگەلێکی نێوەند دادەمەزرێنێ، کە بارکراوە بە ژمارەیەك داواکاری لەنێوان دەستەڵاتدا، کە بەشێوەیەکی نایەکسان دابەشدەکرێ، لەگەڵ پەنابردن بۆ مافی سروشتی کە لە یەك کاتدا دەبێتە بناغەی یەکسانی و ئیرادەی ئازادی.

## پەراوێزەکان:

(1) بەگرنگ وەرگرتنی مافەکان (*Ronald Dorkin, Taking Rights Seriously*)، ل199.

(2) *Rawls, Une theorie de la justice*

(3) *Politeia* لە دەقەکەدا بەزمانی یۆنانی هاتووە.

(4) *Phronesis* لە دەقەکەدا بەزمانی لاتینی هاتووە.

(5) چەند وتارێك دەربارەی سیاسەت (*Claude Le Fort, Essais sur lr Politique*)، ل27.

(6) *Polyaechie elective*

(7) *Partitocrazia* لە دەقەکەدا بە ئیتالی هاتووە، واتە حوکمی حزب یان حزبۆکراتی.

## سەرچاوە:

آلان تورین، ماهي الديموقراطية؟ حكم الأكثرية أم ضمانات الأقلية. ت: حسن قبيسي. ط1، بيروت: دار الساقي،1995، ص23-51.

بەبەراورد لەگەڵ چاپێکی تری هەمان کتێبدا، لە وەرگێڕانی: عبود کاسوحة. دمشق: منشورات وزارة الثقافة، 2000، ص37-61.

# مافەکانی مرۆڤ

حوسین بشیریە

لە فارسییەوە: ئاران

چــەمکی مافــەکانی مــرۆڤ وەك کۆمەڵــە یاسایەك کە مرۆڤەکان بەحوکمی مرۆڤبوونی خۆیــان خــاوەنین، لەســەدەی حەڤدەهەمــدا بڵاوبۆوە و بووە جێگری چەمکی کۆنتری "مافە سروشتیەکان" کە مرۆڤەکان بەحوکمی یاسای سروشتی خاوەنین. چەمکی مافەکانی مرۆڤ بە مانایــەکی فــروانتر لــە مافــە سروشــتیەکان بەکارهات، بۆئەوەی ئەو مافانەش بگرێتەوە کە ناکرێت بە ئاسانی بە سروشتیی دابنرێن، بەڵکو تەنها لە کۆمەڵگا و دەوڵەتدا دەردەکەون. بەم مانایــە بــەبڕوای زۆرێــك لــە لایــەنگرانی دیموکراســی، مافــەکانی مــرۆڤ جەوهــەری دیموکراســی پێکــدەهێنێت. بنــەماکانی تــری دیموکراســی وەك بەشــداریکردنی گــشتی و حکومــەتی زۆرینــــە، رەگیــــان لــــەقۆناغی پێشمۆدێرندا هـەبوو، بەڵام چـەمکی مافـەکانی مــرۆڤ چــەمکێکی تازەیــە و لــە هەلومــەرجی سەردەمی مۆدێرنەوە لەدایکبووە. لە سەردەمی پێــشمۆدێرندا تێــزە سیاســی و ئەخلاقیــەکان جــەختیان لەســەر وەزیفــە و ئەرکــەکانی تــاك دەکـرد. ئەڵبەتــە رابــردوی مێــژوویی چــەمکی کــۆنی مافــە سروشــتیەکان دەگەڕێتــەوە بــۆ فەیلەسوفە رواقیەکانی یۆنانی کۆن کە بڕوایان بـە مافـە سروشـتیەکانیان و یەکسانی هـەموو مرۆڤــەکان هــەبوو. بــەبڕوای ئــەوان مافــە سروشـتیەکان دەرئـەنجامی یاسـا نـەگۆڕەکانی سروشت بوو.

یاسا رۆمیەکانیش جەختیان لەسەر بوونی هەنــدێك مــافی گــشتی و جیهــانی لەســەرو مافەکانی هاوڵاتیـانی هـەر وڵاتێـك دەکـردەوە. لەگــەڵ هــەموو ئەمانەشــدا لــەجیهانی کۆنــدا فەیلەسوفانی وەك ئەرستۆ و تۆماس ئەکیوناس نکوڵیان لە مافە یەکسانەکانی هەموان دەکرد و هەندێك کەسیان بە سروشت بە کۆیلە دەزانی. پاش رێنسانس و لە سەدە تازەکاندا فەیلەسوفە سیاسیە لیبڕاڵـەکان تێڕوانینێکی مۆدێرنیـان بۆ

مافە سروشتیەکان پێشکەشکرد و بەڵگەیان هێنایەوە کە مرۆڤ خۆبەخۆ خاوەن مافی ژیان، موڵکایەتی و ئازاد لە ئیرادەی کەسانی دیە و پاش بەستنی پەیمانی کۆمەڵایەتی و چونە ناو کۆمەڵگای مەدەنیەوە، تەنها مافی جێبەجێکردنی مافە سروشتیەکان لەسەر بناغەی یاسا سروشتیەکان لەدەستدەدات.

تێڕوانینی مۆدێرن بۆ چەمکی مافە سروشتیەکان لە سەدەی هەژدەهەمدا، گەیشتە کۆلۆنە ئەمریکیەکان و لە راگەیاندنی سەربەخۆیی 1776دا رەنگیدایەوە. بەپێی ئەم راگەیاندنە هەموو مرۆڤەکان بەیەکسان لەدایکبوون و خوداوەند مافگەلێکی پێبەخشیون کە قابیلی سەندنەوە نین. گرنگترینی ئەم مافانە بریتین لە: مافی ژیان، ئازادی و بەدواداچوونی بەختەوەری و بەهرەمەندبوون. لەگەڵ ئەمەشدا هەندێك لە لایەنگرانی چەمکی مافەکانی مرۆڤ، بەرهێنانی مافەکانی مرۆڤ لەیاسا سروشتیەکانەوە رەخنەدەکەن. بۆ نمونە جۆن سیتوارت میل بەڵگەی دەهێنایەوە کە مافەکانی مرۆڤ لەسەر بناغەی سود دامەزراوە، واتە ئامرازی بەرەوپێشبردنی شادی و بەختەوەری مرۆڤەکانە، ئەگینا هیچ جۆرە یاسایەکی سروشتی بابەتی یان خودی بوونی نیە. لەگەڵ ئەمەشدا یاسای سروشتی گرنگترین تیورە بووە بۆ رونکردنەوەی سەرچاوەی مافەکانی مرۆڤ. ئەگەرچی تەفسیری جیاواز بۆ چەمکی یاسای سروشتی پێشکەشکراوە کە خۆی بۆتە هۆی پەرەسەندنی ئەو چەمکە.




سادەترین و کۆنترین تەفسیری یاسای سروشتی، هەمان ئەو تەفسیری رواقیەکان بوو کە بەپێی ئەم تەفسیرە کۆی جیهان پەیڕەوی یاسا سروشتیەکانە و شتەکان و زیندەوەرەکان لەرووی پێویستی یان بەپێی غەریزە پەیڕەوی لەم یاسایە دەکەن، هەرچەندە مرۆڤ وەك

بونەوەرێکی عەقڵانی دەتوانێت پەیڕەوی بکات یان نەیکات. ئەم تەفسیرە بەئاشکرا دوو مانای یاسا لەگەڵ یەکدا تێکەڵ دەکات. لەمانایەکدا یاسا بەمانای چەمکی ڕێسا پێویستیە سروشتیەکان دادەنرا، لەمانایەکی دیدا بە ڕێساگەلێك دەژمێررا کە مرۆڤ دەیتوانی بە ویستی خۆی پەیڕەویان لێبکات. بە دەربڕینێکی دی چەمکی یاسا لەم تەفسیرەدا هەم بونیادی سروشت و هەم بنەماکانی ئەخلاق دەگرێتەوە. لێرەوە تیورەی دوهەم لەژێر ناوی تیورەی سروشتی تایبەتی مرۆڤ هاتە ئاراوە کە بەپێی ئەم تیورەیە دەبێت ئەو یاسایانەی پەیوەندیان بە مرۆڤەوە هەیە لەو یاسایە جیابکەینەوە کە پەیوەندیان بە سروشتی شتەکان و زیندەوەرەکانەوە هەیە.

بەپێی ئەم بناغەیە مرۆڤ خاوەن سروشتێکی تایبەتە و بنەما هەمەکیەکانی یاسای سروشتی بەیەك ئەندازە بۆ عەقڵی مرۆڤ قابیلی وەرگرتنە. کێشەی سەرەکی ئەم تەفسیرە ئەوەبوو ناکرێ باسی سروشتی نەگۆڕی مرۆڤ و ڕاوەستاو و یاسای سروشتی هەمیشەیی بکرێت لە دۆخێکدا کە ئەحواڵی مرۆڤەکان بەپێی قۆناغە مێژووییەکان گۆڕانی بەسەردا دێت. لێرەوە تێڕوانینێکی سێهەم بۆ چەمکی یاسای سروشتی هاتەئاراوە کە بەپێی ئەم تێڕوانینە سروشتی مرۆڤ بریتیە لەهەمان خاوەنداریێتی عەقڵ و یاسای سروشتیش عەقڵی دروستی مرۆڤە. دیارە کێشەی ئەم تەفسیرە ئەوەیە ئایا ئەوەی عەقڵ دەیدۆزێتەوە، بابەتی و دەرەکیە یان دروستکراوی عەقڵی ئێمەیە کە لەم حاڵەتەدا ئیتر ناکرێت باسی چەمکی سروشت بەمانای باو بکرێت. دواجار بە سەرنجدان لە کەموکوڕیی تەفسیرەکانی هێنامانەوە، یاسای سروشتی وەك واقعیەتێکی مێژوویی و دینامیکی تەفسیرکرا.

ڕێساکانی یاسا سروشتیەکان بەپێی تەفسیری یاسا سروشتیەکان بە ناوەڕۆکی گۆڕاوەوە، و بەپێی گۆڕان لە کۆمەڵگا و پێداویستیەکانی مرۆڤدا، دەگۆڕێن. بەمشێوەیە دەکرێت چەمکی یاسای سروشتی ببەسترێتەوە بە مافەکانی مرۆڤەوە بە مانا دینامیکیەکەی. لەراستیدا سروشت لەم تەفسیرەدا هەمان کلتورە. سروشتی مرۆڤ لە کۆمەڵگادا پەرەدەسێنێت و هاوکات لەگەڵیشیدا دەمێنێ و مافەکانی مرۆڤیش پەرەدەستێنێ. گەشەکردن و پەرەسەندنی فیکری و ئامێری مرۆڤ تەنانەت مافی تازەش دروستدەکات.

**سەرچاوە:**


حسین بشیریه: اموزش دانش سیاسی. تهران مؤسسه نگاه معاصر.1382

# مارکس و مافەکانی مرۆڤ

رامین جهانبگلو

لە فارسییەوە: ڕێبین هەردی

مەسەلەی یەهود کامڵترین نوسینە کە تیایدا مارکس شۆڕشی فەرەنسی هەڵدەسەنگێنێت. مارکس ئەم نوسینەی لەسەرەتای چونیدا بۆ پاریس نوسیووە. لەم قۆناغەدا سێ مەسەلەی فکریی مارکس بەخۆیانەوە سەرقاڵدەکەن: یەکەم بیرکردنەوەی هیگڵ، پاشان رەخنەی فیورباخ لە مەزهەب و دواجار شۆڕشی فەرەنسی. شۆڕشی فەرەنسی بۆ مارکس نمونەی دیاری شۆڕشی سیاسی بوو کە مارکس وەك بیریاری ئەم شۆڕشە لە بەرامبەر مەسەلەیەکی تازەدا دادەنێت. ئەم مەسەلەیە جیابونەوەی دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنی بوو. لەلایەکی دیەوە فیورباخیش مارکسی بە چەمکی نامۆبوون لەبواری مەزهەبدا ئاشنا دەکرد. بەوشێوەیەی کە لە نوسینەکانی مارکسدا دەردەکەوێت، مارکس لەم قۆناغەدا هەڵسەنگاندنی فیورباخیانەی مەزهەب، لە زەمینەی مافەکان و سیاسەتدا بەکاردێنێت.

"بەمشێوەیە رەخنە لە ئاسمان، دەبێت بە رەخنە لە زەوی، رەخنەکردنی مەزهەب دەبێت بە رەخنەکردنی یاساکان و رەخنەکردنی تیۆلۆجیا دەبێت بە رەخنەکردنی سیاسەت"[1]. یاسا و سیاسەتێك کە مارکس لێرەدا رەخنەی دەکات، دەرئەنجامی راستەوخۆی شۆڕشی فەرەنسیە کە هیگڵ کردبونی بە چەمکگەلێکی فەلسەفی. لێرەوە ئەو رەخنە و هەڵسەنگاندنە فیورباخیانەی مارکس بۆ شۆڕشی فەرەنسی دەکات، رێگای خۆی لەناو فەلسەفەی هیگڵدا دەکاتەوە. مارکس بەدوای هیگڵدا[2] هەقیقەتی شۆڕشی فەرەنسی لەبونی ژاکۆبینەکاندا دەبینێت. لێرەوە کاتێك مارکس لەم قۆناغەدا باسی شۆڕشی فەرەنسی وەك "قۆناغی کلاسیکی زیرەکی سیاسی" دەکات[3]، رۆبسپیێر لە ریزی پاڵەوانەکانی ئەم شۆڕشەدا دادەنێت. رەخنەی مارکس لە سیاسەت (وەك وەهمێك) لەچوارچێوەی ئەم تێروانینەدایە. ئەو سیاسەتە

وەهمیـەی مـارکس لـەم قۆناغـەدا باسـیدەکات، دیموکراسـی سیاسـیە کـە لەرێگـەی سیـستەمی نوێنەرایەتیکردنــەوە، بــەهۆی ژاکۆبینەکانــەوە دروستدەکرێت. بەبڕوای مارکس ئـەم سیاسـەتە لەســەر بناغــەی تێزەکــانی ڕۆســۆ دامــەزراوە. مـارکس دەنوسـێت: "ڕۆبسپێر فـەقیری زیـادە و سامانی زیادە بە تەنها ڕێگرێکی دەستگەیشتن بە دیموکراسی پەتی دەزانێت. هەر لەبەرئەمەش دەیــــەوێت بــــە لاســــایکردنەوەی ســــپارتا قەناعــەتێکی گــشتی جــێگیر بکــات. بنــەمای سیاســـەت، ئیرادەیـــە"[4]. مـــارکس سیاســـەتی ڕۆســۆیی ژاکۆبینــەکان بــە وەهمــی ناودەبـات، لەکاتێکـدا هیگـڵ ئـەم حاڵەتـەی بـە یـەکێك لـە شێوەکانی نامۆبوونی ویژدان دەزانـی. هـەروەها لەروانگــەی مارکــسەوە حکومــەتی تــیرۆر، دەرئەنجامی سیاسەتی وەهمی ژاکۆبینەکانە. بە دەربڕینێکی دی دەرکەوتی "ساتەوەختگەلێکی هەژانــە کــە (کــە تیایــدا) ژیــانی سیاســی هەوڵدەدات تا مەرجە سەرەکیەکانی بونی خۆی، (واتــە) کۆمــەڵگای مــەدەنی و ڕەگــەزەکانی بــۆ ســــەقامگیری خــــۆی وەك ژیــــانی واقعــــی و هاوســـەنگی مـــرۆڤ (واتـــە) ژیـــانی نـــەوعی، بخنکێنێــت"[5]. بــەڵام لەروانگــەی مارکــسدا حکومــەتی تــیرۆر بــۆ ئەنجامــدانی ئــەم کــارە، پێویستی بە بـەرپاکردنی دوبـارەی مەزهەبـە و ئەمـەش کارەسـاتی ڕزگـاری سیاسـیە کـە خـۆی وەك ڕزگـاری مرۆڤ دەناسـێنێت. کارەسـاتێك کـە مـارکس لـە جیابونـەوەی دەوڵـەت و کۆمـەڵگای مەدەنیدا، واتە جیابونەوەی ژیانی نەوعی مرۆڤ –وەك ئەندامی کۆمەڵگای سیاسی – لـە ژیـانی مـادی مـرۆڤ وەك مرۆڤێکـی تایبـەت دەبـینێ. ڕەخنـەکردنی مـارکس بـۆ ڕاگەیانـدنی جیهـانی مافـــەکانی مـــرۆڤ و هـــاوڵاتی ســـاڵەکانی 1793،1789 و1795 لەروانگـەی ئـەم دیـدەوە قــابیلی تێگەیــشتنە. لەدیــدی مارکــسدا ڕاگەیاندنـــەکانی جیهـــانی مافـــەکانی مـــرۆڤ و هـــاوڵاتی فەرەنـــسا، بەرهـــەمی ئەبـــستراکتی خۆپەرســتی تاکەکانــە لــە کۆمــەڵگای پــاش شۆڕشـی فەرەنـسیدا کـە بـەهۆی خاوەنـدارێتی جەوهەرێکی جیهانیەوە، بۆتە جێگری دەزگـای کۆمەڵایـەتی مەزهـەبێك کـە لـە ڕژێمـی پـێش شۆڕشـدا هـەبووە. بـەدەربڕینێکی دی مـارکس ڕاگەیاندنــە جیهانیــەکانی مافــەکانی مــرۆڤ و هـاوڵاتی شۆڕشـی فەرەنـسی، وەك شـێوەیەکی تــازەی نــامۆبوون تاوتوێــدەکات. دیموکراســی سیاسی دەوڵەتی ژاکۆبینەکان بە پشتبەستن بە بنــەماکانی ڕاگەیاندنــەکانی مافــەکانی مرۆڤــی ســــــاڵی 1789 و 1793ڕزگــــــاربوونی فەرەنـــسیەکان، وەك ڕزگـــاربوونی هـــەموو مرۆڤایــەتی پێناســدەکات. لێــرەوە مــارکس ئەگەرچی ڕزگاربوونی سیاسی لە ڕژێمی پێشوو بـە پێـشکەوتنێکی مێـژوویی دەناسـێت، بـەڵام پێیوایــە جیابونــەوەی دەوڵــەت لــە مەزهــەب، نەبۆتـە هـۆی جیابونـەوەی مـرۆڤ لـە مەزهـەب. لێرەوە مارکس بە پێچەوانەی برۆنۆ بائرەوە بەو دەرئەنجامــە دەگــات کــە مرۆڤــەکان دەتــوانن لەرووی سیاسیەوە ڕزگاربن، بەڵام بە مەزهەبی بمێننــەوە. کــەوابوو نــامۆبوونی سیاســی و نــامۆبوونی مەزهــەبی دوو شــتی کامڵکــەری یەکترن، چونکە شۆڕشی فەرەنسی لەئاراستەی ئاشــتکردنەوەی مرۆڤــی گــشتی و مرۆڤــی تایبەتیــدا، جیابونــەوەیانی دروســتکردووە، جیابونەوەیەك کە ڕاگەیاندنی جیهانی مافەکانی مرۆڤ و هاوڵاتی شۆڕشی فەرەنسا، پێناسکەری یاســاییەتی. بــە وتــەی مــارکس ڕاگەیانــدنی جیهــــانی مافــــەکانی مــــرۆڤ و هــــاوڵاتی

"ئاشکراکەری جیابونەوەی مرۆڤە لە مرۆڤ و لە کۆمەڵگاکەی"[6]، چونکە تاکە ئامانجی ئەم راگەیاندنە بریتییە لە زەمانەت کردنی بەهرەمەندبوونی تایبەتی تاکەکان. بەمشێوەیە "رەسەنایەتی وێنەی دەوڵەت" دەبێتە هۆی دروستبوونی "رەسەنایەتی تاکانەی" هاوڵاتیان. بە دەربڕینێکی دی رزگاربونی سیاسی لە رژێمی پێشوو، ئەندامانی کۆمەڵگای مەدەنی لەبەرامبەر سیاسەتدا بەنامۆیی دەهێڵێتەوە. لێرەدا مارکس لەرێگەی بوونی مرۆڤی کۆمەڵایەتیەوە، بیر لە هەقیقەتی مرۆڤی سیاسی دەکاتەوە، و لە دابڕانێکی تازەدا لەنێوان کۆمەڵگا و سیاسەتدا لە پێشبونی کۆمەڵگا بەسەر سیاسەتدا دەهێنێتە ئاراوە. (هیگڵ لە فەلسەفەی یاساکاندا پێچەوانەی ئەمە ئەنجامدەدات). چونکە ئەوەی لە دیدی مارکسدا تاکەکانی کۆمەڵگا لەیەکدیەوە نزیکدەکاتەوە، دەزگای سیاسی کۆمەڵگا نیە، بەڵکو سیستەمی پێداویستیەکانیانە. کەوابوو ئەوە دەوڵەت نیە تەوەرەی سەرەکی کۆمەڵگای مەدەنی پێکدەهێنێت، بەڵکو کۆمەڵگای مەدەنیە دەبێتە بناغە و بنەمای دەوڵەت. بەدەربڕینێکی دی دژایەتی نێوان کۆمەڵگای مەدەنی و دەوڵەت، دژایەتیە لەنێوان بەرژەوەندییە تایبەتیەکانی



مرۆڤی تایبەتی و خەیاڵە سیاسیەکەی. دیارە جارێکی دی بڵێین لە دیدی مارکسدا هیچ سروشتێکی کۆمەڵایەتی هێندەی راگەیاندنی جیهانی مافەکانی مرۆڤ و هاوڵاتی شۆڕشی فەرەنسی، پیشاندەری ئەم دژایەتیە نیە. راگەیاندنێك کە لەلایەکەوە پەنجە دەخاتە سەر زەمانەتی بەرژەوەندییە تایبەتیەکانی تاك و لە لایەکی دیەوە جەخت لەسەر یەکسانی نێوان مرۆڤەکان دەکات. مارکس مافەکانی مرۆڤی شۆڕشی فەرەنسی بە "مافی سیاسی" ناودەبات. ناوەڕۆکی ئەم مافانە بە وتەی خۆی "بەشداریکردنە لە کۆمەڵگا و بەتایبەتی لە کۆمەڵگای سیاسی و ژیانی دەوڵەتدا". لێرەوە لە دیدی مارکسەوە "ئەم مافانە دەچێتە ناو وتەزای مافە مەدەنیەکانەوە"[7].

بەڵام ئەو مرۆڤەی بابەتی یاسایی راگەیاندنی جیهانی مافەکانی مرۆڤ و هاوڵاتی شۆڕشی فەرەنسیە، بەپێچەوانەی وێنای مارکسەوە نەك وەك مرۆڤ، بەڵکو وەك هاوڵاتیەکی ئەندامی کۆمەڵگای مەدەنی (بابەتی راگەیاندنەکەیە). بەدەربڕینێکی دی ئەو مرۆڤەی راگەیاندنی مافەکانی مرۆڤ 1789 باسیدەکات، مرۆڤێکی نەوعیە هەر لەبەرئەمەش کاتێك مافە مەدەنیەکانی خۆی (واتە ئەو مافانەی کە لە پلەی هاوڵاتی

کۆمـــەڵگای مەدەنیـــدا بەدەســـتی دێنێـــت) لەدەســـتدەدات، دەکرێـــت بـــەناوی مافـــەکانی مرۆڤـەوە لـەدەرەوەی چوارچێوەی یاسایی ئـەم کۆمەڵگایە بەرگری لێبکرێت. ئەمەش ڕێك ئەو کارەیـە کـە ڕێکخراوەکـانی مافـەکانی مرۆڤـی جیهـــان (بۆنمونـــە ڕێکخـــراوی لێبـــوردنی نێونەتـــەوەیی) ئەنجامیـــدەدەن. ئـــەوان بـــەبێ دەستێوەردان لە مەسەلە سیاسیەکانی کۆمەڵگا و بێ ڕەچاوکردنی ئەو مافانەی تاکەکەسەکان لەکۆمـــــەڵگای خۆیانـــــدا وەك هـــــاوڵاتی لەدەســـتیانداوە، وەك ڕەگـەزی مـرۆڤ بـەرگری لێدەکەن. هەنوکە دەتوانرێت بگوترێت ئـەمڕۆ ئەم ڕێکخراوانە بەرگری لە ڕاگەیاندنی مافەکانی مرۆڤــی ســاڵی 1948ی ڕێکخــراوی نەتـــەوە یەکگرتووەکان دەکەن، و جیاوازیەکی سەرەکیش لـەنێوان ئـەم ڕاگەیاندنـە و سەرچاوەکەی، واتـە ڕاگەیاندنی جیهانی مافەکانی مـرۆڤ و هاوڵاتی 1789 ی فەرەنسادا نیـە*. لەڕوانگـەی ئێمـەوە هێنانـە ئـارای ئـەم باسـە هـەم سـەرنجڕاکێش و هـەم بنەڕەتیـە، چـونکە ڕونکـەرەوەی زۆرێـك لـە مەســـەلە گـــرنگ و تاریکـــەکانی بیرکردنـــەوەی مافەکانی مرۆڤە.

ئەگەر هەردوو ڕاگەیاندنی مافەکانی مرۆڤی سـاڵی 1789 و 1948 بەیـەك بـەراورد بکـەین، بەباشـی دەتـوانین پەیوەنـدی تـەنگا و تـەنگیان ببینین. بەڵام بەر لەهەر شتێك و بۆ تێگەیشتنی زیاتری ئەم مەسەلەیە، ڕوبکەینە قسەکانی ڕێنێ کاســن کــە نوســـەری ڕاگەیانـــدنی جیهـــانی مافـەکانی مرۆڤـی 1948ی ڕێکخـراوی نەتـەوە یەکگرتووەکانە. ڕێنێ کاستن دەنوسێت: "کاتێك شانازی ئەوەمان هـەبێت سـەر بە زادگای قەشە گرگـوار بـین کـە یـەکێك بـوو لـە داهێنـەرانی ڕاگەیاندنی مافەکانی مرۆڤ 1789 و ڕاگەیاندنی مافـــەکانی خـــەڵك 1793،و بەشـــێوەیەکی ماندونەناسـانە دژی کویلەیـەتی و بـۆ ڕزگـاری هەموو یەهودیەکان و مرۆڤە ناسپیەکان خـەباتی دەکـــرد، ناشـــێت خۆمـــان بەیـــەکێك لـــە جێبەجێکـــەرانی وەســـیەتە مەعنەویـــەکانی لەبەرچاو نەگرین.."[8] ئەمە یەکەمجار و دواجار نەبوو کە ڕێنێ کاستن پەیوەستبوونی خۆی بە سروشتی مافەکانی مرۆڤی شۆڕشی فەڕەنسی و پەیامـــە مەعنەویەکـــەی ڕادەگەیانـــد، ئـــەم پەیوەستبوونە لە هـەموو بەرهـەم و وتارەکانیدا دەبینرێـــت. بـــۆ نمونـــە ڕێنـــی کاســـتن لـــە وتاربێژیـەکی خۆیـدا لـە 9ی دیسامبەری 1948 لـــە دانیـــشتنی گـــشتی ڕێکخـــراوی نەتـــەوە یەکگرتوەکانـــدا، لـــەبارەی ئـــەم مەســـەلەیە بەمـــشێوەیە قـــسەدەکات: "بنـــەما مەزنـــەکانی ئـازادی، یەکـسانی و برایـەتی کـە مرۆڤایـەتی شانازی ئـەوەی هەیـە لـە ڕاگەیاندنی فەڕەنسی 1789وە بـە ئەمانـەت وەریگرتـووە..". لێـرەوە دەبیـنین ڕاگەیانـدنی جیهـانی مافەکانی مـرۆڤ و هاوڵاتی 1789 تا چەند گرنگیەکی بەرچاوی بۆ بـــاوکی دامەزرێنـــەری ڕاگەیانـــدنی جیهـــانی مافـەکانی مـرۆڤ 1948 (واتـە ڕێنـی کاسـتن)، هەیـە. کـەوابوو وەرن بە بـەراوردکردنی ئـەم دوو ڕاگەیاندنـــە، هۆکـــانی ئـــەم گرنگیـــە زۆرتـــر وردبکەینەوە.

ڕەنگـــە بکـــرێ بەجورئەتـــەوە بگوترێـــت ڕاگەیانـــدنی جیهـــانی مافـــەکانی مـــرۆڤ 1948 بەشـێوەیەکی گـشتی ئیلـهامی لـە ڕاگەیانـدنی مافـــەکانی مرۆڤـــی 1789ی فەڕەنـــساوە وەرگرتـووە. مـادەی یەکـەمی ڕاگەیاندنی 1948 لەســـەر نوســـینەوەیەکی وردی ڕاگەیانـــدنی 1789ی فەڕەنـــسایە: "هـــەموو مرۆڤـــەکان بـەئازادی لـەدایك دەبـن و لـەڕووی هەیبـەت و

مافەوە یەکسانن بەیەک". لە ڕاگەیاندنی 1789ی فەڕەنسادا وشەی "هەیبەت" نەهاتووە و لە پاڵ وشەی یەکسانیشدا، چەمکی ئازادیش هاتووە: "هەموو مرۆڤەکان بە ئازادی لەدایك دەبن و لەرووی مافەکانەوە ئازاد و یەکسانن". مادەکانی شەشەم و حەوتەمی ڕاگەیاندنی 1948 مەسەلەی یەکسانی لەبەرامبەر بە یاسادا دەهێنێتە پێشێ.

مادەی 6: "هەرکەس مافی ئەوەی هەیە کەسایەتی یاسایی خۆی لەهەموو جێگەیەکدا وەك مرۆڤێك لەبەرامبەر یاسادا بناسێت"

مادەی7: "هەموان لەبەرامبە یاسادا یەکسانن و مافی ئەوەیان هەیە وەکیەك و بێ جیاوازی لەرێی یاساوە پارێزراو بن".

ناوڕۆکی سەرەکی ئەم دوو مادەیلە مادەی 6ی 1789ڕاگەیاندنی فەڕەنسادا هاتووە: "یاسا نوێنەری ئیرادەی گشتیە. هەموو هاوڵاتیان مافی ئەوەیان هەیە خۆیان یان لەرێگەی نوێنەرەکانیانەوە بەشداری لە دروستکردنیدا بکەن.یاسا دەبێت چ بۆ بەرگریو چ بۆ سزا بۆ هەموان یەکسان بێت یەکسانی هاوڵاتیان لەرووی یاساوە، قبوڵکردنی یەکسانی بۆ هەموو پلەیەك، شوێن و کاری گشتی بەپێی تواناکان و بێ هیچ ئیمتیازێکی دی جگە لە توانا و فەزیلەتەکانی کەسەکە".

هەروەها مادەکانی 9و10و11 ی ڕاگەیاندنی مافەکانی مرۆڤی 1948 بە ئاراستەی دادگایکردن، دەستگیرکردن و تۆمەتبارکردنی بێباکانە، دوبارەکردنەوەی مادەی 7و8و9ی ڕاگەیاندنی 1789ی فەڕەنسایە.

مادەی 9ی ڕاگەیاندنی 1948: "ناکرێت هیچکەس بێباکانە دەستگیر، زیندانی یان دوربخرێتەوە".

مادەی 10 ی 1948: " هەموو کەس بەیەکسان مافی ئەوەی هەیە کە شکاتەکەی بەهۆی دادگایەکی سەربەخۆ و بێلایەنی دادپەروەرانە و بە ئاشکرا چاولێبکرێت و ئەم دادگایە لەبارەی ماف و ئەرکەکانیەوە یان هەر تۆمەتێکی کەتنی کە بەرەو روی کرابێتەوە، بڕیار بدات".

مادەی 11: "هەر تۆمەتبارێك بە بێگوناه دادەنرێت تا ئەوکاتەی لە دادگایەکی گشتیدا کە تیایدا تۆمەتبار هەموو زەمانەتە پێویستیەکانی بۆ بەرگریکردن لە خۆی هەیە، پێچەوانەکەی بسەلمێنرێت".

لە مادەی 7ی ڕاگەیاندنی مافەکانی مرۆڤی 1789دا هاتووە: "ناکرێت هیچ کەس زیندانی یان تومەتباربکرێت، مەگەر بەپێی حاڵەت و شێوازێك کە بەهۆی یاساوە دیاریکراو و رێگەپێدراو بێت".

هەروەها لەمادەی 8ی ئەم ڕاگەیاندنەدا هاتووە: "ئەرکی یاسا دامەزراندنی سزای براوەو پێویستە و ناکرێت هیچ کەس تۆمەتبار بکرێت بەپێی یاسایەك نەبێت کە پێش تاوانەکە دامەزراوە و بڵاوبۆتەوە و بەشێوەیەکی یاسایی خراوەتە پراکتیکەوە".

بەهەمان شێوە مادەی 18و19ی ڕاگەیاندنی جیهانی مافەکانی مرۆڤی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکان کە تایبەتە بە ئازادی بیرکردنەوە و بیروڕا، بە هاوئاراستەی مادەکانی 10 و 11 ڕاگەیاندنی مافەکانی مرۆڤی 1789ی فەڕەنسا نوسراوە: مادەی 18ی 1948: "هەموو کەسێك مافی ئازادی فکر و ویژدان و مەزهەبی هەیە.

ئــەم ئازادیــە ئــازادی گــۆڕینی مەزهــەب و بیروباوەڕو هەروەها ئازادی دەرخستنی بیروڕا و ئیمــان دەگرێتــەوە. هــەروەها ئــازادی تێــزە دینیـــەکان و بـــەرپاکردنی داب و نەریتـــە دینیەکانیش دەگرێتەوە".

مـادەی 19 ی ڕاگەیانـدنی 1948: "هـەموو کەسێك مافی ئازادی بیروڕا و دەربڕینی هەیە و ئەم مافەش بەمانای ئەوەیە نابێت هیچ کەسێك لە بوونی بیروڕا دڵەڕاوکێ یان ترسی هەبێت و دەبـێ خـاوەنی ئـازادی وەرگرتنـی زانیـاری و بیروڕا و بڵاوکردنەوەی بەهەموو شێوازێك بەبێ هیچ سنورێك هەبێت".

هەنوکە بۆ ڕونکردنەوەی بابەتەکان بەکورتی مادەکـانی 10 و 11ی ڕاگەیانـدنی مافـەکانی مرۆڤی 1789ی فەڕەنسا دەهێنینەوە:

مـادەی 10: "هـیچ کـەس نابێـت لەبـەر بیروڕاکـــانی خـــۆی، تەنانـــەت بـــیروڕا مەزهەبیەکانی، ترس لەدڵیدا بێت..".

مـــادەی 11: "پەیوەنـــدی ئـــازاد لـــەنێوان بیروڕاو بیروباوەڕەکانـدا یەکێکـە لـە بـەنرخترین مافـەکانی مـرۆڤ، کـەوابوو هـەموو هاوڵاتیـەك خـــاوەن ئـــازادی قـــسەکردن و نوســـین و چاپکردنە".

مـادەی 21ی ڕاگەیانـدنی مافـەکانی مرۆڤـی 1948یـــش لـــە زۆر ڕووەوە لـــە مـــادەی 6ی ڕاگەیاندنی 1789ی فەڕەنسا دەچێت کە پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد:

مادەی 21: "1-هەموو کەسێك مافی ئەوەی هەیـــە چ بـــە ڕاســـتەوخۆ و چ لەرێگـــە نوێنەرەکانیـــەوە کـــە بەشـــێویەکی ئازادانـــە هەڵبـژێراون، بەشـداری لـە بـەڕێوەبردنی گشتی وڵاتدا بکات. 2- هەموو کەسێك مافی یەکسانی هەیـە بـۆ دەستگەیـشتن بـە کـارە گـشتیەکانی وڵات. 3- بناغـــە و سەرچـــاوەی دەســـەڵاتی حکومەت ئیرادەی خەڵکیە، ئەم ئیرادەیە دەبێت بـــەهۆی هەڵبژاردنێکـــەوە دەربڕێـــت کـــە بەشـــێوەیەکی ڕاســـتگۆیانە و بەشـــێوەیەکی بازنەیی ئەنجامبدرێت".

لەبەرامبـــەر ئەمـــەدا ڕاگەیانـــدنی جیهـــانی مافەکانی مرۆڤـی 1948 مادەگـەلێکی تـری بـۆ ڕاگەیاندنی مافەکانی مرۆڤی 1789ی فەڕەنسا زیـادکرد کـە لەوانـە دەکرێت ناوی: مـادەی 12 (لەبارەی ئازادی ژیانی تایبەتیەوە) مـادەی 13 (لـەبارەی ئـازادی هاتوچۆ) مـادەی 20(لـەبارەی ئـازادی دروسـتکردنی کـۆڕ و کۆمـەڵ) ودیـارە مادەکـانی 23،24،25،26 (لـەبارەی مـافی کـار، مـافی تەندروسـتی و خۆشـگوزەرانی، مـافی پـەروەردە و مـافی بـەتاڵی) بهێـنین کـە هـەموویان جگـە لـە مـادەی 24 لـە مادەکـانی 21،22،23ی ڕاگەیانـــدنی مافـــەکانی مرۆڤـــی 1793ی فەڕەنسادا هاتووە.

کـەوابوو دەبیـنین ڕێـنێ کاسـن بـەخۆڕایی باســی "وەســیەتنامەی مەعنــەوی" ناکــات و کاتێـك مـارکس دەسـت بـە ڕەخنـەکردنی چـوار بنـەمای سـەرەکی ڕاگەیانـدنی مـافی مرۆڤـی فەڕەنـسا دەکـات، واتـە ئـازادی، یەکـسانی، ئاســـــایش، موڵکایـــــەتی تایبـــــەتی، لەراســـتیدا "وەســـیەتنامەی مەعنـــەوی" ڕاگەیانـدنی جیهـانی مافـەکانی مرۆڤـی 1948 ڕەد دەکاتــەوە و بــە دەربڕینێــك دەکــرێ بڵــێین بـــەهۆی ئـــەم ڕەخنەیـــەوە ڕاگەیانـــدنی 1948 دەخاتە ژێر پرسیارەوە.

هەنوکە ببینین ڕەخنەکانی مارکس لە بنـەما سـەرەکیەکانی ڕاگەیانـدنی مافـەکانی مرۆڤـی 1789 لەسـەر چ بناغەیـەك ڕاوەسـتاوە؟ مـارکس ئەو وشـەی ئازادیـەی لـەم ڕاگەیاندنـەدا هـاتووە،

به" ئازادی مرۆڤ وەك مۆنادێكی تاك و داخراو بەسەر خۆیدا"[9] پێشكەش دەكات. بە بڕوای ماركس ئەم تاكانەیی و داخرانە بەهۆی نەبونی پەیوەندیە لەنێوان ئەم مرۆڤە و مرۆڤەكانی تری كۆمەڵگادا. هەر لەبەرئەمەش مافی ئازادی بە "مافی تاكی داخراو بەسەر خۆیدا" هەڵدەسەنگێنێت. ماركس مافی موڵكایەتی تایبەتی وەك دەركەوتی پراكتیكی مافی ئازادی تاوتوێدەكات. مافی مۆڵكایەتی تایبەتی بۆ ماركس "مافی بەرژەوەندی تایبەتی، واتە مافی لەزەت وەرگرتنە لە سامانی خود و هەڵبژاردنی سودوەرگرتن لەم سامانە بەبێ نیگەران بوون بۆ كەسانی دی"[10]. هەروەها بنەمای یەكسانی راگەیاندنی مافەكانی مرۆڤی 1789 لە دیدی ماركسەوە یەكسانیە لەنێوان كۆمەڵێك مۆنادی سەربەخۆدا وەك لە باسكردنی ئازادیدا باسكرا. دواجار بنەمای ئاسایش كە لای ماركس "زەمانەتی خۆپەرستی كۆمەڵگای مەدەنیە"[11] و دەركەوتەكەشی لە دەزگای پۆلیسدا دەبنینێت.

ئێستا دەبێ ببینین ئەم رەخنەیەی ماركس تاچەند راگەیاندنی مافەكانی مرۆڤی 1948 دەگرێتەوە؟ وەك پێشتر ئاماژەمان بۆ كرد هەموو ئەو بنەمایانەی ماركس لە راگەیاندنی مافەكانی مرۆڤی شۆڕشی فەرەنسیدا رەخنەی دەكات، بە راشكاوی لە راگەیاندنی 1948دا هاتووە. لێرەوە رەخنەكانی ماركس لە بنەمای ئازادی راگەیاندنی مافەكانی مرۆڤی فەرەنسا، بە باشی دەتوانێت رەخنەكردنی مادەكانی یەكەم تا سێهەمی راگەیاندنی مافەكانی مرۆڤی سالی 1948 بێت. بەهەمانشێوە رەخنەكردنی بنەمای یەكسانی كە لە راگەیاندنی 1789دا هاتووە، دەكرێ بەمانای رەخنەكردنی مادەی یەكەمی راگەیاندنی 1948ە وەك زەمانەتی خۆپەرستی كۆمەڵگای مەدەنی و دەزگای پۆلیس تەفسیربكرێت. مەسەلەی موڵكایەتی تایبەتی و رەخنەكردنی ماركسیانە لێی پێویستی بە باسێكی ترە، چونكە كۆتایهێنان بە موڵكایەتی



تایبەتی یەكێكە لە دروشمە كلیلیەكانی سیستەمی بیركردنەوەی ماركسیانە. ئێمە لێرەدا باسی موڵكایەتی تایبەتی ناهێنینە پێشێ، چونكە ئەم مەسەلەیە بەئەندازەی پێویست بۆ هەموو كەسێك كە ئاشنای تیورەكانی ماركس بێت، روونە. بەلام نەگونجانی تیورەكەی ماركس لەبارەی موڵكایەتی تایبەتیەوە، لەگەڵ مادەی 17ی راگەیاندنی مافەكانی مرۆڤی سالی 1948وە، نابێت رێگە لە هێنانە ئارای مەسەلەكانی سەرەوە بگرێت. مەسەلەی مۆڵكایەتی تایبەتی مەسەلەیەكی یەكجار گرنگە و ناكرێ بە ئاسانی بەسەریدا برۆین. ئەو ژمارە ماركسیانەی خۆیان بە (لایەنگری) مافەكانی مرۆڤ دەزانن (دەبێ بگوترێت لەناو ئێرانیەكاندا ژمارەی ئەو ماركسیانەی خۆیان بەلایەنگری مافەكانی مرۆڤ دەزانن، بە ئەستەم لە ژمارەكانی پەنجە تێدەپەڕن) (ئەم قسەیە بۆ ماركسیە

کوردیەکانیش راستە. و.ك) مەسەلەی مۆڵکایەتی بە بنەمایەکی لاوەکی دادەنێن و دەڵێن کێشە نیە، لێگەڕێن مافەکانی مرۆڤ لە"ئاراستەی پۆزەتیڤی مێژوو" دا رابوەستێت، ئەوسا بیرێکیش لەرێگەچارە بۆ موڵکایەتی تایبەتی دەکەینەوە. بەڵام مافەکانی مرۆڤ قابیلی تەفسیرکردن نیە، تاکو بێین لەملا یان ئەولای کەمبکەینەوە بۆئەوەی تەرازوی مارکسیزم هاوسەنگی خۆی لەدەستنەدات. رەنگە بکرێ بگوترێت رەخنەکردنی مارکس لەم ئاراستەیەدا راستگۆییەکی زیاتری تێدایە، چونکە مارکس بە شێویەکی بڕاوە و روون هەموو تێڕوانینەکانی خۆی لەبارەی راگەیاندنی مافەکانی مرۆڤەوە دەردەبڕێت.

هەنوکە وتنی ئەوەی مارکس لەبەرامبەر راگەیاندنی مافەکانی مرۆڤدا بێلایەن و بێ مەبەستە، قسەیەکی هەڵەیە. چونکە مارکس بێلایەن نیەو نایەوێت بێلایەن بێت. مارکس هەڵوێستی خۆی بەرامبەر بە راگەیاندنی مافەکانی مرۆڤی شۆڕشی فەرەنسی بەباشی رونکردۆتەوە، لەبەرئەوە بەڵگەیەك نیە کە بیسەلمێنێت لە حاڵەتی زیندوبونیدا، کارێکی وای لەبارەی راگەیاندنی 1948وە بەئەنجام نەدەگەیاند. دیارە ئەگەر مارکس زیندو بوایە بێگومان زوربەی مارکسیەکانی ئەمڕۆ لە ڕیزی لیبرالەکاندا دایاندەنا و دەیانگوت ئەو هیچ لە گوتارەکانی خۆی تێناگات، یان بووە بە کەسێکی لادەر. چونکە ئەوەی بۆ قسەکەرە مارکسیەکان گرنگە، تێگەیشتن و هەڵسەنگاندنی مەسەلەکان نیە، بەڵکو هەوڵدانە بۆ رونکردنەوەی راستبونی بیروڕا و کردارەکانی خۆیان. مەسەلەکە لێرەدا ئاشتکردنەوەی پێویستی رەگەزەکانی دەرەوەی سیستەمی فیکری مارکسیزمە، لەگەڵ لۆژیکی ئەم سیستەمەدا. لێرەدا سیستەمەکەی بڕۆکرۆستی ئایدۆلۆژی دەکەوێتە کار و وتەزاکانی جیاواز لەخۆی بەپێوەری ئەنتۆلۆجی دەزگاکەی خۆی دەکاتە ژورەوە. ئایا چارەنوسی مافەکانی مرۆڤیش ئەوەیە بچێتە سەر سیستەمەکەی پرۆکرۆست، بۆ ئەوەی بە ئاراستەی "رەوتی پۆزەتیڤی مێژوو" هەنگاو بنێت؟

هەنوکە پرسیاری سەرەکی من ئەوەیە ئایا بنەماکانی مافەکانی مرۆڤ دەبێت بەهۆی بەها مارکسیەکانەوە هەڵسەنگێنرێت، یان بەها تیوریەکانی مارکسیزمە کە دەبێت لە پەیوەندیدا بە چوارچێوەی گشتی مافەکانی مرۆڤەوە تاوتوێ بکرێت؟ وەك بینیمان مارکس بنەماکانی مافەکانی مرۆڤی فەرەنسا بەهۆی تیورەکان و بەرنامەی سیاسی خۆیەوە هەڵدەسەنگێنێت. بەڵام چۆن دەکرێت کات و شوێنی فکری لەدایکبوونی بەرنامەی سیاسی مارکس دیاری بکرێت؟ دەتوانین بڵێین بە لەبەرچاوگرتنی ژیاننامەی مارکس جەمسەرە سەرەکیەکانی بیرکردنەوەی بەرنامەی سیاسی مارکس لەنێوان ساڵەکانی 1843و 1848 (واتە ئەو ماوەیەی "رەخنە لە تیزی هیگڵیانەی دەوڵەت" لە "مانیفێستی حیزبی کۆمنیست" جیادەکاتەوە)، قۆناغی کۆرپەلەیی و ئاشکرا بوونی خۆی دەبڕێت. بە وتەی لۆچۆ کێلتی "مارکس کاتێك "رەخنە لە تیزی هیگڵیانەی دەوڵەتی" دەنوسی، هێشتا بە تیورەی کۆمنیستی نەگەیشتبوو. لەکاتی نوسینی ئەم بەرهەمەدا بوو، بەم ئامانجە گەیشت"[12]. ئەو مەسەلە و چەمکانەی مارکس لەم نوسینەدا دەیهێنێتە پێشێ، هەریەکەیان بەپێی خۆیان

بناغەی سیستەمی فکری مارکس پێکدەهێنن. ئێمە لەم نوسینانەدا بەر چەمکی "لەخۆ نامۆبوون" دەکەوین. مارکس ئەم چەمکە لە پەیوەندیدا بە "بوونی تراسندنتالی دەوڵەت"ەوە بەکاردەهێنێت. دەوڵەتێك کە مارکس دوابەدوای هیگڵ بە "بەرهەمی مۆدێرنبوونی" دەزانێت، بەڵام بەشێوەیەکی ئەبستراکت قسە لەبارەیەوە دەکات. لەم ئاراستەیەدا مارکس لە وەڵامی پەرەگرافی 273ی بنەماکانی فەلسەفەی هەقی هیگڵدا، بەرگری لە دیموکراسی لە بەرامبەر سەڵتەنەتدا دەکات. مارکس دیموکراسی بە "هەقیقەتی سەڵتەنەت" ناودەنێت، چونکە بەبڕوای مارکس "دیموکراسی رەگەزی دەستورو سەڵتەنەتیش جۆرەکەیەتی"[13]. زۆرێك لە تەفسیرکارانی مارکس ستایشکردنی مارکس بۆ دیموکراسی لەم نوسینەدا، وەك دیدی گشتی مارکس لەبەرامبەر ئەم مەسەلەیەدا دەهێننە ئاراوە. بەڵام کاتێك مارکس بە راستی چەمکی دیموکراسی لەبەرامبەر چەمکی سەڵتەنەتی هیگڵدا دادەنێت، لەراستیدا تیۆرەی هیگڵی دیموکراسی رەخنەدەکات. لەگەڵ ئەمەشدا خودی مارکسیش بە روکەشی وێناکردنی ئەم چەمکە، لەئاراستەی رەخنەکردنی هیگڵیانەی دیموکراسیدا رادەوەستێت[14]. مارکس بەراوردی دیموکراسی وەك "جەوهەری دەستوری سیاسی" لەگەڵ مەسیحیەت وەك "جەوهەری مەزهەب"دا دەکات، چونکە وەك چۆن مەسیحیەت بە"مەزهەب لە کامڵبونی خۆیدا" ناودەنێت، دیموکراسیش بە نوێنەری "سیاسیەت لە کامڵبوونی خۆیدا" دەزانێت. بەمشێوەیە وەك پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد، مارکس لەژێر کاریگەری فیورباخدا

رەخنەگرتنی مەزهەب دەگۆڕێت بۆ رەخنەکردنی سیاسەت. مارکس لە "مەسەلەی یەهود" و لە رەخنەکردنی دیموکراسیدا دەنوسێت: "دیموکراسی سیاسی بێ هیچ گومانێك مەسیحیە، چونکە تیایدا مرۆڤ، هەر مرۆڤێك نەك تەنها یەك کەس، خۆی وەك بونەوەرێکی فەرمانڕەوا و بونەوەرێکی تراسندنتال دەسەلمێنێت"[15]. لێرەو لە دیدی مارکسەوە دیموکراسی سیاسی شۆڕشی فەرەنسی (ئامادەکاری راگەیاندنی مافەکانی مرۆڤی 1787) هەڵگری جەوهەرێکی مەزهەبیە. وەك دەزانین بۆ مارکس لەناوچونی مەزهەب، مەسەلەیەکی پێویستە. لەبەرئەوە ئەگەر مەزهەب بچێتە ناو دەوڵەتەوە، ئەوا دەبێت دەوڵەتیش لەگەڵیدا لەناو ببرێت. بەڵام لە شۆڕشی فەرەنسیدا بە وتەی مارکس مەزهەب کۆتایی نایەت، بەڵکو دەبێت بە بەشێك لە دەوڵەتی سیاسی. کەوابوو دەبێت دەوڵەتی سیاسی لەناو ببرێت، چونکە "لە دیموکراسی راستەقینەدا، دەوڵەتی سیاسی لەناودەچێت"[16].

مارکس لە مەسەلەی یەهود دا رزگاری سیاسی بە بەس نازانێت و پێویستی رزگاری مرۆڤایەتی دەهێنێتە پێشەوە. لە مەسەلەی یەهوددا رزگاربوونی مرۆڤایەتی دەبەستێتەوە بە لەناوبردنی موڵکایەتی تایبەتیەوە. لێرەدا بەرنامەی سیاسی مارکس هێشتا چەمکی سەرەکی خۆی نەدۆزیوەتەوە. مارکس لە مەسەلەی یەهوددا باسی پرۆلیتاریا ناهێنێتە ئاراوە. مارکس چەند مانگ پاش نوسینی مەسەلەی یەهود، لە "رەخنەکردنی فەلسەفەی هەقی هیگڵ"دا چەمکی پرۆلیتاریا دەدۆزێتەوە. مارکس دەنوسێت: "کاتێك پرۆلیتاریا

لەناوچـــوونی سیـــستەمی جیهـــانی هەنوكـــە رادەگەیـــەنێت، راســـتەخۆ باســـی نهێنـــی بـــوونی(وجـــودی) خـــۆی دەكـــات، چـــونكە لەناوچـــوونی واقعـــی لـــەناو سیـــستەمی جیهانیدایە. كاتێك پرۆلیتاریا داوای نەفیكردنی موڵكایـەتی تایبـەتی دەكات، راستەوخۆ ئـەوەی كۆمـەڵگا وەك بنـەمای پرۆلیتاریـا پێـشكەشی كـــردووەو ئـــەوەی پرۆلیتاریـــا لـــە پێـــشەوە بەشـــێوەیەكی نەویـــستانە وەك دەرئـــەنجامی نیگەتیڤانـەی كۆمـەڵگا لەخۆیـدا بەرجەسـتەی دەكات، بەرزدەكاتەوە بۆ بنەمای كۆمەڵگا...وەك چۆن فەلسەفە لـە پرۆلیتاریـدا "چـەكی مـادی" خـۆی دەدۆزێتـەوە، هـەرواش پرۆلیتاریـا لـە فەلسەفەدا "چەكی مەعنەوی خۆی دەدۆزێتـەوە. هەر ئەوەندەش بروسكەی ئەم بیركردنەوەیە لە قوڵایی ئـەم زەمینـە ساویلكانەیەی جـەماوەردا بدرەوشێتەوە، رزگاربوونی ئەڵمانیەكان بۆ مرۆڤ دێتـە دی...نهێنـی ئـەم رزگاریـە، فەلـسەفەیە. دڵەكەی پرۆلیتاریایە، فەلسەفە ناتوانێت خۆی بـەبێ بەرزكردنـەوەی پرۆلیتاریـا بێنێتـە دی و پرۆلیتاریاش ناتوانێت بێ بەدیهاتنی فەلسەفە، بـەرز بێتـەوە"[17]. بەرنامـەی سیاسـی مـاركس لێـرەدا هـەنگاوێكی دی دێتـە پێـشێ، بـەڵام مـاركس هێـشتا لـە دروسـتكردنی سیـستەمی بیركردنـــەوەی عـــەقڵانی خۆیـــدا، ســـەركەوتوو نـــەبووە. رزگـــاربوونی مرۆڤایـــەتی بەدەســـت پرۆلیتاریـــا شـــتێكە و دیـــاریكردنی لەســـەر هەقبوونی مێژوویی ئەم مەسەلەیە شتێكی دی. هەنوكە ببینین بـەپێی تیورەی ماركس، مێـژوو چـۆن لەســـەر هـــەقبوونی مێـــژوویی پـــەیامی پرۆلیتاریا دیاریدەكات.

مـــاركس یەكـــەمجار لـــە رەخنـــەكردنی فەلـــسەفەی هـــەقی هیگڵـــدا لـــەبارەی ئـــەركی مێـژووەوە دەنوسـێت: "ئـەركی مێـژوو بریتیـە لـــەوەی پـــاش ئـــەوەی رێگرەكـــانی هەقیقـــەت لەناوچوو، هەقیقەتی دنیا سەقامگیر بكات"[18]. وەك پێشتر بینیمان هەقیقەتی دنیا لای ماركس رزگاربوونی مرۆڤایەتیە كە رزگاركەرەكەی خۆی لـە پرۆلیتاریـادا دەدۆزێتـەوە. بـەڵام ئایـا لێـرەدا دەوری پرۆلیتاریـــا لـــە كـــرداری كۆمەڵایـــەتی كرێكارانـدا كـورت دەبێتـەوە، یـان ئـەوەی كـە ئیرادەی خواوەنـدی یـان كۆمـەڵگای مرۆڤایـەتی ئاراسـتەی مێـژوویی مرۆڤـەكان دیاریـدەكات؟ وەڵامـی مـاركس بـۆ ئـەم پرسـیارە ورد و رونـە. مـاركس لـە "خێزانـی پـیرۆز"دا دەنوسـێت: "ئـەوەی زۆر گـرنگ نیـە كـە ئـەم یـان ئـەو پرۆلیتاریـا یـان تەنانـەت هـەموو پرۆلیتاریـا چ شـتێك لـە سـاتەوەختێكدا وەك ئامـانج وێنـا دەكـەن، گـرنگ ئەوەیـە پرۆلیتاریـا لـەرووی مێژووییەوە ناچارە و ناچار دەبێت كە گونجاو لەگـەڵ ئـەم بوونـەدا كاربكـات. ئامـانج و كـاری مێژووییەكەی بەشێوەیەكی ئاشكرا و نەگەڕاوە بۆی وێنە كراوە..."[19].

لێـرەدا یـەكێك لـە دیـارترین نمایـشەكانی تیورەی "مـەكری عـەقڵی مێـژوو" كە ماركس لە هیگڵەوە بەمیرات وەریگرتووە، دەبینین. هەنوكە ببینین ئەم تیورەیە لای هیگڵ چۆن دەردەبڕێت. هیگـڵ دەنوسـێت: "تـەنها بیركردنەوەیـەك كـە فەلـسەفە (بـۆ لێكۆڵینـەوەی مێـژوو) دەیهێنێتـە ئاراوە، بیركردنەوەی سادەی عەقڵە _ واتە ئەو بیركردنەوەیـــەی كـــە عـــەقڵ بەســـەر جیهانـــدا فەرمانڕەوایـە و لەئەنجامـدا مێـژووی جیهـانیش روداوێكی عەقڵانیە...عەقڵ هێزێكی بێكۆتاییە. واتـە ئەوەنـدە بـەهێزە كـە بتوانێـت شـتێكی سـەروتر لـە دروشـم و پێویـستیەكی رووت كـە گوایـــە لـــە جێگەیـــەكی نەناســـراودا بەســـەر

واقعدا و یا شتێکی ئەبستراکت کە لە زیهنی هەندێك لە مرۆڤەکاندا هەبێت، بخولقێنێت. عەقڵ ناوەرۆکێکی بێکۆتاییە. هەقیقەت و خودی هەموو شتێکە، عەقڵ مادەی خۆی لەناوخۆیدا هەیە، و بە کرداری خۆشی دروستیدەکات....هەرچی لە جیهاندا دیارە، جگە لە عەقڵ بەهەموو شکۆ و شەرەفیەوە، نیە.."[20].

ئەو پەیامە مێژووییەی پرۆلیتاریا کە مارکس باسیدەکات، لەزۆر رووەوە لە عەقلّی مێژوویی دەچێت. کەوابوو بەباشی دەبینین کاریگەری هیگڵ لەسەر مارکس زۆر قوڵترە لەوەی مارکس بەچەند خوازەیەك خۆی لێ رزگار بکات، و بەپێچەوانەی وێنای زۆرێك لە قوتابخانە مارکسیەکانەوە کە رەخنەگرتنی مارکس لە هیگڵ وەك دابرانێکی ئەبستۆلۆجی بۆ دەستگەیشتن بە زانستی مێژوو تەماشا دەکەن[21]، دیدی مێژوویی مارکس بەردەوام زیندانی جەوهەری فەلسەفەی مێژوویی هێگل دەمێنێتەوە.

وەك بینیمان "تیورەی مەکری عەقلّی مێژوویی" لەو هێنانەوەیەدا کە لە کتێبی خێزانی پیرۆزی مارکس و ئەنگلزەوە هێنامانەوە، بە روونی دیارە. بەلاّم لەبەرئەوەی هەمیشە یەك نمونە بە ئاوارتن دادەنێن و تا ئەوکاتەی ئاوارتن نەبێت بە رێسایەك، لەلایەن کەسەوە ئەو قسەیە قبوڵناکرێت، لەبەرئەوە هەوڵدەدەین چەند نمونەیەکی دی بهێنینەوە کە کاریگەری ئەم تیورەیە لە فکری مارکسدا ئاشکرا دەکەن.

مارکس نزیکی ساڵێك پاش نوسینی خێزانی پیرۆز، لە نوسینێکی تەواونەکراودا بەناوی ئایدۆلۆژیای ئەڵمانیەوە، هەنگاوێکی دی بەئاراستەی سیستماتیك کردنی بیرکردنەوەی مێژویی خۆی دەنێت. تیورەی "مەکری عەقلّی مێژووی" بەروونی لەم نوسینەدا دەردەکەوێت. ئێمە لێرەدا ئاماژە بۆ هەندێك بەشی ئەم نوسینە دەکەین.




مارکس بە هاورێیەتی خودی ئەنگلز لە ئایدۆلۆژیای ئەڵمانیدا دەنوسێت: "رزگاربوونی هەر تاکەکەسێك کاتێك دێتە دی کە مێژوو بگۆرێت بە مێژووی جیهانی"[22]. مارکس ئەم رزگاربونە لە روداوی شۆرشی کۆمنیستیدا دەبینێت کە لە روانگەی مارکسدا جیاوازییەکی

بنـەڕەتی لەگـەڵ شۆڕشـەکانی دیـدا هەیـە: "تـا ئـەمڕۆ هـەموو شۆڕشـەکان شـێوەی شـتەکانیان بەدەسـت لێنـەدراوی هێـشتۆتەوە...لـەبری ئەمـە شۆڕشــی کۆمنیــستی بــە راپــەڕین دژی شــێوە دێرینەکانی شتەکان، خۆی لەکار رزگاردەکات و بە لەناوبردنی چینەکان، کۆتایی بە بالاَدەستی هەموو چینەکان دێنێت. لەو رووەوە ئەم شۆڕشە بەرهـەمی چینێکە کـە خـاوەن پلـەی چینایەتی نیـە لـە کۆمـەڵگادا و وەك چـینێك ناناسـرێت، بەمــشێوەیە لــەم ســاتەوەختەدا ئــەم چــینە نیشانەی لەناوچوونی هەموو چینەکان، هەموو نەتــەوەکان و...لەســەر شــانۆی کۆمــەڵگای هەنوکەیە"[23]. مارکس هـەروەها دەڵێت: "ئـەوە دروشمـی ئـازادی نیـە کـە مرۆڤـەکان هـەرجارێك لەپەیوەندیـدا بـەو دروشمـەوە خۆیـان رزگـار کردووە، بـەڵکو بـوونی هێزەکـانی بەرهەمهێنانـە کــە رێگەپێــدەر و ئامادەکــاری ئــەم ئازادیــە بوون"[24]. مارکس لەهەمان ساڵدا لە نامەیەکدا بە بـەرواری 28ی دیـسەمبەری 1869 بـۆ پـۆل ئـەنانکۆف ئـەم مەسـەلەیە بەشـێوەیەکی رونـتر روندەکاتـەوە: "کۆمـەڵگا لەهـەر شێوەیەکدا کـە ببێــت، چــیە؟ بەرهــەمی کــاری بەرامبــەری مرۆڤەکانـە. ئایـا مرۆڤەکان لـە هەڵبـژاردنی ئـەم یـان ئـەو شـکڵی کۆمەڵایەتیـەدا ئـازادن؟ بـەهیچ شــێوەیەك..پێویــست ناکــات ئــەوەش بڵــێین مرۆڤــەکان توانــای هەڵبــژاردنی هێزەکــانی بەرهــەمهێنانی خۆیــان نیــە (کــە بناغــەی مێژوویيان پێکدەهێنێت). چونکە هـەر هێزێکی بەرهــەمهێنان هێزێکــی وەرگــیراوە و بەرهــەمی رەفتاری پێشبینیە"[25].

مـارکس لـە 18 بـرۆمیری لـویی بوناپارتـدا جـارێکی دی ئـەم مەسـەلەیە دەهێنێتـە پێـشێ. مارکس دەنوسێت: "مرۆڤەکان مێـژووی خۆیـان دروستدەکەن، بەڵام نەك بەشێوەیەکی هەڵبژێراو نەك لە هەلومەرجێکدا کە هەڵیانبژاردووە، بەڵکو لـە هەلومەرجێکـدا کـە راسـتەخۆ لـە رابـردووەوە پێیــــان بەخــــشراوە و بــــەمیرات بۆیــــان ماوەتەوە"[26]. هەروەها مارکس لە نامەیەکدا بۆ کوگڵمـان لــە بــەرواری 11ی ژوئیــەی 1868دا ئاماژە بـۆ مەسـەلەی یاسـای رێکخـەر مێـژوو و شــێوە مێژووییــەکانی دەکــات و دەنوســێت: "گومـــانی تیـــا نیـــە شـــێوازی دیـــاریکراوی بەرهــەمهێنانی کۆمەڵایــەتی بــەهیچ شــێوەیەك پێویــستی دابەشــکردنی کــاری کۆمەڵایــەتی بــۆ بەشـە دیاریکراوەکـان لـەناونابات، بـەڵکو تـەنها دەتوانێــت شــێوەی روکەشــیەکانی بگۆڕێــت. هــەرگیز ناتوانرێـت یاسـا سروشـتیەکان لـەناو ببرێـت. ئـەوەی کـە لـە هەلومـەرجێکی مێـژوویی جیـاوازدا قـابیلی گۆڕانـە، تـەنها شـکڵێکە کـە لەرێگەیەوە ئەم یاسایانە کاردەکەن"[27].

هەنوکـە تەماشـای نوسـینێکی تـری مـارکس بکـەین کـە دەربـڕی نـاوەڕۆکی پـەیامی گرنگـی پرۆلیتاریایــە لــە مێــژوودا: " لــە ئــەڵمانیا لــە ســــەدەکانی ناوەڕاســــتدا دادگایــــەك لــــەژێر نـاوی"نـەریت و هـەموان" هـەبوو کـە تۆڵـەی لـە تاوانــەکانی فــەرمانڕەوا دەکــردەوە، هــەرکاتێك خانویــەك نیــشانەی خاچــی ســوری لەســــەر ببینرایـە، بەمانای ئـەوەبوو خاوەنەکـەی بەهـۆی "نەریت و هەموانەوە" دادگاییکراوە. لەبەرئـەوە هــەموو خانوەکــانی بۆرجوازیــەکانی ئــەوروپا، خـاوەنی نیشانەی نهێنیئـامێزی خاچـی سورە: قــازی مێــژووە و جێبەجێکــەری حوکمەکــەش پرۆلیتاریا"[28].

هەروەها دوا پـەرەگرافی مانیفیستی حیزبـی کۆمنیـست کـە لـە بیرەوەری هـەموو خوێنەرانـدا هەیە: "کۆمنیستەکان نایەنەوێت بە شاردنەوەی

بیروڕاو بەرنامەکانیان، سوکایەتی بە خۆیان بکەن. ئەوان بە راشکاوی رایدەگەیەنن ئامانجەکانیان تەنها لەڕێگەی روخانی زۆرەکی هەموو جۆرە سیستەمێکی کۆمەلاَیەتی رابردووەوە بەدەست دێت. با چینە بالاَدەستەکان لە وێنای شۆڕشی کۆمنیستی بلەرزن، پرۆلیتاریا شتێکی زیاتر لە زنجیرەکانی نیە بۆئەوەی لەدەستیبدات. ئەوان دنیایەکیان لەبەردەستدایە بۆئەوەی بەدەستی بێنن"[29].

ئەوەی لەم نمونەیەدا بۆ ئێمە گرنگە، ئەو دەورەیە کە مارکس و ئەنگلز بە مەسەلەی توندوتیژی لە مێژوودا دەیدەن. ئەنگلز لە ئەنتی دۆرینگدا باسی توندوتیژی وەك هۆکارێکی شۆڕشگێرانە دەکات. بە وتەی ئەنگلز: "توندوتیژی لە مێژودا خاوەن دەورێکی دی، دەورێکی شۆڕشگێڕانەیە. یان وەك مارکس دەلێت توندوتیژی مامانی هەر کۆمەلگایەکی کۆنە کە کۆمەلگایەکی تازەی لە هەناوی خۆیدا هەلگرتووە، و یان ئامێرێکە کە بەهۆیەوە جولەی کۆمەلاَیەتی بە لەناوبردنی شێوە سیاسیە بێ جولە و مردووەکان، بەسەریاندا سەردەکەوێت"[30].

دەکرێت ئەم بەشە لە وتاری مارکس لەبارەی توندوتیژیەوە کە ئەنگلز ئاماژەی بۆ دەکات، لە نەسکی سی و یەکی بەشی هەشتەمی بەرگی یەکەمی سەرمایەدا بدۆزرێتەوە. مارکس لێرەدا وشەی "زۆر" لەبری وشەی"توندوتیژی" بەکاردەهێنێت و دەنوسێت: "زۆر مامانی هەر کۆمەلگایەکی کۆنە کە لەکاردایە. زۆر هۆکارێکی ئابوریە"[31]. هەنوکە رەنگە زۆرێك لە خوێنەران پرسیار لەخۆیان بکەن کە مەسەلەی توندوتیژی بەچ ناونیشانێك لە درێژەی راستەوخۆی دیدی مێژوویی مارکسدا دادەنرێت؟ ئەوەی لای نوسەری ئەم دێرانە گرنگە، باسکردنی ئەو پەیوەندیەیە کە لەنێوان تیورەی "مەکری عەقلی مێژوویی" و مەسەلەی توندوتیژیدا هەیە. وەك بینیمان مارکس وەك هیگل مێژوو وەك پرۆسەیەکی لۆژیکی_دیالەکتیکی رەچاودەکات. ئەم پرۆسەیە لە فەلسەفەی هیگلدا لە دیاردەناسی رۆحدا دەردەکەوێت کە لەرێگەی دۆزینەوەیەکی لۆژیکی _ مێژووییەوە بە هەقیقەتی خۆی دەگات. هیگل دەرئەنجامی ئەم حەماسەتەی دیالەکتیکی ویژدانی مرۆڤایەتی، بەهاوتا و یەکسانی تەواوی عەقل و واقع دەزانێت. بەمشێوەیە هیگل واقعیەتی جیهان وەك هەمەکیەکی عەقلانی دەهێنێتە پێشێ. ئەمەش رێك ئەو خالەیە کە سەرنجی مارکسی راکێشاوە. مارکس لە پێشەکی چاپی دوهەمی کتێبی سەرمایەدا دەنوسێت: "ئەو شۆکەی دیالەکتیك لەسەر دەستی هیگل بەهۆی فێلکاریەوە توشی دەبێت، بەهیچ شێوەیەك رێگر نیە لەوەی هیگل بۆ یەکەمجار بەشێوەیەکی کامل و هوشیار شێوە گشتیەکانی جولەی دیالەکتیکی دەربڕیووە. دیالەکتیك لای هیگل لەسەر سەر راوەستاوە. بۆئەوەی ناوەڕۆکە عەقلانیەکەی (ئەم دیالەکتیکە) ئاشکرا بێت، دەبێ هەلبگێڕێتەوە"[32]. ئەم "ناوەڕۆکە عەقلانیەی" دیالەکتیکی هیگل چیە کە مارکس بەنیازە هەلیگێڕێتەوە؟ لەراستیدا ناوەڕۆکی عەقلانی دیالەکتیکی هیگل پرۆسەیەکی لۆژیکی_بەرهێنانە(ئیستینتاج) کە عەقل لەرێگەیەوە واقعیەتی مێژووی جیهان، وەك هەمەکیەکی عەقلانی هەلدەسەنگێنێت. بەلاَم هاوتابوونی کاملی عەقل و واقع پێویستی بە تیورەی "مەکری عەقلی مێژوویی" هەیە.

چونکە عەقڵ تەنها کاتێك دەتوانێت واقعی جیهان وەك هەمەکیەکی عەقڵانی رابگەیەنێت کە بە ساختەیی رەگەزە ناچونیەك و ناعەقڵانیەکانی مێژووی مرۆڤایەتی لەبەرچاو بگرێت و فەرمانڕەوایی لۆژیکی سیستەمی عەقڵانی خۆی، لەبەرامبەریاندا بسەلمێنێت. مارکس ئەم پرۆسە لۆژیکیە _بەرهێنانەی فەلسەفەی هیگڵ وەك میتۆدێك لە کتێبی سەرمایەدا بەکاردەهێنێت. لێرەدا مارکس ناوەڕۆکی عەقڵانی لۆژیکی هیگڵی، بۆ هاوتاکردنی عەقڵی ئابوری و واقعی جیهانی بەکاردەهێنێت، و خوێنەر بونیادی سێ قۆناغی دیالەکتیکی هیگڵی لە کۆمەڵەی دیالەکتیکی: کالا-دراو-سەرمایەدا دەدۆزێتەوە. هەنوکە بۆ تێگەیشتنی باشتر لە رەوتی دروستبونی دیالەکتیکی سەرمایە، دەبێ بگەڕێینەوە بۆ بەرگی یەکەمی گرۆندریسەی مارکس. مارکس لە پەرەگرافی46ی نەسکی چوارهەمی بەرگی یەکەمی گرۆندریسەدا دەنوسێت: "ئەو پێشەکیانەی لەسەرەتادا وەك مەرجی دروستبوون و پێکهاتنی سەرمایە بوون و بونیان نەیدەتوانی دەرئەنجامی کارکردنی سەرمایە بێت، هەنوکە دەرئەنجامی سودخوازی سەرمایەدارانە دەردەکەون و واقعێکن کە خۆبەخۆ پەیدا بوون. لێرەدا چیدی مەرجەکانی دروستبوونی سەرمایە نین، بەڵکو دەرئەنجامی بوونی زیندوو ئامادەی سەرمایەن. سەرمایە بۆ گەشەکردنی خۆی چیدی پێویستی بە پێشەکی دەرەکی نیە، بەڵکو بەپێی بوونی خۆی گەشەدەکات، لەسەرپێی خۆی راوەستاوە و دروستکەری مەرجەکانی پاراستن و پەرەسەندنی خۆیەتی"[33]. بەدەربڕینێکی دی بەوتەی مارکس: "پرۆسەی مێژوویی بەرهەمی سەرمایە نیە، بەڵکو پێشەکیەکەیەتی"[34].

کەوابوو لە دیدی مارکسەوە مێژووی مرۆڤایەتی ئاشکراکەری دروستبوون و گۆڕانی سەرمایەیە. ئالێرەدا دیدی مێژوگەریانەی مارکس رێك لە ئاراستەی فەلسەفەی مێژووی هیگڵدا رادەوەستێت. هیگڵ لە پێشەکی چەند وانەیەك لەبارەی فەلسەفەی مێژوەوە دەنوسێت: "مێژووی جیهان هیچ نیە جگە لە دەرکەوتنی عەقڵێکی یەکتا. مێژووی جیهان وێنا و بەرهەمی عەقڵە"[35]. کەوابوو بەپێی ئەم روانگەیە، مێژووی مرۆڤایەتی هێڵێکی پێویست و دیاریکراوی هەیە کە وەك یاساگەلێکی هەمەکی و ناچارانە و لە دەرەوەی ئیرادەی مرۆڤەکان، دیاریکەری پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکانیانە. لێرەوە پەیوەندی نێوان کرێکار و سەرمایەدار بەناچار پەیوەندیەکی زۆرداریە، چونکە دەرکەوتنی چەمکی سەرمایە رێگە بەهیچ پەیوەندیەك جگە لەوە نادات. بە وتەی مارکس: "نە لە مێژوودا ئەو خەیاڵە جوانانە هەیە کە تیایدا سەرمایەداران و کرێکاران دەستیان خستۆتە ناو دەستی یەکەوە، و نە دەتوانرێت جێ پێی (ئەم خەیاڵە) لە گۆڕانەکانی چەمکی سەرمایەدا بدۆزرێتەوە"[36].

وەك دەبینین مارکس بەدوای هیگڵدا مێژووی مرۆڤایەتی بە پرۆسەیەکی "لۆژیکی-بەرهێنانی خۆدەرکەوتنی چەمکێك دەزانێت و هەر لەبەرئەمەش بە درێژەپێدەری نمونەی ئەنتۆلۆجیای هیگڵی (کە عەقڵانیبوونی تەواوی واقع رادەگەێنێت) دادەنرێت. مارکس خۆی ئەم مەسەلەیە بەمشێوەیە دەخاتە روو "گەورەترین شایستەبوونی دیاردەناسی هیگڵ و دەرئەنجامە

ئامانجەكەی دیالەكتیكی نێگەتیڤ، وەك بنەمایەكی بزوێنەر و خوڵقێنەر، لەم مەسەلەیەدا كورت دەبێتەوە: هیگڵ خۆخوڵقێنەری مرۆڤ وەك پرۆسەیەك لەبەرچاو دەگرێت.."[37]. سەرنجی ماركس بۆ مێژوو وەك "پرۆسەیەك"، نەك وەك "پێشكەوتن"، پەیوەندی بە دیدی هیگڵیانەی ماركسەوە هەیە. هیگڵ لە دیاردەناسی رۆحدا "رەگەزی فەلسەفە بە پرۆسەیەك (ناودەبات) كە قۆناغەكانی خۆی پێكدەهێنێت و دەپێوێت"[38].ماركس بەنۆبەتی خۆی مێژووی دەركەوتنی چەمكی سەرمایە وەك پرۆسەیەك لەبەرچاو دەگرێت. جیاوازی سەرەكی لەنێوان "پرۆسە" و "پێشكەوتندا" ئەوەیە پرۆسە لە قۆناغگەلێكی دیاریكراو پێكهاتووە كە هەمویان دەركەوتنی یەك چەمك، جەوهەر یان وێنایەكە كە بە ئاراستەیەكی دیاریكراو و بەهۆی ئەنجامێكی ئامانجیەوە و بەشێوەیەكی دیالەكتیكی بەرز دەبێتەوە. لێرەوە پرۆسە بەناچار جوڵەیەكی هێڵی هەیە كە وەك تیرێك لە كەوانێكەوە دەربچێت، تا گەیشتن بە مەبەستی دیاریكراو لە قۆناغەكان تێدەپەرێت. بەڵام پێشكەوتن خاوەنی ئەم جوڵەیە نیە. جوڵەی پێشكەوتن دەكرێ وەك باسكال بەشێوەیەكی مارپێچ و شكاوە ببینین. بەمشێوەیە پێشكەوتن لە مێژوودا بەشێوەی داكشان و هەڵكشانی دەریا دێتە پێشێ و دەرواتە دواوە. ئێمە لە مێژوودا بەرەو شوێن و كاتی دیاریكراو نارۆین، و هەر پێشكەوتنێك بەرزكردنەوەی دیالەكتیكی قۆناغێكی مێژوویی زیاتر نیە. لەم روانگەیەوە هەندێك لە دەزگا كۆمەڵایەتیەكانی سەردەمی كۆن بەچەندانجار پێشكەوتوترن لە بەربەریەتی زۆرێك لە دەزگا كۆمەڵایەتیەكانی ئەم دوا سەدەیە. لێرەوە تەماشاكردنی مێژوو وەك پرۆسە تەنها لەچوارچێوەی مێژووگەریدا دەبێت كە لەپێشبوونی دیترمینیزمی (جەبریەت) مێژوویی بەسەر هەڵبژاردنی ئیرادەی ئازادی مرۆڤەكاندا رادەگەیێنێت.



بەدەربڕینێكی دی تا ئەوكاتەی مرۆڤەكان بۆ ئازادی و سەربەخۆی خۆیان لەسەر شانۆی كۆمەڵایەتی خەباتدەكەن، رزگاریان لەدیدی بیركردنەوەی مێژووگەرییەوە تەنها لە پەیوەندیدا بەو دەزگا كۆمەڵایەتیانەی لەپێشەوە دیاریكراون، مانا و چەمكی واقعی خۆیان وەردەگرن. رێك وەك ئەوەی بڵێین هەموو خەباتەكانی مرۆڤ بۆ بەدەستهێنانی ئازادی و سەربەخۆی خۆیان لە كۆمەڵگادا (لەوانە خەبات لەپێناوی ژینگەدا، بزوتنەوەی كرێكاران، خەبات لەپێناوی مافی ژناندا، خەبات لەپێناو مافەكانی مرۆڤدا...) بەئاراستەی بەدیهاتنی سۆشیالیزم ئەنجامدەدرێت. ئەمرۆ لە ئەوروپادا زوربەی ئەم

بزوتنەوە رزگاریخوازانە لەدژایەتی ئایدۆلۆژیای کۆمۆنیزم و واقعی سۆشیالیستیدا ئەنجامدەدرێت (لەوانە بزوتنەوەی سەندیکایی پۆڵەندا، بزوتنەوەی سەوزەکان لە ئەڵمانیا، هۆڵەندا، سویدو..و خەباتەکانی مافی مرۆڤ و رێکخراوگەلێکی وەك لێبوردنی نێونەتەوەیی). ئایا ئەمە بەمانای ئەوەیە کە هەموو ئەم بزوتنەوە کۆمەڵایەتیە رزگاریخوازانە، بەهۆی نەبوونی رەنگ و بۆنی کۆمنیستیەوە، بەئاراستەی پێچەوانەی مێژوەوە هەنگاو دەنێن؟ بەمشێوەیە گەر راگەیاندنی جیهانی مافەکانی مرۆڤی 1948 وەك قۆناغێك لە پرۆسەی لۆژیکی —بەرهێنانی مێژوو بزانین، ئەوا بونیادی دیالەکتیکی ئەم پرۆسەیە دەخوازێت ئەم راگەیاندنە وەك سروشتێکی کۆمەڵایەتی، لە شکڵێکی مێژوویی تازەدا بەرزبکرێتەوە. لەم حاڵەتدا دەبێ ببینرێت ئەم شکڵە مێژووییە تازەیە چیە کە هەموو خەسڵەتە جەوهەریەکانی راگەیاندنی مافەکانی مرۆڤی هەیە، بەڵام خۆی قۆناغێکی دیالەکتیکی کاملترە لەو. وەك دەبینین لەرووی ئەم روانگەیەوە سروشتی کۆمەڵایەتی مافەکانی مرۆڤ، وەك ئامانج ناهێنرێتە پێشێ، بەڵکو ئامانجی سەرەکیە قوناغێك لە بەجیهانیبوونە. مارکس ئامانجی سەرەکی بەرنامە سیاسیەکەی خۆی بە گەیشتن بە کۆمەڵگایەکی بێ چین لەرێگەی دیکتاتۆری پرۆلیتاریاوە دەناسێنێت. لەنامەیەکدا بۆ جۆزێف ڤیدە مایەر لە بەرواری 5ی مارسی 1852 دەنوسێت: "ئەو شتە نوێیەی کە من هێنامە ئاراوە لەم بەڵگاندنەدا کورت دەبێتەوە: 1-بوونی چینەکان تەنها بەستراوە بە قۆناغی دیاریکراوی دەرکەوتنی مێژووی بەرهەمهێنانەوە. 2-خەباتی چینایەتی بەناچار بە دیکتاتۆری پرۆلیتاریا دەگات. 3- ئەم دیکتاتۆریەتە خۆی بریتیە لە گوزەرێك بۆ لەناوچوونی هەموو چینەکان و کۆمەڵگای بێ چین"[39]. بەهەمانشێوە مارکس لەساڵی 1871دا بە ئۆژن و رمرش رادەگەیێنێت: "کۆمەڵگا بەشێوەیەکی مێژوویی ناچارە بە دیکتاتۆری پرۆلیتاریادا تێپەرێت"[40]. هەروەها لەنامەیەکدا بۆ فەرد بۆڵت لە بەرواری 23 نۆڤەمبەری 1871دا دەنوسێت: "ئامانجی بزوتنەوەی سیاسیی کرێکاران بێگومان دەست بەسەراگرتنی دەسەڵاتی سیاسیە بۆ خۆی"[41]. مارکس لە رەخنەکردنی بەرنامەی گۆتادا جارێکی دی دەگەرێتەوە بۆ ئەم مەسەلەیە: "لەنێوان کۆمەڵگای سەرمایەداری و کۆمەڵگای کۆمنیستیدا، قۆناغێکی گۆرانی سیاسی هەیە کە تیایدا دەوڵەت جگە لە دیکتاتۆری پرۆلیتاریا هیچی دی نیە"[42]. جەختکردنی زیاد لە سنوری مارکس لەسەر "دیکتاتۆری پرۆلیتاریا" رێگرێکی تازەیە بۆ هێنانە ئارای مەسەلەی مافەکانی مرۆڤ لە سیستەمی بیرکردنەوەی مارکسیدا. ئەوەی مارکس ئەم چەمکەی لە چ ئەزمونێکی کۆمەڵایەتیەوە وەرگرتووە، تەنها گرنگیەکی ئەرشیفیانەی هەیە. مەسەلەی سەرەکی بۆ خوێنەری مارکس شێوەی سودوەرگرتنی مارکسە لە وشەی دیکتاتۆر لە چەمکی "دیکتاتۆری پرۆلیتاریا"دا. بۆچی دیکتاتۆری و نە دیموکراسی؟ کەم کەس هەیە گومان بکات لەوەی مارکس وەك بیریارێکی سیاسی ئاگادار، بەباشی جیاوازی ئەم دوو چەمکە دەزانێت. کەوابوو سودوەرگرتنی مارکس لە وشەی "دیکتاتۆری" بەمەبەست و هوشیارانەیە. مارکس دەیتوانی لێرەدا بەباشی لەبری

دیکتاتۆری وشەی دیموکراسی بەکاربهێنێت. بەڵام ئەو ئەم کارەی نەکرد. لەبەرچی؟ ئایا ئەمە بەمانای ئەوەیە مارکس دژی دیموکراسی و لەگەڵ دیکتاتۆریدایە؟ بێگومان ئەم ئەنجامگیریە لەبارەی کەسێکی وەك مارکسەوە کە بەردەوام بەدرێژایی ژیانی خۆی لەپێناوی بەدیهاتنی ئازادیەکانی هاولاتیە کرێکارەکاندا هەوڵیداوە، بێ بنەما و بێ بناغەیە. هەرچەندە ناکرێت لەم بوارەدا باسی مارکس وەك بەرگریکاری مافی هاولاتیانی مەدەنی بکرێت. چونکە مارکس بەرگری لە مافی ئەو کەسانە دەکات کە بەبڕوای خۆی لەمافی هاولاتیبوون بێبەشن. بەوتەی رۆبل: "مارکس تەنها لەبارەی کرێکارانەوە قسەی نەکردووە، بەڵکو لەگەڵ کرێکاراندا و بۆ کرێکاران قسەی کردووە"[43]. بەڵام ئایا شتێکی لەمچەشنە بۆ بۆرژوازیش راستە؟ نا! بۆرژوازی بابەتی قسەکردنی مارکسە، بەڵام قسەیەك لەگەڵ بۆرژوازیدا و بۆ بۆرژوازی ناکات. لەبەرئەوە بۆرژوازی لە بەرنامەی سیاسی مارکسدا دەورێکی نێگەتیڤی هەیە. لەبەرنامەی سیاسی مارکسدا پرۆلیتاریا تاکە بکەرێکی کۆمەلایەتی سیاسەتی کۆمەڵگای داهاتووە. بەدەربڕینێکی دی ئەگەر پرۆلیتاریا بۆ رزگارکردنی خۆی پێویستی بە روخانی بۆرژوازی هەبێت، کەوابوو لەرووی لۆژیکیشەوە ناکرێت بەرگریکردن لە مافەکانی هاولاتیە بۆرژوازیەکان تەنانەت لەناو بەرنامەی سیاسی مارکسدا بێت. مارکس لەناوبردنی بۆرژوازی بەدەستی پرۆلیتاریا، وەك کردارێکی مێژوویی پێویست هەڵدەسەنگێنێت. بەڵام مارکس هەروەها جەخت لەسەر رەهەندی زۆرەکی ئەم کردارە کۆمەلایەتیە دەکات و هاوڕێ لەگەڵ ئەنگلزدا لە مانیفێستدا دەنوسێت:

"پرۆلیتاریای هەر ولاتێك دەبێت بەر لەهەر شتێك کۆتایی بە بۆرژوازی ولاتەکەی بێنێت... پرۆلیتاریا بناغەی دەسەلاتی خۆی لەسەر بنەمای روخانی زۆرەکی بۆرژوازی دادەمەزرێنێت"[44]. سودوەرگرتن لە وشەی "زۆرەکی" لێرەدا رێکەوت نیە، چونکە لەدیدی مارکسدا پەیامی مێژوویی پرۆلیتاریا بۆ رزگاری مرۆڤایەتی، تەنها لەرێگەی توندوتیژی شۆرشگێرانەوە مومکینە. دامەزراندنی دەزگای دیکتاتۆری پرۆلیتاریا (ئەگەرچی ماهیەتێکی کاتی و تێپەڕی هەیە) پێویستی بە لەناوبردنی بۆرژوازیە. لەم حاڵەتەدا ئەگەر قبوڵمان بێت مارکس وشەیەکی لەبارەی کوشتنی مرۆڤە بۆرژوازیەکانەوە نەهێناوەتە سەر کاغەز ، بەڵام گومانی تیا نیە کە توندوتیژی بە هۆکارێکی لەناوبردنی بۆرژوازی زانیووە.

هانا ئارنێت لە کتێبی شۆڕشدا بە کورتی ئاماژەی بۆ ئەم مەسەلەیە کردووە. هانا ئارنێت دەنوسێت: "مارکس و لینین بونیادی دەوڵەتە تاك نەتەوەییەکانیان بە بناغەی بیرکردنەوە دانا و لێرەوە شۆرشیان بە هۆکارێك بۆ گرتنە دەستی دەسەلات و دەسەلاتیشیان بەمانای سودوەرگرتن لە ئامێرەکانی کاری توندوتیژی دەزانی"[45].

لێرەوە یەکێکی تر لەو هۆکارانەی ئاشتکردنەوەی نێوان بەرنامەی سیاسی مارکس (و نەك کەسایەتیە مێژووییەکەی مارکس) و مافەکانی مرۆڤ نامومکین دەکات، مەسەلەی شۆڕش و روخانی زۆرەکی کۆمەڵگای بۆرژوازیە. ئەگەر مافەکانی مرۆڤ بەیەکێك لە سروشتە یاساییەکانی کۆمەڵگای بۆرژوازی بزانین و هەروەها قبوڵمان بێت ئامانجی

بەرنامەی سیاسی مارکس، لەناوبردنی کۆمەڵگای بۆرژوازیە، ئەوا دەتوانین لەم پێشەکیەوە بەوە بگەین کە سروشتی کۆمەڵایەتی مافەکانی مرۆڤ، بە لەناوچوونی کۆمەڵگای مەدەنی بۆرژوازی لەناودەچێت. کەوابوو لێرەدا دەبێت لەنێوان سروشتی یاسایی مافەکانی مرۆڤ وەك سروشتی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگای مەدەنی بۆرژوازی و بەرنامەی سیاسی مارکس، یەکێکیان هەڵبژێرن. چونکە جگە لەمە دەکرێ مافەکانی مرۆڤ وەك فەرمودەکانی خوداوەندی بان کۆمەڵگای بۆرژوازی دابنێین و ئەو دەرئەنجامە وەربگرین کە بە لەناوبردنی کۆمەڵگای بۆرژوازی و نەهێشتنی لە کۆمەڵگای بێ چیندا، هیچ گۆڕانێك لە ماهیەتی مافەکانی مرۆڤدا وەك سەرچاوەیەکی بان کۆمەڵایەتی روونادات، بەڵام مافەکانی مرۆڤ خۆی یەکێکە لە گرنگترین رەگەزە پێکهێنەرەکانی فەزای گشتی کۆمەڵگای مەدەنی. لەم روانگەیەوە رێزگرتن لە مافەکانی مرۆڤ، هۆی پێویستە بەڵام بەس نیە بۆ بوونی دیموکراسی لە کۆمەڵگایەکدا. یەکێکی دی لە ئامانجەکانی مافەکانی مرۆڤ، رێگرتنە لە باڵادەستی فەزای گشتی بەسەر فەزای تایبەتی مرۆڤەکاندا لەرێگەی جیاکردنەوەی ئەم دوو بوارە کۆمەڵایەتیەوە. ئەم جیابونەوەیە لەبیرکردنەوەی سیاسی تازەدا، وەك جیابونەوەی دەوڵەت لە کۆمەڵگای مەدەنی دەردەکەوێت. بەڵام وەك پێشتر بینیمان یەکێك لە جەمسەرە سەرەکیەکانی بەرنامەی سیاسی مارکس سڕینەوە و لەناوبردنی جیابونەوەی کۆمەڵگای مەدەنی و دەوڵەتە بەهۆی شۆڕشەوەو بەئاراستەی بونیادنانی کۆمەڵگایەکی مێژوویی تازە. بەپێی ئەوەی گوترا مەسەلەی شۆڕش لەو کۆمەڵە مەسەلانەیە کە ئاشتکردنەوەی دو تێزی مارکسیزم و مافەکانی مرۆڤ نامومکین دەکات. هەنوکە با ئەم مەسەلەیە بەشێوەیەکی وردتر تاوتوێبکەین.

بێگومان ئەوەی لەهەر شۆڕشێکدا رەچاو دەکرێت، مەسەلەی دامەزراندنی ئازادیە. بەڵام ئایا شۆڕش تاکە رێگەی دامەزراندنی ئازادیە، یان رێگەی کۆمەڵایەتی دیش هەیە کە تاقیبکرێنەوە؟ بەبڕوای نوسەری ئەم وتارە مرۆڤانەترین دەستگەیشتن بە ئازادی سیاسی، واتە بەشداریکردنی تاکەکانی کۆمەڵگا لە بەڕێوەبردنی مەسەلەکانی کۆمەڵگادا، لەرێگەی بەرگری مەدەنیەوە مومکینە. گونجاوترین رێگە بۆ دەستگەیشتن بە مافەکان و شێوەکانی تری بەرگری مەدەنیانە کە بەئاراستەی نەفیکردنی توندوتیژیدا ئەنجامدەدرێت، گونجاوترین رێگەیە بۆ دەستگەیشتن بە مافە خوازراوەکان لە چوارچێوەی بنەماکانی مافەکانی مرۆڤدا. کەوابوو بەشێوەیەکی دی دەبێت بۆ گۆڕانی دەزگاکانی کۆمەڵگا لەنێوان شۆڕش و ریفۆرمدا یەکێك هەڵبژێرین. ریفۆرم گۆڕینی دەزگا و سروشتەکانی کۆمەڵگایە لەرێگەی ناتوندوتیژیەوە، لەکاتێکدا شۆڕش گۆڕان و گۆڕینی ئەم سروشت و دەزگایانەیە لەرێگەی لەناوبردنی مرۆڤەکان و شتەکانەوە. هەنوکە دەبێ ببینین بیرکردنەوە و کاری مافەکانی مرۆڤ لە شۆڕشەوە نزیکترە یان لە ریفۆمەوە. بێگومان مافەکانی مرۆڤ تێزێکی شۆڕشگێڕانە نیە، چونکە بنەمای ریفۆرمی کۆمەڵگا، لەرێگەی یاسا و بێ دەستبردن بۆ توندوتیژی ئەنجامدەدرێت. لەدیدی مافەکانی مرۆڤەوە مەسەلەی گۆڕینی دەزگایەکی سیاسی لە کۆمەڵگایەکدا، بەستراوە بە ریفۆرمی دیموکراتی

یاسا وەك فەزای گشتی و سەربەخۆیی بڕیاردان لەبارەی مەسەلە کۆمەڵایەتیەکانەوە. لێرەوە مافەکانی مرۆڤ نەیارێکی جەوهەری سیاسەتێکە بەمانای ستراتیژی دەسەڵاتگرتنە دەست بێت لەرێگەی دەسەڵات و فەرمانڕەوای گروپێکی کۆمەڵایەتی بەسەر گروپەکانی دی کۆمەڵگادا. لەلایەکی دیەوە ئەو بەرنامە شۆڕشگێڕانەیەی کە توندوتیژی بە تاکە ڕێگەی لەناوبردنی گوێڕایەڵی و کویلەیەتی دەزانێت، لە ئاراستەی پێچەوانەی مافەکانی مرۆڤدا دەجولێتەوە. بەدەربڕینێکی دی ناکرێت بە توندوتیژی خەبات دژی گوێڕایەڵی و کۆیلەیەتی بکرێت، چونکە توندوتیژی خۆی دورستکەری گوێڕایەڵی و کۆیلەیەتیە.

لەدەقە سەرەکیەکەدا هاتووە کە جیاوازی هەیە. (و.ك).

**پەراوێزەکان:**

1) مارکس، نقد فلسفه حقوق هگل، ترجمه فارسی،انتشارات مزدك،ص2

2) هگل: پدیدارشناسی روح، بخش"ازادی مطلق و ترور"زمتن المانی/چاپ 1952،ص414، ترجمه فرانسوی هیبولیت، انتشارات اوبیه مونتی،جلد دوم:ص 130

3) مارکس، "رونکردنەوەیەکی رەخنەگرانە لەپەراوێزی وتاری شای پرۆس و ریفۆرمی کۆمەڵایەتی بەقەڵەمی پرۆسیەك" لە بەرهەمەکانی مارکس، بەرگی سێهەم، ص407

4) ه.س.پ ص410.

5) مارکس، بەرهەمەکامی مارکس، مەسەلەی یەهود، پلیاد، بەرگی سێهەم، لا359.

6) ه.س.پ.لا366

7)ه.س.پ. لا 365

8) رێنێ کاستن، جزوه 37 انستیتو فرانسه،1950.

9)مارکس، اثار مارکس. "مسئلەی یهود"،پلیاد، جلد سوم، ص76.

10)ه.س.پ، ص367.

11)ه.س.پ، ص368.

12)مقدمه بر اثار جوانی مارکس، پلیاد، جلد سوم،ص45.

13) مارکس، اثار مارکس ، پلیاد، جلد سوم، ص901 .

14) ئەم تەفسیرە لەدرێژەی بیروڕای ئەریك ویل لەوتاری "مارکس و فەلسەفەی یاساکان" لە پەراوێزی کتێبی هیگڵ و دەوڵەتدا، رادەوەستێت.

15) اثار مارکس ،پلیاد، جلد سوم،ص363

16)نقد اموزه هگلی دولت، در مارکس اثار جوانی، انتشاران پبنگوئن، 1975،ص88.

17)مارکس و نقد فلسفه حقوق هگل، ترجمه فارسی، انتشارات مردك، ص11.

18) ه.س.پ.ص2.

19) خانواده مقدس، در اثار مارکس. پلیاد، جلدسوم، ص460.

20)گ،و،هگل: عقل در تاریخ، ترجمه حمید عنایت، انتشارات علمی دانشگاه صنعتی اریامهر، ص31و32.

21) لویی التوسیر: برای مارکس، انتشارات ماسپرو، 1975، ص167-183.

22) ر.ك: ایدئولوژی المانی، اثار مارکس پلیاد جلد سوم. ص1070.

23) ه.س.پ. ص1123.

24) ه.س.پ ص 315

25) در: برگزیده اثار مارکس ترجمه روبل، جلد لول، انتشارات پایو،،1970، ص123.

26) مـــارکس: 18 برمـــر لـــۆئی بناپـــارت، ترجمـــه فرانسوی، ادیسون سوسیال،1976، ص15.

27) ر.ك: كـارل مـارکس، نامـههای بـه كوگلمـهن، نیویورك،1934،ص73.

28) ر.ك: مـــارکس، وتاربێژیـــهك لهبـــهرواری 19ی ئاڤریـــل بـــه بۆنـــهی ســـاڵیادی ئۆرگـــانی شارنـــشینی "رۆژنامـهی جـهماوهر"/ لـه: برگزیـده اثـار مـارکس ترجمـه روبل، جلد دوم، انتشارات پایو، 970.

29) ر.ك: مـــارکس–انگلـــز، مانیفـــست حـــزب کمونیست، انتشارات 18\10 ، پاریس، 1964، ص61.

30) انگلز، انتی دورینگ، ایدسون سوسیال، قسمت دوم، فصل چهارم،ص216.

31) ر.ك: مـــارکس، ســـرمایه، جلـــد اول، ادیـــسون سوسیال،پاریس1976،ص 548.

32) ر.ك:مارکس، سرمایه،جلد اول، انتشارات حزب توده، ص60.

33) ر.ك: مراكس، گروندریسه(مبانی نقد اقتصاد سیاســی)، جلــد اول ترجمــه فارســی، انتــشارات اگــاه، تهران، 1363. ص453–454.

34) ه.س.پ. ص514.

35) ر.ك: هگـل، خـرد در تـاریخ ، ترجمـه فرانـسه. انتشارات 18\10، پاریس 1965. ص49.

36) مارکس، گروندریسه: ترجمه فارسی، انتشارات اگاه، ص515.

37) مارکس، مجموع اثار پلیاد، جلد دوم، ص125.

38) ر.ك" هگـــل، پدیدارشناســـی روح، ترجمـــه فرانسه، هیبولیت، پاریس،1939، جلد اول انتشارات اوبیه، ص40.

39) مـارکس، برگزیـده اثـار مـارکس. ترجمـه روبـل، انتشارات پایو، جلد دوم، ص، 80.

40) ه.س.پ ص81.

41) ه.س.پ. ص92.

42) مـارکس، نقـد برنامـه گوتـا، ترجمـه فرانـسه، انتشارات پکن، 1975، ص26.

43) روبـل، مـارکس منتقـد مارکسیـسم، انتـشارات پایو، پاریس،ص9.

44)مـارکس و انگلـز، مانفیـست حـزب کمونیـست، انتشارات18\10. پاریس 1962.ص33.

45) هانـا ارنـت: انقلاب، ترجمه فارسـی، انتـشارات خوارزمی، ص364

## سەرچاوە:


رامـین جهـانبگلو: بـین گزشـته و اینـده. تهـران، نشر نی 1384

# مافی مرۆڤ، مافی جیهانگیر

نەجات بەهرامی

لەفارسییەوە: ئاریا ئەحمەدی

ئەم نووسینە لە بنەڕەتدا، بەرگریکردن لە جیهانگیربوونی ماف مرۆڤ و پێداگریکردنی ئەو بانگەشەیە، کە ئەم بابەتە سەرباری جۆرەکانی کولتوور، مەزهەب و سیاسەت، مافێکی جیانەکراوەی جۆری مرۆڤ لە جیهاندایەو هەرجۆرە لەکەدارکردن یاخود پێناسەکردن و هێڵکێشی بۆ بابەتەکە لەسەر بنەمای دین و کولتوورو ئایدیۆلۆژی و ... ، بێوەفاییەکی حاشاهەڵنەگرو ستەمێکی گەورەیە لە مافی مرۆڤایەتی.

بۆ تێگەیشتن لە چەمکی مافی مرۆڤ، پێویستە بگەین بە جۆرێك لە پێناسەکردن و ڕوانین لە مرۆڤ، کە ئەو جۆرە ڕوانین و پێناسەکردنەکەش بەدوور بێت لە بنەما ئەبستراکت و ئامانجخوازەکان و، لەسەر بنەمای تۆکمەو پتەوی دەرکەوتنی راستییەکان و ئەزموون بوەستێتەوە. نووسەر پێی وایە زۆربەی ئەو ئایدیۆلۆژی و ئاخێوانەی لەسەردەمی نوێدا سەریانهەڵداوەو هەروەها زۆربەی باوەڕە کلاسیکیەکان، لە پێناسەکردنی مرۆڤدا ڕێگەی ئامانجخوازییان گرتۆتە بەرو گرفتاری تەڵەی خەیالاتی و وەهمی بوون. چونکە مرۆڤ بەر لە هەر شتێك بوونەوەرێکی زیندووە کە کۆمەڵێك پێویستی ژینگەیی و فیزیۆلۆژیکی تایبەت بە خۆی هەیەو، پتر لە هەرجۆرە ئایدیاو هزرێکیش، دەبێت ئەم تایبەتمەندی و بنەمایە وەك پرنسیپی پێناسەکردنی مرۆڤ و هەڵوێستوەرگرتن دەربارەی مرۆڤ دابنرێت. ئەم تایبەتمەندییە کە لە لیبراڵیزمی کلاسیك و هزری مۆدێرن بەناوی ماف سروشتی هاتە ئاراوە، ڕیشەی لە فەلسەفەی یۆنانی کۆنیشدا هەبووە.

بنەمای ئەم باوەڕە لەسەر ئەم گریمانەیە وەستاوە، کە مرۆڤەکان خاوەن تایبەتمەندیگەلێکی هاوبەشن و ئەم تابەتمەندیانەش پێش ئەوەی بەرهەمی دین،

کولتور یان بڕیارێکی تایبەت بن، ڕیشەی لە تایبەتمەندیەکانی مرۆڤ وەك بوونەوەرێکی بان مێژوویی و بان مەزهەبی هەیە، بۆیە ئەو دەرکەوتانەش ناتوانرێت لە هیچ سەردەمێك و بە هیچ جۆرە بەڵگاندنێك لە مرۆڤ بستێندرێت.

مافی مرۆڤ پشتی بە جیهانگیریخوازی ئەخلاقی بەستووەو باوەڕی بە بوونی کۆمەڵگەیەك هەیە کە گشت مرۆڤەکان لەخۆبگرێت. جیهانگیریخوازی ئەخلاقی قایلە بە بوونی ئەو راستیە ئەخلاقیانەی کە بە شێوەی عەقلانی دەناسرێن و لەسەرووی کولتورو مێژوودا جێیان گرتووە. بە شێوەیەکی باو، سەرچاوەی جیهانگیریخوازی ئەخلاقی لە ئەوروپا، بۆ نووسینەکانی ئەرەستۆو ڕەواقیەکان دەگەڕێننەوە. بەم جۆرە، مافە سروشتیەکان بە مافگەلێك ژمێردران کە تاکەکان – سەربەخۆ لە کۆمەڵگەو سیاسەت – هەیانە. واتە مافە سروشتیەکان سەرباری ئەوەی کە ئایا یاسادانەر یاخود پەرلەمان بە فەرمی بیانناسن یان نەیانناسن، وەك بایەخی کۆتایی ئەژمار کران. شیکەرەوەی سەرەکی ئەم ڕوانگەیە، جۆن لۆك فەیلەسوفی سەدەی هەڤدەیەمە کە زۆربەی بەڵگاندنەکانی لە کتێبی دوو نامیلکە دەربارەی دەوڵەت لە 1688دا باس کردووە. بنەمای بەڵگاندنەکانی لۆك ئەم بانگەشەیە کە مافە سروشتیەکان، سەربەست لە پێکهاتەی کۆمەڵگەی سیاسین و لەپێشەوەی کۆمەڵگەی ڕامیاریدان. لۆك بەڵگەی ئەوەی هێنایەوە کە مافە سروشتیەکان لە یاسا سروشتیەکانەوە سەرچاوەیان گرتووەو چاوگەی یاسای سروشتیش خودایە. ناسینی ڕێکوپێکی ئیرادەی خوا، یاسایەکی ئەخلاقی دەخاتە بەردەممان کە خاوەن "سەرچاوە – مەرجەعیەت"ی کۆتایین. لە بنەڕەتدا هەموومان لەهەمبەر خوداوە ئەرکی پاراستنی جەوهەری خۆمان هەیە. بۆئەوەی ئەم ئەرکە بە سەرکەوتوویی ئەنجام بدەین، نابێت ژیان و ئازادی تاك و، هەروەها ئەو شتەی کە لۆك بە هۆکارە پۆزەتیڤە سەرەتاییەکانی پاراستنی نەفس ناویدەبات، واتە مۆڵکدارێتی تایبەتی، هەڕەشەی لێبکرێت.

لە سەدەی بیستەمدا، بابەتی مافەکانی مرۆڤ بالادەستی و دەسەلاتی خۆی بەسەر ژیانی کۆمەلایەتی و سیاسی مرۆڤدا بەرفراوان کرد. بە جۆرێك کەمتر کەسێك دەکەوتنە مشتومڕەوە لەمەڕ ئەم خاڵە کە مافی مرۆڤ مەسەلەیەکی زۆر گرنگ و پێویستە لە ژیانی ئینساندا. بەلام ئەوەی کە سەدەی بیستەمی لەبواری مافی مرۆڤەوە گۆڕی بۆ یەکێك لە تاریکترین قۆناغەکانی مێژووی مرۆڤایەتی و، کارەساتی مەزنی وەك کۆمەڵکوژی دروستکردو کارەساتی ئاشویتس و هۆلۆکۆستی لە کارنامەی خۆیدا تۆمار کرد، هەمان تێگەیشتن و لێکدانەوەی ئامانجخوازانەو ئایدیۆلۆژیك لە مرۆڤ و مەسەلەی مافەکانی مرۆڤ بوو، کە ئێستاش ترس لەم ئەبستراکت و سواربوونی شەپۆلەکانی خەیاڵ هەڕەشە لە مرۆڤی مۆدێرن دەکات. هەڕەشەیەك کە لە قاڵبگەلێکی وەك نەتەوەخوازی، دژایەتیکردنی سەرمایەداری، هەوڵدان بۆ دنیایەکی باشترو بانترو بالاتری مرۆڤ و خەیاڵەکانی دیکە دەردەکەون، کە هۆش و بیری هەندێك لە ڕۆشنبیران و سیاسەتمەدارانی داگیرکردووە.

کۆتاییهاتنی جەنگی جیهانی دووەم و ئەو لێدانە گەورەیەی کە دنیای هەژاندو لەخەودا ڕایچڵەکاند، هۆکارێکی کاریگەر بوو تا مرۆڤ

ناچار بە بیرکردنەوە دەربارەی مافەکانی مرۆڤ و ئاشتی بکات. جاڕنامەی جیهانی مافی مرۆڤ کە کارێکی یەکجار مەزن و مێژوویی لەو بوارەوە بوو، یەکێك لەو داهێنانانە بوو کە توانی هاوبەشییەکی مەزن بکات لە کانالیزەکردنی مافەکانی مرۆڤ و دانانی نەریتی نێودەوڵەتی بۆ بەرگریکردن لە مافەکانی مرۆڤ. ئەم جاڕنامەیە لەتەك پەیماننامەکان و جاڕنامەکانی دواتردا، دەستکەوتگەلێکی مێژوویی بۆ مرۆڤ بوون کە نزیکایەتییەکی زۆری لەگەڵ مافە سروشتی و بنەڕەتیەکانی مرۆڤ هەیەو بە لێهاتووییەوە دەکرێت بڵێین، هیچ مرۆڤێك نادۆزینەوە کە خاوەن مەزهەب و بڕوایەکی تایبەتی بێت، کە لەگەڵ مادەکانی ئەم جاڕنامەیەدا ناکۆك بێت، بەلام دژایەتیکردنی جاڕنامەکە تەنیا لەلایەن حکومەتە توتالیتارەکان، دیکتاتۆرەکان، ئایدیۆلۆژیکیەکان و خەیاڵییە کۆمەڵایەتیەکانەوەیە، کە ڕوانینی بنەمایی بۆ مافەکانی مرۆڤ و بۆ ئینسان و تایبەتمەندی و پێویستیەکانی، ئەو ستەمکارانە ئازار دەدات و ئەوانیش دەکەونە دژایەتیکردن لەگەڵ مافەکانی مرۆڤ یاخود بەلاڕێدابردن و چەواشەکردنی ئەو مافە مرۆیانە.

ئەگەرچی ڕەشنووسی جاڕنامەی جیهانی بەرهەمی ئامانجی جەنگی هاوپەیمانان بووە، بەلام جاڕنامەکە لە لیژنەیەك کە خاوەن پێشینە جۆراوجۆرەکانی کولتوری و جوگرافیایی بوو، پێکهات. بەشی دیارو گرنگی جاڕنامەکە لەسەر شانی نوێنەرانی هندستان و چین و لوبنان بوو، هەروەها نوێنەرانی شیلی و ئێران و میسریش بەشدارییان تێدا کرد. زۆربەی وڵاتانی ئاسیایی و ئەفریقایی لەو قۆناغەدا سەربەخۆییان نەبوو، بەلام لە کۆڕی گشتی پێکهاتوو لە 56 وڵات، 14 ئەندام لە ئاسیاو 4 ئەندام لە ئەفریقاو 20 ئەندام لە ئەمریکای لاتین بەشدار بوون. ئەندامە کۆمۆنیستەکان کە دەنگی بێلایەنییان دابوو، ڕەزامەندییان لەسەر مادەکانی پەیوەندیدار بە ئازادی تاکەکەسی پیشاندابوو، بەلام ترسی ئەو کۆمۆنیستانە لە لایەنگریکردنی جاڕنامەکە لە دیموکراسی بوو. بەم هۆیەشەوە، بۆ دڵڕاگرتنی کۆمۆنیستەکان




تەنیا یەك جار لە مادەی 29دا ئاماژەیان بەو وشەیە کردبوو. بەمپێیە، ئەو ڕەخنە گەلاڵەکراوانەی لە ماوەی دەیەکانی دواتر خرانە ڕوو سەبارەت بەو مەسەلەیەی کە جاڕنامەی جیهانی بەتەواوی بەها لیبراڵیەکانی خۆرئاوا وێنا دەکات، لە بواری مێژووییەوە ئەوەندە بایەخیان نییە.

هەڵبەت ئەم ڕەخنانە بە شێوەیەکی ڕوون و

ئابڕووبەرانە لەلایەن دوو گرووپەوە دەخرێنە ڕوو. گرووپی یەکەم بەرگریکەرانی کۆن و پارێزەرانی نەریتن، کە تێگەیشتن و لێکدانەوەی زۆر ئەرتۆدۆکسیانە لە مەزهەب پێشکەشی لایەنگرانیان دەکەن. ئەم گرووپە پتر لە هەر شتێکی دیکە، لە هەڕەشەی تێزە مەزهەبییەکان لەلایەن " یاسا "ی مۆدێرن و ڕەتکردنەوەی بەکارهێنانی مەزهەب لە بەڕێوەبردنی کاروبارە مرۆییەکاندا دەترسن. لەئەنجامدا هەوڵدەدەن تا لایەنگرانیان لە ریزی ئەو کەسانە بهێننە دەرێ کە یاسای مۆدێرن دەیانگرێتەوە، چونکە ئەو یاسایە بە دانان و دروستکراوی هێزری نوێ دەزانن و حاشا لە سروشتیبوونی ئەو مافانە دەکەن. مەترسی و هەڕەشەی زۆرەکانی ئەو کەسانە، هەڕەشە لە مافەکانی مرۆڤ ناکات، چونکە ڕیفۆرمخوازانی مەزهەبی خۆیان لە مشتومڕە مەزهەبییەکانی دینە جۆراوجۆرەکاندا، خەریکە پاشەکشێ بەم گرووپە دەکەن.

بەڵام گرووپی دووەم کە زۆر مەترسیدارتر لە گرووپی یەکەمن، ئایدیۆلۆژیستگەلێکن کە ئایدیۆلۆژیاکەیان لە دنیای مۆدێرن و بەپێی تێگەیشتنی ناتەواوو دۆگمانە لە مۆدێرنیزم شێوەی گرتووە. بەستێنە هزرییەکان و بیروبۆچوونەکانی ئەم گرووپە، ناوچەیەکی بەرین لە قەڵغانی هزری بناژۆخوازی ئیسلامی تا مارکسیزم و ئەندێشەی خوارو ئامانجخوازانەی چەپ و، هەروەها نەتەوەخوازی ڕادیکاڵانەو نەژادپەرستی لە ژێر ئالای خۆیدا کۆکردۆتەوەو، هۆگرییەکی سەیری بە قوربانیکردنی مرۆڤ لەپێناو "خەیاڵ و ئامانج"دا هەیە. گیانفیدایی و گیانفیداییکردن، شەهیدبوون و شەهیدکردن و ڕستە هاوشێوەکانی دیکە، بازنەی دەستەواژەکان و چوارچێوەی هۆشی ئەم گروپانە پێکدەهێنێت. لە کۆمەڵیك کەشی وەهادایە کە کوشتنی بێتاوانەکان و کارگەی مرۆڤ سووتاندن و بەکارهێنانی گەنجان وەك بۆمبە مرۆییەکان و ... لەگەڵ چەمگەلێکی پڕ زرق و برقی وەك سەرکەوتن بەسەر دوژمن، شەهیدبوون، بەرگریکردن لە خاك و ناموس و هتد، پاساوی بۆ دەهێندرێتەوەو بە شێوەی ئاسایی خۆی دەنوێنێت.

بەو هۆیەوە کە ئایدیۆلۆژییەکان لە بری هاوئاهەنگی لەگەڵ بابەتە جیهانیەکاندا، هەوڵی پێکهێنانی جیهانێك لەسەر بنەمای تێزەکانی خۆیان دەدەن و، دیاردەکان دەگۆڕن بە ڕاستییەك لە ئامانجەکانی خۆیان و توانای جێبەجێکردنی بابەتی مافەکانی مرۆڤیان نییە، هەولی دژایەتیکردن لەگەڵ مافە جیهانگیرە مرۆییەکان دەدەن و بەدوای داڕشتنەوەی هەمان ئەو مافانە لەسەر بنەمای تێزەکانی خۆیان دەبن. ئەمەش هەمان ئەو خاڵەیە کە لە سەرەوەدا ئاماژەم پێکرد، واتە هەوڵدان بۆ گۆڕینی کۆی بوارەکانی ژیان – تەنانەت مافە بنەڕەتی و سروشتیەکانی مرۆڤ وەك بوونەوەرێکی زیندوو – بەپێی دەرکەوتنی ڕاستیەکانی هزرە ئایدیۆلۆژیەکانیان. ئەو دەنگە نەیارو دژانەی کە لەم ڕۆژو ساڵانەدا لە زاری دیکتاتۆرەکان و حکومەتە ئایدیۆلۆژیکیەکانەوە دەبیستین سەبارەت بە خۆرئاوایی بوون یان لیبراڵبوونی مافەکانی مرۆڤ، هیچ لێکدانەوەو ڕاڤەکردنێکی دیکەی جگە لەمە نییە.

کوفی عەنان سکرتێری پێشووی ڕێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان لە وەڵامی پرسیارێکدا، دەربارەی جیهانگیربوونی مافەکانی مرۆڤ دەڵێت:

" پێم وایە چەندین جار دەربارەی جیهانگیربوونی مافەکانی مرۆڤ پرسیار کراوە. ئیزن بدەن وتەکانم بەم پەیڤە دەستپێبکەم. ڕەشنووسی جاڕنامەی جیهانی مافەکانی مرۆڤ لەلایەن گروپێکی بێوێنە لە بیرمەندان ئامادە کرا کە سەر بە هەموو کولتورەکان بوون و زۆربەشیان سەر بە وڵاتانی ناخۆرئاوایی بوون. ئەم قسەیە کە مافەکانی مرۆڤ لەلایەن کولتوری خۆرئاواوە سەپێندراوە، وەك شەخسی خۆم زۆر بە سوکایەتی دەزانم. سوکایەتی بە عەشق، بە کەرامەت، سوکایەتی بە عەشق بە ئازادی تاکەکەسی کە لە ناخی هەر تاکێکی ئەفریقی، ئاسیایی، ئەمریکای لاتین، ئەمریکایی و ئەورووپی ئامادەیە. مافەکانی مرۆڤ تاکەکەسین و لە جەوهەری هەر تاکێکدا بەشێوەیەکی سروشتی هەیە. ئەم مافانە پەیوەندی بەوەوە نییە کە چی حکومەتێك ئەو مافانە بە ئێوە دەدات یان نادات. ڕیشەی مافەکانی مرۆڤ لەناو گشت دینە مەزنەکاندا هەیە. ئێوە سەر بە هەر مەزهەب و ئاینێك بن، ئەگەر ئاوڕێك لە کتێبە مەزهەبیەکەی خۆتان بدەنەوە، بۆتان دەردەکەوێت کە فێرتان دەکات: بە پشوو، دژەخۆ قبوڵکەر، یەکسانخواز، بە ویژدان و هتد بن. کەوابوو مافەکانی مرۆڤ دەربارەی هەڵکردنە لەگەڵ ناکۆك، ڕێزگرتن لە ئەوانی دیکە، ڕێزگرتن لە جۆراوجۆری و هەمەچەشنی و ڕێزگرتن لەو دینانەی کە ئەوانی دیکە بە پیرۆزی دەزانن. من وا بیر دەکەمەوە کە کاتێك سەیری مافەکانی مرۆڤ بکەیت و بەڕاستی شرۆڤەو ڕاڤەی بکەیت، بەشێوەی بنەڕەتی گشت ئەو بانگەشانە لەوانە ئەم ڕستەیە کە " مافەکانی مرۆڤ سەپێندراون، ئەم مافانە لەگەڵ کولتوری ئێمەدا ناکۆکیان هەیە"، هەڵەن و من قبوڵیان ناکەم.

**سەرچاوە:**

ماڵپەری ئافتاب نیوز

http://www.aftabnews.ir/vdcb0wbrh5b5z.html

# ئایا ئەخلاقێکی جیهانی بوونی هەیە؟

جۆن هیك

لە ئینگلیزیەوە: د. هادی محمد

**"دەقی ووتارێکی گەورە بیریاری مەسیحی جۆن هیکە لە سەنتەری لێکۆڵینەوەی ئەخلاقی جیهانی زانکۆی بیرمینگهام لە بەریتانیا لە شوباتی 2007 دا پێشکەشکراوە".**

–ئەوەی ئەخلاقێکی جیهانی بوونی هەیە لانی کەم لە کایەی مافەکانی مرۆڤدا ڕەزامەندی لەسەر دراوە لەلایەن کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە لە ساڵی 1948 لە بەیاننامەی جاڕدانی جیهانی مافەکانی مرۆڤدا. ئەو زاراوەیەی بەکارهاتووە زاراوەی مافە جیهانییەکانی مرۆڤە نەك ئەخلاقێکی جیهانی، بەڵام مافە جیهانییەکانی مرۆڤ لانی کەم بەشێکە یاخود توخمێکە لە چوارچێوەی ئەخلاقێکی جیهانی. زاراوەی ئەخلاقی جیهانی *Global Ethic* نەوەیەك لەمەو پێش لەلایەن ئیلاهیاتناسی کاسۆلیکی ئەڵمانی "هانس کونگ *hans kung*"وە خرایە ڕوو، ئەم ئیلاهیاتناسە ماوەیەکی درێژ لە ناکۆکیدا بوو لەگەڵ ڤاتیکاندا چونکە بیرۆکەی مەعسومیەتی پاپای ڕەتدەکردەوەو سنوری تەسکی ئیرادەی چاکەی تێدەپەڕاند و بەشداری دیالۆگی نێوان ئایینەکانی دەکرد. ئەو مەبەستی ئەخلاقێك *Ethic* بوو کە هاوبەشە لە نێوان هەموو شارستانیەت و کلتور و ئایینە جیاوازەکانی جیهاندا. ئەمە پەیوەندی بە پێشەکی بەیاننامەی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە هەیە کە دەڵێت: "ڕێزنەگرتن و سوکایەتی پێکردنی مافەکانی مرۆڤ کردەوەی بەربەرییانە لەگەڵ خۆیدا دەهێنێت و دەبێتە هۆی تووڕەکردنی ویژدانی مرۆڤایەتی". دواتر دەگەڕێمەوە سەر بڕگەی "ویژدانی مرۆڤایەتی *conscience of mankind*".

بەر لە دامەزراندنی مەڵبەندەکەمان لە بێرمینگهام لە ساڵی 2002، دامەزراوەی ئەخلاقی جیهانی (لەلایەن هانس کونگەوە بیرۆکەکەی دانرا) چەندین کۆنگرەی گەورەی نێودەوڵەتی سازکرد، لە ئەڵمانیا تۆنی بلێر ووتاری داو لە شیکاگۆ کۆفی عەنان (ووتارەکانیان دەتوانرێت لەسەر تۆڕی ئنتەرنێت بخوێنرێتەوە)، دامەزراوەکەش ڕەشنووسێکی بەیاننامەی ئەخلاقی جیهانی بەرهەم هێنا، دواتر دەگەڕێمەوە سەری. نازانم ئاخۆ ئەوە مەبەستێکی دڵسۆزانە بوو کە مەڵبەندی بێرمینگهام دەبێت لەم پرۆژەیەدا کار بکات یاخود نا.




ئایا هیچ ئەخلاقێکی مرۆیی جیهانی یاخود گەردوونی یاخود نزیک جیهانی بوونی هەیە؟ دەبێت ئاستە جۆراوجۆرەکانی پرنسیپە ئەخلاقییەکان بناسینەوە. هەموو کلتورە تەمەن درێژەکان بنەڕەتێکی دینی کۆنیان هەیە. لە ئایینە جیهانییەکاندا، لە گشتگیرترین ئاستدا، ڕێسایەکی گەردونی یاخود گشتگیر هەیە، لە مەسیحیەتدا پێی دەڵێن ڕێسای ئاڵتونی (*golden rule*). ئەم ڕێسایە لە فۆرمە ئەرێیییەکەیدا واتە: "بە شێوەیەك ڕەفتار لەگەڵ ئەوانی دیکەدا بکە کە خۆت حەزدەکەیت بەو شێوەیە لەگەڵتا ڕەفتار بکەن"، لە فۆرمە نەرێکەیدا واتە: "بەشێوەیەك هەڵسوکەوت لەگەڵ ئەوانی دیکەدا مەکە کە خۆت حەزناکەیت بەو شێوەیە هەڵسوکەوت لەگەڵتا بکەن"، ئەمە لەوانەکانی هەموو ئایینە مەزنەکاندا هەیە. با لە هندستانەوە دەست پێبکەین، لە مهابەهاراتەی *Mahabharata* هندۆسیدا: "هەرگیز ڕەفتارێك مەنوێنە بەرامبەر کەسێك کاتێك ئەو ڕەفتارە بەرامبەر خۆت بکرێت جێگەی ئازار و ناڕەحەتی بێت". بە کورتی ئەمە ڕێسای چاکەخوازییە *Righteousness*. لە کریتانگای سوترا *kritanga sutra*"ی جەینی دا (*jain*)، پێمان دەوترێت بە شێوەیەك مامەڵە لەگەڵ مەخلوقاتەکانی دنیا بکەن کە خۆت حەز بکەیت بەو شێوەیە مامەڵەت لەگەڵدا بکرێت. لە پەرتووکەکانی بوزادا چەندین ووتەی لەم جۆرە هەیە: "چۆن دایکێك بە درێژایی هەموو تەمەنی چاودێری منداڵەکەی دەکات، تۆش ئامێز بۆ هەموو زیندەوەرەکانی دیکە بکەرەوە، (سوتانیپاتا)". وە گرنگترین فەزیلەتەکان لە

بودیزمدا بریتین لە کارونا (*karuna*) واتە سۆزو میێتا *metta* واتە بەزەیی – خۆشەویستی. لە کلتوری چینیشدا، کۆنفۆشیۆس فێرمان دەکات" ئەو شتەی بۆ خۆت بە پەسەندی نازانی، بۆ ئەوانی دیکەش بە پەسەندی مەزانە"، لە پەرتوکی تاویستدا (تای شانگ *Taishang*) دەخوێنینەوە: "پیاو چاك ئەو کەسەیە کە زەرەر و قازانجی خەڵکی بەهی خۆی دەزانێت". لە فارسی دێریندا (بە ئێرانی ئەمڕۆشەوە) پەرتوکی زەردەشتی بانگەشە دەکات: "فیترەتی چاك کاتێك بە چاکی لە بەرامبەر ئەوانی دیکەدا بەکارنایەت، هەرچییەك بێت بۆ خودی خۆشت چاك نییە.". مەسیح فێرمان دەکات: "ئەوەی خۆت پێت باشە خەڵکی لەگەڵتا بیکەن، تۆش بەو شێوەیەبە لەگەڵ خەڵکدا" (لۆقا 6:31). لە تەلمودی *Talmnd* جولەکەشدا هاتووە "چیت بۆ خۆت پێناخۆشە، بۆخەڵکیش پێت ناخۆش بێت..." ئەمە سەرجەمی ناوەڕۆکی تەوراتە. لە ئیسلامیشدا، لە فەرموودەکانی موحەمەد پێغەمبەردا دەخوێنینەوە: "ئیمانداری ڕاستەقینە نییە ئەو کەسەی کە چی بۆ خۆی پێخۆشە بۆ براکەی پێی خۆش نەبێت..". کەواتە ئەم بنەما گشتییەی چاکەخوازی *Benevolence* ڕەنگی داوەتەوە لە هەموو ئەو وانانەدا کە هەموو شارستانیەتەکانیان پێکهێناوە هەر لە سەردەمی تەوەرییەوە *axial age* لە دەوروبەری نیوەی یەکەمی هەزار ساڵی پێش زایین. ڕێسا ئاڵتونییەکە لەسەر هەستێکی ئەخلاقی مرۆیی بنەڕەتی بنەما دادەنێت کە بە هەموو تیۆرییە ئەخلاقییەکان پێشینەسازی بۆ دەکرێت. ئەم هەستەش لە پێشەکی بەیاننامەی جیهانی مافەکانی مرۆڤی نەتەوە یەکگرتووەکاندا بە "ویژدانی مرۆڤایەتی" ناوی هاتووە. فەیلەسوفەکانی فەلسەفەی ئەخلاق هەر لە کانتەوە بۆ میلْ و بۆ جۆن ڕاوڵز و تاوەکو ئەمڕۆش ئاخۆ گرنگییان دابێت بە ئەرکەکان *duty* یاخود لێکدانەوەی دەرەنجامەکان یاخود فەزیلەتەکان *Virtues* یاخود سروشت و فیترەتی مرۆڤ، هەموویان هەوڵدەدەن بۆ شیکردنەوەی پێکهاتەی لۆژیکی فیترەتێك *Insight* یاخود هەستێك کە پێشوەخت لە ناوماندا بوونی هەبووەو لە هەموماندا هاوبەشە. کەس ناتوانێت ئەم بنەما بنەڕەتییە بسەلمێنێت، لەوە بنەڕەتیتر و قوڵترە بتوانرێت لە پێشەکی مەعریفی پێشینەییەوە وەربگیرێت و لە ڕووی عەقڵییەوە بسەلمێنرێت، بەڵام سەرجەمی گوتاری ئەخلاقیمان لەسەر ئەم بنەمایە بناغە دادەنێت. مامۆستای کۆنفۆشیۆسی مینیشیۆس لە سەدەی چوارەم و سێهەمی پێش زاییندا ئەم فیترەتە بنەڕەتییە بەم شێوەیە دەردەبڕێت: "من دەڵێم هەموو مرۆڤێك دڵێکی هەیە بەزەیی بەوانی دیکەدا دێتەوەو سۆزی خۆی بۆیان دەردەبڕێت، دڵی هەر مرۆڤێکیش ترس و تۆقین و سۆز و بەزەیی دەیجوڵێنێ، کاتێك دەبینێت منداڵێك خەریکە دەکەوێتە بیرێکەوە. ئەمەش لەبەرئەوە نییە کە حەز دەکات هاوڕێیەتی لەگەڵ دایك و باوکی منداڵەکە دروست بکات یاخود کۆمەڵگە و هاوڕێکانی ستایشی بکەن یاخود لەبەرئەوە نییە گریانی منداڵەکە ئازاری دابێت، ئەمە ئەوە نیشان دەدات هیچ مرۆڤێك نییە بێ دڵ بێت، هەموو مرۆڤێك دڵێکی هەیە چاکە و خراپەی پێلێکجیا بکاتەوە". لە ڕاستیدا هەندێك کەس ئەم دڵەیان نییە و بەبێ هۆ دڕندەیی نیشان دەدەن و چێژ دەبەن لە ئازاردانی ئەوانی دیکە و

دواجــاریش دەکەونــە زیندانــەوە یــاخود لــە پــەیمانگای شــێتەکاندا بەنــد دەکــرێن. ئــەم دەروون نەخۆشـانە یـا ئـەوەتا هەمیـشە توانـای ڕێزگرتنی ئەوانی دیکەیان نەبووە یاخود هەر لە لەدایکبوونەوە بەو شێوەیە بووە کە هەرگیز ئەم توانایــە گەشــەی پێنــەدراوە، ڕای مــن ئەمــەی دووەمیانە.

هەوڵـــدەدەین زۆرتـــرین قـــسە لـــەبارەی گشتگیرترین پرنـسیپی ئەخلاقییەوە بکەین کە مـن پێیـدەڵێم پرنـسیپی ئـیرادەی چاکەخوازی *Benevolence*، ئەم پرنسیپە بە نزیکەیی سەد دەرسەد جیهانییانە دانی پێدانراوە و بە تیۆری قبـوڵکراوە. بـەلاّم کاتێــك ســەیری دونیــای دەوروبـــەرمان دەکـــەین چ ناوچـــەییانە و چ جیهانییانە زۆر ئاشکرایە کە ڕێسا ئاڵتونییەکە، بە دەربرینەکەی هاملێت، زیاتر پێشێلدەکرێت و دەشـکێنرێت و پـشتگوێ دەخرێـت وەك لـەوەی ڕەچاو بکرێت و بە گوێی بکرێت. لانی کەم ئەم قــسەیە تارادەیـــەکی زۆر ڕاســـتە لـــە بـــواری سیاســەتە نەتەوەییەکانــدا. ئەگــەر ناوچــەییانە ســـەیرکەین، لـــە نـــاو خۆمـــان و دراوســـێ و هاوڕێکانمانــدا بـــوارێکی باشـــی میهرەبـــانی و ڕێـــزو ڕەچـــاوکردنی دوولایەنــە بـــوونی هەیــە، هەرچــەندە زۆر باشـیش ئاگـاداری ئـەو هــەموو بارودۆخــە دەروونییــە ئاشــکرایانەین کــە دژی ڕێـــسا ئاڵتونییەکـــە دەوەســـتنەوە وەکـــو خۆپەرســـتی و چاوچـــنۆکی و شـــەهوەتبازی و حەسودی و... هتد.

ئایا دۆخەکەش بەو شێوەیەیە کە عەقیدە بە جـدی دەسـت پێـوە گیراوەکـان هەریەکـە لـەلای خۆیـــەوە بـــە شـــێوەیەك پرنـــسیپە (بنـــەما) بنەڕەتییەکـــەی ڕاقـــەکردووە بۆتـــە هـــۆی لەکارخستنی ئەو بنەمایە؟ پێم وایە هیتلەر و ڕابـەرانی نـازی و بەشـێك لـە دانیـشتوانی ئـەو کاتـەی ئـەڵمانیا بـە جـدی باوەڕیـان وابـوو کـە جولەکـەکان بەرپرسـیارن لـە زۆرتـرین کێـشەی ئــەورووپا و ئەهریمــەنێك بــوون کــە دەبــوو لــە نـاوببرێن. بـۆ چـەندان سـەدە سـپی پێـستەکان باوەڕیـان وابـوو کـە ڕەش پێستەکان ڕەگـەزێکی نـزمتر و سـەرەتاییترن، لەبەرئـەوەش ئەخلاقیـەن ڕێگەپێدراو بوو بچەوسێنرێتەوەو کۆیلە بکرێن. بۆ ئێستای ئێمەش ئەم دۆخە هەروایە. ماوەیەك لـــە باشـــووری ئـــەفریقا بـــووم لـــە مـــاوەی دروســـتبوونی جیــاوازی ڕەگەزیــدا *apartheid* لەگەڵ دێسمۆند توتو و چەند کەسێکی دیکەدا کـە بـەرەنگاری سیاسـەتی جیـاوازی ڕەگـەزی دەبوونـــەوە، لـــەوێ کۆمـــەڵێك ئیلاهیاتناســـی گـــەورەترین کەنیـــسەی مەســـیحی (کەنیـــسەی ڕیفۆرمکراوی هۆڵەندی) زۆر بە جدی بە پشت بە ستن بە بنـەما و بەڵگـەی ئنجیلـی پشتیوانیان لە سیاسەتی جیاوازی خستنی ڕەگەزی دەکرد. ئەوان بە جدی باوەڕیان وابوو کە ویستی خودا وایــە مرۆڤــی ســپی پێــست دەبێــت فــەرمانڕەوا بێتو ئەفریقیە ڕەش پێستەکانیش خزمەتکار و ژێر دەستە. ئەمڕۆ لە بەریتانیا وا دەردەکەوێت ڕابـەرانی پـارتی نیـشتمانی بـەریتانی (*BNP*) و لایــەنگرەکانیان بەجــدی باوەڕیــان وایــە کــە دانیـشتوانی سـپی پێـستی نیـشتمانی دایك لـە هـەموو مەسـەلە کۆمەلاّیەتییـەکان پێـشینەیەکی بالاّتریــان هەیــە بەســەر کۆچــکردووە ڕەش و بۆرەکان و نەوەکانیان.

ووتم وا دەردەکــەوێت هــەموو ئـەم کەسـانە دڵـــسۆز و جـــدین لـــە عەقیـــدە جۆراوجـــۆرە ڕەگەزپەرستانەکەیاندا. لە ڕاستیدا دەتوانم بڵێم بــە شــێوەیەکی پێــچەوانەیی، دڵــسۆزترینی نازییــەکان بــەدکارترینیان بــوون. بــەلاّم لــە

ئەفریقای باشور لەو کاتەدا پێم وابوو ئێستاش پێموایە کە زۆرینەی ئەو سپی پێستانەی سوودمەندبوون لە سیاسەتی جیاوازی ڕەگەزی بە ویستی خۆیان هەڵدەخەڵەتاند. ئنجیل *Bible* دەکرێت بە دیاری کراوی بەکاربهێنرێت بۆ پاساودانی هەموو شتێك هەروەکو کەنیسەی ریفۆرمکراوی هۆڵەندی کردی. پێشموایە زۆربەی ئەوانەی پشتگیری پارتی نیشتمانی بەریتانی *BNP* دەکەن، پشتگیری ئەو شتانەش دەکەن کە خۆیان وا دەزانن لە بەرژەوەندیە تایبەتییەکانی خۆیانن و بە ڕەگەز پەرستییەکی ناعەقڵانی بەهێز دەکرێت و پشتیوانی لێدەکرێت...

لێرەدا ئەوەی بە ڕاستی دەمێنێتەوە و جێگەی دڵنیاییە ئەوەیە کە هەستێکی ئەخلاقی گەردوونی یاخود جیهانی بوونی هەیە، هەرچەندە ئەم هەستەش لەلایەن بەرژەوەندییە تاکی و کۆییەکانەوە زیاد لە خۆی فرمانی دراوەتەپاڵ.

ریچارد دۆکین *Richard Dawkins* لە کتێبە پڕ خوێنەرەکەیدا "وڕێنەی خودا" *God Delusion* قسە لە هەستی ئەخلاقی و شکۆیی و سۆز و بەزەییمان دەکات.. ئەو سۆزە ئازار بەخشەی هەستی پێدەکەین لە ساتی بینینی منداڵێکی هەتیودا کە دەگری، بێوەژنێکی پیری نائومێد لە تەنیایدا یاخود بینینی ئاژەڵێك دەناڵێنێ لە ئازاردا، هەروەها هەستی بەهێزی ناردنی خەڵاتی نەناسراوی پارەو پۆشاك بۆ قوربانییەکانی تسونامی لەوپەڕی جیهان کە هەرگیز نایانبینین، (215)، دۆکین لێکدانەوەیەکی بایۆلۆژییانەی بۆ ئەم هەستە هەیە. باسی چوار سەرچاوەی داروینی دەکات بۆ ئەخلاق *morality*. سەرچاوەیەکیان پشت دەبەستێت لەسەر ئەو شتەی دۆکین پێیدەڵێت "جینی خۆویستی" *selfish gene*، ئەو دەڵێت ئەو جینەی بەرنامەسازی دەکات بۆ زیندەوەرە تاکەکان بۆ ئەوەی لە بەرژەوەندی نزیکە (بنەماڵە) بۆماوەییەکانی خۆیان کار بکەن، ئەم جینە لە ڕووی ئامارییەوە زۆر ڕێی تێدەچێت سوود بە کۆپییەکانی خۆی بگەیەنێت. دەکرێت ڕێژەی جینێکی لەو شێوەیە زیاد بکات بۆ ئاستێك تیایدا ئیرادەی خۆکردنە قوربانی و چاکەخوازی *Altruism* بۆ نزیکەکانی خۆی بێتە ڕێساو فۆرم، (216). لێرەوە پێیوایە چاودێری دایك و باوك بۆ منداڵەکانیان چ لە مرۆڤ و چ لە زیندەوەرەکانی دیکەدا بەم شێوەیە بەڕێوە دەچێت. بەڵام ئاخۆ ئەوەی "جینی خۆپەرستی" کەسێك دەیهەوێت سوودمەندبێت بە حسابکردنی ئامارییانەی نەستی کە چۆن بە باشترین شێوە ئەمە ئەنجام بدات، من وەکو چیرۆکی جانەوەرێکی مرۆشێوە دێتە بەرچاوم. لە ڕاستیشدا چۆن دەتوانێت سود لە جینی کەسێك وەربگرێت لە کاتێکدا ژمارەیەك کۆپی زۆر لە خۆی یان نزیك لە خۆی هەبێت؟. لای دۆکین، سەرچاوەی دووەمی داروینی ئەخلاق چاکەخوازی بەرامبەرێنی یاخود ئاڵوگۆڕییە *Reciprocal altruism* : "تۆ پشتی من بخورێنە، منیش پشتی تۆ دەخورێنم"، واتە من شتێك بۆ تۆ دەکەم تۆش لە بەرامبەردا شتێك بۆ من بکە. ئەمە تەنها لەناو ئێمەی مرۆڤدا روونادات بەڵکو لەناو جۆرەکانی دیکەی زیندەوەرانیشدا ڕوودەدات."هەنگ پێویستی بە هەلاڵە هەیە و گوڵەکانیش پێویستیان بە بڵاوبونەوەی هەلاڵەکان هەیە، گوڵەکان خۆیان ناتوانن بفڕن، لەبەرئەوە گوڵەکان هەلاڵەکانی خۆیان وەکو پارە دەدەنە کرێ باڵی هەنگەکان"

(216-7). ئەمــە بنــەمای هــەموو ئــاڵوگۆڕو بازرگانییەکـەو دواجـاریش بنـەمای داهێنـانی دراوو پارەیە.

کەواتـە بـە بۆچـوونی دۆکـین: "خزمێنـە و بەرامبـــەرێنی جووتـــە پایـــەی ئـــیرادەی چاکەخوازین لـە جیهانێکی داروینیدا" (218). سەرچاوە دووەمینییـەکانی ئـەخلاق بـریتین لـە سومعە *reputation* لەوانیش سومعەی بەزەیی و بەخـشندەیی کـە دەشێت ببێتە هۆی دروسـت بـوونی ڕەفتـــــاری چـــاکەخوازی، سەرچـــاوەیەکی دووەمــینی دیکـە بریتییـــە لـــە بەخـــشندەیی *Generosity* "بەخـــشندەیی وەکـو بانگەشـەی زاڵـێتی یـاخود بـــالآیی" (218). دۆکین ئاماژە بەوە دەکـات کـە لـە ڕۆژگـــــارە سـەرەتاییەکانی مرۆڤایەتیـدا، پێـشینانمان لـە گونـدە بـچوکەکاندا یـاخود لـە شـێوەی گروپـی گەڕۆکـدا ژیـاون، لـە دۆخێکـی لـەم شـێوەیەدا، زۆربـەی ئەنـدامانی گروپەکـە خزمـی یـەکبون و ئـەوانی دیکـەش کەسـانێك بـوون کـە ڕۆژانـە یـەکتریان بینیـوەو تێکـەڵی یـەکتر بـوون. ئەگـەر خزم بوونایە ئەو کاتە چاکەخوازی خزمێنەکاری پێدەکرا، ئەگـەریش خـزم نەبوونایـە بـەلآم ئەگـەر ناسـیاو بوونایـە ئـەوا بنـەمای بەرامبـەرێنی و ئاڵوگۆڕ بەرقەرار دەبوو.

لە گروپێکی بچوکیشدا، ڕووبەرێکی هێجگار فـــراوان هەیـــە بـــۆ هانـــدانی شـــکۆمەندی و بانگەشـــەی بـــالآیی و خۆدەرخـــستن. دۆکـــین پێیوایـە هـەموو ئەمانـە ڕێـسای گـشتی پەنجـە گـەورەیان لـە ئێمـەدا پەرەپێـداوەو گەشـەی کردووە: لەگەڵ ئەو کەسانەدا جوان ڕەفتار بکە کـــە پێویـــستە لەگەڵیاندا وا بیت. دۆکـــین دەڵێـــت "ئـــــــــەوەی هەڵبـــــــژاردنی سروشـــتی داوای دەکـات ڕێساکانی پەنجە گەورەیە کە بـــە شـــێوەیەکی کردەیی کاردەکات بـۆ هانـدانی ئـەو جینانـــەی ئـــەو ڕێـــــــسایانە (ڕێساکانی پەنجـە گـــەورە) بنیـــات دەنـێن". ئـەمڕۆش کـــە دەبیـــنین ژمارەیەکی زۆر خەڵکی لە شار و شارۆچکەکاندا دەژیـن، ئـەم ڕێسای پەنجە گەورەیە درێـژەی بە کارکردنی خۆی داوە وەکو ڕێسا ئاڵتونییەکە بۆ ماوەیـــەکی زۆر دوای ئـــەوەی ئـــەو بارودۆخـــە بنەڕەتییانە کۆتاییان هاتووە کە یەکەمجار ئەو ڕێسایەیان دروست کـرد. وەکـو دۆکـین دەڵێـت ڕێـــسا ئاڵتونییەکـــە لـــە ڕووی بنەڕەتـــە بایۆلۆژییەکەیـەوە بەرهـەمی ڕێـسای بـە کـەڵکی



پەنجە گەورەیە. باڵندەکان ڕەچاوی ڕێسای پەنجە گەورە دەکەن کاتێك خۆراك دەدەنە بێچووەکانیان لە هێلانەکانیاندا. دۆکین دەپرسێت: "ئایا دەکرێت ئیرادەی چاکەخوازیمان هاوشێوەی ڕەگەزی باوانی تەیرەکانی قامیشەڵان بێت کاتێك بێووچان ئیش دەکەن بۆ بێچووەکانیان؟ بە لێکچواندنێکی نزیکتر ئەوەش دەڵێت: "ویستی مرۆڤ بۆ هەڵگرتنەوەو بەخێوکردنی منداڵێك بەهەمان شێوە بەڕێوە دەچێت.."

پوختەی تیۆریاکەی دۆکین ئەوەیە کە: ئەو هەستە ئەخلاقییەی لە ڕێسا ئاڵتونییەکەدا بەرجەستە دەبێت لە ڕووی بایۆلۆژییەوە بەرهەمێکی بەجێماوی ڕێسای سوودبەخشی پەنجە گەورەیە لە سەردەمانی دێرینەوە گەشەی کردووە کاتێك ژیان لە کۆمەڵە بچوکە داخراوەکاندا گوزەراوە. وەکو نمونەیەکی دیکەی دەرهاویشتەیەکی بایۆلۆژی دۆکین ئاماژە بەوە دەکات ئارەزووی سێکسی درێژە بە مانەوەی خۆی دەدات لە کاتێکدا هیچ پێشبینییەك یاخود نیەتێك لە ئارادا نییە بۆ سکپڕی. دەشڵێت "هیچ دەلیلێك نییە کە بۆچی هەمان شت ڕاست نەبێت لەبارەی ئارەزووی بەخشندەیی و بەزەیی بوون ئەگەر ئەمە دەرەنجامێکی پەیدابووی ژیانی لادێییانەی پێشینانە (222)". دەڵێت "هەردووکیان دەرەنجامن و هەڵەکانی داروین هەڵەگەلێکی جوان و بەنرخن (221)". لێرەوە دۆکین بەهایەکی بەرز دەداتە ئەخلاق بەڵام تێڕوانینێکی سروشتگەرایی پەتی بۆی هەیە. ئایا ئارەزوویەکی بە بەزەیی و بەخشندەیی بوون لە ئێمەدا هەیە بشێت بە شێوەیەك لە شێوەکان بەراورد بکرێت لە خێرایی و خەستیدا بە ئارەزووی سێکسی؟ پێموایە ئەمە تەنها زیادەڕەوییەکی بەلاغییە. ئایا تیۆریەکەی دۆکین شایانی قبوڵکردنە؟، تاسەر ئێسقان قسەگەلێکی تیۆرییە و دانراوەیەکی (فرضیة) زانستی نییە چونکە توانای ڕاست بوون ***Verification*** یاخود هەڵەبوونی ***Falsification*** ئەزموونی نییە واتە ناکەوێتە ژێر ئەزمونەوە بۆ ئەوەی بزانین ڕاستە یاخود هەڵە. بەڵام ئایا ئەم تێڕوانینە یاخود تیۆریایە شایانی ڕاست بوونە؟ زۆریش نا. بێگومان پێم وایە ئەوە ڕاستە کە ئێمە ئاژەڵگەلێکی کۆمەڵایەتین و مرۆڤە سەرەتاییەکانیش لە شێوەی گروپی بچوکدا ژیاون کە تیایدا خزمایەتی و بەرامبەرێنی فاکتەرگەلێکی گرنگ بوون. بەڵام ئەوەی ئەم دۆخە دەبێت کاری کردبێتە سەر جینەکان و ڕێسای پەنجە گەورەی بەرهەم هێنابێت و بۆماوەییانە گواسترابێتەوە بۆ جینەکانی ئێمە لەمڕۆدا، بەلای منەوە ئەمە شتێکە شایەنی ڕاست بوون نییە. کۆنترین مرۆڤ لە ڕووی زانستی توێکارییەوە مرۆڤی نوێ بۆی بگەڕێتەوە ***homo sapiens sapiens*** نزیکەی دووسەد هەزار ساڵ لەمەوبەر لە ئەفریقا ژیاوە هەرچەندە دیاری کردنی ئەم ماوەیە جیاوازە لە 130 هەزار ساڵەوە بۆ 250 هەزار ساڵ. بەڵام ئەمە لە ڕووی کاتی پەرەسەندنەوە چاوتروکانێکە. ئایا ئەمە جێی باوەڕپێکردنە کە ئیرادەی بەهێزی ئێمە بۆ ناردنی بەخششی پارە یاخود جلوبەرگ بۆ قوربانییەکانی تسونامی لەوپەڕی جیهان کە هەرگیز نەمانبینیون و پێیان نەگەیشتووین یاخود هەستی ئێمە لە ساتی بینینی ئاژەڵێك لە ئازاردا دەناڵێنێت (ئەمانە دوو نمونەی دۆکینن لە بارەی ئیرادەی چاکەخوازییەوە) دەربڕین و دەرکەوتەگەلێکی

ڕێسای پەنجەگەورەن لە کۆمەڵگە داخراوە بچوکەکاندا پەرەی سەندبێت. ئەمە بەلاتانەوە چۆنە؟ بەلای منەوە تائەوپەڕی شایانی ڕاست بوون نییە. ئەم نمونانەو زۆرێکی دیکەش گونجاونین لەگەڵ چوار سەرچاوەکەی ئەخلاق کە دۆکین دەیانناسێنێت (خزمایەتی و بەرامبەرێنی و سومعە و جەختکردنە سەر بالأیی). بە پێچەوانەوە وا دەردەکەوێت ئێمە هەستێکی ناوەکی سۆز و بەزەییمان هەیە بەرامبەر ئەوانی دیکە کە دەشێت پێی بڵێین "ویژدانی مرۆڤایەتی *conscience of mankind*" کە لە ڕێسا ئاڵتونییەکەدا بەرجەستە بووە.

### ئەم هەستە ناوەکییە لە کوێوە سەرچاوەی گرتووە؟

ئێستا من پێشنیارێکی سەرەتایی لەبارەی بنەڕەتی (ئەسڵی) چاکەخوازییەوە دەخەمە ڕوو. ڕێسا ئاڵتونییەکە وەکو پرنسیپێك شایانی دەرککردن بێت، لە ماوەی تەوەرییەوە *axial period* هاتۆتە بوون بە نزیکەیی لە نێوان 800-200 پێش زاینی بووە. لەو فەترەیەدا بوو کەسایەتییە بەرچاوەکانی دونیا دەرکەوتن و لە کۆمەڵگاکانی خۆیانەوە سەریان دەرهێناو بانگەشەی جیهان بینییە نوێیە گرنگەکانی خۆیان کرد. لە چین، کۆنفۆشیۆس و مێنشیوس و لاوتز و (یاخود نوسەرە نەناسراوەکەی تاوتی شینگ) و مۆتزی دەرکەوتن. لە هندستان، گواتامای بوزی و هاویرای دامەزرێنەری ترادسیۆنی جەین *Jain* یاخود جەینیزم (ئایینێکی هندۆسییە لە سەدەی شەشەمی پێش زاینییەوە دروست بووەو جەخت لە سەر زوهد و ڕوحگۆڕکێ دەکاتەوە بەڵام گرنگی بە پەرستشی ڕوحیانەی خوداکان نادات)، نوسەرەکانی ئۆپانیشادو دواتر باگاوادی گیتا. لە فەلەستین پێغەمبەری عیبری مەزن دەرکەوتن: ئامۆس، هۆزیا، جێرەمیا، ئیزایا، ئیزەکیاڵ. لە یۆنانیش، پایتاگۆراس و سوکرات و ئەفلاتون و ئەرستۆ. هەروەها زەردەشتیش پێیانوایە لەم فەترەیەدا ژیاوە بەڵام ئێستا دەڵێن زۆر زووتر، دەوروبەری 1200 پێش زاین ژیاوە. بەڵام ئەگەر ئێمە مەسیحیەت *Christianity* بە یەهودیەتێکی *Judaism* پێش وەخت هاتووی بزانین و ئیسلامیش بە یەهودیەت و مەسیحیەتێکی پێشوەخت هاتووی بزانین، ئەو کاتە هەموو "ئایینە جیهانییە مەزنەکان" ڕەگوڕیشە و بنەڕەتیان دەگەڕێتەوە بۆ ماوەی تەوەری.

بەشێوەیەکی گشتی، میللەتانی پێش سەردەمی تەوەری لە شێوەی کۆمەڵی لادێیی بچوکدا ژیاون تیایدا ئەندامەکانی خۆیان بە خانەی زیندووی جەستەی کۆمەڵگە دەزانی وەك لەوەی خۆیان بە تاکگەلێکی تەواو سەربەخۆ بزانن. بەڵام لە سەردەمی تەوەریدا، شارەکان گەشەیان کرد و بەرهەمهێنانی تایبەتمەند و ئاڵوگۆڕی شتومەك و پەرەسەندنی نوسین و لە کەشی تاڕادەیەك ئاشتی ئیمپراتۆریەتە گەورەکاندا، هەستی سەرەتایی کەسایەتی تاك لە هەست و هۆشیاری گشتی خێڵدا دەرکەوت و لە مەلیك و ئیمپراتۆر و قەشە باڵاکانەوە گواسترایەوە بۆ خەڵکی ئاسایی. ئەمەش مانای ئەوەبوو لە پێشتردا خواکان خوای شوێنێکی تایبەتی یاخود گروپێکی تایبەت بوون، بەڵام گەورە حەکیم و پێغەمبەرەکانی سەردەمی تەوەری بە پەیامێك قسەیان بۆ تاك دەکرد لە جەوهەردا گرنگییەکی

گەردونی هەبوو، تایبەت نەبوو بە ناوچەیەك یاخود كۆمەڵێكەوە. لە ناو ئەم دۆخە نوێیەشدا بوو كە ڕێسا ئاڵتونییەكە لەناو هەریەكە لە ترادسیۆنە گەشەكردووەكاندا چەسپێنراو دەوترایەوە. هەموو دەربڕینە جیاوازەكانی ئەم ڕێسا ئاڵتونییە كە پێشتر ئاماژەم پێدان لەم ماوەیەدا دەركەوتن یەكێكیش لەوانە ئەو ڕێسایەیە لە پەرتوكە زەردەشتییەكاندا هاتووە كە پاش زەردەشت خۆی پەیدا بووە.

كەواتە لە كاتێكدا دەشێت خزمایەتی و بەرامبەرێنی بە باشترین شێوە بووبێتە بنەمای ئەخلاقیەتی گروپی بچوك و لادێیی لە سەردەمە درێژەكانی پێش – تەوەری دا، پێشنیار و تێڕوانینی من ئەمەیە: پرنسیپە گەردونیترەكەی ڕێسا ئاڵتونییەكە لەگەڵ تێڕوانین و دیدگای ئایینی نوێی سەردەمی تەوەریدا پەیدا بوو. ئێمە وەڵامی پێویستییەكانی قوربانییەكانی تسونامی یاخود قوربانییەكانی هەژاری و قاتو قڕی لە ئەفریقا یاخود قوربانییەكانی زوڵم و ئەشكەنجە نادەینەوە كە هەزاران میل لێمانەوە دوورن لەسەر بنەمای خزمایەتی و بەرامبەرێنی بەڵكو وەڵام دەدەینەوەو بەهانایانەوە دەچین لەسەر سۆز و بەزەییەكی ناكۆتا و سۆز و بەزەییەك كە بۆ یەكەم جار لە سەردەمی تەوەریدا لەسەر دەستی پێغەمبەر و حەكیمە مەزنەكان وترایەوەو لە ڕێسا ئاڵتونییەكەدا بەرجەستەبوو. ئەم ڕێسایەیان لە كوێوە بەدەست هێنا؟ لە دیدێكی ئایینیەوە، خەڵكی هۆشیارییەكی قوڵتریان پەیداكرد لە بارەی حەقیقەتی باڵای (متعالی) كۆتاییەوە، لای هەندێكیان ئەم هۆشیارییە وەكو شتێكی كەسی و هەندێكی دیكەشیان وەكو شتێكی بەدەر لە جیاوازی كەسی و ناكەسی وەریانگرت. ئەم هۆشیارییە قوڵە لە بارەی باڵایی یاخود بڵندگەرایییەوە (متعالی ***Transcendent***) زەرورەتێكی ئەخلاقی لەگەڵ خۆی هێنا. دەشێت لۆژیكی ئەم هۆشیارییە لە ڕوونترین شێوەدا لە بودیزمدا ببینین، لە بودیزمدا، ئازادبوون (بە زاراوەی خۆرئاوا رزگاری ***Salvation***) ئازادبوونە لە نەفسێكی خود سەنتەر كە سەرچاوەی هەموو خۆویستییەك و بەدبەختییەكە و ئازادبوونە بەرەو گرنگیدانێكی بێ لایەن بە هەمووان و خود و ئەوانی دیكەش. بڵندگەرا (متعالی) – سەنتەریش كرۆكی هەریەكێك لە ئیمانە جیهانییەكانە.

بەڵام لە دیدێكی سروشتگەرایی یاخود نا ئایینییەوە، چۆن ئەم هۆشیارییە دروست بوو؟ نەخێر، من لە بایۆلۆژی مرۆڤەوە قسەدەكەم كە هیچ جیاواز نابێت لە ماوەیەكی كورتی وجودی مرۆڤدا؟ پاشان چۆن پەیدا بوو؟ ئەمە پرسیارێكە بۆ بیریارە سروشتگەراكان وەڵامی بدەنەوە.

بەڵام هەرچۆنێك بێت پەیدا بووە، ئەوەی حەقیقەتە ئەوەیە كە ڕێسا ئاڵتونییەكە جیهانییانە دانی پێدانراوە هەم وەكو پرنسیپێكو هەم لە پراكتیزیشدا. لەگەڵ ئەوەشدا پرنسیپێكی زۆر گشتییە. ئەوەش كاتێكە كە هەوڵی ڕوونكردنەوەو شیكردنەوەی جێكەوتەكانی دەدەین لە بارودۆخ گەلێكی تایبەتیدا كە كێشەكان تیایدا پەیدادەبن. لێرەدا پێویستە جیاوازی بكەین لە نێوان دوو ئاستی تایبەتمەندێتیدا: لە نێوان ئەوەی ئێمە دەتوانین پێیبڵێین پرنسیپە ناوەندییەكان (***intermediate***) و ڕێسا تایبەتەكان (***Specific rules***).

نمونەیەکی پرنسیپی ناوەندی دەشێت ئەمە بێت: "کۆمەڵگەی تەندروست کۆمەڵگایەکە بە دادپەروەرانە مامەڵە لەگەڵ هەموو کەسێکدا دەکات"، لە کاتێکدا نمونەی ڕێسایەکی تایبەتی دەشێت ئەمە بێت: "مامەڵەکردن لەگەڵ هەموو کەسێکدا بە دادپەروەرانە پێویستی بەوەیە هەموو کەسێك مافی دەنگدانی دیموکراسی هەبێت..".

دامەزراوەی ئەخلاقی جیهانی بەیاننامەیەکی دەرکردووە تیایدا بانگێشتی خەڵکی هەموو کلتوور و ئایینەکان دەکات بۆ بەشداری کردن و هاوبەشی کردن تیایدا. لەبری ئەم بەڵگەنامە زۆر درێژە، دانە (نوسخە) کورتکراوەکەی بەکاردەبەم کە لەلایەن پرۆفیسۆر لیونارد سویدلێر لە فیلادلفیا یەکێکە لە ناسراوترین کەسایەتیەکانی ئەم بزوتنەوەیە، پێشنیار کراوە. سویدلێر نۆ پرنسیپ دەخاتە ڕوو ئەو بە پرنسیپە ناوەندییەکان ناویان دەبات، باسی هەموویان دەکەم بەڵام تێبینی خۆم تەنها لەسەر هەندێکیان دەدەم.

پرنسیپی یەکەم: ماف و بەرپرسیاریەتە یاساییەکان: "لەبەرئەوەی هەموو مرۆڤەکان شکۆمەندییەکی یەکسانی زگماکیان هەیە، پێویستە لەبەردەم یاسادا بە یەکسانی مامەڵەیان لەگەڵدا بکرێت و وەکو یەك پارێزگاریان لێبکرێت..". تاکە سەرنجێك لێرەدا بیدەم دەشێت تەنها کات کوشتن بێت، ئەوەیە کە یاسا خۆی چییە. هەندێك یاسا خۆی جیاوازی دروست دەکات لە نێوان کەسەکاندا. بۆ نموونە هەنووکە لە ئەمریکا یاسایەکی پێشنیار کراو هەیە بەپێی ئەم یاسایە کۆچبەرە نایاساییەکان دەبێت پێنج ساڵ لەو وڵاتەدا بژین و کار بکەن بۆ ئەوەی بتوانن داوای هاوڵاتیبوون بکەن، ئەمەش جیاوازی دروستکردنە لە نێوان ئەمانە و ئەوانەی کەمتر لە پێنج ساڵ لەو وڵاتەدا نیشتەجێبوون. بەم شێوەیە ئەمە جیاوازی دروستکردنە لە نێوان دوو گرووپدا. بەڵام یاسادانەران قسەی ئەوە دەکەن کە کۆچبەران بە یەکسانی بە گوێرەی یاسا مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرێت و ئەو یاسایەش بەشێوەیەکی وەها پاساودراوە لە بەرژەوەندی وڵاتە یەکگرتووەکاندا بێت. ئەوە یاسایە و مامەڵەکردن نییە لەگەڵ خەڵکدا بەگوێرەی یاسا، ئەوە جیاوازی دروستکەرە. ئەو پرسیارەی ئەم جۆرە گەلاڵەکردنەی



پرنسیپی ناوەندی یەکەم بەبێ وەڵام جێیدەهێڵێت ئەوەیە چۆن دەتوانین جیاوازی بکەین لە نێوان یاسا جیاوازی دروستکەرە پاساودراوەکان و ناپاساو دراوەکان؟

پرنسیپی دووەم: "لەبەرئەوەی مرۆڤەکان بیردەکەنەوەو لە جەوهەریشدا بونەوەرێکی ئازاد - بڕیاردەرن، هەموویان مافی ئازادی بیرکردنەوەو قسەکردن و ئازادی هۆش و ئایین و بیرو باوەڕیان هەیە"، ئەم پاشکۆیەشی لەگەڵدایە: "لە هەمان کاتدا، هەموو مرۆڤەکان دەبێت مومارەسەی ئەم بە شێوەیەك بکەن کە

ڕێزی خۆیان و ئەوانی دیکە بگرن و هەوڵبدەن زۆرترین سوودمەندی بەرهەم بهێنن هەم بۆ خۆیان و مرۆڤەکانی دەوروبەریشیان". دووبارە ئەم پرنسیپە گشتییە ڕاست و دروست دێتە بەرچاو، بەلاّم لە هەندێك باری تایبەتیدا یارمەتیمان نادات بڕیار بدەین بۆ نمونە کاریکاتێرەکانی دانیمارك پێغەمبەر موحەممەدیان نیشاندەدا بە بۆمبێکەوە لە مێزەرەکەیدا کە ئەیچواند بە خۆتەقێنەرەوەکانی ئەمرۆ یاخود نارەزاییەکانی دژی شانۆکەی بێرمینگهام لە بارەی سیخییەکانەوە. دیدی شەخسی من ئەمەیە کە کاریکاتێرە دانیمارکییەکان وێڵکەرن و نابەرپرسیان، بەلاّم خۆپیشاندەرە سیخییەکان هەڵ بوون لەوەدا پێیان وابوو کردەوەکانیان شایانی پاساون، بە بڕوای من جیاوازی نێوان ئەم دوو بارە ئەمەیە لەگەڵ ئەوەی یەکەمیان دەست درێژی بوو بۆ سەر موسڵمانەکان و دووەمیشیان بۆ سەر سیخییەکان، هەروەها کاریکاتێرە دانیمارکییەکان مایەی سەر لێشێوان بوو بۆ زۆر کەس چونکە لە ئیسلامدا خۆ کوشتن تاوانە و لەبەر ئەوەش موحەممەد پەلاماردانی یاساغ کردووە بۆ سەر خەڵکی مەدەنی و سومعەی دوژمن و سەر لێشێوێنەر بوو بەو مانایەی ڕق و کینە لە ناو خەڵکیدا دەوروژێنێت دژی موسڵمانەکان، لە کاتێکدا شانۆگەرییەکی بێرمینگهام ڕەخنەیەکی ناوەکی نووسەرێکی سیخی بوو لە دیوێکی ژیانی هەندێك لە گوروە سیخییەکان (ڕابەری ڕوحی سیخییەکان).

دەکرێت لە یەکێك یاخود لە هەردوو ئەو بارانەدا کە باسکران حوکمی جیاواز بدەن، بەلاّم هەرچییەك بێت پرنسیپە ناوەندییەکە خۆی لە پراکتیزەدا یارمەتیمان نادات، لەبەرئەوە ئەم بابەتە زۆر پشت دەبەستێت بە بارودۆخە تایبەتییەکان.

پرنسیپی ناوەندی سێهەم: "لەبەرئەوەی مرۆڤەکان بونەوەرێکی بیرکەرەوەن و توانای دەرککردن و دەربڕینی حەقیقەتیان ***reality*** هەیە، هەموو تاکەکان و کۆمەڵەکان ماف و بەرپرسیاریەتی فێربوون و دەربڕینی حەقیقەتیان هەیە بەڕاستگۆیانە تا ئەوپەڕی". دیسانەوە ئەم پرنسیپەش ڕاست دێتە پێش چاو بەلاّم پرسیارگەلێکی قورس بێ وەلاّم جێدەهێڵێت. لە هەندێك کایەدا پرنسیپەکە وادەردەکەوێت جێی مشتومڕ نییە: لە فەزای گشتیدا، حەقیقەت ***Truth*** واتە ڕاستییە سادە و ڕووتەکان – ئایا عێراق چەکی کۆمەڵکوژی هەبوو؟... هتد. بەلاّم لە فەزای تایبەتی خێزان و ژیانی دراوسێیەتیدا، ئایا بۆ نمونە هەمیشە باشترین کار ئەوەیە بڵێین حەقیقەت بلاّوکردنەوەی هەندێك زانیاری سوکایەتی ئامێز و بەدڕەفتارییە؟ بەلاّم بێگومان لێرەدا پەیامێکی گرنگ هەیە بۆ ڕاگەیاندنەکان و چاپخانەکان، ئەگەر ئەوان هەمیشە هەوڵی "فێربوون و دەربڕینی حەقیقەتیان داوە بە ڕاستگۆیی"، بەبێ زیادەڕەوی سەردێڕەکان و بێ لادان و لار و لەوێری، بێگومان کۆمەڵگە لە دۆخێکی باشتردا دەبوو. بەلاّم کاتێك دێینە سەر ئەو پرسانەی کە ڕێککەوتنێك ***agreement*** لەسەریان نییە (دەشێت هەرگیز ئەو ڕێککەوتنە دروست نەبێت) هەروەکو پرسەکانی ئایین و ئایدۆلۆژیا، ئەم پرنسیپە ناوەندییە جێبەجێ نابێت.

پرنسیپی ناوەندی چوارەم: "لەبەرئەوەی مرۆڤەکان بونەوەرێکی ئازاد – بڕیاردەرن، هەموو مرۆڤە پێگەیشتووەکان (باڵغەکان) مافی

دەنگدانیان هەیە بەڕاستەوخۆ یاخود ناڕاستەوخۆ لە هەموو ئەو بڕیارانەی کار دەکاتە سەریان، ئەمە ئەو بەشداریکردنە مانادارەش دەگرێتەوە لە هەڵبژاردنی ڕابەرەکانیان و هێشتنەوەیان، بە هەمان شێوەش ماف ئەوەیان هەیە بچنە هەموو ئەو پێگە سەرۆکایەتییانەی کە تواناکانیان ڕێیان پێدەدا"، بە کورتی بانگەشەی ئەوە دەکات دیموکراسی لە چوارچێوەی ئەخلاقێکی گەردونیدایە. شەخسی خۆم بەمە ڕازیم، بەڵام سەیرم لەوە دێت ئاخۆ ئەم بانگەشەیە هێندە بەڵگە نەویستە وەکو ئەوەی لە کلتوری خۆماندا هەستی پێدەکەین.

هەندێك شتی زۆر گرنگ هەن کە دیموکراسی بە باشی مامەڵەیان لە تەکدا ناکات چونکە فەرمانڕەواکان بۆ فەترەیەکی دیاری کراو هەڵدەبژێردرێن بە شێوەیەکی گشتی ناتوانن کێشە تەمەن درێژەکان لەباربەرن کە ئێستا پێویستیان بە بڕیارگەلێکی جەماوەری نییە. زەقترین نمونەش بەرزبوونەوەی پلەی گەرمی جیهانە (*Global warming*)، ئەگەر حکومەتەکەمان و حکومەتە ئەوروپییەکانی دیکە و حکومەتی ئەمریکی زۆر بە جدی هەوڵی کەمکردنەوەی ئەو گەشتە ئاسمانییانەیان بدایە کە بۆ خۆشی و ڕابواردن دەکرێن و باجی قورسیان لەسەر بەکارهێنانی ئەو ئوتومبێلانە دابنایە کە بۆ خۆشی و لەزەت بەکار دەهێنرێن و بەکارهێنانی نا پێویستی کارەبا و گازیان کەمبکردایەتەوە، ئەوا هەڵبژاردنی داهاتوویان دەدۆڕاند. لەلایەکی دیکەوە، ستەمکارێکی ڕۆشنگەر، پاشا فەیلەسوفەکەی ئەفلاتون دەیتوانی ئەو کارانە بکات. بەڵام بێگومان کێشەکە لێرەدا مەحاڵی دڵنیابوونە لەوەی کە ستەمکارەکە چەندە زیرەکانە بە ڕۆشنگەری ڕوپۆشکراوە. لەبەرئەوەی ئەم دڵنیابوونە مەحاڵە، دیموکراسی هێشتا سیستەمی کەمترین خراپەیە.

پرنسیپی ناوەندی پێنجەم: "لەبەرئەوەی پیاوان و ژنان بەیەکسانی لەدایك دەبن و هەموو پیاوان و ژنانیش ماف یەکسانیان هەیە بۆ گەشەسەندنی تەواوی هەموو تواناکانیان و ئازادی هاوسەرگیرییان هەیە، هەموو ژنان و پیاوان ماف یەکسانیان هەیە بچنە ژیانی هاوسەرییەوە یاخود بەبێ ژیانی هاوسەری بژین. پێم وایە لێرەدا و لە هیچ شوێنێکی دیکەشدا هیچ نەوتراوە لەبارەی پەیوەندییە هاوڕەگەزبازییەکان (*Homosexual*) یاخود هاوڕێیەتییە مەدەنییەکان.

پرنسیپی ناوەندی شەشەم: "لەبەرئەوەی مرۆڤەکان بە سروشتی خۆیان جەستەییانەو کۆمەڵایەتییانە ئازادن، هەموو مرۆڤەکان تاکەکان و کۆمەڵەکان مافی خاوەنێتی و تایبەتمەندێتی هەمەچەشنییان هەیە". بڕگەی "خاوەنێتی و تایبەتمەندێتی هەمەچەشنەیی" زۆر لێك و ناڕۆشنە، ئایا ئەو پیشەسازییانە دەگرێتەوە لەلایەن کەسێکەوە یاخود گروپێکی بچوکەوە خاوەنداریێتییان دەکرێت؟ یاخود ئەو ڕۆژنامە و ڕاگەیاندنانەی تاکە کەسێك خاوەنیانە وەکو برلسکۆنی یاخود موردۆخ؟

پرنسیپی ناوەندی حەوتەم: "هەموو مرۆڤەکان بەشێوەیەکی ئاسایی دەبێت کاری مانادار و پشوویەکی (فەراغ) خۆشی هەبێت. هەرچۆنێك ڕەخنە بکرێت، هەنووکە کارگەلێکی زۆرهەن کە زەروورین بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا مانادارنین بەڵکو ناخۆش و بێمانا و

نەخوازراون. ئایا دەشێت بۆ هەموو کەسێك و لە هەموو شوێنێك وەك ئەوان دەڵێن کاریکی مانادار هەبێت؟ ئایا چەند کەس ئەمڕۆ ئەو جۆرە کارانەیان هەیە؟ پشووی ڕابواردن و کات بەسەربردن ئاسانتر بەهانەی بۆ دەهێنرێتەوە. دەکرێت بووترێت کارێك کەمتر مانادار بێت، کاتێکی پشووی زیاتری هەبێت. بەڵام ئەم پرنسیپە خۆی یارمەتیمان نادات بۆ چارەسەرکردنی ئەم کێشانە.

پرنسیپی هەشتەم: "لەبەرئەوەی ئاشتی هەم وەکو نەبوونی توندوتیژی و هەم وەکو بوونی دادپەروەری مەرجێکی پێویستە بۆ ئەوەی مرۆڤ بوونی خۆی بەرەو کامڵ بوون بەرێت. هەموومان دەبێت خەبات کەین بۆ گەشەکردن و بەرقەراربوونی ئاشتی لەسەر هەموو ئاستەکان". ئەو مەرجەی بەڵگەنامەکە زیادی کردووە ئەوەیە کە "دەبێت زۆر بە توندی دژی توندوتیژی بوەستینەوە، تەنها لەیەك کاتدا پەنای بۆ دەبرێت کە نەبوونی توندوتیژی ببێتە تاوانکارییەکی گەورەتر". بەڵام پرسیارگەلێك هەن لە کاتی بوونی تاوانکارییەکی گەورەتردا پەیدا دەبن، لەبەرئەوە دەبێت چاوەڕێی ئەو کاتە بین ئینجا دەکرێت دڵنیا بین.

پرنسیپی نۆیەم و دوا پرنسیپ: "پێویستە هەموومان ڕێزی ئەو فەزا و کەشە بگرین کە پەیوەستن پێوەی، وا دێتە پێش چاوم ئەمە شتێکە هەموو کەسێك لە هەموو شوێنێکەوە بەشێوەیەکی تیۆری پابەندە پێوەی، بەڵام هەموومان لە پراکتیزدا پێشێلی دەکەین. پرنسیپەکەش یارمەتیمان نادات بۆ دیاریکردنی ئەو پێوەرە تایبەتانەی کە کردەیین لە پیادەکردنی دیموکراسییەکی خۆییدا. ئێستا هەوڵدەدەم سەرنجێکی گشتی لەسەر ئەم پرنسیپانە وەکو گشتێك بدەم. ئێمە ئەمڕۆ هەموومان هۆشیارین بەوەی ئەم جیهانەمان بۆتە یەکەیەکی پەیوەندیداری واقعی، بەو مانایەی نەتەوەکان و نیشتمانەکان لە ڕووی ئابورییەوە تاڕادەیەکی زۆر پەیوەستی یەکترن و پشت بە یەکتر دەبەستن، لەبەر ئەوەشە جەنگ بە شێوەیەکی دڕندانە وێرانکەرە. مانەوەو گەشەسەندنی ڕەگەزی مرۆیی لەم قۆناغەی مێژوودا پێویستی بە گفتوگۆ و دەربڕینی لانیکەم یەك بۆچوون و دیدگایەکی ئەخلاقی بنەڕەتی یاخود کۆمەڵێك پرنسیپی ئەخلاقی هەیە لەسەر ئەم پرنسیپانە هەموو تەرزە سەرەکییەکانی کلتوری مرۆیی ڕێکبکەون و دەکرێت کاریگەری لەسەر ڕەفتاریان هەبێت. پێویستمان بە دەرخستن و پەروەردەکردنی زەمینەی یەکیەتی مرۆیی هەیە لەژێر فرەیی نەتەوەکان و کلتورەکان و سیستەمە کۆمەڵایەتییەکان و ئایینەکان و ئایدۆلۆژییەکان کە لە ناویاندا و لە نێوانیاندا پێکدادان ڕوودەدات.

کاتێك ڕۆشنگەری ئەوروپا لە سەدەی هەژدەیەمدا گەیشتە لوتکە، خۆرئاوا لێوانلێو بوو لە ڕوحیەتی بیرمێژوویی زانستخوازی لیبراڵی دیموکراسی تاکگەرایی، ئەم ڕوحیەتە دەکرێت بەشێوەیەکی گشتی پێیبووترێت مۆدێرنیتە. هەروەها لەم ماوەیەدا، خۆرئاوا لە بنەڕەتدا مەسیحی بوو یاخود دەکرێت بڵێین ئەمڕۆ تاڕادەیەکی زۆر پاش- مەسیحییە - ***post christian***. لە ڕاستیدا مەسیحیەت وەکو کاریگەرییەکی کلتوری دەبینرێت لە زەینی زۆربەی ئەو مەسیحییانەی کە هەڵگری ئەم بیرۆکە لیبراڵییانەی مۆدێرنیتەن بەتایبەتی

کاتێک بەراوردی دەکەن لەگەڵ ئایینەکانی دیکەدا. لە دیدێکی مێژووییەوە ئەمە ڕاست نییە. ئەوەی ڕوویدا ئەوە بوو مۆدێرنیتەی سێکولار دیدی جیهانی مەسیحی گۆڕی لانی کەم لە خۆرئاوا وەك لەوەی مەسیحیەت *christianity* لە سەرچاوە ئایینیە تایبەتمەندەکانی خۆی دابڕیبێت و ئەم بەها لیبراڵییە نوێیانەی خستە کلتووری خۆرئاواییەوە. لە ماوەی بەشێکی زۆرتری مێژووی خۆیدا، مەسیحیەت نە دیموکراسی بووە، نە لیبراڵی و نە زانستخواز و نە بیر مێژوویی بووە. بەهەر حاڵ، ئاشکرایە ئەم پرنسیپە ناوەندیانە لەدایکبوی کلتوری پاش – ڕۆشنگەری خۆرئاوای هاوچەرخن. هەرکەسێك بیانخوێنێتەوە، زۆر بە باشی سەرچاوەکەیان دەناسێتەوە و بۆی دەردەکەوێت کە ڕەنگدانەوەی بایەت و پێشگریمانەکانی مۆدێرنیتەن.

هەنووکە زۆرینەمان یاخود دەشێت بڵێین هەمووما بەرهەمی کلتوری خۆرئاوای نوێین، زۆر بەلای ئەم پرنسیپە ناوەندییانەدا دایدەشکێنین واتە لامان پەسەندن، دەشێت بە ووردیش دەستکاری بکرێن و چاکسازیان تێدا بکرێت. ئێمەش حەزدەکەین ئەم پرنسیپانە یاخود هاوشێوەیان ببنە ئەخلاقیەتێکی جیهانی ڕاستەقینە. لەبەرئەمەشە گرنگە تێبینی جیاوازی و ناکۆکی نێوان کلتوری ڕۆشنگەری *Enlightenment* و پێش – ڕۆشنگەری بکەین، وەکو بینیمان هەردووکیان لە خۆرئاوا پەیوەستی زهنیەتێکی مەسیحین بە زهنیەتە پاش – مەسیحییەکەشەوە، تەنانەت زهنیەتی پاش – مەسیحیش پەیوەستی زهنیەتە مەسیحییەکەیە. بەلام ئومێدی ئەوە نییە

هەرچی مەسیحیەتی مۆدێرنیشە ببێتە ئایینی جیهانی و ئیسلام و یاهودیەت و هندویزم و سیخیزم و بودیزم دەرپەڕێنێت.. بەلام دەشێت ئومێدێك هەبێت بەهاکانی ڕۆشنگەری جیهانییانە قبوڵبکرێن، مەسیحیەت تاڕادەیەکی زۆر لەگەڵ ئەم بەهایانەدا خۆی گونجاندووە. ئێستا زۆر بە باشی هەندێك لەم بەهایانە لەسەرتاسەری جیهانی یەکگرتوماندا لە کارکردندان و کلتورو ئایینەکانی دیکە بەشێوەیەکی وا دەگۆڕن کە مەسیحیەتیان یاخود زۆرینەی مەسیحیەتیان گۆڕی، بەلام هێشتا بەشێکی گەورەی فەندەمێنتالست هەیەو ئەگەری زۆرە لە داهاتووشدا هەبێت کە بە عەقڵیەتی پێش – ڕۆشنگەرییەوە کار دەکات.

بەلام ئەمە لەوانەیە بەشێکی دۆخەکە بێت، هەندێك لەم کاریگەری و بەهایانە(نەك هەموویان) کە دیدە خۆرئاواییەکەی مۆدێرنیتەیان دروست کردووە، بەردەوام کاریگەری لەسەر کلتورەکانی دیکە دروست دەکەن، بەلام هەندێك کاریگەری و بەها هەیە لەسەر ئەم کلتورانە هێشتا کاریان نەکردۆتە سەر خۆرئاوا بەلام لە داهاتوودا دەیکەن. چینی و ئەفریقی و هیندی و شێوازی دیکەی هەستکردن و بیرکردنەوە هەیە دەشێت خۆرئاوا پێویستی بە خۆگونجاندن و تێکەڵ بوون هەبێت لەگەڵیاندا. بۆ نموونە چەمکی ئەفریقی "یوبونتۆ *ubuntu*) هەیە لە کۆمەڵە زمانەکانی نگونی *Nguni* یاخود چەمکی بۆتۆ *Botho* هەیە لە زمانەکانی سۆتۆ. هەروەکو دیسمۆند توتو *tutu Desmond* ئەم چەمکە ڕوون دەکاتەوە "مرۆڤ بوونی من لە تۆدا بەرجەستەیە، بەشێوەیەکی لێدەرباز نەبوو پەیوەستی تۆیە"، ئێمە تاڵێکین لە گوزەری

ژیـان. دەڵـێین: مـرۆڤ لـە ڕێگـەی مرۆڤـەکانی دیکـەوە مرۆڤـە (یـاخود کەسـێك لـە ڕێگـەی کەسـەکانی دیکـەوە کەسـە). مرۆڤێـك لـە پلـەی یۆبۆنتـۆدا مرۆڤێکـی ڕاسـتەقینەی خـود – دڵنیایە، ئەم خود – دڵنیاییەش لەوەوە دێت کە ئـەو مرۆڤـە سـەر بـە گـشتێکی گـەورەترەو هەرکاتێك مرۆڤەکانی دیکە سوکایەتیان پێکراو لـە شـکۆمەندییان کەمکرایـەوە، ئـەوا لـەم مرۆڤـەیان کەمکردۆتـەوە، هـەر کـاتێکیش مرۆڤـەکانی دیکـە ئەشـکەنجەدران و سـەرکوتکران و کـەمتر لـە خۆیـان مامەڵـەیان لـە تەکدا کرا، ئەوا ئەم مرۆڤە سوکایەتی پێکراوەو ئەشـکەنجە دراوەو لێـی کەمکراوەتـەوە. (هـیچ داهاتوویـەك نییـە بـەبێ لێبـوردن). ئـەم دیـدە لەسـەر ئـەرك و دەربەسـتەکان (ئیلتیزامـەکان) بناغەدانانێت، تەنها پەیوەستی پەیوەندی نێوان تاکـەکان نییـە بـەڵکو گرنگـی سیاسـی گـەورەی هەیـە چـونکە ئـەم دیـدە لـە پـشت سیاسـەتی ئاشـتبوونەوەی نێڵـسن مانـدێلاوە بـوو وەك لـە سیاسەتی تۆڵە کردنەوە و پاشانیش لە لیژنـەی ڕاستی و ئاشتبوونەوەدا بەرجەستە بوو کاتێك سیاسـەتی جیـاوازی ڕەگـەزی کۆتاییهـات. ئـەم دیـدی یۆبۆنتۆیـە لەوانەیـە تـوخمێکی دیکـەی جیـاواز بهێنێتـە نـاو بیرۆکـەی ئـەخلاقێکی جیهانییـەوە، ئـەویش مرۆڤـە. دیسانەوە هـەمان دید لـە پـشت پرنسیپی ناتوند و تیـژی مهاتما غاندییـەوە بـوو، ئـەو عەقیـدە سـوونەتییە هندوسـییەی قبـوڵ بـوو کـە ئاتمـان *Atman* یـاخود ڕوح *Soul* لـە هـەر یـەکێك لـە ئێمـەدا دواجـار یەکـە. کاتێـك ئـازاری کەسـێك دەدەیـت ئـازاری بەشـێك لـە خـۆت دەدەیـت. دەڵێـت: "ڕاستگۆ بن بەرامبەر ئاوەها ئاینێك"، هـەروەها دەڵێـت: "دەبێـت خـۆت بکـەیت بـە قوربـانی لـە پێنـاو خزمـەتی بـەردەوامی هـەموو ژیـان"، دیـسانەوە ئەمـە کاریگەرییـەکی سیاسـی زۆر گەورەی هەبوو چونکە ئەم دیدە لە پشت دواین هەڵمەتە سەرکەوتووە ناتوند و تیژییەکەوە بوو لە پێناو سەربەخۆیی هندستاندا.

دەشێت دیدی جیاوازی چینی (*chinese*) و شـێوازی دیکـەی بیرکردنـەوە هـەبێت کۆمـەکی دروست بوونی ئـەخلاقێکی جیهانی ڕاستەقینە بکـات. شـێوازە جیاوازەکـانی مـرۆڤ بـوون کـە شارسـتانیەت و کلتـورە مەزنـەکانی سـەر زەوی لەگەڵ خۆیدا هێناوە دەشێت لە هەندێك ڕووەوە لـە چوارچـێوەی سیـستەمی مۆدێرنیتـەی جیهانی فۆرمی جیاواز وەربگرێت و لێرەشەوە کـار بکاتـە سـەر هـەر سیـستەمێکی ئـەخلاقی داهاتووی جیهانی.

کەواتـە دەرەنجـامی قـسەکانم ئەمەیـە: ئـەخلاقێکی جیهـانی بـێ پـەردە و بـە ئاشـکرا دەمێنێتەوەو بۆ ئەوەی بەرقەرار بێت پێویستی بـە ڕاپرسـییەکی جیهـانی هەیـە کـە دیـدگا خۆرئاواییەکەی ئێستا تێپەڕێنێت..

**سەرچاوە**

www.johnhick.org.uk

SARDAM No. 55 2008

# مافەکانی مرۆڤ

جۆرج تەرابیشی

لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد

مافەکانی مرۆڤ ئایدیایەکی نامێژوویی نییە، بەڵکو ئایدیایەکە بەرهەمی مۆدێرنەیە، دوای ئەوەی لە هەناوی کلتورەکانی بەر لە مۆدێرنەدا گەشەیەکی سەرەتایی کرد. ئایدیای مافەکانی مرۆڤ وەك کات ، لە قۆناغی نێوان سەدەی حەڤدەو هەژدەداو وەکو شوێنیش، لە ئەورووپای خۆرئاوادا بە دیاریکراوی هاتە ئارا و فۆرمەلە بوو. هاتنە ئاراشی لە هەلومەرجێکی کەلتوری نوێدابوو کە بڕوای بە پێشکەوتنی مرۆڤ و رۆڵی زانست و دەسەڵاتی ئەقڵ هەبوو.

چەمکی مافەکانی مرۆڤ روناکی نەدەبینی، ئەگەر وتەزاکانی ئازادی و یەکسانی و فەردانیەت، وەك وتەزای سێنترالْ لە فیکری سیاسی و یاسایی و فەلسەفیدا، خۆیان فەرز نەکردایە. کلتوری سیاسی بەر لە مۆدێرنە، چەمکی گروپی پێش چەمکی فەردانیەت دەخست و وەك یەکەیەکی سەربەخۆ سەیری تاکەکەسی نەدەکرد، بەڵکو وەك بەشێك لە گشتێکی گەورەتر کە قەوارەی کۆمەڵایەتیە لێی دەڕوانی، ئیتر ئەو قەوارە کۆمەڵایەتیە دەوڵەت-شاری یۆنانی یان قەڵەمڕەوی مەسیحی یاخود ئومەی ئیسلامی بوبێت.

لەسەر ئاستی فەلسەفەی مێژووش، دەبوو گۆڕانێك لەو دیدگا ئۆرگانیەدا دروست بێت کە فەرد لە گروپدا شەتەك دەدات، بەرەو دیدگایەکی میکانیکی کە پێیوایە کۆمەڵ یەکەیەکی گشتگیر و ئۆرگانی پێشوەخت نییە، بەڵکو گردبونەوەیەکی خۆویستانەی تاکەکەسەکانە کە هەریەکەیان خاوەن بڕیارو سەروەری خۆیانن.

هەرسێ ئایینە یەکتاپەرستیەکە ئەگەرچی رۆڵیان لە تێکدانەوەی ئەو دیدگا ئۆرگانیە گشتگیرەدا نەبوو، بەڵام لە بەرامبەردا بەشداربوون لە خوڵقاندنی ئایدیای مرۆڤدا. چونکە هەریەك لە (یەهودیەت و مەسیحیەت و ئیسلام)، هاوڕابوون لەسەر ئەوەی کە بڵێن:

(یـەزدان مرۆڤـی لەسـەر شـێوەو فـۆرمی خـۆی دروسـت کـردووە). بـەمجۆرە مـرۆڤ رێـز و حورمەتێکی چنگ کەوت، کە کلتورەکانی پێشتر پێیان رەوا نەدەبینی. گومانیشی تێدا نییە کە ئـەم سـێ ئایینـە یەکتاپەرسـتیە، رۆڵیـان لـە گەشـەپێدان و بـەرەو پێـشبردنی ئایـدیای (ماف)دا هەبووە، بەڵام هەر هەموویان مافەکانی یەزدانیان دەخستە پێش مافەکانی مرۆڤەوە.

تیۆلۆژیستە ئیسپانیەکان لەنێوان سەدەی شازدەو حەڤدەدا، رۆڵێکی تایبەت دەگێڕن لە هێنانە ئارای چەمکی مرۆڤ و مافەکانیدا. لەپای دۆزینـەوەی کیـشوەری ئـەمریکادا، مەسـەلەی ئینسان بوونی هندییە-سـورەکان رووبـەروی فیکـری یاسـایی و تیۆلـۆژی بـووەوە. سـەرەتاو کاتێـک ئیسپانیەکان چوونە ناو ئەو جیهانە تازەوە، پێیان وابـوو دانیـشتوانە رەسـەنەکەی ئـەو کیـشوەرە، ئاژەڵگـەلێکی بێـرۆح و گیـانن، لێـرەوە مـافی ئـەوە بـەخۆیان دەدەن کە قەتڵ و عامیان بکەن و دەست بەسەر موڵك و ماڵاتیاندا بگرن.



ئـەوەی بـەری بـەم پرۆسـەی پاکتـاوکردن و بەکۆیلەکردنە گرت، قەشەیەکی دۆمنیکانی بوو بە نـاوی "لاس کاساس"ەوە. ئەم پیـاوە سـاڵی 1539 کتێبێکـی بـەناوی (پەنـدو ئـەزموون دەربارەی هیندیەکان) بڵاوکردەوەو تیایدا باس لـەوە دەکـات کـە خـەڵکانی ئـەو کیـشوەرە سـەرەڕای بـت-پەرسـتیان هـەر مـرۆڤن. بـەو پێیەشی مرۆڤن ئەوا دەبێت ماف و حورمـەتی ئینـسانیان هـەبێت، بـەپێی ئـەو یاسـا سروشتیانەی ئیرادەی یەزدان سەرچاوەکەیەتی. ئەم بیرۆکەی مافی سروشتیەش کە نوێنـەرانی قوتابخانـەی تیۆلـۆژی (سـەلمەنقە) پـەیرەوی دەکـەن، بەتایبـەتیش "ڤیکتۆریا" و "سواریز"، پێیـان وابـوو مـرۆڤ بونـەوەرێکی زینـدووەو یـەزدانیش بـە ئـەقڵ لـە تـەواوی بونـەوەرەکانی دیکـە جیـای کردۆتـەوەو مافـە سروشـتیەکانی مـرۆڤیش مەرجەعیـەتێکی یۆنیڤێرسـالی هەیـە. دواتر قوتابخانەی نوێی مافە سروشتیەکان، کە هەریـەك لـە مافناسـی هۆڵەنـدی "گرۆسـیۆس" و مافناسـی ئـەڵمانی "بۆفنـدرۆف" نوێنەرایـەتیان دەکـرد، پـشتیان بـە بیرۆکـەی مافـە سروشـتیەکان بەسـت، وەکـی ئـەوەی تیۆلۆژیـستەکانی قوتابخانـەی "سـەلمنقە" پـەرەیان پێـدابوو، بـەڵام لە هەمان کاتدا ویستیان ئـەو مافانـە لـە بنـەما ئایینیەکـەی دابمـاڵن و بنەمایەکی عەلمانی پەتی بۆ دابنێن کە بریتی بێت لە ئەقڵی مرۆڤ خۆی.

فەیلەسـوفانی سیاسـی ئینگلیـز، بـەر لـە هەمووشـیان "تۆمـاس هـۆبس" و "جـۆن لـۆك"، لەسەر پرۆسەی بەعەلمانیکردنی تیۆریای ماف بـەردەوام بـوون و بـە مافـە یاسـاییەکان رووبـەرووی مافـە سروشـتیەکان بوونـەوە. هاوکـات سنورداركردنی دەسـەڵاتیان بـە یاسـا فۆرمەلـە کـرد. لەلایـەکی دیکەشـەوە بیرۆکـەی

کۆمەڵگـەی مەدەنیـشیان بـەرفراوانتر کـرد، وەك شـوێنێك کـە تیایـدا مـرۆڤ دەسـتبەرداری ئازادییـە خۆڕسـکەکانی دەبێـت ئـەو ئازادییـە خۆرسـکانەی دۆخـی سروشـتی پێیـان دەبەخـشێت، لـە پێنـاو ئازادییـەکی بەیاسـایکراودا، واتـە ئازادیـەك لـە سـایەی هەلومـەرجێکی یاسـایدا ئـەنجام دەدرێـت کـە هەمووان لەسەری کۆکن و پێی رازین. بەمجۆرە کۆمەڵگە شوێنی جەنگەڵ دەگرێتـەوە و ئـازادی هەریەکێك لەوێدا کۆتایی دێت کە ئازادی ئەوی دی دەسـت پێدەکات. لەم سەرو بەندەدا فەیلەسوفی پـەیمانی کۆمەڵایەتی"ژان ژاك رۆسـۆ" دوودڵ نەبوو لەوەی ئازادی بەوە پێناسە بکات کـە: (ملدانـە بـەو یاسـایەی هاوڵاتیـە ئازادەکـان بـۆ خۆیانی دادەڕێژن). لـەناو فەیلەسوفانی رۆشنگەری فەرەنسیدا، "ڤۆڵتێر" یەکەم کەس بوو کە بە روونی ئایدیای مافەکانی مرۆڤی فۆرمەلەکرد. لە (فەرهەنگی فەلسەفی)دا وەها پێناسـەی مافـەکانی مرۆڤـی کـردووە کـە بریتیـە لـەوەی مرۆڤ ئـازادی تـەواوی لـە ژیـانی خۆیـدا هـەبێت و مـافی ئـەوەی هـەبێت لـەڕێی پێنووسـەکەیەوە، نەتەوەکـەی بـدوێنێت و هاوکات بتوانێت لەسەر تاوانێك کە کردویەتی، تەنها لەبەردەم دەستەیەك دادوەری سەربەخۆدا دادگـایی بکرێـت و بـەپێی کۆمـەڵێك بڕگـەی



یاسـایی روون و ئاشـکرا نـەبێت، بڕیـاری بەسـەردا نـەدرێت. هاوکـات مـافی ئەوەشـی هـەبێت، بە دڵنیایی ئەو ئایینە هەڵبژێرێت کە خۆی دەیەوێت).

بـەڵام لێـرەدا دەکرێـت بڵـێین شۆڕشـی فەرەنـسی 1789 خـاڵی وەرچـەرخانی چارەنووسسازە لە مێژووی مافەکانی مرۆڤدا، نـەك هـەر لەبـەر ئـەوەی جاڕنامـەی (مافـەکانی مـرۆڤو هـاوڵاتیبوونی) راگەیانـد، بـەڵکو لەبەرئـەوەی هـەنگاوێکی چۆنایەتی دروستکرد لـە مـافی سروشتییەوە بەرەو مـافی وەزعـی. جاڕنامەی مافەکانی مرۆڤ و هاوڵاتی کە لـە سـێیەم سـاڵی شۆڕشـدا دەرچـوو، هیچ ئاماژەیەکی بۆ مافە سروشتیەکانی مـرۆڤ تێـدا نـەبوو، بەڵکو تەنها ئەژماری ئـەو مافـە وەزعیانـە دەکـات کـە مـرۆڤ بـەپێی یاسا دەگەڕێتـەوە بۆیـان، بەتایبـەتیش مـافی ئـازادی و یەکـسانی و ئاسـایش و موڵکدارێتی. مـافی مـرۆڤ لـە سروشـتدا بـوونی نییـە، بـوونی تـەنها ئـەو کاتـە دەبێـت کـە یاسایەکی وەزعی بوونی دەپارێزێت. هەر لەبەر ئەمەشـە شۆڕشـی فەرەنسی مافـەکانی مـرۆڤ و مافەکانی هاوڵاتی هاوتای یەك کرد، چونکە ئەو لەگـەڵ مرۆڤـی ئەبـستراکتدا مامەڵـەی نـەکرد، بەڵکو مامەڵەی لەگەڵ هاوڵاتی فەرەنسایدا بوو. لێـرەوە سـەرجەم دیکۆمێنتـە دەسـتوریەکانی

فەرەنسای دوای شۆڕش، چوونە ژێرباری ئەم ئاقارە وەزعیەوە، بۆیە دەبینین هەموویان باس لە (مافی فەرەنساییەکان) دەکەن و زۆر بە وردیش سروشت و خەسڵەتی ئەو مافانە دیاری دەکەن. بەڵام لێرەدا دەبێت ئەوە بەبیر بهێنینەوە کە ئەو مافە وەزعیانەی جاڕنامەی مافەکانی مرۆڤ لەگەڵ خۆیدا هانی، لەلایەن نەیارانی شۆڕشی فەرەنسییەوە کەوتە بەر رەخنەو دژایەتیکردن، بەتایبەت لەلایەن هەوادارانی سستمی پاشایەتی پێشوو لەگەڵ شوێن کەوتوانی کڵێسای کاتۆلیکیدا. ئەمانە دژی سستمی نوێی شۆڕش و ئەو پرانسیپانەبوون کە لە جاڕنامەی مرۆڤ و هاوڵاتیدا هاتبوو.

بۆ نموونە بیریاری بەریتانی "ئەدمۆند بێرك" لە کتێبە بەناوبانگەکەیدا (تێڕامان دەربارەی شۆڕش لە فەرەنسا) کە لە ساڵی 1790 بە چاپی گەیاندووە، دژی ئەو مافە ئەبستراکتانەیە کە شۆڕشگێڕانی فەرەنسایی بانگەشەی بۆ دەکەن و دژایەتی ئەمەش بەو مافە بەرجەستە و واقیعیانە دەکات کە بە شێوەیەکی شێلگێرانە لە کۆمەڵگەی بەریتانیدا بە دەست هاتوون، ئەویش بە حوکمی کەڵەکەبوونی ئەزموونی ڕابردوو لەگەڵ پەرەسەندنی سروشتی و خۆڕسکانەی کۆمەڵگە، نەك بە گەڕانەوەو پشت بەستن بە پرانسیپی تیۆریای میتافیزیکی. بە هەمان شێوەی "ئەدمۆند بێرك"، تیۆرسینی کاتۆلیکی دژە شۆڕش "جۆزیف دی میستەر"، بە ئاشکرا دژایەتی خۆی بۆ چەمکی مافەکانی مرۆڤ ڕادەگەیەنێت و ئەقڵی یۆنیڤێرسالی ئەو ئەقڵەی شۆڕشگێرەکانی 1789 بە ناوی ئەوەوە چەمکی مافەکانی مرۆڤ هاوڵاتیان فۆرمەلە کرد، بە کەم دەگرێت و ڕەخنەی دەکات. "جۆزیف دی میستەر" پێیوایە نەتەوە وەکی گشتێك، لەسەر مرۆڤەوەیە وەك تاکە کەس. لە مبارەیەوە دەڵێت: (لە جیهاندا مرۆڤ نییە. من فەرەنسایی و ئیتاڵی و ڕوسیم بینیووە، بەڵام هەرگیز لە ژیانمدا چاوم بە چاوی مرۆڤ نەکەوتووە).

شایەنی باسە هەر بە تەنها "جۆزیف دی میستەر"ی کۆنەپەرست دژایەتی مافەکانی مرۆڤی نەدەکرد، بە بیانوی ئەوەی شتێکی ئەبستراکتە، بەڵکو پێشکەوتوخوازێکی وەك "کارل مارکس"یش هەمان هەڵوێستی هەبوو، پێیوابوو مرۆڤ بونی نییە، ئەوەی هەیە تەنها کرێکار و بۆرژواو ئۆرستۆکراتەکانن. ئەو جاڕنامەیەشی کە شۆڕشگێڕانی 1789 ڕایانگەیاند، هیچ نییە جگە لە جاڕنامەیەك بۆ مافەکانی مرۆڤی بۆرژوازی. لە پای ئەم بۆچوونانەی "مارکس"دا بەلشەفیکەکانی شۆڕشی ڕوسی – دواتریش ستالینیەکانی، چەمکی مافەکانی مرۆڤیان ئافەرۆز کرد و بە چەمکی مافەکانی پڕۆلیتاریا کەوتنە دژایەتیکردنی، ئەو چەمکەی "لینین" خۆی لە ڕووی تیوریەوە داڕشت و مافی تەواوەتیشی دایە کە دیکتاتۆریەت پراکتیزە بکات. لە ڕاستیدا بەلشەفیەکان تاکە گروپێ نەبوون لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا کە دەیانویست ئەو دیدگا ئۆرگانیە گشتگیرە بۆ کۆمەڵگە زیندوو بکەنەوە، لە بەرامبەر ئەو دیدگا فەردانیەی ئەوان بە بۆرژوازی ناوزەدیان دەکرد، بەڵکو لەگەڵ ئەوانیشدا فاشیزمەکانی ئیتاڵیا و نازیزمەکانی ئەڵمانیا، سەرقاڵی هەمان پرۆسە بوون.

فاشیەکان و نازیەکان لەسەر زمانی "مۆسۆلۆنی" دوپاتیاندەکردەوە کە: (مافەکان، تەواوی مافەکان پێویستە بدرێتەوە بە دەوڵەت،

لە بەرامبەریشدا هاولاتیان جگە لە ئەرك دەرهەق بە دەولەت، هیچی دیکەیان نییە). لە بەر رۆشنایی ئەم دەستەواژەیەشدا، نازیەکان دەکەونە داتاشینی دروشمی فەرمی رژێمەکەیان کە دەلێت: (تۆ بۆ خۆت هیچ نیت، نەتەوەکەت هەموو شتێکە).

سەرەرای ئەوەی لە کۆتاییەکانی نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا تۆتالیتاریزمی فاشیزم و نازیزم، لە کۆتایی نیوەی دووەمی ئەو سەدەیەشدا تۆتالیتاریزمی کۆمۆنیزم، هەرەسیان هێناو ژێرەو ژوور بوون، بەلام لەگەل ئەوەشدا رێبازی ئۆرگانیزەی گشتگیری کۆمەلگە، تەواوی لایەنگرانی خۆی نەدۆراند.

بۆ نمونە بزوتنەوەکانی بەگژاچونەوەو بەرخودانی کۆلۆنیالیزم بە درێژایی سەدەی بیستەم، ناچار بوون گرنگی زیاتر بە مافەکانی گەل بدەن نەك مافەکانی تاکەکەس، واتە مافەکانی نەتەوە لەسەرو مافەکانی تاکەکەسەوە دابنێن. هەر ئەمەش جەوهەری فەلسەفەی سیاسی سەرجەم ئەو سستمە دیکتاتۆریانە بوو کە لە دوای قۆناغی رزگاری نیشتمانی دەسەلاتیان لە ولاتەکانیاندا گرتە دەست.

فەرمانرەوایانی جیهانی سێ و ئەو توێژە رۆشنبیرەی لە دەوریان بوون چەمکی مافەکانی مرۆڤیان رەتکردەوە، بەو پێیەی چەمکێکە مەیلی فەردانیەتی هەیە و هەروەها بەهانەیەکیشە بە دەست خۆرئاواوە بۆ مومارەسەکردنی ئیمپریالیزمێکی نوێی کلتوری و بۆ دەستێوەردان لە کاروباری ناوخۆی ئەو میللەتانەی تازە لە دەست کۆلۆنیالیزمی ئەوروپایی رزگاریان بووە. کاری رێکەوت نییە لە ئێستادا ئەو ژمارە زۆرەی جاڕنامەی مافەکانی مرۆڤ دەبینین کە لە لایەن دەستەو لیژنەی جیهانی سێ و ولاتانی ئەفریکایی و ئیسلامیەوە دەردەچێت. تەواوی ئەم جاڕنامانەش ئەوەندەی گرنگی بە شوناس و ناسنامەی ئەو گروپە دەدەن کە جاڕنامەکەی دەرکردووە، ئەوەندە بایەخ بە مافەکانی نادەن. واتە ئەوەی گرنگە لەم جاڕنامانەدا مەسەلەی داکۆکیکردن نییە لە مرۆڤ، بەلکو داکۆکیکردنە لە کلتوری ئەو جڤاتەی مرۆڤ لە ناویدا دەژی.

کەواتە هەنوکە لە ژێر ناوی کیشوەری رەش یان جیهانی سێهەم یاخود ئیسلامدا، جارێکی تر رێبازی ئۆرگانی گشتگیرانەی کۆمەل دێتەوە ئاراو لە بەرامبەر رێبازی فەردانیەت مافەکانی مرۆڤدا کە بە (خۆرئاوایی) ناوزەد دەکرێت، رادەوەستێت و خۆی ئیعلان دەکات.

سەرچاوە:

الحیاة، ژمارە (14374)، بەرواری 2002/7/28.

# پەیوەندییەکان و مافەکانی مرۆڤ

فەرزاد پورمرادی

لە فارسیەوە: ستار رەحمانی

سەردەمی دیوارکێشان و سنووردانان بۆ پێشگریکردن لە گواستنەوەی زانیاری کۆتایی پێهاتووە. سنوور دانانی بۆ پەیوەندییەکان ئیتر بێ مانایە، مرۆڤەکان بە گۆڕینەوەی ملیۆنەها نامەی ئەنتەرنێتی لەنێوانیاندا، تەنانەت ئامادەنین بۆ چرکەساتێکیش بگەڕێنەوە بۆ دنیای نامۆی رابردووی خۆیان. کۆبوونەوەی مالآن و بازاڕ جێگای گۆڕیوەتەوە بۆ ناو کافینێتەکان. وێنەی جوانی دیجیتالی سەتەلایت، جێگای کەناڵە تەلەفزیۆنیە پڕ لە تەرزەکانی گرتووتەوەو دیوارەکانی کولتووری ڕووخاندووە. هیچ ئەکادیمیاو قوتابخانەیەک ناتوانێت وەک بەهێزی و بالادەستی وێنەی سەتەلایت و شاڕێگای جیهانی ئەنتەرنێت، نزمترین چینەکانی کۆمەڵگاو تاکەکانی کۆمەڵ لە



چۆنیەتی ژیان و پەیوەندی نیوان ولاتان ئاگادار بکاتەوە.

پەیوەندییەکان تێگەیشتنی جۆراجۆری نێوان مرۆڤەکانی بە چەشنێك دەستەبەر کردووە، کە لێتێگەیشتنی بۆ گشت مرۆڤەکانی سەر گۆی زەوی ئاسان بێت.

هەزاران کاتژمێر لە شەوو ڕۆژێکدا بۆ ملیۆنان بینەر لە سەرانسەری دونیاو ملیۆنان بینەری ماڵپەرە ئەنتەرنێتیەکان، بۆتە ناوەندێکی هەمەچەشن و هەمە بابەت بۆ فێرگەو فێرکردن و گۆڕینەوەی کولتوورەکان.

هیچ کەرەستەیەك نەیتوانیوە لە بلاوکردنەوەی چەمکە گشتگیرە جیهانیەکانی مافەکانی مرۆڤ لە سەرانسەری دونیادا، بەم شێوازە فراوانە ڕۆڵ بگێڕێت. ئێمە هەموو چرکەساتەکان بینەری گواستنەوەی هزرین بۆ ناو چینە جۆراوجۆرەکانی نێو کۆمەڵگا لە

هەموو دونیاداو، هەروەهاش بە چاوی خۆمان پرۆڤەکردنی دیموکراسی لە دڵی بنەماڵەکاندا دەبینین. هیچ کاتێك بەربەستو ئاستەنگ دروستکردن بۆ گواستنەوەی زانیاری بەم شێوەیە لاوازو ڕسوا نەبووەو نابێت. هەواڵی ناڕاستو بڵاوکردنەوەی درۆو، هەڵخەڵەتاندنی بیروڕای گشتی کۆمەڵگایەك بۆ گرتنەدەستی دەسەڵات بە مەبەستێکی دژە مرۆڤانە، بۆتە کارێکی بێهوودەو بێسود. بێگومان کۆمەڵگا لاوازەکانو ئەو کۆمەڵگایانەی کە پشتیوانی مێژوویيان نییەو لە بواری کولتووریشدا هەژارن، لەم پەیوەندییە جیهانییەدا تووشی کۆمەڵێك گرفت دەبن. بەڵام ملهوڕو دیکتاتۆرەکان دۆڕاوی سەرەکی ئەم خوانە جیهانییەن. هەرەسهێنانی دیواری داخراوی گواستنەوەو ئاگاداربوونەوەی خەڵك لە ڕاستیەکانی خۆیانو نەتەوەکانی دیکەی جیهان، هەروەها بەرهەمهێنانی چاوەڕوانی خەڵك لە دەسەڵاتێك- کە لە ڕووی بێ توانایيەوە دەستیان داوەتە دیوار کێشانو خەڵکی کۆمەڵگاکەیان لە بێئاگایی هێشتۆتەوە- بەرچاوترین ئەنجامی باڵادەستی پەیوەندیێکانە لە کۆمەڵگا داخراوو دواکەوتووەکاندا. پێشوازیکردن لە چۆنیەتی ژیانی وڵاتانی ئازادو دیموکرات، کە لە زمانو جلوبەرگو ئابووری بنەماڵەیی، چاوەڕوانیە نەتەوەییەکان سەرهەڵدەدەن، پیشاندەری دوورکەوتنەوەی خەڵکی لەو بگرەو بەردانە هەیە لە بەڕێوەبردنی کاروباری ژیانیاندا.

گواستنەوەی مانای مافەکانی مرۆڤ بە سادەترین شێوازی لێتێگەیشتن لە ڕێگای ڕاگەیاندنو ئەنتەرنێتو دەرکەوتنی شوێنەوارەکانی، ڕێزگرتن لە کۆمەڵگا ئازادەکان (وێرای ڕۆڵێك کە لە بەختەوەریو تەندروستیاندا بینیوێتی) زیاد کردووە. ئەوەش بۆتە هۆی دروستبوونی ئینتما بەو تایبەتمەندیانەو گۆڕینیان بۆ خواستێکی گشتی لە کۆمەڵگە دواکەوتوەکاندا. بۆیە تێپەڕبوون لە کۆسپە کولتوریەکانیشی بۆ ئەو کۆمەڵگە دواکەوتوانە ئاسانتر کردووە. کێشمەکێشێك کە لە نێوان توێژە جیاجیا کۆمەڵایەتیەکان، لەڕێی پلانی سنووردارو داخراوی حکومەت بۆ بەزاندنی سنوورداریێتی پەیوەندیەکان ڕوودەدات، هەروەها دروستبوونو دەرکەوتنی چاوەڕوانییە جۆراوجۆرەکان کە بە شێوازی جۆراوجۆر باس دەکرێن، نمونەگەلێکی دیارن لە ڕۆڵی ڕاگەیاندنو گەیاندنی زانیاریەکان لە سەردەمی ئەمڕۆدا.

لەو ڕووەوە کە خەڵکانی ئاگادارو هۆشیار گەورەترین مەترسیان لەسەرە لە دامەزراندنی دیکتاتۆریدا، بۆیە کۆڵەکەکانی ئەم جۆرە دەسەڵاتانە لەم سەردەمەدا، لە پەیوەندیو گواستنەوەی زانیاری پێکهاتووە. بەم پێیە هەولدەدا بەهەر شێوازێك بۆی بکرێت – ئاسمانی بێت یاخود تەنانەت دروستکردنی کۆسپی بەردین لەبەردەم کولتوری کۆمەڵگا– دژی ئەو دەستکەوتە مرۆییە ڕاپەڕێتو ڕێوشوێنی سنووردار لەو بوارەوە بۆ خەڵکانی کۆمەڵگەکەی بگرێتە بەر. بەڵام ڕەوتی ڕوو لە گەشەی داخوازییە گشتیەکان لە کۆمەڵگاو ئارەزووی خەڵك بۆ گەیشتن بە ژیانێکی باشترو ئاگاداربوونیان لە ڕاستیەکانی بارودۆخی ناوخۆی وڵاتەکانیانو پێکهاتنی ڕوانینێکی گونجێندراو، هەموویان پیشاندەری ڕۆڵی کاریگەری ڕەوتی زانیاریو لاوازبوونی ڕۆژانەی هێزو دەستەڵاتی ئەو حکومەتانەن کە دژی پێشکەوتن و گەشەکردنی کۆمەڵگان.

ئەگەر ئەم حکومەت و هێزانە بەڕواڵەت توانیبێتیان دژایەتی خۆیان لەگەڵ ئەم ڕەوتانە دەربڕن و تەنانەت توانیبێتیان هەنگاوی سەرکەوتوو لەو بوارەدا هەڵبگرن بۆ سەرکوتکردنی هەرچەشنە دەنگێکی ئازادیخوازانەو دیموکراسیخوازانە، ئەوا بێگومان لە کردەوەدا نەیانتوانیوە پێش بە ڕێگای گواستنەوەی "هزر" تەنانەت لەئاست خوارترین چین و توێژەکانی نێو کۆمەڵگا بگرن، کە هەڵقولاوو بەرهەم هاتووی پانتایی دونیای وێنەی دیجیتاڵی و ئەنتەرنێتە.

پێویستە ئەوەش بزانین کە سیستەمی سیاسەتی پەروەردەیی و تەنانەت ڕێگریکردن بۆ سوودوەرگرتن و بەرژەوەندی حکومەتی و بەربەست دروستکردن لەو بوارەدا، هەردووکیان بە قازانجی گواستنەوەی زانیاری تەواو بووە. ئەم هەموو ترس و دڵەڕاوکیٚ لە دنیای ڕاگەیاندن لە کۆمەڵگا داخراوەکاندا، لە بەرامبەر پێشوازی و زەوق و مەیلی خەڵك بۆ ڕوانین بەرەو ژیان و جیهانێکی ئازاد، دەرخەری ڕۆڵی سەرەکی ئەم دەستکەوتە گەورە مرۆییەیە.

بە واتایەکی دیکە، سەردەمی پەیوەندییەکان گرنگترین بارگرژی نێوان دیکتاتۆرییەت و دیموکراسییە. سەرفکردنی بودجەیەکی لە ڕادەبەدەرو بیٚ ئەژمار بۆ ڕێگرتن لە ڕەوتی هۆشیار کردنەوەو گەیاندنی هەواڵی بیٚ سانسۆر، ئەم ڕاستییە دەسەلمێنێت. گەر دوێنیٚ هەر ڕەوتێکی ئازادیخوازانە هەڵگری هەندێك بیری دیکتاتۆرانە بووبێت و نەیتوانیبێت وەڵامدەرەوەی گشت چاوەڕوانێکانی کۆمەڵگای دیکتاتۆرلێدراو بێت، ئەوا ئەمڕۆ بە یارمەتی چۆمی هەمیشە بەڕێگای گەیاندنی خێراو بێوەستانی زانیاری و بیٚ لە بەرچاوگرتنی کات و شوێن، بینەری دارمانی تەواوی کۆڵەکەکانی هزری و کرداری دیکتاتۆرو ملهوڕەکان بەگشتین.

بێگومان بەربەرەکانیٚ لەگەڵ میلیۆنان بینەری ڕاگەیاندن و ئەنتەرنێت کارێکی زۆر ئەستەم و بێهودەیە. ئەویش لەبەرئەوەی لە هەر چرکەیەکدا لە حاڵی وەرگرتنی هەواڵ و زانیارین، یاخود لە ناو ماڵ و کافی نێت لە پشت ئامێری کۆمپیوتەرو سەتەلایت بە دوور لە چاوی پۆلیس بۆ لەناوبردنی کۆڵەکەکانی سیستەمی دیکتاتۆرییەت تێدەکۆشن. دژایەتی (تاڵبان) لەگەڵ تەلەفزیۆن و ڕاگەیاندن شتێك جگە لە ترس و دڵەڕاوکیٚ لە زانیاری و هۆشیاری نەبووە. ئەوەی لە پاکستان ڕوویدا، ڕۆڵی حاشا هەڵنەگری هێزو باڵادەستی زانیاری لە هۆشیارکردنەوەی خێراو بێوەستان بوو لە نێوان نەیارانی حکومەت و بەرفراوانکردنی لە ئاستی نەتەوەییدا دژی کردەوەکانی پەروێز موشەرەف. تێکۆشەرانی دیموکراسی تەنیا لە حاڵەتێکدا دەتوانن بۆ بردنە پێشەوەی ئامانجی ئینسانی مافەکانی مرۆڤ کەڵك لەم کەرەستەیە وەربگرن، کە خۆیان بڕوای تەواویان بە پێوەرو مەرجەکانی دیموکراسی و کۆمەڵگای ئازاد هەبیٚ. بە پێچەوانەوە وەك چۆن دەسەڵاتە دیکتاتۆریەکان، تەکنۆلۆژیای زانیاری لە خزمەت ئامانجی دەسەڵاتخوازانەی خۆیان بەکار دەبەن، ئەو کەسانەش خزمەتێکی باشتر لەمە ناتوانن ئەنجام بدەن بۆ بەربەست دروستکردن لەسەر ڕێگای بەرفراوانکردنی کولتووری دان بەخۆداگرتن و پێکەوەهەڵکردن و ڕێگەخۆشکردن بۆ بەختەوەری و باشتربوونی داهاتووی کۆمەڵگەکەیان.

**سەرچاوە:**

سایت ئاینده – حوزەیرانی 2008

# چەند ئاماژەیەك لەبارەی رەوایەتی لەرێگەی مافەکانی مرۆڤەوە

یۆرگن هابرماس

لە فارسییەوە: سەردەم

من لەم وتارەدا زاراوەی "رەوایەتی" بەدوو مانای سنوردراو بەکاردەهێنم. سەرەتا چاوم لەسەر رەوایەتی رژێمی سیاسیە و دوهەمیان باسی رەوایەتی دیموکراسی یاسایی دەکەم. باسەکە بەبیرهێنانەوەی پێشنیارێك دەستپێدەکەم کە لە لێکۆڵینەوەی پەیوەندی دیموکراسی و مافەکانی مرۆڤدا پێشکەشم کردبوو. پاشان بەکورتی باسی هەندێك رەهەندی گرنگ دەکەم کە لە رەخنەکردنی رەوتی رەوایەتی رۆژئاواییدا ـچ لەرێگەی ئەو گوتارە باوانەی ناو بیریارانی رۆژئاواوە یان لە وتوێژی نێوان کلتورە رۆژئاواییەکان لەلایەك و کلتورەکانی دی لەلایەکی دیەوە، هێنراوەتە ئاراوە.

**یەکەم: ئاراستەکردنی سیستەمی دیموکراسی دەستوری**

رێگەبدەن باسەکەی خۆم بە رونکردنەوەی چەمکی رەوایەتی سیاسی دەست پێبکەم. رێکخستنی کۆمەڵایەتی کە لەگەڵ دەسەڵاتی سیاسیدا لەشکڵی دەوڵەتدا بەرجەستە دەبێت- بۆ نمونە و رێکخستنێك کە لە کۆمەڵگا خێڵەکیەکان جیای دەکاتەوە- پێویستی بە رەوایەتیەك هەیە کە چەمکی دەسەڵاتی سیاسی هەڵگرێتی. لەو روەوە کە پێویستیەکانی دەوڵەت لە شێوەی یاسادا دروستدەکرێت، ئەوا رێکخستنی سیاسی بە پشتبەستن بە بانگەشەی رەوایەتی یاسا، بەفەرمی دەناسرێت. واتە یاسا بانگەشەی شتێکی زیاتر لەوە دەکات کە تەنها قبوڵبکرێت و پەیڕەوی لێبکرێت. یاسا سەرەڕای ئەوەی خوازیاری ئەوەیە لەلایەن کەسەکانەوە بە فەرمی بناسرێت، بەشێوەیەکی شاراوە هەڵگری ئەو بانگەشەیەشە کە شایستەی ئەم بە فەرمی ناسینەیە. لە ئەنجامدا هەموو ئەو ئاراستەکردن و دروستکراوەکانی پەیوەندی بەم ئیستیحقاقەوە هەیە، دەبنە

بەشێك لە روایەتی حكومەتێك كە بەهۆی یاساوە دروستبووە.

ئەم حوكمە بۆ هەموو حكومەتەكان راستە. خەسڵەتی دەوڵەتی مۆدێرن ئەوەیە كە دەسەڵاتی سیاسی بەهۆی یاسای دانراو، واتە یاسایی پۆزەتڤیزمی و ناچاركەر دادەمەزرێت. ئێستا كە مەسەلەی رەهەندی رەوایەتی سیاسی بەمشێوە یاسایی یان دادگاییەوە بەستراوە، سەرەتا باسی بونیاد و رەهەندەكانی بایەخی یاسای مۆدێرن بەمەبەستی دیاریكردنی سنورەكانی دەكەم. دواتر جۆری ئەو رەوایەتیە باسدەكەم كە دەیهێنێتە ئاراوە.

$1-$ مافەكانی تاكەكەس ناوەرۆكی سیستەمی یاسایی مۆدێرن پێكدەهێنێت. كرانەوەی فەزای دادگایی بۆ بەدواداچوونی ئارەزوە فەردیەكان دەبێتە هۆی ئەوەی مافەكانی تاكەكەس بەشێوەیەكی جەختلێكراو، كەسی خاوەن ماف لە ناچاریەكانی حوكمە ئەخلاقیەكان و حوكمەكانی دی ئازاد بكات. بەهەرحاڵ لە سنوری رێگەپێدراوی یاساییدا هیچ كەس لەرووی یاساییەوە ناچار نیە بۆ ئەنجامدانی كارەكانی خۆی لەبەردەم (بواری) گشتیدا بەهانە بێنێتەوە. یاسای مۆدێرن بە پێشكەشكردنی ئازادیە فەردیەكان -لەبەرامبەر سیستەمی یاسایی دێرندا- بایەخی بەو بنەمایەی هانری داوە كە (دەڵێت) ئەوەی بەشێوەیەكی راشكاوانە قەدەغە نەكراوە، بەرێگەپێدراو دابنرێت. لە هەلومەرجێكدا كە ئەخلاق پێشوەخت پێماندەڵێت چ ئەركێكمان لەسەرشانە، یاسا هەڵگری بونیادێكە كە مافەكانمان پێشدەخات. لەكاتێكدا مافە ئەخلاقیەكان لە ئەركە دولایەنیەكانەوە وەردەگیرێت، ئەوا ئەركەكانی سیستەمی یاسایی لەسەر بناغەی ئەو سنورانە دادەمەزرێت كە بەسەر ئازادیە فەردیەكاندا باركراوە. ئەم گرنگیەی مافەكان بەسەر ئەركەكاندا، لە چەمكە مۆدێرنەكانی كەسایەتی یاسایی و كۆمەڵی یاساییدا شاراوەتەوە. ئاسمانی ئەخلاقی كە لەرووی شوێنی كۆمەلایەتی و كاتی مێژووییەوە بێسنورە، هەموو كەسە سروشتیەكان بە هەموو ئاڵۆزیە مێژووییەكانی ژیانیانەوە دەگرێتەوە. لەبری ئەمە كۆمەڵگایەكی یاسایی كە لەرووی شوێنكاتەوە سنوردارە، تەنها تا ئەو شوێنە بەرگری لە هەمەكی ئەندامەكانی دەكات كە خاوەنی هەلومەرجی دروستكراوی مافە فەردیەكان بن.

رەهەندی تایبەتی بایەخی یاسا رەنگدانەوەی ئەم بونیادەیە. لەبارەی رەهەندی دادگایی بایەخی یاساوە، روبەروی ئەو راستیە دەبینەوە كە جێبەجێكردنی یاسا بەهۆی دەوڵەتەوە پەیوەندی بە رەوایەتی میتۆدی عەقڵانیەوە هەیە لە یاسادانانەدا. یاسای مۆدێرن گوێگرانی ئازاد دەكات كە بەدوو شێوە هەڵوێست لە یاسا وەربگرن: دەتوانن خەسڵەتەكانی یاسا بەسنوردانان بۆ ئازادی خۆیان بژمێرن و بە حسابكردنی سودوزیانی ئەگەری پێشێلكردنی یاسا، روبكەنە پێشێلكردنی، یان "تەنها بۆ رێزگرتن لە یاسا" پەیرەوی یاسا بكەن. كانت سەردەمێكی پێشتر بە تێگەیشتنی خۆی بۆ یاسایەتی، لەگەڵ بەرجەستەكردنی ئەم دوو ساتەوەختەدا كە بێ ئەوان ناكرێ داوای پەیڕەویكردنی یاسا لەو كەسانە بكرێت كە لەرووی ئەخلاقیەوە ئەركی سەرشانیانە ، ئەم خاڵەی دەربڕیوە. سروشتەكانی یاسا بەجۆرێك داڕێژراون كە

هاوكات دەتوانین وەك یاسای ناچاركەر یان یاسای ئازادی تەماشای بكەین. دەبێ ئەو ئەگەرە هەبێت كە پەیڕەوی لە یاساكان نەك لەبەر سروشتی ناچاریان، بەڵكو لەبەر ڕەوایەتیان بكرێت. بایەخی شێوازی یاسایی واتە ئەوەی دەوڵەت هەم زامنی یاسادانان بەشێوەی ڕەوا و هەم زامنی جێبەجێكردنی پراكتیكیانەی دەكات. دەوڵەت دەبێت هەردوو ڕەهەندەكە زامن بكات: " لەلایەكەوە دەبێت زەمانەتی ڕەهەندی یاسایی ڕەفتاربكات كە بریتیە لە پەیڕەوكردنی یاسا بەشێوەیەكی ئاسایی و لەكاتی پێویستیشدا لەڕێگەی سزادانی هەركەسێكەوە كە ناكۆك بە یاسا دەجولێتەوە، زەمانەتی جێبەجێكردن پەیدا دەكات لەلایەكی دیەوە زەمانەتی ڕەهەندی ڕەوایەتی ڕێساكانی (قواعد) یاسا دەكات كە ئەو توانایەمان پێدەبەخشێت لەڕێگەی ڕێزگرتن لە یاساوە، خۆمان لەگەڵ شێوازێكدا بگونجێنین..

بەڵام لەبارەی ڕەوایەتی سیستەمی یاسایەوە ڕەهەندێكی دی گرنگیەكی تایبەتی هەیە كە بریتیە لە ڕەهەندی سەلماندنی یاسای دانراو. چۆن دەكرێت ڕەوایەتی یاساگەلێك كە بەردەوام بەهۆی یاسادانەری سیاسیەوە قابیلی گۆڕانە، ئاراستە بكرێت؟ دەستورەكانیش قابیلی گۆڕانن. تەنانەت سروشتە بنەڕەتیەكانی یاسا كە خودی دەستور بە نەگۆڕ دایناون، لە خەسڵەتی قابیلی گۆڕانبوندا لەگەڵ یاسا پۆزەتڤیزمەكاندا (بۆ نمونە پاش گۆڕانی ڕژێم) هاوبەشن. بەڵام ئەگەر بۆ یاساگەلێك بگەڕێنەوە كە لەسەر بناغەی دین یان فەلسەفەی سەرەتا دامەزراوە، ئەخلاق ئەو بۆشاییە پڕ دەكاتەوە كە بەهۆی كاتیبوونی یاساوە بەجێماوە. تەنانەت لە سەرەتادا وا وێنای یاسای دانراویان دەكرد كە ملكەچ و پەیڕەوی یاسایەكی ئەخلاقی نەمرە كە وەك "یاسایەكی بەرزتر" وێنا دەكرا. بەڵام لە كۆمەڵگا فرەكاندا ئەمجۆرە جیهانبینیە سیستماتیك و ڕێكخستنە ئەخلاقیە ناچاركەرانەیە، هەڵوەشایەوە.

تیۆرەی سیاسی دوو وەڵامی بۆ پرسیاری ڕەوایەتی دۆزیوەتەوە: دەسەڵاتی خەڵك و



مافەكانی مرۆڤ. بنەمای دەسەڵاتی خەڵك هەڵگری ڕەوتێكی دیموكراتیە لە یاساداناندا كە ڕەوایەتی بە بەرهەمی ئەم یاسادانانە دەدات. ئەم بنەمایە لەمافی بەشداریكردن و وتوێژدا دەردەكەوێت كە زامنكەری سەربەخۆی هاوڵاتیانی خاوەن دەنگە لە بواری گشتیدا. بەڵام لە بەرامبەر ئەم تێڕوانینەدا مافەكانی مرۆڤی كلاسیك پشتی بە ڕەوایەتی خودی

دەسەڵاتدارێتی یاسا بەستووە. ئەم مافانە زەمانەتی ژیان و ئازادی تایبەتی، واتە دەرفەتی بەدواداچوونی نەخشەی ژیانی تایبەتی هاوڵاتیان دەکەن. بنەمای دەسەڵاتدارێتی خەڵك‌و مافەکانی مرۆڤ دوو دیمەنی شێوازێکن کە لەسەر بناغەیان دەکرێت ڕەوایەتی یاسای پۆزەتیڤ و نەگۆڕ، وەك هۆکانی زەمانەتکردنی سەربەخۆیی فەردی و مەدەنی ئاراستە بکرێت.

2– بەڵام فەلسەفەی سیاسی نەیتوانیوە هاوسەنگی لەنێوان دوو تیورەی دەسەڵاتدارێتی خەڵك و مافەکانی مرۆڤ یان لەنێوان "ئازادیە کۆنەکان" و "ئازادیە تازەکان"دا دروستبکات. "کۆمارخوازی" کە ڕابردوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ئەرستۆ و هیومانیزمی ڕینسانس، بەردەوام بنەمای سەربەرخۆی مەدەنی هاوڵاتیانی بەسەر ئازادی پێش–سیاسی کەسە تایبەتیەکاندا پێشخستووە. لیبرالیزم کە ڕابردووەکەی بە جۆن لۆك دەگات، بە هێنانە ئارای مەترسی زۆرینەی دیسپۆتیزمانە (لانیکەم لە سەدەی نۆزدەهەمەوە) بنەما گریمانیەکەی خۆی لەسەر پێشخستنی مافەکان مرۆڤ دامەزراندووە. بنەمای کۆماریخوازی ڕەوایەتی مافەکانی مرۆڤی بەستۆتەوە بە لەخۆ تێگەیشتنی ئەخلاقی و خۆ بڕیاردانی کۆمەڵگای سیاسی، (بەڵام) ئایدیای لیبرالیزم مافەکانی مرۆڤ بە دروستکەری ڕەوایەتیەکی خودی (زاتی) و وەك ڕێگرێك لەبەردەم ئیرادەی فەرمانڕەوایی خەڵك لە دەستبەسەراگرتنی بواری ئازادی فەردیدا دادەنێت. دەبێ بگوترێت لە نەیارێتی تاکڕەهەندی ئەم دوو نەریتەدا کە کامڵکەری یەکترن، چەمکی مافەکانی مرۆڤ – ئەو مافە بنەڕەتیانەی کانت لەبارەی ئازادی و یەکسانی فەردیەوە ڕەچاوی کردبوو – نابێت تەنها وەك ڕێگرێکی دەرەکی تەماشاکەین کە بەسەر یاسادانەردا سەپێنراوە. هەروەها نابێت وەك ئامرازێك بۆ پێویستی کارکردن بە ئاراستەی خۆ بڕیاردانی دیموکراتی تەماشای بکەین.

بۆئەوەی ئەم بەڵگاندنە وردتر دەربڕم، بابەتەکە بەهێنانەوەی پرسیارێك فۆرمەلە دەکەم: ئەگەر هاوڵاتیانی ئازاد و یەکسان بەیەك بیانەوێت ژیانی هاوبەشی خۆیان بەپێی یاسای دانراو بەشێوەیەکی ڕەوا ڕێکبخەن، دەبێت کام مافە بنەڕەتیانە بەشێوەیەکی دولایەنە بۆ یەکدی بەفەرمی بناسن. تێگەیشتنێکی وا بۆ کاری یاسادانان، مەسەلەی بەرجەستەبوونی دەسەڵاتدارێتی خەڵکی بە دروستکردنی سیستەمێکی یاساییەوە دەبەستێتەوە. من لێرەدا وەك پێشگریمانەیەك بنەمایەك وەردەگرم کە لێرەدا ناتوانم بەدرێژی باسی بکەم. پێشگریمانەکەی من ئەوەیە: یاسایەك کاتێك دەتوانێت بانگەشەی ڕەوایەتی بکات کە هەموو ئەو کەسانەی یاساکە کاریان تێدەکات، بتوانن بە بەشداریکردن لە وتوێژێکی عەقڵانیدا بە یاساکە ڕازیبوو بن. ئێمە وەك کەسانێك کە لە وتوێژدا بەشداری دەکەین، دەمانەوێت بە قەناعەت پێکردنی یەکدی بە مەسەلەیەکی تایبەت، بە بیروڕایەکی هاوبەش لەڕێگەی وتوێژ و بەڵگاندنەوە بگەین. بەڵام وەك بەشداریکردن لە "چەلەحانێدا" هەوڵی ئێمە ئەوەیە کە بەرژەوەندییە جیاوازەکان لەگەڵ یەکدا هاوسەنگ بکەین. (لەگەڵ ئەوەشدا دەبێ بگوترێت تەنانەت لە چەلەحانێشدا دادپەروەری بوونی ڕێکەوتنەکان، بەستراوە بە ڕەوایەتی شێوازی ڕێکەوتن لە ڕوانگەی هەلومەرجەکانی

گفتوگۆوە). هەنوکە گەر ئەم وتوێژە (و رووداوی چەلەحانێ) لەجێگەیەکدا روبدات کە بڕیارە ئیرادەیەکی سیاسی ماقوڵی لێوە دەرکەوێت، لەم حاڵەتدا کاتێك رەوایەتی دەرئەنجامەکانی ئەم وتوێژە کە بەشێوازێکی دیموکراتیك بەدەست دێت، قابیلی ئاراستەکردنە کە لەسەر بناغەی وتوێژێکی هەڵسەنگێنراو دامەزرابێت: شێوازەکانی پەیوەندی پێویست بۆ دروستکردنی ئیرادەی ماقوڵ لەلایەن یاسادانەرەوە و هەروەها ئەو مەرجانەی زامنی رەوایەتی دەکات، دەبێت بەشێوەیەکی یاسایی بەدەزگایی بکرێت.

پەیوەندی دەرونی خوازراو لەنێوان مافەکانی مرۆڤ و دەسەڵاتی خەڵکیدا بەمشێوەیەیە: مافەکانی مرۆڤ مەرجی پێویستی پەیوەندی و وتوێژ بۆ دروستکردنی ئیرادەیەکی سیاسی ماقوڵ، بەدەزگایی دەکات. مافەکانی تاك جێبەجێکردنی دەسەڵاتداریێتی خەڵکی دەرەخسێنێت، ناکرێت وەك سنورداریێتیەکی دەرەکی تەماشا بکرێت کە بەسەر جێبەجێکردنی دەسەڵاتداریێتی خەڵکیدا سەپێنراوە. دیارە ئەم حوکمە راستەوخۆ تەنها لەبارەی مافە سیاسیەکان، واتە مافی وتوێژ و پەیوەندی و بەشداریکردنەوە رەوایە، بەڵام لەبارەی مافەکانی مرۆڤی کلاسیکەوە کە زامنکەری سەربەخۆی تایبەتی هاوڵاتیانە، بەڵگەنەویست نیە. مافەکانی مرۆڤ بۆ هەرکەسێك پاراستنێکی یاسایی گشتی و بۆ بەدوادا چوونی نەخشەی ژیانی تایبەتی دەرفەتێکی یەکسان دەرەخسێنێت، بێگومان دروستکەری بەهایەکی زاتیە. لێرەوە ناکرێت مافەکانی مرۆڤ بۆ بەها ئامێرییەکەی بە ئاراستەی دروستکردنی ئیرادەی دیموکراتی، کورتبکرێتەوە.

لە هەمانکاتدا نابێت ئەوە فەرامۆش بکەین کە ئەو هۆیانەی هاوڵاتیان لەرێگەیەوە دەست بە کاری سەربەخۆیی سیاسی دەکەن، بابەتێکی هەڕەمەکی نیە. هاوڵاتیان تەنها وەك بکەرێکی یاسایی بەشداری لە کاری یاسادانانادا دەکەن، کەوابوو لەدەستیاندا نیە چ زمانێك بۆ وتوێژ بەکاردێنن. لەبەرئەوە پێش ئەوەی بتوانرێت گریمانەی ئیرادەسازی لەسەر بناغەی وتوێژ وەك مافی مەدەنی بەدەزگایی بکرێت، دەبێت کۆمەڵێك رێسای یاسایی خۆبەخۆ لە پێشەوە لەبەردەستدا بن. بەڵام بۆ جێگیرکردنی ئەم رێسایانە پێویستە هەبیەتی ئەو کەسە یاساییانەی کە وەك هەڵگری مافە فەردیەکانی سەر بە کۆمەڵگایەکی خۆبەخشی هاوڵاتیانن، بخوڵقێنرێت، بۆئەوەی بتوانن لەکاتی پێویستدا مافەکانی خۆیان بەشێوەیەکی کاریگەر داوا بکەن. تاکەکەسە یاساییەکان بێ سەربەخۆی تایبەتی، ناتوانن وەك گشتێکی یاسایی بوونیان هەبێت. لە ئەنجامدا بێ بوونی مافەکانی ئازادی کلاسیك بەتایبەتی ئەو مافە بنەڕەتیانەی پەیوەندیان بە ئازدیەکانی تاکەکەسی یەکسانەوە هەیە، هۆیەك نیە کە بتوانرێت بەهۆیەوە بەشێوەیەکی یاسایی دەست بە دەزگایکردنی هەلومەرجێك بکرێت کە لەناویدا هاوڵاتیان بتوانن لە کاری خۆ بڕیارسازیدا بەشداریبکەن.

ئەمە دەریدەخات چۆن سەربەخۆیی تایبەتی و گشتی بەشێوەیەکی دولایەنە یەکتر دەسەپێنن. پەیوەندی دەرونی لەنێوان دیموکراسی و دەسەڵاتداریێتی یاساییدا بەمشێوەیەیە: لەلایەکەوە هاوڵاتیان کاتێك

دەتوانن سود لە سەربەخۆیی گشتی خۆیان بەشێوەیەکی گونجاو وەربگرن کە لەسەر بناغەی سەربەخۆیی تایبەتی یەکسان، خاوەن سەربەخۆیی پێویست بن. لەلایەکی دیەوە ئەوان کاتێک دەتوانن یەکسانی خۆیان لە بەهرەمەندبوون لە سەربەخۆی تایبەتیان بەدیبهێنن، کە سودی گونجاو لە سەربەخۆی سیاسی خۆیان وەک هاولاتی وەربگرن. لە ئەنجامدا مافی بنەڕەتی لیبرالی و سیاسی لەیەک جیا نابنەوە. خوازەی مێشک و پێست کە گوایە پانتاییەکی مافە بنەڕەتیەکانی هەیە وەک ناوکێکی سەرەکی لەپێش مافەکانی وتوێژ و بەشداریکردنەوەیە- هەڵەیە. بۆ (چەمکی) رەوایەتی لە رەوتی رۆژئاواییدا، مەسەلەی رەسەنایەتی دولایەنەی مافەکانی ئازادی و مافەکانی هاولاتی، مەسەلەیەکی سەرەکیە.

## دووهەم: رەخنە لەخۆگرتنی رۆژئاوا

مافەکانی مرۆڤ سیمایەکی یانوسی هەیە و هاوکات تەماشای ئەخلاق و یاسا دەکات. ناوەرۆکی ئەخلاقی مافەکانی مرۆڤیش شێوازێکی یاسایی وەردەگرێت. مافەکانی مرۆڤ وەک سروشتێکی ئەخلاقی دەگەڕێتەوە بۆ هەر بونەوەرێک "کە خاوەن شکڵی مرۆییە"، بەلام وەک سروشتێکی یاسایی تا ئەو شوێنە پارێزگاری لە تاک تاکی کەسەکان دەکات، کە ئەم کەسانە سەر بە کۆمەڵگایەکی یاسایی تایبەت -بەشێوەیەکی ئاسایی سەر بە دەوڵەت- نەتەوەیەکن. لێرەوە لەنێوان مانای گشتی (گەردونی) مافەکانی مرۆڤ و مەرجە پراکتیکیەکانی بەدیهاتنیان، ناکۆکیەک دروست دەبێت: ئەم مافانە دەبێت خاوەن بایەخێکی بێسنور بن بۆ هەموو ئەو کەسانەی دەیانگرێتەوە - بەلام چۆن دەبێت دەست بەم کارە بکرێت؟ لەلایەکەوە دەکرێت هەلومەرجێک وێنا بکەین کە تیایدا مافەکانی مرۆڤ لە ئاستی جیهاندا پەرەی سەندووە، بەجۆرێک هەموو دەوڵەتە هەبوەکان بوون بە دەوڵەتی دیموکراتی، هەموو کەسێکیش مافی هەیە بەدڵی خۆی ببێتە هاولاتی هەر دەوڵەتێک کە دەیەوێت. وەک ئاشکرایە هێشتا لەم ئامانجەوە یەکجار دورین. لەلایەکی دی ئەوەیە هەر تاکێک وەک هاولاتی جیهان بە شێوەیەکی کاریگەر ببێتە خاوەن مافەکانی مرۆڤ. لەم مانایەدا مادەی 28ی راگەیاندنی مافەکانی مرۆڤی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان ئاماژە بۆ رێکخستنێکی جیهانی دەکات "کە تیایدا هەموو ئەو ماف و ئازادیانەی لەم راگەیاندنەدا هاتوون، بتوانن بەشێوەیەکی کامڵ بێنەدی"، بەلام هەر ئەم ئامانجە واتە سیستەمێکی یاسایی گەردوونی کە لە پراکتیکدا بەدەزگایی بوبێت، سەر بە ئایندەیەکی دورە.

ناکرێ بگوترێت لە گواستنەوە لە سیستەمی دەوڵەت-نەتەوەوە بۆ جیهان - نیشتیمانی، چ شتێک مەترسیەکی گەورەتر دروستدەکات: لەناوچوونی دنیای دەوڵەتەکانی سەر بە مافە نێو نەتەوەییەکان، کە زۆر دەمێکە پاکێتی خۆیان لەدەستداوە یان ئەو دەزگا و کۆنفرانسە بان نەتەوەییانەی کە دەتوانن رەوایەتیەکی نادڵنیا پێشکەش بکەن، ئەو دەزگا و کۆنفرانسە بان نەتەوەییانەی کە وەک هەمیشە بەستراون بە ئیرادەی خێری دەوڵەتەکان و یەکێتیە بەهێزەکان. مافەکانی مرۆڤ لەم هەلومەرجە ناسەقامگیرەدا تەنها بناغەی ناسراوی رەوایەتیە بۆ سیاسەتی کۆمەڵگای

نێونەتەوەیی. بەگشتی هەموو دەوڵەتەکان لایەنیکەم لەسەر کاغەز، راگەیاندنی مافەکانی مرۆڤی رێکخراوی نێونەتەوەییان قبوڵکردووە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بایەخی گشتی مافەکانی مرۆڤ و پلە و پایەی ئەم مافانە، وەك هەمیشە جێگەی ناکۆکیە. لەڕاستیدا گوتاری مافەکانی مرۆڤ کە لە بواری بنەما سروشتیەکاندا باسکراوە، توشی ئەو دودڵیە بووە ئایا شێوەیەکی ئەو رەوایەتیەی لە رۆژئاوادا سەریهەڵداوە، بۆ چوارچێوەی کلتورەکانی دیش دەشێت. رادیکاڵترین رەخنەگران لەم زەمینەیەدا خودی رۆشنبیرانی رۆژئاوان. ئەوان دەڵێن بانگەشەی بایەخی گشتی مافەکانی مرۆڤ تەنها سەرپۆشێکە بۆ بانگەشەی هەڵخەڵەتێنەری دەسەڵات لەلایەن رۆژئاوا.

ئەمە شتێکی رێکەوت نیە. کەمێك دورکەوتنەوە لە نەریتەکانی خود و پەرەپێدانی روانگە داخراوەکان، یەکێکە لە ئیمتیازەکانی عەقڵانیەتی رۆژئاوایی. مێژووی ئەوروپایی تەفسیر و بەدیهاتنی مافەکانی مرۆڤ، مێژووی فراوانکردنی دیدی ئێمە بووە بۆ شتەکان. فراوانکردنی مافە بە زاراوە یەکسانەکان بۆ ستەملێکراوان، پەراوێزنشینەکان، و گروپە دەرکراوەکان، لەسەرخۆ بەرەوپێشچووە. تەنها پاش خەباتی سیاسی جدی بووە کە کرێکاران، ژنان، یەهودیەکان، قەرەجەکان، نەخۆشە جنسیەکان و پەنابەران وەك "مرۆڤ" بە مافی تەواو یەکسانەوە بە فەرمی ناسراوون.

مەسەلەکە هەنوکە ئەوەیە کە لە سەیرکردندا بۆ رابردوو هەر پێشکەوتنێك لە بەدەستهاتنی مافی دەنگداندا، لەهەمانکاتدا ئاشکراکەری دەوری ئایدۆلۆژی مافەکانی مرۆڤ بووە. واتە بانگەشەی یەکسانخوازانە و بایەخی گشتی و گەردونی مافەکانی مرۆڤ، بەردەوام بۆ شاردنەوەی هەڵوێستی نایەکسان لەگەڵ ئەو کەسانەدا بەکارهاتووە کە بە بێدەنگی و بە کردەوە دەرکراوو بوون. ئەم سەرنجانە بۆتە هۆی دروستبوونی ئەو بەدگومانیە کە مافەکانی مرۆڤ دەکرێت بۆ ئەم بەکارهێنانە ئایدۆلۆژیە کورتببێتەوە. ئایا بەردەوام سود لە مافەکانی مرۆڤ بۆ شاردنەوەی گشتگیریەکی درۆزنانەی مرۆڤخوازی وەرنەگیراوە کە بەهۆیەوە





ئیمپریالیزمی رۆژئاوا توانیویێتی ئامانج و بەرژەوەندیەکانی خۆی لەژێریاندا بشارێتەوە؟ رۆشنبیرانی رۆژئاوا بەدوای هایدگەر و کارل شمیسدا ئەم راڤەکردنە بەدگومانەیان بە دوو شێوەی جیاواز وەك رەخنەی عەقڵ و رەخنەی دەسەڵات راڤەکردووە.

بەپێی خوێندنەوەی یەکەم بیرکردنەوەی مافەکانی مرۆڤ جۆرێکی تایبەتی تێڕوانینی رۆژئاواییە بۆ عەقڵ کە سەرچاوەکەی بۆ ئەفلاتۆن دەگەڕێتەوە. ئەم تێڕوانینە بە قامچی "مغالەتەیەکی ئەبستراکت" لە یەکەم زەمینی دەرکەوتنی خۆیەوە دەبزوێت و لە بایەخێکی

ناوچەییەوە بەرەو دنیای خەیاڵی گەردونی بوون هەنگاو دەنێت. روداوی رەخنەکردنی عەقڵ بڕوای وایە هەر نەریت، جیهانبینی یان کلتورێك پێوەرگەلێکی تایبەتی خۆی بۆ راستو هەڵە هەیە. بەلاّم ئەم رەخنەیە خەسڵەتی خود -مەرجەعی مۆدێرنە فەراموٚشدەکات. گوتاری مافەکانی مرۆڤ بۆئەوە هاتووە کە هەمووان بتوانن دەنگی خۆیان بگەیەنن. کەوابوو خودی ئەم گوتارە ئەوە دیاری دەکات بەچ شێوەیەك دەکرێت پێشێلکردنی شاراوەی خواستەکانیان ئاشکراو چاکبکەن. لۆنز ڤینگرت ئاماژەی بۆ ئەم رەهەندە "ئاشکراکەرەی" مافەکانی مرۆڤ کردووە: مافەکانی مرۆڤ کە خوازیاری ئەوەیە هەموان بگرێتەوە، لەهەمانکاتدا لەبارەی ئەو کارە خراپانەی کە بەناویەوە ئەنجامدەدرێت، وەك جیاکەرەوەیەك کاردەکات.

بەلاّم نەریتی دوهەم واتە نەریتی رەخنەگرتنی دەسەلاّت کەمێك ناشیانەترە. ئەوانیش بە قبوڵکردنی لەپێشبوونی تایبەتمەندی سەرکوتکراو، نکوڵی لە بایەخی گشتیبوونی بایەخی مافەکانی مرۆڤ دەکەن. بەلاّم لێرەدا فێڵێکی کورتکەرەوە بۆ ئەمکارە بەسە. بەپێی ئەم رەخنەیە زمانی شێوازی یاسا ناتوانێت رەنگدانەوەی شتێکی دی بێت جگە لە خواستی دەسەلاّتی سیاسی لە پراکتیکدا. لە ئەنجامدا بەپێی ئەم دیدگایە بانگەشەی گشتیبوونی مافەکان، بەردەوام بەمانای شاردنەوەی ئیرادەی تایبەتی گروپێکی دیاریکراوە بۆ دۆزینەوەی رێگەی تایبەتی خۆیان. بەلاّم ئەم رەخنەگرانەی دەسەلاّت لەبیریان دەچێت کە چۆن لەسەدەی هەژدەدا ئەو نەتەوانەی کە بەختێکی باشتریان هەبوو فێربوون چۆن دەسەلاّتی رەها بە یاسای رەوا دەستەمۆ بکەن. "ئەو کەسەی دەڵێت "مرۆڤایەتی" درۆیە " -ئەم پەرەگرافە ئاشنایەی ئایدۆلۆژیای ئەڵمانی- تەنها بۆ ئەزمونی مێژوویی خۆی ئاشکرا دەکات.

رۆشنبیرانی رۆژئاوا نابێت گوتاری خۆیان لەبارەی لایەنگریەکانی سەنتەریزمی ئەوروپییەوە، لەگەڵ ئەو وتوێژانەدا تێکەڵبکەن کە ئەندامانی کلتورەکانی دی پاڵی پێوە دەنێن. راستە ئێمە لە وتوێژی نێوان کلتورەکاندا روبەروی بەڵگاندنێك دەبینەوە کە ئەندامانی کلتورەکانی دی لە رۆژئاواوە وەریانگرتووە، بۆئەوەی بەسودوەرگرتن لێیان پیشانیبدەن بایەخی مافەکانی مرۆڤ سەرەڕای هەموو شتێك زیندانی زەمینەیەکە کە لە ناوەرۆکدا ئەوروپاییە. بەلاّم بێگومان ئەو رەخنەگرە نارۆژئاواییانە کە هوشیاریان لە نەریتەکانی خۆیانەوە دروستبووە، نکوڵی لە گرنگی مافەکانی مرۆڤ ناکەن. بەڵگەش بۆ ئەمە ئەوەیە دین و کلتورەکانی دیش هەنوکە، روبەرووی پرسەکانی تازەگەری بونەتەوە، رێك وەك کاتێك ئەوروپا لە سەردەمی خۆیدا مافەکانی مرۆڤ و دیموکراسی "دۆزیەوە" و داهێنا".

لێرە بەدواوە من لە وتوێژی نێوان کلتورەکاندا لەبارەی مافەکانی مرۆڤەوە، دەوری بەرگریکاری بەشدارێکی رۆژئاوایی لەئەستۆ دەگرم. گریمانە رێپیشاندەرەکەی من ئەوەیە پێوەرەکانی مافەکانی مرۆڤ بەر لەوەی لەناو کلتوری تایبەتی رۆژئاواوە لەدایك بوبێت، لە هەوڵی وەلاّمدانەوەی پرسگەلێکی دیاریکراوەوە سەرچاوە دەگرن کە دەرەئەنجامی تازەگەری کۆمەلاّیەتیە کە هاوکات جیهانی گرتۆتەوە. هەرچۆنێك خاڵی دەرچوونی مۆدێرنە

هەڵسەنگێنین، ئەوا دەربازبوون لە روبەروبونەوەی فاكتی مافەكانی مرۆڤ نیە و لێرەوە پێویست بە روكردنە ئاراستەكردنێك ناكات كە رووی لە رابردووبێت، بەمشێوەیەش قابیلی ئاراستەكردن نیە. ململانێ لەسەر تەفسیری گونجاو بۆ مافەكانی مرۆڤ، رووی لە خوازیاری (هەلومەرجی مۆدێرن) نیە، بەڵكو زۆرتر رووی لە تەفسیرێكی مافەكانی مرۆڤە كە رێك وەك دیدی ئێمە بۆ دیدی كلتورەكانی دیشەوە، مافەكانی دنیا مۆدێرن پێشكەش دەكات. وتوێژەكە زۆرتر رووی لە خەسڵەتی تاكگەریانە و عەلمانیەتی مافەكانی مرۆڤە كە لەسەر چەمكی سەربەخۆیی چڕبۆتەوە.

من بۆ دەربڕینێكی وردتر ئاماژە بان رەخنەییەكانی خۆم لەسەر بناغەی رونكردنەوەی پێوەری رۆژئاوایی رەوایەتی دادەمەزرێنم. دروستكردنەوەی پەیوەندی نێوان مافەكانی ئازادی و مافی هاوڵاتیان بەو شێوەیەی لەسەرەوە باسكرا، لەو پێشگریمانەیەوە دەستپێدەكات كە هاوڵاتیانی ئازاد و یەكسان بەیەك دەچنە ناو راگۆڕینەوە، بۆئەوەی ژیانی هاوبەشی خۆیان هەم بەهۆی یاسا دانراوەكانەوە و هەم بە شێوەیەكی رەوا رێكبخەن. من سەرەتا مانای سێ لایەنی ئەم گریمانەیە كە پەیوەندی بە درێژەی باسەكەمەوە هەیە، دەهێنمەوە.

أ)نمونەی جێی باس لە پەیوەندی ئاسۆیی هاوڵاتیانەوە دەست پێدەكات. تەنها لە هەنگاوی دوهەمدا واتە لەسەر بناغەی مافە جێگیرانەیە كە ئەم نمونەیە پەیوەندی بەكارهێنان لەنێوان هاوڵاتیان و دەزگای دەوڵەتدا پێشكەشدەكات. ئەم مەسەلەیە ئەو توانایەمان پێدەبەخشێت، بۆئەوەی لە پەرستنی لیبرالیەكان بۆ مەسەلەی چۆنێتی پاوانكردنی توندوتیژی لەرێگەی دەوڵەتەوە تێپەڕین. ئەگەرچی ئەم گرنگی پێدانە لیبراڵیە لە دیمەنی ئەورپاوە قابیلی تێگەیشتنە، بەڵام ئەم گرنگی پێدانە دەبێتە هۆی ئەوەی مەسەلەی لۆژیكی یەكێتی بەخشی كۆمەڵگای سیاسی كە مەسەلەیەكی بێ ئازارترە، بڕواتە دواوە.

ب)لە نمونەی پێشنیاركراوی مندا پرسیاری سەرەتایی لەو گریمانەیەوە دەست پێدەكات كە ئێمە دەتوانین كەم تازۆر یاسای پۆزەتیڤ و ناچاركەرانە بەهەمان مانا روكەشیەكانی خۆی كە كارایی هەیە و پێویستی بە ئاراستەكردن نیە، قبولبكەین. نمونەی پێشنیارەكەی من، بەپێچەوانەی تیۆرەی كلاسیكی پەیمانی (كۆمەڵایەیەتیەوە) دروستبونی كۆمەڵگایەكی پێكهاتوو لە كەسایەتی یاسایی (كە وەك هەڵگرانی مافە تاكەكەسیەكان دەناسرێن) بە بڕیارێك دانانێت كە پێویستی بە بەهانەی میتۆدی هەیە. بۆ ئەم بڕیارە بەهانەی كاركردن (وەزیفی) بەسە، چونكە كۆمەڵگا ئاڵۆزەكان چ ئاسیایی یان ئەورووپی بۆ ئاوێزانكردن هاوتایەكی تری جیاواز لە یاسایان نیە. سروشتی یاسا كە بەشێوەیەكی دروستكراو دانراوە، هاوكات هەم ناچاركەرانەیە و هەم ئازادی خولقێنەرە. لەو روەشەوە دروستكەری بەهایە كە شێوەیەكی ئەبستراكت لە یەكێتی مەدەنی دروستدەكات كە تەنانەت ئەو بێگانانەش كە دەیانەوێت بە بێگانەیی بمێننەوە، لەم یەكێتیەدا بەشدارن.

ح)دواجار نمونەی دامەزراو لەسەر یاسازی بەو شێوەیە دەردەكەوێت كە مافەكانی مرۆڤ هەقیقەتێكی ئەخلاقی نیە كە لە پێشەوە بوونی هەیە و دەبێت بدۆزرێتەوە، بەڵكو دیاردەیەكی

دروستکراوە. مافە یاساییەکان بە پێچەوانەی مافە ئەخلاقیەکانەوە نابێت لەرووی سیاسیەوە ناچارکەرانە نەبێت. مافەکانی مرۆڤ وەك مافی تاکەکەسی یان مافی زیهنی خۆبەخۆ ماهیەتێکی دادگایی هەیە و بەمانای ئەوەیە لەکاتی یاسادانانیدا لەبەرچاوی یاسادانەراندا بێت.

دیارە ئەم سەرنجانە شتێکی ئەوتۆ لەبارەی شێوازی فەردی و بنەما نادینیەکانی ئەو سیستەمە یاساییە ناگۆڕێت کە لەسەر بناغەی مافی مرۆڤ دامەزراوە، لەراستیدا جەختکردنی مافەکانی مرۆڤ لەسەر مەرکەزیەتی گونجاو لەگەڵ سەربەخۆیدایە. بەڵام لەهەمانکاتدا مافەکانی مرۆڤ تیشکێکی تازە دەخاتە سەر ئەو رەخنانەی کە لە وتوێژی نێوان کلتورەکاندا بەر گوێ دەکەوێت و هێرش دەکاتە سەر هەردوو شێوەی سیستەمی یاسایی رۆژئاوا.

### سێهەم:
### وتوێژ لە نێوان رۆژئاواو کلتورەکانی دیدا "بەها ئاسیایەکان"

وەك لە کۆنفرانسی ڤێنادا سەبارەت بە مافەکانی مرۆڤ دیاریکرا، لە سەردەمی راپۆرتی حکومەتی سەنگاپورەوە لەبارەی "بەها هاوبەشەکانەوە" لەساڵی 1991 و راگەیاندنی بانکۆك بە ئیمزای وڵاتانی وەك سەنگاپور، مالیزیا، تایوان و چین لە ساڵی 1992دا، وتوێژێك لەبارەی مافەکانی مرۆڤەوە رویداوە. لەم وتوێژانەدا لێدوانگەلێك لەلایەن نوێنەرانی حکومەتەکانەوە پێشکەشکراوە کە لەهەندێك روەوە لەگەڵ تێڕوانینی نەیارانەی رۆشنبیرانی سەربەخۆدایە و لەهەندێك رووی دیشەوە جیاوازە لێیان. رەخنەگران بە پشتبەستن بە "بەها"خۆییەکانی کلتورەکانی خۆرهەڵاتی دوور کە لە مەزهەبی کۆنفۆشیۆسەوە سەرچاوەیان گرتووە، بە سێ شێوە مەسەلەکە پێشکەشکەش دەکەن: (1) رەخنە لە بنەمای لەپێشبوونی مافەکان بەسەر ئەرکەکاندا دەکەن. (2)پشت بە "زنجیرە پلەیەکەی" سۆسیۆلۆجیانەی مافەکانی مرۆڤ دەبەستن. (3) باسی دەورە نێگەتیڤەکانی سیستەمێکی یاسایی تاکگەری لەسەر پەکپارچەیی کۆمەڵایەتی دەکەن.

(1)ناوەڕۆکی وتوێژەکە لەسەر ئەو تێزە دامەزراوە کە کلتورە کۆنەکانی ئاسیا (هەروەها کلتورە خێڵەکیەکانی ئەفەریقا) کۆمەڵگا لەپێش تاکەوە دادەنێن و جیاوازی توندی نێوان یاسا و ئەخلاق بە فەرمی ناناسن. ئەوان دەڵێن کۆمەڵگای سیاسی بەشێوەیەکی نەریتی لەرێگەی ئەرکی زیاترەوە هاوئاهەنگی پەیدا دەکات تا لەرێگەی مافەکانەوە. ئەخلاقی سیاسی مافە خودیەکانی تاك بە فەرمی ناناسێت، بەڵکو تەنها ئەو مافانە بە فەرمی دەناسێت کە بە تاك بەخشراوە. هەر لەبەرئەوە دەرککردنی مافە تاکگەریەکانی رۆژئاوا لەگەڵ خەسڵەت و خوەکانی کۆمەڵگایەك کە بەقوڵی بەستراوە بە نەریتە تایبەتیەکانی خۆیەوە و پێویستی بە پەیڕەوی و ملکەچی تاکەکەسە، ناگۆنجێت.

بەبڕوای من گێرانەوەی ئەم وتوێژە بۆ جیاوازیە کلتوریەکان، باسەکە بەرێگەیەکی نادروستدا دەبات. لەراستیدا دەکرێت کارکردنی مافە مۆدێرنەکان لە شکڵەکەیەوە بەربهێنین(ئیستنتاج). مافەکانی تاك جۆرێك کەمەربەندی پارێزگار بۆ بەڕێوەبردنی تایبەتی

ژیان بە دوو شێوەی جیاواز دەستەبەر دەکەن. مافەکان هەم گەڕانی هوشیارانە بۆ یەك بەرنامەی ژیانی ئەخلاقی دەپارێزێت و هەم دور وەسوەسە ئەخلاقیەکان، زەمانەتی باوەڕهێنان بە هەڵبژاردنە شەخسەیەکان دەکات. ئەم شێوە یاساییانەی لەگەڵ پێداویستیە کارکردنەکانی(وەزیفیەکانی) کۆمەڵگا ئابوریەکانی مۆدێرندا کە پشتی بە بڕیاری سەربەخۆیانەی گەمەکەرە سەربەخۆ بێشومارەکان بەستووە، داڕێژراوە.. بەهەرحاڵ کۆمەڵگا ئاسیایەکانیش سود لەم یاسا دانراوە، وەك ئامێرێك بۆ ڕێنمایی کۆمەڵگا لەچوارچێوەی سیستەمی بازاڕی جیهانیدا وەردەگرن. ئەوان ئەم کارە بە سەرنجدان لەهەمان ئەو پێداویستیانە ئەنجامدەدەن کە سەردەمێك لە ئەوروپادا بووە هۆی بالادەستی ئەمجۆرە یاسایانە بەسەر یەکپارچەیی کۆمەڵایەتیدا کە پشتی بە یاسا صنفیەکان بەستووە. بۆ نمونە یەکێك لە پێداویستیەکانی بازرگانی، دڵنیایی یاساییە کە پشتی بە پێشبینیکردن، قوڵکردنی بەرپرسیاری و پاراستنی متمانە بەستووە. کەوابوو هۆکارە دیاریکەرەکان سەر بە ئاستی ئابوری – کۆمەڵایەتین، نەك ئاستە کلتوریەکان. کۆمەڵگاکانی ئاسیا ناتوانن لە نوێگەری سەرمایەدارانەدا بەشداری بکەن، ئەگەر نەچنە ژێرباری دەستکەوتەکانی بونیادی یاسایی تاکگەریانە. ناکرێ یەکێکیانت بوێت و ئەوی دیانت نەوێت. لە دیمەنی ولاتە ئاسیایەکانەوە مەسەلەکە ئەوە نیە ئایا مافەکانی مرۆڤ وەك بەشێك لە سیستەمی یاسایی تاکگەریانە، لەگەڵ گۆڕانە کلتوریەکاندا دەگونجێت یان نا، بەڵکو ئەوەیە ئایا دەکرێت شێوازە دێرینەکانی ئاوێزانبونی سیاسی یان نەتەوەیی لە دژایەتی خواستەکانی نوێگەری ئابوریدا کە بە گشتی لەلایەن هەموانەوە قبوڵکراوە، هەروا بپارێزرێت یان دەبێت لەگەڵ خواستەکاندا بگونجێنرێت.

(2)زۆرجار ئاشکراکردنی دودڵی سەبارەت بە مەسەلەی تاکگەری ئەوروپی، هۆکاری بزوێنەرانەی هەیە نەك هۆکاری میتۆدی. ئەمجۆرە مەبەستە بزوێنەرانە لەو شوێنانەدا کە وتوێژە ناوبراوەکان بەهانەیەکی سیاسی بۆ جۆرێك دەسەلاتخوازی "نەرم" دەهێننەوە کە لە خەسڵەتەکانی دیسپۆتیزمی ولاتە تازە



پەرەسەندوەکانە، بە روونی قابیلی دیاریکردنە. لەو شوێنانەدا کە باسەکان پەیوەندیان بە پلەی مافەکانی مرۆڤ لەزنجیرە پلەی مافەکاندا هەیە، ئەم حوکمە بەشێوەیەکی تایبەت راستە. حکومەتەکانی سەنگاپور و مالیزیا و تایوان و چین لایەنگری لەپێشبوونی مافە بنەڕەتیە کلتوری و کۆمەلایەتیەکان دەکەن، بۆئەوەی پێشێلکردنی مافە یاسایی و سیاسیەکان کە رۆژئاوا ئەم ولاتانەی پێ تاوانبار دەکات، ئاراستە بکەن. ئەم حکومەتە دیکتاتۆریانە بە پشتبەستن بە"مافی پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی"

-کـە پێدەچـێت وەك مـافێکی دەسـتەجەمعی بناسرێت- خۆیان بەرێگەپێدراو دەزانن هەنگاو بـۆ دواخـستنی بـەدیهاتنی مافـە لیبرالیـەکان و مـافی بەشـداریکردنی سیاسـی بنـێن، بـەو بەهانەیە کە گوایا دەبێت وڵاتەکانیان بەئاستێك لـە پەرەسـەندنی سیاسـی بگـات بۆئـەوەی دابینکردنی پێداویستیە مادیەکان بەشێوەیەکی یەکـسان بێتـە دی. ئـەوان ئـەو بانگەشـەیە دەهێننـە پێـشێ کـە بـۆ جـەماوەرێکی فـەقیر، یەکسانی مـاف و ئـازادی بـیروڕا بـە ئەنـدازەی روانگەی ژیانێکی باشتر گرنگ نیە.

لەمـە باشـتر ناکرێـت باسـە میتۆدیـەکان بـۆ باسـە بەکارهێنانـەکان(وەزیفیـەکان) لابـدرێت. راسـتە لـە درێژخایەنـدا هەنـدێك هەلومـەرج هاوکـاری زیـاتر بـۆ جێبـەجێکردنی مافـەکانی مرۆڤ دەکات، بەڵام ئەم خاڵە ناتوانێت بەهانە بۆ نمونـــەی دەســـەڵاتخوازانەی پەرەســـەندن بهێنێتـەوە کـە بـەپێی ئـەو نمونەیـە و بـە تێگەیـشتنێکی باوکسالارانە، ئـازادی تـاك بـە ملکەچـی "خێـری گـشتی" بزانرێـت. لەراسـتیدا ئەم حکومەتانـە هـیچ هـەقیان بەسـەر بـەرگری لـە مافەکانی تاکەوە نیە، بەڵکو لە بنەڕەتدا بەرگری لە نیگەرانیەکی باوکسالارانە دەکەن کە روی لە سـنوردارکردنی مافگەلێکـە کـە لـە رۆژئـاوادا بـە بنـەڕەتیترین مافـەکان ژمێـرراوە: مـافی ژیـان و ....، مـافی پاراسـتنی سـەرتاپای دادگـایی و هەڵوێستی یەکسان، ئازادی مەزهـەبی، ئـازادی ئەنجومـەن، ئـازادی دەربـڕین و ئـەم شـتانە. رازیبـوون بـە "لەپێـشبوونی" مافـە بنەڕەتیـە کۆمەڵایـەتی و کلتوریـەکان لە دیـدی میتۆدیـەوە بێ مانایە، لەبەر ئەو هۆ سادەیە کە ئەم مافانـە تـــەنها هاوکـــاری دابینکردنـــی "بـــەهای دادپەروەرانە"ی(راولز) مافە بنەڕەتیە لیبڕاڵـی و سیاسـیەکان، واتـە بـونی هـەلی یەکـسان بـۆ بەدەستهێنانی مافی فەردی، دەکات.

(3)زوربـەی جـار دو بەڵگاندنەکـەی سـەرەوە هاوکاتـە لەگـەڵ رەخنەیەکـدا کـە ئاراسـتەی دەرئەنجامـە گومانـاویـەکانی سیـستەمێکی یاسایی تاکگەریانە دەکرێت کە پێدەچێت زیان بە کۆی سیستەمە سروشتیەکانی ژیان، خێزان، هاوسـێیەتی و سیاسـەت بگەیـەنێت. لـەمجۆرە رەخنانـەدا دەگوترێـت ئـەو جـۆرە سیـستەمە یاسـاییانەی مافـەکانی تـاك بـۆ کەسـەکان دەستەبەر دەکات، رووی لە ناکۆکیەکانەو لەگەڵ ئـارەزووی کلتـوری خـۆیی بـۆ کـۆدەنگی و گونجاندن ناگونجێت. خراپ نیە لـەم رەخنەیـەدا رەهەنـدە بنەماییـەکان لـە رەهەنـدە سیاسـیەکان جیابکەینەوە.

لە رەهەندە بنەماییەکاندا ئەو چەندوچونەی لەبارەی شێوازی تاکخوازانەی مافەکانی مرۆڤـی ئەوروپیـەوە هەیـە، سـود لـە پـشتیوانەی رەخنەیـەکی ئاراسـتەکراو لـەبارەی نـەریتی لۆکـەوە وەردەگرێـت، نـەریتێك کـە ئەمڕۆژانـە بەهۆی نیولیبرالیزمەوە زیندوو کراوەتەوە.

تاکباوەڕیی نەریتی لۆك لە دیاریکردنی ئەو خاڵـە کـورت دەهێنـێ کـە مافـەکانی تاکەکەسـی پـارێزراو لـەرووی دادگـاوە، تـەنها دەتوانێـت لـە شـــێوازە بەفـــەرمی ناســـراوەکانی نێـــوان زیهنیـــەکانی کۆمەڵگایـــەکی یاســـاییەوە وەربگیرێـت. راسـتە مافـە فەردیـەکان بەشـێك لـە پێداویـستیەکانی کەسـانی یاسـاییە، بـەڵام هەلومـەرجی کەسـانی یاسـایی وەك هـەڵگری مافـەکان، تـەنها لـە چوارچـێوەی کۆمەڵگایـەکی یاسـاییدا فـراوان دەبێـت کـە پێـشگریمانەکەی کۆکردنـەوەی ئازادانـەی تاکەکانـە بەشـێوەیەکی دولایەنە یەکتریان بەفەرمی ناسیوە. لە ئەنجامدا

چەمکەکانی مافەکانی مرۆڤ دەبێ ئەو گریمانەیە میتافیزیکیە بخاتەلاوە کە تاك لەپێش هەموو جۆرە شکڵێکی بەکۆمەڵایەتیبونەوە هەیە و بە مافە فتریەکانەوە پێ دەنێتەوە ناودنیاوە. لەبەرئەوە وەلاوەنانی ئەم تێزە رۆژئاواییە و ئەنتی تێزە رۆژهەڵاتیەکەی- دامەزراو لەسەر لەپێشبوونی کۆمەڵگا بەسەر تاکی یاساییدا- نەفیدەکات. کاتێك لە دیدی یەکێتی دیالەکتیکی تاکایەتی و کۆمەڵگایەتیەوە تەماشای چەمکە بنەڕەتیەکانی مافەکان بکەین، ئەو کاتە ئەو بابەتە نامێنێت کە لەنێوان ئاراستەی تاکگەری و ئاراستەی کۆمەڵگەریدا یەکێکیان هەڵبژێرین. هۆی ئەمەش ئەوەیە کە کەسە یاساییەکان تەنها لە رەوتی کۆمەڵایەتیدا دەبنە تاك و دەکرێت هەموو تاکەکان تەنها لە رێگەی دەستگەیشتنی ئازادیان بەو پەیوەندیەیان لەگەڵ کەسانی دیدا و نەریتەکانی دیدا کە بەهۆیەوە شوناسی خۆیان بەدەستهێناوە، پارێزگاریان لێبکرێت. بێ ئەمجۆرە "رەسەنایەتی کۆمەڵگا" تێگەیشتنی ئێمە بۆ "رەسانەیەتی تاك" کەموکوڕ دەبێت.

ئەو رەخنانەی لە ئەنجامی کەرتکردنەکانی یاسای مۆدێرنەوە، ئاراستەی مافەکانی مرۆڤی ئەوروپایی دەکرێت، بە بەراورد بەو رەخنەیەی لەرووی بنەماییەوە لە مافەکانی مرۆڤ دەگیرا، زۆر لاوازترە. پرۆسەکانی مۆدێرنەکردنی ئابوری و کۆمەڵایەتی کە لە وڵاتە تازە گەشەکردوەکاندا هەم خێرا و هەم توندە، هاوشانی دابەشبوونی کۆمەڵایەتی و سودوەرگرتن و خراپ بەکارهێنانی دەسەڵاتە کە هەندێکجار لەگەڵ شێوە یاساییەکانی کۆمەڵگادا تێکەڵی دەکەن. تەنها رێگەیەك بۆ روبەڕوبونەوەی ئەو ستەمەی لە کرداردا بەهۆی دیکتاتۆرەکانی وڵاتە تازە پێگەیشتوەکانەوە ئەنجامدەدرێت، رێکخستنی سیاسەتێکە لەسەر بنەمای مافەکان. ئەو پرسانەی پەیوەندیان بە ئاوێزانبونەوە هەیە کە هەر کۆمەڵگایەکی ئاڵۆز دەست بە چارەسەریان دەکات، تەنها بەهۆی یاسای مۆدێرنەوە قابیلی چارەسەرکردنە. دیارە بەو مەرجەی بە پشتبەستن بە رەوایەتی یاسایی، بە دروستکردنی ئەو شێوە ئەبستراکتەی یەکێتی کۆمەڵایەتی بگەین کە بەرز و نزمیەکانی بە پێوەرەکانی بەدیهاتنی مافە بنەڕەتیەکان دەپێورێت.

### چوارهەم: کێشەی فەندەمێنتالیزم

یەکێك لەو خاڵانەی لە هێرشکردندا بۆ سەر تاکگەری مافەکانی مرۆڤ، زۆرتر رەخنەی ئاراستەدەکرێت چەمکی سەربەخۆییە، واتە ئەو ئازادیانەی کە بۆ تاك لە بەرامبەر دەوڵەت و لایەنەکانی سێهەمدا زامنکراوە. بەڵام وەك گوتمان هاوڵاتیان لە بواری سیاسیدا تەنها کاتێك سەربەخۆ دەبن کە دەست بە دارشتنی یاسا بۆ خۆیان بکەن. نمونەی ئەنجومەنی دامەزرێنەران ئاماژە بۆ دروستکراوی مافە بنەڕەتیەکان دەکات. کانت سەربەخۆیی وەك توانای کونترۆڵکردنی ئیرادە، بە دیدی شێوازی بەرهەمهێنەری سودوەرگرتن لە عەقڵ لەبواری گشتیدا دەزانێت. ئەم بیرکردنەوە خود- یاسادانەرە، هەروەها ئیلهامبەخشی شێوەی ئیرادەسازی دیموکراتیە کە بەپێی ئەم شێوەیە دەسەڵاتی سیاسی شانی داداوەتە سەر جۆرێك لە رەوایەتی کە سەبارەت بە جیهانبینی بێلایەنە. لێرەوە ئاراستەکردنی مافەکانی مرۆڤ

بــەهۆی دیــن یــان میتافیزیکـــەوە کـــارێکی دروســتکراوە. لــەم روانگەیــەوە عــەلمانیکردنی سیاسەت رەهەندێکی تری سەربەخۆیی سیاسی هاوڵاتیانە.

چەمکی ئەوروپایی مافەکانی مرۆڤ تەنها لەو رووەوە رەخنەی لەلایەن قسەکەرانی کلتورەکـانی دیــەوە لێناگیرێــت کــە چــەمکی ســەربەخۆی خەســڵەتێکی تاکگەریانــە بــە مافــەکانی مــرۆڤ دەدات، بـەڵکو هـەروەها لـەو رووەشـەوە جێگـەی رەخنەیە کە دەسەڵاتی سیاسی عەلمانی هەقی بەسەر جیهانبینی دینی یان جیهانناسیەوە نیە. لـــە دیـــدی فەنـــدەمێنتالیزمانی ئیـــسلامی، مەسیحی و یەهودیدا جیهانبینیەکانیان رەهایە، بــەو مانایـــەی کــە شایــستەی پیادەکردنــە و تەنانـەت گـەر لەرێگـەی دەسـەڵاتی سیاسیشەوە بێت. ئەمشێوە تێڕوانیە دەرئەنجامگەلێك بەسەر خەســڵەتی دەرکـــەری کۆمـــەڵگای سیاســـیدا باردەکـات، ئـەو رەوایەتیانـەی لەسـەر ئـەمجۆرە دین یـان جیهانبینیـە دامـەزراون، هێنـدە لەگـەڵ بڕواداران بە مەزهەبی تردا ناگونجێن.

بــەڵام رەوایـــەتی نادینباوەڕیانــە لەرێگـــەی مافـەکانی مرۆڤـەوە پرسـگەلێکی ناڕەحەتکـەر، دیـــارە هـــەر بـــۆ فەندەمینتالیزمـــەکان نـــا، ئامادەدەکـات. تەنانـەت رۆشـنبیرانی هندی وەك "ئاشیزناندی" بەیاننامەی "دژی عەلمانیەتیان" نوسـیوە. پێـشبینی ئـەوان وایــە لێکبـوردن و دەوڵەمەنـــدکردنی بەرامبـــەری کلتـــوری دینـــی ئیـــسلامی و هنـــدی، بەرلـــەوەی دەرئـــەنجامی پەرەسەندنی بێلایەنی دەوڵەت بێت سەبارەت بە جیهانبینیـــەکان، لـــە کـــارتێکردن و کاریگـــەری شـێوە دینیـەکانی دوو کلتورەکـەوە سەرچـاوە دەگرێــت. ئــەوان ســەبارەت بــە سیاســـەتێکی بێلایەنـــەی فـــەرمی کـــە تـــەنها دەبێتـــە هـــۆی بێلایـەنکردنی دیـن لـەبواری گـشتیدا، بـەدبینن. بـەڵام ئـەم سـەرنجانە دەبێتـە هـۆی تێکـەڵکردنی سەرنجە میتۆدیەکان- واتە چۆنێتی دۆزینەوەی بنەمایـــەکی هاوبـــەش بـــۆ ژیـــانی سیاســـی هاوبـــەش-لەگـــەڵ مەســـەلە ئەزمونگەرەکانـــدا. لەراستیدا دەشێت جیابونەوەی بوارێکی دینی جیا لە دەوڵـەت، ببێتە هـۆی لاوازبوونی نفوزی "خـوا و شـەیتانە" تایبەتیـەکان. بـەڵام بنـەمای لێکبـوردن خۆبـەخۆ دژی رەسـەنایەتی و راسـتی بانگەشـــەکانی بیروبـــاوەڕە دینیـــەکان نیـــە، مەبەسـت لـە لێکبـوردن ئەوەیـە پێکـەوە ژیـانی یەکـــسانیان لـــەناو دەرونـــی کۆمەڵگایـــەکی سیاسیدا دەستەبەر بکات.

بابـەتی سـەرەکی وتوێـژی نـاوبراو ململانـێ نیە لەسەر پەیوەندی و گرنگیەك کە هەریەك لـەم کلتورانـە بـۆ دینـی دادەنـێن. چـەمکی مافـەکانی مـــرۆڤ وەلامدانـــەوەی مەســـەلەیەك بـــوو کـــە سەردەمێك لەپێش دەمی هەموو ئەوروپیەکاندا بــوو -کاتێــك دەبــوو بەســەر ئــەو دەرئەنجامــە سیاســـیانەدا ســـەرکەون کـــە دەرئـــەنجامی کەرتبوونی مەزهەبیە- و هەنوکە هەمان مەسەلە لەبـــەردەم کلتورەکـــانی دیدایـــە. بەهـــەرحاڵ ململانێـی کلتورەکـانی ئـەمڕۆ لـە چوارچـێوەی کۆمەڵگایـەکی جیهانیـدا روودەدات کـە تیایـدا گەمەکـەرە گـشتیەکان (دەوڵـەتـەکان)، بـەدەر لـە نـەریتی کلتـورە جۆراجۆرەکـان، بەشـێوەیەکی باشـتر یـان خـراپتر، دەبێـت بەسـەر سروشـتی پێکـەوەژیان لەگـەڵ یەکدیـدا بـە رێکـەوتن بگـەن. چـیدی لـە دنیـای ئـەمڕۆدا گوشـەگیری و گـەڕان بـەدوای خۆداخرانـدا ناتوانێـت هەڵبـژاردنێك بێت. بەهەرحاڵ تەنانـەت لـەو کۆمەڵگایانـەدا کە خـاوەن نـەریتی بـەهێزن، فرەیـی جیهانبینیـەکان بەخێرایی رووی لە پەرەسەندنە.

تەنانــەت لــەو کۆمەڵگایانــەدا کــە لــەرووی کلتورییەوە کەمتازۆر هاوئاهەنگن، هەنگاونان بۆ فۆرمەلەکردنــەوەی ســەرلەنوێ و پیاچــونەوەی نەریتــە دۆگماییــەکان، رۆژ بــە رۆژ زیــاتر دەبێتــە شــتێکی ناچــاری. ئــەم هوشــیاریە بــەر لەهــەر شــتێك رۆژ بــە رۆژ لــەناو رۆشــنبیراندا زیــاتر پەرەدەســتێنێت کــە دەبێــت راســتیەکانی دینــی خودی لەگەڵ زانستی نادینیدا کە بە فراوانی قبــوڵکراوە، بگونجێنرێــت و دەبێــت لەبــەردەم بانگەشــەی راســتیەکانی دینــەکانی تــردا، لــە چوارچێوەی یــەك گوتــاردا بــەرگریان لێبکرێــت. لێــرەوە جیهانبینیــە دێرینــەکان رێــك وەك مەســیحیەت لەســەردەمی ریفــۆرمی دینیــەوە، لەژێر فشاری نەرمی ژیانی مۆدێرندا، گۆڕان بۆ "تێــزە گــشتگیر و ماقوڵــەکان". لێرەوەیــە راولــز باســی یــەك جیهــانبینی و خــو- تیگەیــشتنی ئــەخلاقی نــەرم و بەخۆداچــوەوە دەکــات کــە دەکرێ بگوترێت بەئاراستەی نەیارێتی ماقوڵ لەگــەڵ سیــستەمەکانی تــری بیرکردنــەوەدا (هاوکات لەگەڵ لێکتێگەیشتن لەسەر رێساکانی پێکــەوە ژیــانی یەکــسان)، خــاوەن خەســڵەتی کرانەوە یان دوبارە ئامادە بۆ کرانەوەیە.

تێڕوانینــە بەرگریکارانەکــەی مــن نمونــەی رەوایــەتی رۆژئــاوا وەك وەڵامێــك بــۆ پرســگەلێك دەناســێنێت کــە چــیدی تــەنها مەســەلەی شارســتانێتی رۆژئــاوا نیــە. بێگومــان مانــای قسەکانی من ئەوە نیە کە ئەو وەڵامانەی رۆژئاوا دۆزیویەتەوە، تاکە وەڵام و باشترین وەڵامە. ئەم وتوێژانەی هەنوکە لەئارادان هاوکاریمان دەکات کەموکوڕیەکانی نمونەکەی خۆمان بزانین. لەهەر حاڵەتێکدا سەرنجە راڤەکردنەکان لەبارەی خاڵی دەرچــوونی گوتــاری مافــەکانی مــرۆڤ لەلایــەن بەشــداریکەرانەوە، لــە کلتــورە جیاوازەکانــەوە سەرنجمان بۆ ناوەڕۆکێکی میتۆدی رادەکێشێت کــە هــەر گوتارێــك ئامــانجی لێکتێگەیــشتنی دولایەنە بێت، لە پێشگریمانەکانی خۆیدا هەیە. مانای ئەم گوتارە ئەوەیە هەموو بەشداریکەرانی ســەر بــە کلتــورە جیاوازەکــان، بــەدەر لــە پــێش زەمینــە کلتوریــەکان، بەشــێوەیەکی حەدســی بــە باشــی ئاگــادارن کــە مــادام پەیوەنــدی تــەریب - ناســینی دولایەنــە، دەوربینینــی دولایەنــە، ئارەزوی هاوبەش بۆ سەیرکردنی نەریتی خود لەچــاوی بێگانەکانــەوە، فێربــوون لەیــەکتر و شتەکانی تــر-لەنێوانیانــدا نــەبێت، گەیــشتن بــە کۆدەنگی لەســەر بناغــەی باوەڕهێنــان رونــادات. لەســەر ئــەم بناغەیــە ئێمــە نــەك هــەر نــاتوانین مەســــەلەی وەك خوێندنــــەوەی دڵخوازانــــە، تەفسیری بەدکارانە و سودوەرگرتنی کورتبینانە لــە مافــەکانی مــرۆڤ، بــەڵکو هــەروەها بــە ئــامێرکردنی بێــشەرمانەی مافــەکانی مــرۆڤ کــە دەست بە شاردنەوەی بەرژەوەندی تایبەت لە دەمــــامکێکی گــــشتبینانەدا دەکــــات- هەڵخەڵەتاندنێك کە دەبێتە بەهانەی ئەم حوکمە نادروستە کە مانای مافەکانی مرۆڤ بە خراپ بەکارهێنانی خاڵی لە مانا دەبێت - بەهەموو هێزەوە رەخنە بکەین.

**سەرچاوە:**

فەسڵی پێنجەمی کتێبی: (یۆرگن هابرماس: جهانی شدن و دیموکراسی. ت: کمال پولادی. تهران-نشر مرکز . چاپ دوم 1382).

# هەلومەرجی یاسایی و ئەخلاقیی "جاڕنامەی گەردوونی"

گلێن جۆنسۆن

لە فارسییەوە: ڕەزا مەنوچەهری

**مشتومڕو وتوێژ دەربارەی هەلومەرجی یاسایی و ئەخلاقیی "جاڕنامەی گەردوونی" لەکاتی نوسینەوەیدا**

زۆربەی ئەو کەسانەی دەستیان لە نوسینەوەی جاڕنامەی گەردوونیی مافەکانی مرۆڤدا بووە، بڕوایان وابوو کە ئەو جاڕنامەیە هیچ بنەمایەکی یاسایی نییە. ئەو کەسانە لەو بڕوایەدابوون، بەشداری لە نوسینی جاڕنامەیەکدا دەکەن کە ئامانجی دروستکردنی کاریگەرییە لەسەر ویژدانەکان و لەهەمان کاتدا یەکەمین هەنگاوە لەڕێگای زنجیرە ڕێککەوتنێکدا کە لە دوارۆژدا هێزی یاسایی بەدەستبهێنن. گەرچی (ئەلنۆر ڕۆزڤێڵت) ئەو ئۆمێدەی ڕاگەیاند کە "جاڕنامە" جۆرێکە لە (فرمانی بڵاوکردنەوەی ڕەهەندە مەزنەکەی ڕەگەزی مرۆی)و – ئەو دەستەواژەیە لەدوایدا بوو بە قسەی سەر زاران– بەشێوەیەکی سیستماتیک بەرگریی لە ڕوانگەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەکرد. بەپێی ئەو ڕوانگەیە دەبێت پاش ڕاگەیاندنی یاساو ڕێسا ئەخلاقییەکان لە جاڕنامەی گەردوونیدا، هەوڵ بۆ چەسپاندن و بەدواداچوونی بنەماکانی یاسایی مافەکانی مرۆڤ بدرێت. زۆربەی نوێنەرەکانی دیکەش لایەنگری ئەو ڕوانگەیە بوون و هەمیشە بۆچوونەکانیان لە ڕەوتی وتوێژەکانی (کۆمیسۆن)، (ئەنجومەنی ئابووری و کۆمەڵایەتی)، (سێیەمین کۆمیتە)و (ئەنجومەنی گشتی)دا دەردەبڕی. ئەوە بەو مانایە نەبوو کە نەیاندەخواست خۆیان ڕووبەڕووی کارێك بکەنەوە کە لە مەیدانی یاسای نێونەتەوەیدا دەرەنجامی جۆراوجۆری لێدەکەوێتەوە. لەڕاستیدا هەر ئەو کەسانە وەك ئەلنۆر ڕۆزڤێڵت مەبەستیان ئەوە بوو کە

هەوڵەکانیان ببێتە هۆی نوسینی گوزارەگەلێك، کە دەسەڵاتی یاسایی هەبێت. سەرباری ئەوانەش بڕیار بوو لەسەرەتادا "جاڕنامەی گەردوونی" تەنها راگەیاندنی بنەماکان، ئامانجو حەزەکان بێت نەك بەڵگەیەکی یاسایی بۆ ناچارکردن، یان پێبەندبوون پێیەوە. لەراستیدا دەقی دیکۆمێنتەکەش جەخت لەسەر ئەو خاڵە دەکاتەوە، چونکە تیایدا هاتووە (ئەنجومەنی گشتی) جاڕنامەی گەردوونیی مافەکانی مرۆڤ وەك (ئامانجی هاوبەشی) هەموو خەڵكو گەلان رادەگەیەنێت. ئەوە ئامانجێکە کە دەبێت هەموو تاکەکانو کۆمەڵگاکان بە گرتنەبەری رێوشوێنی زۆرتر بەرەو ئەو ئامانجە پێش بڕۆنو هەنگاوی بۆ بنێن. زمانی ئەو نوسینە زۆرتر زمانی ئەخلاقە تاکو زمانی پێبەندبوونی یاسایی.



لە دەقی رەشنوسی کۆتاییدا لە پێشدابوونی لایەنی ئەخلاقی بەرانبەر بە پێبەندبوونی یاسایی تەنها لەژێر رۆشنایی هەوڵی هاوبەشی هەندێك حکومەتدا جێگای کراوەتەوەو دەرکەوت پێشنیاری تەبا لەگەڵ ئەو خاڵە، یان تا ئەو شوێنەی دەکرێ رەدکردووەتەوە کە "جاڕنامە" دەربڕی ئەو بنەما یاساییە کە جێبەجێکردنی لە لایەن نەتەوە یەکگرتووەکان، یان لە چوارچێوەی دادگەی نێونەتەوەیدا پێویستە. بۆ نمونە (هومفری) لە یادداشتێکدا بۆ (هانری لوژییە) جێگری سکرتێری گشتی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان نوسیبووی، ئەو بۆچوونەی کە "کۆمیسییونی مافەکانی مرۆڤ" لە توانایدا بێت سکاڵا گشتییەکان وەربگرێت کێشە دروست ناکات، بەڵام لە بەرامبەر هەر پێشنیازێکدا کە ئەو کۆمیسیونە بتوانێت سکاڵا تایبەتەکان وەربگرێت، ئەوە بەپێی مادەی (12) لە بەندی (7)ی راگەیەندراوی نەتەوەیەکگرتووەکاندا بابەتی گرنگ دەورووژێنێت، هەڵبەت جگە لەو بابەتانەی کە سکاڵاکردنەکان لەسەر کێشەیەك بێت کە لە ناوەرۆکدا هەڕەشە لە ئاشتی نێونەتەوەیی – بەو جۆرەی کە لە بڵاوکراوەکەدا پێناسەکراوە – دەکات.[1]

بەتایبەت دەوڵەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا داوای دەکرد دووری بکرێت لەو پێشنیازانەی کە ببێتە هۆی ئەوە، "جاڕنامە" لە ئاستی نێونەتەوەیداو لە رووی یاساییەوە بۆ جێبەجێکردن بەپێویست بزانرێت. لە 20 ی نۆڤەمبەر 1947 دا (جیمز– پ – هیندریك) جێگری ئەلنۆر رۆزڤێڵت کە دانراوی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا بوو، پاش کۆبوونەوەیەکی تێروتەسەل لەگەڵ (ئا، لوت) وەزیری دەرەوەی ئەو کاتەی ئەمریکادا، بۆ ئەلنۆر رۆزڤێڵت ئەم یاداشتە دەستنوسەی خوارەوەی نارد:

" بەرێز لوت رەخنەی جدیی لە دەرەنجامەکانی ئەو ناواخنەی (رەشنوسی جاڕنامە) گرتووە، کە تیایدا هاتووە پێویستە هەموو مافە نوسراوەکان دەمودەست جێبەجێ بکرێت. دەبوایە هەوڵم بدایە یەکێك لەو دوو

ڕێگایەی خوارەوەم هەڵبژاردایە، یەکەم: دەبوایە بە سەرنجدانە ئەو کەسایەتییە جۆراوجۆرانەی کە "جاڕنامە"یان نوسیبوو و پەسەندیان کردبوو (لوت)م بە قبوڵکردنی جاڕنامە بەو شێوەیەی کە نوسرابوو ناچاربکردایە. دووەم: یان دەبوایە بە گۆڕانێکی زۆر سادە لە(پێشەکیی جاڕنامەکەدا) ڕەخنەکانی بەهەند وەربگرم. بۆیە لەو کاتەدا گەیشتمە ئەو بڕوایە کاتێک لوت ئەو ڕەخنەیەی هێناوەتە گۆڕێ (ڕەخنەیەك کە پێش ئەویش زۆر کەسی دیکە گرتبوویان)، پێدەچێت ڕوانگەی لەگەڵ ڕوانگەی هەمان ئەو کەسە زیرەکانەی دیکەدا یەکبگرێتەوە کە ئێمە بۆ خۆمان بەپلەی یەکەم هەوڵمان دەدا ڕەزامەندییان وەربگرین. سەرەڕای ئەوەش ڕاکێشانی پشتیوانی پڕ جۆش‌وخرۆشی (لوت)م بە پێویست دەزانی. لەمڕووە خۆم بەدەستەوە دا و پێشنیازم کرد کە لە "پێشەکیی جاڕنامە"دا لەباتی "ڕەچاوکردن"ی مافە نوسراوەکانی نێو جاڕنامە، بانگ لە ئەندامەکانی نەتەوەیەکگرتووەکان بکرێت بۆ "برەوپێدان"ی ئەو مافانە.

بۆیە هیوادارم ئێوە ڕازی بن کە ئەوە زیرەکانەترین ڕێگا چارەبوو، بەڵام هەروەها ئۆمێدەوارم، ئەگەر ڕەزامەند نەبوویت سەردانی (دین ڕاسل) بکەیت‌و بەبێ هیچ دوودڵییەك بۆچوونەکانی خۆتی پێبڵێیت. لەو بڕوایەدام کە توانایی بەڵگاندنەکانت بە باشی دەتوانێت لوت لە پەسەندکردنی ئەو بڕیارە وەرگیراوە بگەڕێنێتەوە.[2]

ڕۆژی دواتر (ئالیس م.مەك دایارمید) جێگری بەشی ڕێکخراوە نێونەتەوەییەکانی وەزارەتی دەرەوە ڕێنوێنییەکی بە ئەلنۆر ڕۆزڤێڵت ڕاگەیاند کە ڕاشکاوی کەمتری تێدا بوو:

"بەپێی بۆچوونی وەزیری دەرەوەی ئێستا، نابێت جاڕنامەی گەردوونیی مافەکانی مرۆڤ بە شێوەیەك بنوسرێت کە ئەو هەستە لای هاوڵاتیان‌و حکومەتەکاندا دروست بکات، کە حکومەتەکان، یان نەتەوەیەکگرتووەکان جۆرێك ڕێکەوتننامەی ناچارکردنی بەرامبەر بە گەرەنتی مافەکانی مرۆڤ هەیە، کە لە جاڕنامەدا نوسراوە. لە ڕاستیدا ئەو جاڕنامەیە زیاتر لە تۆمارکردنی یاسا یەکلایکەرەوەکان، دەربڕی خۆزگەو حەزەکانە".[3]

لەگەڵ ئەو یاداشتەی سەرەوەدا پاشکۆی ڕەشنوسە گۆڕاوەکەی "جاڕنامە" م ناردووە کە ڕوانگەکەی سەرەوەی ڕەچاوە کردووە.[4]

بەگشتی یاساناسەکان لەو بابەتەدا هاوڕان، ئەگەر جاڕنامەیەك بەشێوەیەکی فەرمی لەلایەن دەوڵەتەکانەوە پەسەند نەکرابێت‌و تەنها ئەنجومەنی گشتیی (نەتەوە یەکگرتووەکان) پەسەندی کردبێت ئەوە ناتوانێت پێبەندبوونی یاسایی دروست بکات، یان تەنانەت پێناسەیشی بۆ بکات. بە بڕوای (سێر هرش لاترپاچت) – کە لەو کاتەدا لە بەرجەستەترین کەسایەتیەکانی بواری بابەتە یاساییەکان دەژمێردرا – لاوازیی دادگەری گریمانە بۆ کراوی "جاڕنامە" هۆکارێکی شایانە سەرنج نییە. لاترپاچت لە ڕاپۆرتە بە توانا و کاریگەرەکەیدا بۆ "کۆنفرانسی ئەنجومەنی یاسای نێونەتەوەیی" کە لە بڕۆکسل‌و لە 1948 دا بەڕێوەدەچوو سەرزەنشتکردنێکی زۆر توندی دەربڕیوە: " لە کاتێکدا دەکرا جاڕنامەیەك بەو چییەتییەوە بەهایەکی ئەخلاقیی هەبێت کە لە لایەن دەزگاگەلێکەوە

نوســــرابێت و ئـــــەرکیان بڵاوکردنـــــەوەی ئەندێشەکان و شکڵدان بێت بە رامانەکان، ئەگەر (جاڕنامـە) لـە چـاوگەو ناوەنـدێکی لـەو جـۆرە سەرچــاوە بگرێـــت ئـــەوە دەکـــرا وشـــەی "تیـشکەکان" و "هانـدان"یـش بـە هـەمان رادەی کردارە دیاریکراوەکان بەهێزبن.

ئەگەر ئەم جاڕنامەیە لە لایەن دەوڵەتەکانەوە بنوسرێت و بڵاوبکرێتەوە، ئەوە هەرگیز وشەکان لـە ئاسـتی بەکردەوەکردنـدا نـابن. ئـەوەی کـە ویــژدانی مــرۆڤ لــە دەوڵەتــەکان چـاوەڕوانی دەکات، راگەیاندنی ئەندێشەی مافەکانی مرۆڤ، یـان تەنانـەت پێناسـەکردنی ئـەو مافانـە نییـە، ئــەوەی کــە ویــژدانی جیهان (لە دەوڵەتـەکان) چــاوەڕوانی دەکـــات، پـــــــــــشتیوانییەکی کاریگـەرو کرداریـیە لـە مافـــەکانی مــرۆڤ کـــە پێویــــــــستی بــــــە ناچـــــــــارکردن و پێبەنـــــــــدبوونی راســـتەقینەو پێویـــستیی بـــە جێبـــەجێکردن هەیە."[5]



کەواتـە لەوکاتـەدا زۆربـەی چـاودێران– هـەم زانکۆییەکان و هەم دیپلۆماتەکان– لـەو بڕوایـەدا بـوون کـە "جاڕنامــە" پێبەنـدبوونی ئـەخلاقی دروسـتدەکات نـەك پێبەنـدبوونی یاسـایی. لـە راسـتیدا کاتێك "کۆمیسیۆنی مافەکانی مرۆڤ" لە دانیشتنی دیسەمبەری 1947 دا سێ گرووپی کـــارکردنی دروســـتکرد، گرووپـــی کـــارکردن دەربـارەی گرتنەبـەری رێوشـوێنی کـرداری لـە راپۆرتەکەیاندا بەم ئەنجامە گەیشتوون:

"بابەتـی گرتنەبــەری رێوشــوێنی کرداری زۆرتر پەیوەندی بە "پەیماننامە"وە هەیە تاکو "جاڕنامــە". ئــەم "جاڕنامــە"یــە لــە دوایــین شیکردنەوەدا وەکو " تێبینییەکی" ئەنجومەنی گــشتیی نەتەوەیــەکگرتووەکانی لێــدێت و لــە ئەنجامداو بەپێی مانای وردی وشەو لە رووی یاسـاییەوە ناچـارکردنی جێبـەجێکردنی تێـدا نابێت. لەمڕووە گرووپەکەمان بە لە بەرچاوگرتنی گرتنەبەری رێوشوێنی کرداری بۆ پێبەندبوونێك کە لـە راسـتیدا لایـەنی یاسایی و پێویـست بـۆ ناچـــارکردن و جێبـــەجێکردنی تێـــدا نییـــە، بەئاشـــکرا (رایدەگەیـــەنین) کـــە ئاســـتەمەو نابێت."[6]

سـەرباری تێکـرای ئـەو باسـانە، هەرلـەو سەردەمەدا هەندێك ئەو بۆچوونەیان خستەڕوو کـــە "جاڕنامـــەی گەردوونی" دەرەنجام و کاردانـــەوەی یاسـایی وردو جــــــــوان و راســـتەقینەی دەبێـــت.

جێگای سەرسوڕمان نییە کە نوێنـەری هەندێك لـە دەوڵەتـەکانی ئـەمریکای لاتـین – بێهـوودە– جەختیان لەسەر ئەوە کردبووە کە دەستەواژەی پێویستە و زۆرتـر پێویستە بـەکاربهێنرێت، یان بنوسرێت، ئەوانە لە ریزی ئەو کەسانەدا بوون کـــە بـــەرگرییان لـــە بۆچـــوون و راڤەیـــەکی (رادیکاڵ)تر لەسەر جاڕنامە دەکردەوە.

بــۆ نمونــە نوێنـــەری پانامــا بـــەمجۆرەی دەبەڵگانـــد کـــە مـــادەی (2) لـــە بەنـــدی(7)ی "بڵاوکراوە" رێگری لەوە ناکات کە "جاڕنامە" لەســـەر بنـــەمای مافـــە نێونەتەوەیـــەکان بـەکاربهێنرێت یـان جێبـەجێ بکرێت. نوێنـەری

پاناما لەو بڕوایەدا بوو خودی "بلاوكراوەی نەتەوە یەكگرتووەكان" مافەكانی مرۆڤ بە بابەتێكی نێونەتەوەیی دەزانێت و لە بواری مافەكانی مرۆڤدا بەرپرسیاربوونی بۆ رێكخراوی نەتەوە یەكگرتووەكان دیاریكردووەو ئەو مافانەیان وەكو بابەتی نێونەتەوەیی پێناسەكردووە، نەك وەك بابەتێك كە بەپێی پێناسەی نوسراو لە "بلاوكراوەكەدا" دەڵێت "تەنها پەیوەندیی بە پاراستن و رێگاپێدانی بەرژەوەندیی (نیشتمانی) نەتەوەییەوە" هەیە.[7]

نوێنەری شیلی بۆ بەدواداچوونی ئەو بەڵگاندنەو لە هەمان كاتدا قبوڵكردنی ئەو بابەتە كە لە رووی یاساییەوە تەنها پەیماننامەكان دەسەڵاتی یاساییان هەیە، رایگەیاند كە هەرجۆرە پێشێلكردنێكی "جاڕنامە" لە ئاستی پێشێلكردنی (بلاوكراوەی نەتەوە یەكگرتووەكان)دا دەبێت، چونكە یەكێك لە بنەماكانی نەتەوە یەكگرتووەكان پێشێل دەكات. هەروەها ئەوەی بەبیرهێنایەوە كە"جاڕنامە" تەنها بەئاشكرا مافە راگەیەندراو ناسراوەكانی نێو"بلاوكراوەی" نەتەوە یەكگرتووەكان دەردەبڕێت.[8] لەو روانگەیەوە "بلاوكراوەی نەتەوە یەكگرتووەكان" مافەكانی مرۆڤی بە نێونەتەوەیی كردووە. تەنها "جاڕنامە" بە بەشێك لە نوسین، پێڕست و رەشنوسێكی مافە پێشكەشكراوەكانی "بلاوكراوەی نەتەوە یەكگرتووەكان" دەژمێردرێت و بلاوكراوەی نەتەوە یەكگرتووەكانیش وەكو پەیماننامەیەكی نێونەتەوەییە.

پێدەچوو بەلایەنی كەمەوە چەندین نوێنەری دیكە تاكو رادەیەك هاوڕابووبن لەگەڵ تێگەیشتنێكی لەو جۆرەدا.(كێنت كارتۆن دوویارت)ی بەلجیكی رایگەیاند: گەرچی "جاڕنامە" بەهایەكی ئەخلاقیی بێ وێنە لەخۆ دەگرێت، بەڵام لە هەمان كاتدا لە ناوەڕۆكەكەیدا "سەرەتایەكی بۆ بەهای مافەكان" تێدایە.[9]

پێدەچوو(رێنیە كاسین)یش حەزی نەدەكرد "جاڕنامە" بە بەڵگەیەك بزانێت كە تەنها بەهایەكی ئەخلاقیی هەبێت. رێنیە بە پێشكەشكردنی خاڵێك رایگەیاند كە "جاڕنامە" جۆرێك لە بەهای یاسایشی هەیە، چونكە یەكەمین جاڕنامەیە كە لەلایەن گروپێكی نێونەتەوەییەوە "رێگاپێدان و پاراستنێكی یاسایی" تایبەتی پێدراوە.[10] سەرەڕای ئەوەش رێنیە كاسین لەمبارەیەوە لە "ئەنجومەنی گشتی"دا رایگەیاند:

"ئاشكرایە ئەم جاڕنامەیە بەهەمان رادەی پێبەندبوون بەنوسراوەكانی ناو پەیماننامەكان، هێزی پێویست و ناچاركردنی بۆ ئەوە نییە كە جێبەجێ بكرێت، بەڵام "جاڕنامە"كەمان لە چوارچێوەی بڕیارێكی "ئەنجومەنی گشتی"دا نوسراوە كە بەهای یاسایی و داواكاریی تێدایە. ئەم راگەیاندنە لە حوكمی فراوانكردنی "بلاوكراوەدایە" كە مافەكانی مرۆڤی خستە ناو مافەدانراوە نێونەتەوەییەكانەوە. دەتوانین دەربارەی ئەو مافانە بڵێین كە ئێستا لە ریزی ئەو بابەتانەدان كە بە "بنەمای گشتیی مافەكان" ناسراون و لە مادەی (38) ئەنجومەنی دادوەریی لاهای پێشبینیی بۆ كراوە، كەواتە من ناتوانم ئەو بۆچوونە قبوڵ بكەم كە "جاڕنامە" تەنها بەڵگەیەكی ئەكادیمییە. هەڵبەت ئەوەم قبوڵە كە ئەو بەڵگەیە لە هەناوی خۆیدا هێزی هەیەو زیاتر لە گەرایەكیش نییە،

بەڵام ئەو بابەتە هیچ لە ناچاری جێبەجێکردنی "بڵاوکراوەکە" کەمناکاتەوە."[11]

بەپێچەوانەی نوێنەری وڵاتانی ئەمریکای لاتین و مامۆستا رێنیە کاسین کە لایەنگری ئەو راڤەکردنەبوو کە پانتایی و بایەخی "جاڕنامە" زۆرتر بکات، دەوڵەتە یەکگرتووەکانی ئەفریقای باشوور ئەو راڤەکردنەیان بە هەڵخەڵەتێنەر و لە هەمان کاتدا دەست وپێگیر دەزانی. یەکێتیی ئەفریقای باشوور هەمیشە هەوڵی دەدا هەندێك مافی نوسراو لە "جاڕنامە"دا کەمبکاتەوەو بەڵگاندنەکەیشی ئەوە بوو تەنها مافە ناسراوەو دیارە گەردوونییەکان کە لە یاسا بنچینەییەکان و سیستمە یاساییەکاندا بوونیان هەیە لە "جاڕنامەدا" بنوسرێتەوە.

کاتێك لە سەرەتای (1948) "کۆمیسیونی مافەکانی مرۆڤ" بۆ وەرگرتنی راڤەی دەوڵەتە ئەندامەکان، رەشنوسی جاڕنامەکەی خستە بەردەستیان، یەکێتیی ئەفریقای باشوور لە وەڵامدا رەخنەیەکی توندی لەسەر دەقی جاڕنامەکە پێشکەشکردو جەختی لەوە دەکردەوە کە ئەو دەقە خراپ نوسراوەو داواکاریی یاسایی جۆراوجۆر لە خۆ دەگرێت کە لە ئاستی جیهانیدا بەفەرمی نەناسراون. هەروەها لەو وەڵامەدا هاتبوو کە دەبێت تەنها مافە "بنچینەییەکانی مرۆڤ" لە "جاڕنامەدا" بنوسرێت و دەبێت بۆ مافە "بنچینەییەکانیش" پێناسەیەکی وردو رێکوپێك پێشکەش بکرێت. بنەماکانی ئەو روانگەیە دەگەڕێتەوە بۆ چوونیەتیی هەڵسەنگاندنی حکومەتی یەکێتی ئەفریقای باشوور لەسەر تێکڕای بایەخی یاسایی و سیاسی "جاڕنامە"و بەشێك لە وەڵامەکە بەمشێوەیەی خوارەوەیە:

"بەو جۆرە وێنا دەکرێت ئەگەر جاڕنامەیەك بەو چییەتییەوە لەلایەن "ئەنجومەنی گشتی"یەوە پەسەند بکرێت، لایەنی یاسایی، یان پێبەندبوونی یاسایی دروست ناکات. رەنگە لەبەر ئەمەش بێت کە لە نوسینی جاڕنامەدا، ئەم هەموو کەم پایەیە بە دەستنیشانکردنی بابەتەکان و هەلومەرجە تایبەتەکان، یان پانتایی راستەقینەی ئازادییەکان و مافە بنچینەییەکان دراوە. لە بەرامبەردا ئەو خاڵە لەبیرنەکراوە کە هەر ئەو جاڕنامەیە وەکو سەرچاوەی مافەکان و پێبەندبوونی ئەخلاقی ناسراوە. ئەوە لە ئەنجامدا نەك تەنها سەرچاوەی پەشێوی و ئاژاوەی ناوخۆیی زیاد دەکات، بەڵکو دەبێتە سەرچاوەی پەشێوی و دژوارییە هەمیشەییەکان لە" نەتەوە یەکگرتووەکان"و دەزگا جۆراوجۆرەکانیشیدا، کەواتە بێئەندازە گرنگە کە ئەو دەقە، لە کاتێکدا بە شێوەیەکی هەمەکی چوارچێوەیەکی قبوڵ نەکراوی هەیە، پەسەند نەکرێت".[12]

لە وتوێژەکانی "سێیەمین کۆمیتە"شدا نوێنەری یەکێتیی ئەفریقای باشوور لەسەر هەمان روانگە بەردەوام بووو دووبارەی دەکردنەوە.[13]

بێگومان لە ئەنجامی هەمان بەڵگاندنەوە بوو کە دەوڵەتی یەکێتی ئەفریقای باشوور لە دەنگدانەکانی "سێیەمین کۆمیتە"و "ئەنجومەنی گشتی"دا دەنگی سپی بەکارهێنا. لە درێژەی وتوێژەکانی "ئەنجومەنی گشتی"دا بەڵگاندنەکانی نوێنەری ئەفریقای باشوور هەندێك زیاتر رۆیشت، چونکە نیگەرانییەکانی پەیوەند دەدرا بە بۆچوونی نوێنەری وڵاتانی ئەمریکای لاتینەوە. گەرچی نوێنەری ئەفریقای

باشــوور بەباشــی لــەو خاڵــە گەیــشتبوو کــە "جاڕنامە" لە ئاستی ڕاگەیاندنی پێناسە متمانە پێکراوەکانی ئازادیو مافە بنچینەییەکانی نێو خـــــودی "بلاوکـــــــراوەی" نەتـــــــەوە یەکگرتووەکاندایە، بەڵام پێناسەی بۆ نەکراوە، ئەو دەوڵەتانە کە دەنگ بە "جاڕنامە" دەدەن "بەشێوەیەك لەشێوەکان پێبەندەبن پێوەی، چونکە وەك بڵێیت پەیماننامەی دەربڕینی ئەو بنەمایانەیان واژۆکردوە.."[14]

مامۆســـتا جـــۆن هـــومفری بۆچـــوونێکی میانڕەوی هەڵبـژارد، گەرچی ئەوەی قبوڵ بوو کـــە لـــەرووی تەکنیکییـــەوە ئـــەو ڕوانگەیـــە دروســـتەو بڕیارنامـــەی "ئەنجومـــەنی گـــشتی" ناتوانێـــت خـــۆی لـــەخۆڕا پێبەنـــدبوونێکی یاســـاییو ناچـــارکردن بـــۆ بەجێبـــەجێکردن دروست بکات. لە هەمان کاتدا لەو بڕوایەدا بوو کــە "جاڕنامــە" توانــایی یاســایی بــەرفراوانی هەیە. هەندێك لە دەوڵەتەکان بۆ نموونە ویلایەتە یــەکگرتووەکان لــە هــەر دەرفەتێکـدا جــەختیان لەسەر لایەنی نایاساییو ناپێویست بوون بۆ جێبـەجێکردن دەکـردەوە، لەلایـەك زێـدەڕۆییان دەکـــردو لـــە لایـــەکی دیکـــەوە زیانیـــان بـــە ئامانجەکانی مافی مرۆڤ دەگەیاند.[15]

## وەرچەرخانی هەلومەرجی یاسایی "جاڕنامە"

گەرچی لە کاتی پەسەندکردنی "جاڕنامە" لـــــە "ئەنجومــــــەنی گـــــشتیی نەتـــــەوە یــەکگرتووەکان"دا کــەم بــوون ئــەو کەســانەی جــەختیان لــەوە دەکــردەوە "جاڕنامــە" لــەرووی یاســـاییەوە پێویـــستی بـــۆ جێبـــەجێکردن دروستدەکاتو پێویستیشە جێبـەجێ بکرێـت، بــەڵام پاشــان ژمارەیــەکی زۆرتــر بــەو ئەنجامــە گەیشتن جاڕنامە لەرووی یاساییەوە بۆ تێکڕای دەوڵەتـەکان بـە پێویـست دەزانـن کـە جێبـەجی بکرێــت. ســێ جــۆر بەڵگــەو دۆکیومێنــت لــەو وەرچەرخانەدا ڕۆڵیان هەبووە.

یەکـەم: زۆرێـك لـەو دەوڵەتانـەی کـە یاسـای بنچینەییان پاش ساڵی 1948 نوسیوەتەوە- بە تایبەت ئەو دەوڵەتانەی کە لەکۆتی داگیرکاری ڕزگاریان بووەو سەربەخۆییان بەدەستهێناوە لە یاســاکانیاندا هەڵێنجانــدنیان لــە "جاڕنامــەی گەردوونیی مافەکانی مرۆڤ"ەوە وەرگرتووە.

دووەم: ئەو ڕێکخراوانەی کە لە چوارچێوەی حکومەتێکـدانو لۆکـاڵینو خۆیـان بـۆ مافـەکانی مـرۆڤ تـەرخانکردووە، یـان چییەتییەکی گشتی تریـان هەیـە لـە پـەیڕەو پرۆگرامـەکانی خۆیانـدا پـشتیان بـە "جاڕنامـەی گـەردوونی" بەسـتووە، یـــان لـــە بڕیارنامـــەو ڕاگەیاندنەکانیانـــدا جاڕنامەیان قبوڵ کردووە.

ســـێیەم: خـــودی ڕێکخـــراوی نەتـــەوە یەکگرتووەکانو زۆرێك لە دەزگا پسپۆڕییەکانی (*un*) لـە بڕیارنامـەو ڕاگەیاندنـەکانی خۆیانـدا چـــەندەها جـــار هەڵێنجاندنـــەکانیان بـــەپێی "جاڕنامە" بووەو پشتیان بە جاڕنامە بەستووە. جــۆن هــومفری ئــەوە بــەیاد دەهێنێتــەوە کــە لەراستیدا جگـە لـە یـەکێتی ئەفریقای باشـوور، تێکڕای ئەو دەوڵەتانە کە لـە 10 ی دیسەمبەر 1948 دا دەنگـــی ســـپییان بـــەکارهێنابوو لەدوایــدا دەنگــی ئــەرێیان بــە بڕیارنامـــەو ڕاگەیاندنــەکانی "ئەنجومــەنی گــشتی" دا کــە دوڵەتـــەکانی بـــۆ ڕەچـــاوکردنی جاڕنامـــەی گەردوونی ناچار دەکرد.[16]

زۆرێك لە مافناسانی نێودەوڵەتی – بێگومان زۆربـــەیان – لـــەو بڕوایـــەدان پـــشتبەستنی بەردەوام بە "جاڕنامەی گەردوونی " لە هـەموو

ئاستەکاندا باشترین ئاماژەیە کە "جارنامە" لە ئێستادا بووە بە یاسای باوی نێونەتەوەیی، کە لەرووی مافەکانەوە بۆ تێکڕای دەوڵەتەکان رەهەندی ناچارکردنی جێبەجێکردنی هەیە.[17] هەڵبەت ئەوەی کە مافناسانی نێودەوڵەتی "جارنامە" لەرووی یاساییەوە بە بابەتێکی پێویست و ناچارکەر لەقەڵەمبدەن، بەو مانایە نییە کە لە هەموو شوێنێکدا بەشێوەی یەکسان رەچاوکراوە، یان رەچاو بکرێت. لەراستیدا ئەو خاڵەی جۆن هومفری دروستەو جێگای داخیشە کە دەڵێت:" بۆ بەدبەختی بەڵگەیەکی ئەوتۆ بوونی نییە کە بیربکەینەوە مافەکانی مرۆڤ- رەنگە جگە لە مافە ئابووری، کۆمەڵایەتی، کولتوری و یاساییەکانی پەیوەست بە نەبوونی جیاکاری لەسەر گروپە مرۆیەکان- لەمڕۆدا زۆرتر لە قۆناغی پێش 1948 رەچاو دەکرێت، یان نا."[18]

زیاتر لە پەنجا ساڵ پاش ئەوەی کەسانێکی وەك ئەلنۆر رۆزڤێلت، پ.ج.چانگ، چارڵز مالك، رێنیەکاسین و جۆن هومفری بۆ نوسینی جارنامە، لە هەوڵدابوون و هەوڵیان دەدا بەهایەکی گەردوونیی هەبێت تاکو پێویست بە رەچاوکردنی گشتی بکات، زۆرێك لە بابەتەکان گۆڕانکارییان بەسەردا هاتووە. پێگەی زۆرینەی نێو نەتەوە یەکگرتووەکان لە وڵاتە لیبراڵە خۆرئاواییەکانەوە گۆڕاوە بۆ وڵاتەکانی جیهانی سێیەم. جەنگی سارد توندتر بووە، پاشان هێدی بووەتەوەو دیسان توندتر بووەتەوەو پاشان هێدی بووەتەوە. ئەمڕۆ خەباتکارانی مافەکانی مرۆڤ بەهۆی تۆڕێکی پەیوەندیی بەرفراوانەوە پێکەوە بەستراونەتەوەو ئەوەش پێکهێنانی کۆمەڵگایەکی نێودەوڵەتی مافەکانی مرۆڤی مەیسەر کردووە.

لەلایەك رێکخراوە ناحکومیەکان (*N.G.O*) پاڵنەرو هاندەری پلاندانەرانی ئەمریکی لە نێو رێکخراوە نێونەتەوەییەکان لە پاش جەنگدا بوون و لە لایەکی دیکەوە هەوڵەکانی ئەلنۆر رۆزڤێلت لە چوارچێوەی نەتەوە یەکگرتووەکاندا یارمەتیدەر بووە بۆ چەسپاندنی مافەکانی مرۆڤ لەناو بەرنامەی کاری رۆژانەی بابەتە نێونەتەوەییەکاندا. پاداشتی هەوڵەکانیان بەرفراوانبوونی لەرادەبەدەری بایەخدان بەبابەتی مافەکانی مرۆڤ لە سەرانسەری جیهاندایە. ئەمڕۆ مافەکانی مرۆڤ زیاتر لەهەر کاتێکی دیکە کاری پێدەکرێت و راستیی هەیە.

بەڵام سەرباری ئەو وەرچەرخانەش - لەوانەیە بەهۆی ئەو وەرچەرخانەشەوە بێت - هێشتا ئەو کەسانەی "جارنامەی گەردوونی"یان نوسیووەو پەسەندیان کردووەو بەدیانهێناوە زۆر بەرچاو و گرنگن. ئەوە لە کاتێکدایە هێشتا خەڵك تازە لە دەستی جەنگ رزگاری بووە و جەنگی سارد دەستپێدەکات، کە ئەزموونی نەتەوە یەکگرتووەکان بەتایبەت لە مەیدانی ئابووری و کۆمەڵایەتیدا لە بڕینی قۆناغە سەرەتاییەکانیدا بوو. رێك لە ماوەی (30) مانگدا توانیان دەقێك بنوسن و لەسەری رێکبکەون کە جیاوازی زمان، رەگەزو کەلتورەکان - بەڵام نەك بەتەواوی - بەڵکو تاکو رادەیەك تێپەڕێنن و تاکو ئەو کاتە لە پەیوەندییە نێونەتەوەییەکاندا بێ وێنە بووە. بۆ تێگەیشتن لە بایەخی هەوڵەکانیان، بۆ ساتێك بیر لەو خاڵە بکەینەوە کە بۆ دەستبەرکردنی ریکەوتن دەربارەی گرێبەستە نێونەتەوەیەکان، " نەتەوە یەکگرتووەکان" لەسەر بابەتی مافەکانی مرۆڤ پێویستی بە (18)ساڵی دیکە

هـــەبوو، ئـــەو دەوڵەتانـــەی ڕێکەوتنـــەکانیان پەسـەند نـەکردووە دەبـوا(11)سـاڵی دیکـەش تێپەڕیبایە تاکو واژۆیـان لەسەر بکردایە، تاکو توانـــایی جێبـــەجێکردنیان بەدەســـتبهێنایە. هەرچـۆنێك بێـت لـەمڕۆداو هێـشتا پـاش (40) ساڵ لـە پەسـەندکردنی "جاڕنامـە" هەنـدێك لـە دەوڵەتـــە گرنگـــەکان، بـــۆ نمونـــە ویلایەتـــە یـەکگرتووەکان لـە واژۆکردنـی ئـەو ڕێکەوتنانـە خـۆی دەدزێتـەوە. کـارکردن لەسـەر گرتنەبـەری ڕێوشـــوێنی جێبـــەجێکردن لـــە چوارچـــێوەی "نەتەوە یەکگرتووەکاندا" حاڵـەتێکی زۆر پـرژو بـــڵاوو کـــەم کاریگـــەری هـــەبووەو تـــەنها لـــە هەنـــدێك چوارچـــێوەی هەرێمیـــدا هەنـــدێك کاریگەری هەبووە.

کورتە مێژووی "جاڕنامەی گەردوونی"چەند ئـەنجامێکی لێوەردەگیرێـت. لەلایـەك هـەوڵی ئـەو کەسـانە کـە بەشـدارییان لـەو کـارەدا کـردووە نمونەیـــەکی ئاوارتەیـــە لـــە هاوکـــاریکردنی نێونەتـەوەیی، ئـەو کەسـانە جگـە لـە جیاوازییـە کولتـــووری و کەســـییەکانیان پرۆســـەی کـــاری هاوبەشـی نوسـین، پێداچـوونەوەو سـەرلەنوێ نوســـینەوەی هـــەموو ڕەشنوســـەکانیان لەئەستۆگرتووە، بۆ ئەوەش و بۆ هاوئاهەنگی لە نێـــوان ڕوانگـــە جیاوازەکانـــدا، زمانیـــان زاخـــاوکردووەو(پێناســـەی هاوبەشـــیان بـــۆ دەسـتەواژە جۆراوجۆرەکـانی نێـو زمانـەکانیان کـردووە تـاکو باشتر لەیەکدی تێبگـەن) و لـەژێر ڕۆشـــنایی ڕوانینـــە جیاوازەکانیانـــدا کـــاری هەڵـــسەنگاندنیان بـــۆ چـــەمکە جۆراوجـــۆرو کـەلتورە تایبەتـەکانی خۆیـان کـردووە. تێکـڕای ئـــەو کەســـانەی نوســـەری"جاڕنامـــە"بـــوون هەریەکـەیان خـاوەنی کەسـایەتیەکی هەڵکـەوتوو بـــووە، بـــەڵام ئـــەلنۆر ڕۆزفێڵـــت لـــە هـــەموو ڕووەکانـــەوە لـــە هـــەموان بەرچـــاوتر بـــووە. لەراسـتیدا کـەمتر لـە هـەموو کەسـەکانی دیکـە چاوەڕوانییان لێی بووە، چونکە نە فەیلەسـوف بووە نە مافناس، سەرباری هەموو ئەوانە بۆ ئەو کارە دوو تایبەتمەندی گرنگی هەبوو کە لە هـیچ کەسـێکی دیکـەدا نـەدەبینراو لەوانەیـە زۆر بـۆ سـەرکەوتنی کارەکـانی "جاڕنامـە" پێویـست بووبێـت: پێگـەی بـەرزی نێونەتـەوەیی لـەنێو کـۆڕو کۆمەڵـە سیاسـیەکان و هـەروەها پێگـەی بـەرزی لـەنێو کۆمەڵـە مرۆدۆسـتەکاندا دەبـووە هـــۆی بەخـــشینی متمانـــە بـــە کارەکـــانی (کۆمیـسیون)، توانـایی و هونـەری گونجانـدن و ئاشـتکردنەوەی "کۆمیسیونی مافـەکانی مـرۆڤ" لەگـەڵ کـارو کردەکـانی دەوڵەتەکـەی خۆیـدا، بێگومـان بـەبێ ئـەو پێگـەو تواناییـە نوسـین و پەسەندکردنی "جاڕنامە"، یان دوادەکەوت، یان ئەستەم دەبوو.

ئێستا متمانەی یاسایی "جاڕنامە" بەردەوام ڕوو لە زیادبوونە، پێشێلکردنە جۆراوجۆرەکانی مـافی مـرۆڤ لـە لایـەن دەوڵەتەکانـەوە – کـە هـەر ڕۆژە ئـــامرازی ئـــاڵۆزتر بـــۆ چـــاودێریکردنی تاکـــــەکان و ئەشـــــکەنجەکردنیان بـــــەکار دەهێـــنن– تـــوڕەیی و بێـــزاری ئـــەو کەســـانە دەوروژێنێـت کـە هـاوڕان لەگـەڵ ڕوانگـەکانی ئەلنۆر ڕۆزفێڵت و هەموو نوسـەرانی "جاڕنامـەی گـەردوونی" سـەبارەت بـە جیهـانێکی ئـازادترو یەکگرتووتر.

بێگومـان ئـەلنۆر ڕۆزفێڵـت ڕچەشـکێن بووەو نیـشانی داوە کـە "جاڕنامـە" چـۆن دەتوانێـت زۆرترین کاریگەری دروستبکات، چونکە یـەکێك لـــە خووەکـــانی ڕۆزفێڵـــت ئـــەوە بـــوو کاتێـــك بەشداریی لە کۆڕو کۆمەڵەکاندا دەکرد دەیگوت: دەبێـــت بـــە گـــشتی و لـــە لایـــەن هەموانـــەوە

وردبوونەوەو بەداوادا چوون بۆ مافەکانی مرۆڤ بکرێت و لەهەر گوند، شارو شوێنێکی ئەم گەردوونەدا دەستپێبکرێت، چونکە تەنها لەژێر رۆشنایی هەوڵی یەك بەیەکی تاکەکانەدایە کە لە ئەنجامدا مافەکانی مرۆڤ بەتەواوەتی دەپارێزرێن.

## چۆن دەکرێت مافە نوسراوەکانی ناو "جارنامە" گەرەنتی بکرێت؟

لە راستیدا "کۆمیتەی نوسین" ئەرکەکەی ئەوە بوو کە جارنامەی گەردوونیی مافەکانی مرۆڤ بنوسێت، بەڵام هەر وەك رێنیە کاسین دەڵێت: دەبێت توانای و هەلومەرجی کردارییانەی رەچاوکردنی ئەو مافانە لەژێر چاودێریی کۆمەڵگای نەتەوە یەکگرتووەکاندا بەسەر دەسەڵاتە کۆن و تۆقێنەرو کوشندەکاندا مەیسەر بکات.

ئەو بابەتە لەیەکەمین دانیشتنی "کۆمیتەی نوسینی جارنامەی گەردوونی "دا خرایەڕوو.

لێرەدا کورتەیەك لە گرنگترین خاڵە پێشکەشکراوەکانی ئەو باسانەتان بۆ دەنوسینەوە.

"جارنامەی مافەکان و ئازادییە بنچینەییەکان" خۆی لە خۆیدا بایەخێکی ئەخلاقیی بەرچاوی هەیە، بەڵام لە کاتێکدا کاریگەر دەبێت و جێی پەنجەی خۆی بەجێدەهێڵێت کە:

– لە پەیماننامەیەکداو بە فەرمی وەك یاسای نێونەتەوەیی قبوڵ بکرێت و بنوسرێتەوە.

– واژۆکارانی ئەو پەیماننامەیە ئەوە قبوڵ بکەن کە ئەو مافانە لە دادگاکانی وڵاتەکەیاندا پێویستە و دەبێت جێبەجێ بکرێت.

– لە نێو ئەو هۆکارانەدا کە لەوانەیە رێگربن لە هەر جۆرە پێشێلکردنی ئەو پەیماننامەیە، جۆرێك چاودێریی گشتی و نێونەتەوەیی دەستبەر بکرێت کە لەگەڵ ئەو پێکهاتانەی خوارەوەدا کامڵ بکرێت: ناردنی سکاڵا بۆ "نەتەوە یەکگرتووەکان"، پێکهێنانی دەزگایەك بۆ بەدواداچوونی سکاڵا پەیوەندیدارەکانی ئەو پێشێلکاریانەو باسکردنی لە "ئەنجومەنی گشتی"دا.

– دادگای نێونەتەوەیی مافەکانی مرۆڤ پێکبهێنرێت.

– رێگا بەوە بدرێت، تێکڕای ئەو دەوڵەتانەی کە پێداگری لەسەر ئەو پێشێلکاریانە دەکەن لە "نەتەوە یەکگرتووەکان" دەربکرێن.

### پەراوێزەکان:

1. یاداشتەکانی هومفری بۆ لوژییە لە28ی ئوتی 1946 دا

*(boit 52, dossiers oscar schecter, archives ONU, NY)*

چەند راڤەیەکی دیکەی هومفری سەبارەت بە بابەتی سکاڵاکان و هەندێك بابەتی دیکەی گشتی لەسەر متمانە بەخشین بە یاسای نەتەوە یەکگرتووەکان دەربارەی مافەکانی مرۆڤ لە یاداشتێکی دیکەدا بۆ هانری لۆژییە لە 2 ئۆکتۆبەری 1946 دا بەرچاو دەکەون و تیایدا دەربارەی راڤەی یاسایی (ولینگتۆن کۆ)و لەسەر کۆمیسیۆنی مافەکانی مرۆڤ قسەکراوە:

*(Dossier 605-1, Central Registry file, RAG- 1/73)*

2. نامەی (جیمز– پ – هیندریك) بۆ ئەلنۆر رۆزڤێلت لە 20ی نۆڤەمبەری 1947.

*(Dossir "Geneva and Human Rights", Boit 4578, Eleanor Roosevelt Papers).*

3. یاداشتی (ئالیس م.مەك دایارمید) بۆ ئەلنۆر رۆزڤێڵت 21ی نۆڤەمبەری 1947. *(Dossir "Geneva and Human Rights", Boit 4578, Eleanor Roosevelt Papers).*

4. لەوانەیە خوێنەران ئەوەیان لەیاد بێت کە لە کۆنفرانسی سان فرانسیسکۆیشدا بابەتێکی هاوشێوە لەسەر ئەو دەستەواژانەی کە دەبێت لە " بڵاوکراوە" کەدا باسبکرێن و لەبابەتی پەیوەندیدار بە مافەکانی مرۆڤەوە بەکاردەبرێن بخرێنەڕوو، رێگا چارەکەیشیان هاوشێوەی یەکدی بوو.

5. ***H. Lauterpacht, "The Universal Declaration of Human Rights", op. cit.(37) P. 372.***

6 **. *Document des Nations Unies; UN doc E/CN. 4/53, 10 decembre 1947, Commission on Human Rights, second (Commission des droits de ihomme, 2e session), Draft Report to the working group on Implementation(projet de rappor du rotpe de travail sur les measures d,application), P.[2] (boite 4595, Eleanor Roosevelt Papers).***

7 **. *M.de Leon (Panama), Third Committee, Summary Records (Comptes rendus du Troiseieme Comite), p. 43.***

8.***M. Hernan Sanat Crux (Chili), Third Committee, Summary Records, p.50.***

9. ***General Assembly, Summary Records (Comptes rendus de l,Assemblee generale), p. 880.***

10. ***Rene Cassin, Third Committee, Summary Record, p. 62.***

11. ***General Assembly, Summary Records (Comptes rendus de l,Assemblee generale), p. 866.***

12. ***Document des Nations Unies: UN Doc E/CN. 4/82/Add. 4, Comments From Governments ( Commentaires des governments).***

13. ***Third Committee, Summary Records (Comptes rendus du Troisieme Comite), p. 39.***

14. ***M. Andrews (Union sud-africaine), General Assembly, Summary Records (Comptes rendus de l,Assemblee generale), General Assemblee generale), p. 910.***

15. ***John Humphrey, op. cit (19), pp.73-74.***

هەروەها سەیری،

***John Humphrey, ch. VII, "No Didtan Millennium: The International Low of Human Rights", Paris, Unesco, 1989.***

16. سەیری ***John Humphrey, op. cit.(16) pp. 75-76*** جیمز ف. گرین بکەو لەهەمان بابەتدا و لە پەراوێزی ژمارە 7 لاپەڕەی 35–36 چەندەها نمونەی جۆراوجۆری لە دەقە گرنگە نەتەوەی، یان نێونەتەوەیەکان خستووەتەڕوو کە هەڵیننجاندنەکانیان پشتی بە " جاڕنامەی گەردوونی" بەستووە.

***17. John Humphrey, op. cit.***

***18. Ibid***

**سەرچاوە:**

ئەم بابەتە بەشی چوارەمە لە کتێبی (جاڕنامەی گەردوونی و کورتە مێژوویەکی)، گلێن جۆنسۆن نوسیویەتی و محەمەد جەعفەر پویەندە کردوویەتی بەفارسی.

2008 / 4/ 21

# شتێك نییە بەناوی شەڕی دژە تیرۆر

چاوپێکەوتن لەگەڵ نۆم چۆمسکی

لە ئینگلیزیەوە: عەزیز ڕەئووف

نۆم چۆمسکی یەکێکە لە هەرە ڕۆشنبیرە ڕەخنەگرە دیارەکانی سیاسەتی ئەمریکا کە بۆ ماوەی چل ساڵە بەردەوامە. ئەمڕۆ لەگەڵ ئەوەی دوایین ئەدڤێنچەری ئیمپراتۆری. ئەمریکا دەست پێدەکات کە هەڵگری کێشەیە لە هەردوو بواری سیاسی و سەربازییەوە، چۆمسکی تەمەن 77ساڵ لە تەفسیر و ڕەخنەکانی خۆی لە سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکا بە پێویست دەزانێت. سەبارەت بە گفتوگۆ لەگەڵ چۆمسکی دا بە تەلەفۆن قسەم لەگەڵ کرد کاتێك ئەو سەرگەرمی کارکردن بوو لە ئۆفیسەکەی خۆی لە کامبریج.



-ئایا جۆرج بۆش لەبەردەم کێشەی سیاسیدایە؟ گەر وایە بۆچی؟

چۆمسکی: جۆرج بوش دەکەوێتە هەڵەیەکی سیاسی گەورەوە ئەگەر پارتی سیاسی ئۆپۆزسیۆن لەو وڵاتەدا بکەونە ململانێوە. تەنانەت لە هەرڕۆژێکدا بێت تۆپەکە لە گۆڕەپانەکەدا دەکەوێتە پێی ئۆپۆزسیۆنەکان. سەرنجراکێشترین ڕاستی سەبارەت بە ئێستای سیاسەتەکانی ئەمریکا ئەوەیە کە دیموکراتەکان لەم سیاسەتە هیچیان وەدەست نەهێنا. نەك تەنها وەدەستهێنان بەڵکو پشتیوانی کۆماریەکانیشیان دۆڕاند. ئێستا، دوبارە هەر پارتێکی ئۆپۆزسیۆن لەئارادا نیە، بەڵام دیموکراتەکان لە سیاسەتی کۆماریەکانەوە زۆر نزیکن، نزیکیەکەشیان ئەوەیە ئەوانیش ناتوانن هیچ بکەن. کاتێك ئەوان هەوڵدەدەن

لەبارەی عیراقەوە شتێك بڵێن، جۆرج بۆش دەگەڕێتەوە بۆلایان، یان كارڵ ڕۆڤ دەگەڕێتەوە بۆلایان و پێیان دەڵێت: "چۆن ئێوە ڕەخنە لەم سیاسەتە دەگرن؟ هەموتان دەنگتان پێداوە". بەڵێ، ئەوان زۆر ڕاست دەكەن.

**-دیموكراتەكان چۆن دەتوانن لەم خاڵەدا خۆیان جیاواز پیشان بدەن، لەكاتێكدا خۆیان لەم گێژاوەدا دەبیننەوە؟**

چۆمسكی: دیموكراتەكان دەنگەكانیان خوێندۆتەوە و بە ڕاستیەكە دەزانن زیاد لەوەی من بۆی دەچم، تەنانەت سەركردەكانیانیش بەو ڕاستیە دەزانن. ئەوان دەزانن كە ڕەئی گشتی ***public opinion*** چییە. ئەوان دەیانتوانی ئەو پێگەیە بە پاڵپشتی ڕەئی گشتی بۆخۆیان داگیر بكەن لەجیاتی ئەوەی دژایەتی بكەن. بۆیە ئەوان دەیانتوانی ببن بە پارتێكی ئۆپۆزسیۆن، تەنانەت وەك پارتێكی زۆرینە. بەڵام ئەوان لە هەموو بوارێكەوە شوێن و پایەیان گۆڕی و بوە هۆی دۆڕاندنیان.

سەیركە، نمونە بهێنەرەوە، بۆ نمونە با باس لە چاودێری تەندروستی بكەین. مەسەلەكە ڕەنگە پەیوەندی بە كێشەیەكی گەورەی ناوەكییەوە هەبێت بۆ خەڵك. ڕێژەیەكی گەورە لە زۆرینەی دانیشتوان لە چەندین ڕووەوە لایەنگری سیستەمی چاودێری تەندروستی نەتەوەیی دەدەن. ئەوە ماوەیەكی زۆر بەشێك بوو لە ڕاستی. بەڵام هەركاتێك لە ڕاگەیاندنەكانەوە باس دەكرایەوە، بە شێوەیەكی بەربلاو لەڕووی سیاسیەوە هەست دەكەین كە شتێكی تەواو نەگونجاوە، یاخود"لەدەستدانی پشتیوانی سیاسی"یە، كە ڕێگایەكە بۆ دەربڕینێك كە كار لەسەر متمانەی پیشەسازی و كۆمپانیای دەرمانسازی ناكات، هەروەها شتی تری لەو بارەیەوە. ئۆكەی، زۆرینەی دانیشتوان ئەمەیان دەوێت، بەڵام كێ گرنگی بەوان دەدات؟ بەڵێ، دیموكراتەكان ئیستا ئەمەیان دەوێت. كلنتۆنیش ڕوبەڕووی هەمان پرۆژەی نامـاقوڵ بۆوە، كە زۆر لەوە ئاڵۆزتربوو كە تۆ بتوانی هەژماری بكەیت، ئەوەبوو شكستی هێنا.

جۆن كێری لە دواین هەڵبژاردندا، لە دواین مشتومڕ و دیبەیتی هەڵبژاردنەكەدا لە *28ی* ئۆكتۆبەر، تەواو هەست بە ئەوە دەكرا كە ئەو دیبەیتانە پەیوەندی بە دۆزی ناوخۆوە هەبوو. نیویۆرك تایمز ڕاپۆرتێكی باشی لە ڕۆژی دواتردا بڵاوكردەوە. جۆن كێری هیچی سەبارەت بە بەشداری حكومەت سەبارەت بە سیستەمی تەندروست بەرهەم نەهێنا، چونكە "نەبوونی پشتیوانی سیاسی "لەئارادابوو. ئەوە ڕێگەی دەربڕینی ئەو ڕاستییە بوو كە تێگەیشتنی جۆن كێری دەردەبڕی سەبارەت بە پشتیوانی سیاسی كە بەمانای پشتیوانی تەندروستی و دەسەڵات دەهات. باشە، نەدەزاندرا دیموكراتەكان چی دەكەن و چییان دەوێت. تۆ دەتوانی وێنەی ئەوە بخوڵقێنیت كە پارتێكی ئۆپۆزسیۆن لەسەر بنەمای بەرژەوەندی و پەیوەستبوونی جەماوەر كار بكات.

**بەخشینی نەبوونی جیاوازییە ڕاستەقینەكان لە سیاسەتە دەرەكیەكانی دوو پارتەكە.....**

چۆمسكی: یاخود ناوخۆیی....

بەڵێ، یان ناوخۆیی. بەڵام من ئەمە لە مەسەلەی سیاسەتی دەرەوەدا دەوروژێنم. ئایا ئێمە لە بەڕێوەبردنی دۆخێكی نەگۆڕی شەڕداین؟

چۆمسکی: من لەو بڕوایەدا نیم. لەڕاستیدا کەس شەڕی ناوێت. چیمان لە سەرکەوتن دەوێت. سەیری ناوەندی ئەمریکا بکە. لە سالآنی *1980*کاندا، ناوەندی ئەمریکا لە دەرەوەی کۆنترۆڵدا خۆی دەبینیەوە. ئەمریکا شەڕی توندوتیژ و تیرۆرستانەی لە نیکاراگوا کرد، کە ئەمەش بوە هۆی پشتیوانی خوێنڕێژی دۆخێکی تیرۆرستی لە ئیل سالڤادۆر و گواتیمالا و هۆندۆراس، بەلآم ئەوە تەواو دۆخی جەنگ بوو. ئـیٚ، تیرۆرستەکان سەرکەوتن. ئیستا کەم و زۆر ئاشتی لەئارادایە. لەبەرئەوە تۆ چیتر ناتوانی تەنانەت بخوێنیتەوە لەبارەی ناوەندی ئەمریکاوە چونکە ئاشتی لەئارادایە. مەبەستم ئەوەیە، ئازار و خەمباری و شتیتر لەئارادایە بەلآم هێندە هەیە دۆخێك هەیە بۆ ئاشتی. لەبەرئەوە ئەوە دۆخێك نییە بۆ شەڕ. وە هەمانشت بۆ هەموو شوێنێك. گەر تۆ توانیت خەڵك لە کۆنترۆڵدا بهێڵیتەوە، ئەوە بەمانای دۆخی شەڕ نایات.

سەیری ڕوسیا و ڕۆژهەلآتی ئەوروپا بکە. ڕوسیا نیو سەدە ڕۆژهەلآتی ئەوروپای بەڕێوە دەبرد. ئەمەش بە کەمترین هاتنەناوەوەی سەربازی ئەنجام درا. بۆ مێژوو ئەوان ڕۆژهەلآتی بەرلین و هەنگاریا و چیکسلۆڤاکیایان داگیر کرد، بەلآم لە زۆر ڕووەوە ئاشتی لەئارادابوو. ئەوان وایان بیر دەکردەوە کە هەموو شتێك بە باشەدا تێپەڕێنن - بەڕێوەبردن بە هێزە ئاسایشە لۆکاڵییەکان، کارەکتەرە سیاسییە لۆکاڵییەکان، ئەوە کێشەیەکی هێندە گەورە نەبوو. ئەوە دۆخێکی هەمیشەیی نەبوو بۆ شەڕ.

**لە شەڕی دژ بە تیرۆردا، هەرچۆنێك بێت، چۆن پێناسەی سەرکەوتنێك دەکەیت دژ بە تاکتیك؟ تۆ دەتوانیت لەکاتێکدا لەو بارەیەوە شتێك دەستبخەیت؟**

چۆمسکی: ئەوە شێوازێکی پێوانەیی لەخۆ دەگرێت. بۆنمونە، تۆ دەتوانی پێوانەی ژمارەی چالاکی و لێدانی تیرۆرستەکان بکەیت. باشە، ئەمەش بەشێوەیەکی توند لەسایەی ئیدارەکەی سەرۆك بۆش و، زۆر بەتوندیش لە دوای شەڕی عیراقەوە دەرکەوت. وەك ئەوەی چاوەڕیٚ کرا، پێشبینی ئەوە کرا کە لەلایەن دەزگای سیخوڕیەکانی ئەمریکاوە شەڕی عیراق دەبێتە هۆی فراوانبوونی چانسی تیرۆر لەو ولآتەدا. وە هەڵسەنگاندنی دۆخی دوای داگیرکاری لەلایەن *CIA*و دەزگای زانیاری ئەنجومەنی نیشتمانیەوە بەجۆرێك بوو کە دەزگاگەلێکی تری سیخوڕی لەو بارەیەوە بێنە ئاراوە. بەڵیٚ، ئەوە تیرۆری زیادکرد. لەڕاستیدا هەرچەندە ئەوە دۆخێکی وای خوڵقاند کە هەرگیز پێشتر نەبینراوە بەلآم زەمینەیەکی نوێی مەشقی بۆ تیرۆرستان هێنایە ئاراوە، کە لە ئەفغانستان تەواو دیاردەیەکی ئاڵۆزە، کە لەویٚ تیرۆرستان بەشێوەیەکی پرۆفیشناڵ مەشقیان پێدەکرا بۆ ئەوەی بگەڕێنەوە بۆ ولآتەکانی خۆیان و چالاکی ئەنجام بدەن. لەبەرئەوە، بەڵیٚ، ئەوە ڕێگەیەك بوو بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ شەڕی دژە تیرۆر، واتە زیادبوونی تیرۆر وە بەشێوەیەکی پێوانەیی سانا، ژمارەی چالاکی تیرۆرستان. بەڵیٚ، ئێمە سەرکەوتوو بوین لە گەشەپێدان و زیادکردنی تیرۆر.

ڕاستیەکە ئەوەیە کە ئەوە شەڕ نییە دژ بە تیرۆر. ئەوە دڵڕاگرتنێکی زۆر بچوکە بۆ خەڵك. لەبەر ئەوە داگیرکردنی عیراق و کۆنترۆڵکردنی وزە و سەرچاوە نەوتیەکانی جیهان زۆر گرنگترە لە هەڕەشەی تیرۆر. بۆ بیانوەکانی تریش هەر

هەمان شت لەئارادایە. سەیرکە، دەڵێن لەناوبردنی وزەی ئەتۆم. سیستەمە سیخوڕیەکانی ئەمریکا وا دەخەمڵێنن کە لێکچون هەیە، "بۆمبی ناشرین"، بۆمبی ناشرینی ئەتۆم لە وڵاتەیەکگرتوەکانی ئەمریکا لە دەساڵی ئایندەدا، کە بەڕێژەی لە سەدا پەنجایە. بەڵێ، ئەوە ئاستێکی زۆر بەرزە. ئایا ئەوان هیچ شتێك لەو بارەیەوە ئەنجام دەدەن؟ بەڵێ، ئەوان توانیان هەڕەشەکە زیاد بکەن، بەهۆی گەشەکردنی وزەی ئەتۆمەوە، بەهۆی ناچارکردنی دوژمنە شاراوەکانەوە، کە پێوەرێکی زۆر خەتەرناکیان دروستکردووە بۆ ئەوەی بتوانن گەشەکردنێکی پێچەوانە هەڕەشەکانیان ئاراستەی ئەمریکا بکەن.

ئەوە دیاردەگەلێکە کە پێویستی بە مشتومڕی زیاتر هەیە. تۆ دەتوانی ئەوە لە لێکۆڵینەوەی ستراتیژی ئەدەبیدا بدۆزیتەوە. سەیرکە، بڵێ دوبارە داگیرکردنەوەی عیراق. ئێمە وتمان ئەوان هەرگیز چەکی کۆمەڵکوژیان نەدۆزیەوە. باشە، ئەمە بەتەواوی ڕاست نیە. ئەوان چەکی کۆمەڵکوژیان دۆزیەوە، واتە ئەوان ئەو چەکانەیان دۆزیەوە کە ئەمریکا و بەریتانیاو چەندین وڵاتی تر لە ساڵانی *1980*کاندا ناردبویان بۆ سەدام حسێن. زۆرێك لەو چەکانە لەوێ ماون. لەوێ لەژێر کۆنترۆڵی پشکێنەرانی نەتەوە یەکگرتوەکاندان وەك بونێك بۆ چەکداماڵین. بەڵام زۆرێك لەو چەکانە تا ئێستا لەوێ ماون. کاتێك ئەمریکا عیراقی داگیرکرد، شکێنەران دەرکران و ڕامسفێڵد و چێنی بە سوپای هاوپەیمانانیان نەوت کە شوێنی ئەو چەکە کۆکوژیانە لەکوێیە. ئەو شوێنانە بێ پاسەوان جێهێشتران و تەنانەت بەشێوەیەکی سیستەماتیکی شتومەکەکانی تالان کران. پشکێنەرانی نەتەوە یەکگرتوەکان لەڕێی سەتەلایتەوە بەردەوامبوون لەسەر کارەکانیان و باسیان لە زیاتر لە *100*شوێن کرد کە تالان کراون، نەك وەك کەسێك هاتبێت و دزیبێتی، بەڵکو بەشێوەیەکی بەرنامەبۆداڕێژراو تالان کراون.

**لەلایەن خەڵکانێکەوە کە زانیویانە چیدەکەن.**

چۆمسکی: بەڵێ، خەڵکانێك کە زانیویانە چی دەکەن. ئەوە بەو مانایەبوو کە ئەوان شتێکی زۆر گرنگیان برد کە دەتوانرا بۆ چەکە ئەتۆمیەکان و موشەکەکان و هەموو جۆرە مادەیەك سودی لێ ببینرێت. کەس نەیزانی ئەوانە بۆکوێ بران، بەڵام تۆ دەزانی، تۆ حەز ناکەی تەنانەت لەو بارەیەشەوە تێفکرێی. باشە، ئەوە بەشێوەیەکی فراوان دەستی هەبوو لە زیادکردنی دیاردەی تیرۆردا. ڕوسیا بەشێوەیەکی تووند توانا سەربازیەکانی خستەگەڕ لە بەرپەرچدانەوەی پرۆگرامەکانی بۆش، کە زۆر ترسناکە، بەڵام ئەوە هەوڵێکە بۆ بەرپەرچدانەوەی زاڵبوونی هێزی ئەمریکا لە توانای داگیرکاریدا. ئەمەش ناچارکردنێك بوو بۆ گەڕاندنەوەی موشەکە ئەتۆمیەکان بۆ هەرێمە گەورەکەیان وە بەشی زۆری بێ پاسەوان مانەوە. وە *CIA*بەتەواوی ئاگادارە کە یاخیبوانی چیچان دەستیان گرت بەسەر هێڵی شەمەندەفەری ڕوسیا و مەکینە و دامەزراوەکاندا، کە لەڕاستیدا پلانێك بوو بۆ دزینی موشەکە ئەتۆمیەکان. بەڵێ، ئەوە کارەساتێك بوو. بەڵام ئەوان ئەو هەڕەشەیە پەرە پێدەدەن... لەبەرئەوەی ئەوان زۆرگرنگی بەو مەسەلەیە نادەن.

هەمان شت مشتومڕێکی جیهانی لەخۆ

دەگرێت .ئەوان گەمژە نین. ئەوان دەزانن کە پەرەیان بەو هەرەشانە داوە و لەڕاستیدا فۆرمێکی تەواو کارەساتئامێزی وەرگرتووە. بەڵام ئەوە نەوەیەك و دوو نەوەیە. كێ گرنگی پێدەدات؟ لێرەدا بەشێوەیەکی بنەڕەتی بە دوو پرەنسیپ دەتوانین پێناسەی سیاسەتەکانی ئیدارەی سەرۆك بۆش بکەین: پڕکردنی گیرفانەکانی هاوڕێ دەوڵەمەندەکانت بە دۆلار، زیادبوونی کۆنترۆڵت بەسەر جیهاندا. هەموو شتێك دواکەوتەی ئەمەیە. ڕامسفێلد گوتەنی، گەر وا ڕوویدا جیهان تەقیەوە، تۆ دەزانی ئەوە کەسێکی ترە لە پیشەدا، کەرەستەی خاو لەئارادایە.

**تۆ لەبارەی شەڕەکانی ئەمریکاوە قسەت هەبوو بەتایبەت لە دوژمنکاری دەرەکی ئەمریکا لە شەڕی ڤێتنام و ئیستاش لە شەڕی عیراقدا. تۆ لەوبڕوایەدای چانسێك هەبێت لە ئەنجامەکەیدا، ئایا ئەوە نوشست نەبوو، یاخود ئەوە چانسگەلێکی بنەڕەتی بوو بۆ سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکا؟ وە ئەگەر وایە، چی لەو بارەیەوە توانرا وەدەست بێت؟**

چۆمسکی: بەڵێ، چەندین گۆڕانی گەورە لەئارادایە. بەراوردی شەڕی عیراق لەگەڵ 40 ساڵ لەمەوبەردا بکە، مەبەستم لە شەڕی ڤێتنامە. بەبڕوای من شەڕی عیراق یەکەمین شەڕە لە مێژووی ئیمپریالیزمی ئەوروپادا، سەبارەت بە ئەمریکا، چەندین نارەزایی و پرۆتیستۆی گشتی هەبوو پێش ڕاگەیاندن و دەستپێکردنی شەڕەکە. لە ڤێتنام چوار تا پێنج ساڵ دوای شەڕەکە پرۆتیستۆ و نارەزایی دەبینرا. پرۆتیستۆ و نارەزاییەکان هێندە بچوك بوون کە کەس بیری نەدەهاتەوە یاخود نەیدەزانی جۆرج کەنەدی هێرشی کردۆتە سەر باشوری ڤێتنام لە ساڵی 1962. بەڕاستی لێدان لە ڤێتنام زۆر توندوتیژ و کاریگەربوو. بەڵام چەندین ساڵ دوای لێدانەکە دەرئەنجام پرۆتیستۆ گەشەی کرد و نارەزایی دەبینرا.

**ئەی لەبارەی عیراقەوە پێویستە چی ئەنجام بدرێت، ئێوە چ بۆچونێکتان هەیە؟**

چۆمسکی: باشە، یەکەمین شت پێویستە بکرێت لە عیراقدا بەنسبەت ئێمە ئەوەیە کە کاریگەری چی لەئارادایە سەبارەت بە بەردەوامی بارودۆخەکە. هیچ مشتومڕێکی کاریگەر لەگۆڕێ نییە، بمبورە کە من ئەوە دەڵێم، سەرجەم باسوخواسەکان لە دەوری ئەڵقەی ئەو پرسیارەوە دەسوڕێتەوە ئەویش چەمکی هاتنەدەرەوەیە"مەبەست لە هاتنە دەرەوەی ئەمریکایە لە عیراق. و". مەسەلەکە پەیوەندی بەوەوە هەیە کە ئێمە لەبەر ڕێبازی توندو پڕ لە زەبرو زەنگی خۆرئاوادان، کوێرباوەڕێکی ئاینی کە دەڵێت پێویستە ئێمە بڕوامان بەوە هەبێت ئەمریکا عیراق داگیر بکات تەنانەت ئەگەر بەرهەمی سەرەکی کاهو و خەیاری ترشیات، یاخود سەرچاوە نەوتیەکان لەجیهاندا کەوتونەتە ناوەڕاستی ئەفریقاوە، کە بەڕاستی گاڵتەجاڕیە .هەرکەسێك بڕوای بە ئیدانەکردن هەبێت وەك پلانێکی تیۆریست کارڵ مارکس، یاخود بە پیاوێکی شێت لەقەڵەم دەدرێت، یان هەر شتێکی لەوبارەیەوە. ئەمریکا عیراقی داگیرکرد تەنها لەبەر سەرچاوە ئابووریەکانی نەوت، ئەوە ئەو ڕاستیەیە کە دڵی وزەی سەرچاوە نەوتیەکان دەکەوێتە ئەو هەرێمە. ئەمەش بەو مانایەیە ئەگەر ئەمریکا کۆنترۆڵی عیراق بکات دەبێتە هۆی فراوانبوونی دەسەڵاتی ستراتیژی ئەو وڵاتە، وەك زیگنیو برزێزنکی پێی وایە گەورەترین کاریگەری

لەســەر ئــەوروپاو ئاســیا هەیــە. بــەڵێ ئــەوە گــەورەترین هۆکــاری کــۆنترۆڵکردنی سەرچــاوە نەوتیــەکان -ئــەوە هێزێکــی تــەواو ســتراتیژیە. تەنانــەت ئەگــەر تــۆ بتــەوێت سەرچاوەکانی وزە نــوێ بکەیتــەوە پێویــستە ئــەم پرۆســەیە بگریتــە بــەر کــە ئــەمریکا گرتویەتیــە بــەر. لەبەرئــەوە ئەمەیــە هۆکـــاری داگیرکردنـــی عـــیراق، کـــە هۆکارێکی تەواو بنچینەییە.

با ئێستا باس لە پاشەکشە بکەین، ڕۆژانــە سەیری زۆرێك لە ڕۆژنامە و ڕۆژنامەنوسان بکە. ئــەوان بــەوە دەســتپێدەکەن کــە دەڵــێن ئــەمریکا ئارەزووی ئەوە دەکات کە عیراقێکی ســەربەخۆو دیمــوکراس و خــاوەن ســیادە جێبهێڵێــت. مــن مەبەستم ئەوەیە ئایا ئەوە گریمانەیــەکی کەمــە؟ تــەنها بڕوانــە کــە چــۆن سیاســەتەکان وا لێکــچون دروستدەکەن سەبارەت بە عیراقێکی سەربەخۆی خاوەن سیادە .گەر ئەوە کەم تا زۆر دیموکراسی بێــت، ئــەوا ئاینــدە بــۆ زۆرینــەی شــیعەکانە. ئــەوانیش بەشــێوەیەکی سروشــتی دەیانــەوێ پەیوەندیــەکانیان لەگــەڵ ئێرانــدا گەشــە پێبــدەن، مەبەستم ئیرانی شیعە مەزهەبە. زۆرێك لــە پیــاوە ئاینییــەکان لــە ئیرانــەوە هاتونەتــەوە بــۆ عــیراق. سوپای بەدر کە بەشێوەیەکی بنــەڕەتی باشــوری عیراق بەڕێوە دەبەن، لە ئیران مەشقیان کــردووە. ئـــەوان عـــەقڵێکی پەیوەنـــدی ئـــابوری باشـــیان هەیـــــەو لـــــە گەشەکردنیـــــشدان. ئەمـــــەش هاوپەیمانی عیراق و ئێران ناهێڵێت. زیــاتر لــەوە لەســـەر ســـنوری عـــەرەبی ســـعودیە دانیـــشتوانی شــیعە هــەن کــە بەتــەواوی لەلایــەن ســتەمکارە ســـەلەفیەکانەوە کـــە ئـــەمریکایان لـــە پـــشتەوەیە دژایەتی دەکرێن.

**سەرچاوە:**

گۆڤاری *Times*

# گفتووگۆ لەگەڵ ئەدۆنیسی باوکمدا

سازدانی: نینار ئەسبەر

لە سویدییەوە: هیوا قادر

**نینار:** تۆ پێتوایە بۆچی خەڵکی لە وڵاتە عەرەبییەکاندا هێندە پابەندی داب و نەریتن؟ من بەشبەحاڵی خۆم پێموانییە هەموو داب و نەریتێك شایستەی ئەوە بێت پارێزگاری لێبکرێت، ئەو کەسانەشی نایانەوێت دەستبەرداری دابونەریتە کۆنەکان بن، ئەوانەن کە توانای ئەوەیان نییە کارێك بۆ دواڕۆژ بکەن. لە ئەورووپادا دابونەریتەکان بەهۆی کاریگەری شۆڕشەکانەوە کەوتونەتە پشتەوە. ئایە شۆڕشگەلێکی وا لە مێژووی عەرەبیدا هەڵگیرساوە کە خاوەنی بیرۆکەی دیموکراتی و ئەنارشییەت بووبێت؟ ئایە خەڵکی هەوڵی شۆڕشی لەو جۆرەیان داوە؟ دیارە من دەزانم ڕاپەڕینی وەك یاخیبوونی



خەڵکی دژی بەهێزی داگیرکەران یاخود دژ بە سەرباز و کۆلۆنیالیستەکان ڕوویانداوە. بەڵام ئایا شۆڕشێکی لەو چەشنە لەناو کەسایەتی مرۆڤی عەرەبی و بونیاتی مێژوویاندا ڕوویداوە؟

**ئەدۆنیس:** دیارە لە ناو مێژووی عەرەبیدا زۆر شۆڕش ڕوویانداوە، تاکو ئێستاش ڕوو لە ڕوودانن. بێگومان بەشێك لەو یاخیبوونە بچوکانە یاخود ئەو ڕاپەڕینانە ئامانجێکیان هەبووە، بەڵام دواتر ئیسلام ئەو تەفسیرە جیاوازانەی بۆ کردوون کە خۆی ویستویێتی. سەرباری ئەوەی هەموو بیریارە عەرەبەکان هەر لە "ئەبو نەواس"ەوە تا "موعەری"، هەروەها هەر هەموو شاعیرە

گەورەكان و فەیلەسوفەكان دژ بە دیین بوون. هیچ بیرۆكەیەكی گرنگیش لە دیینەوە وەك بڵاوبونەوەی بۆنێك لە گوڵێكەوە ڕاستەوخۆ سەریهەڵنەداوە. بەڵام بە دیویكی تردا بیریاران و شاعیران چەندان گوڵیان خەڵقكردووە كە بۆن و بەرامەی جیاوازی هەبووە و باشتریش لە دین بڵاوبۆتەوە. هەر هۆی ئەمەشە هیچ مانایەكی بەهێز لە ئەدەبیاتی دینیدا نادۆزیتەوە كە ئیسلام توانیبێتی خۆی باس لە دیین بكات. تەنانەت یەك فەلسەفەی ئیسلامیش نییە، بەڵكە تەنها تیۆلۆگی "خوداناسی" و شەریعەت هەیە كە ئەوانیش یاسان. ئەو تیۆلۆگی و شەریعەتەی قورعان ڕووندەكاتەوەو لە دەرەوەی ئەو سیستەمی خوێندنەوانەشەوە ڕێباز و یاساكان جێگیر بوون. بەڵام ئەدەب و شیعر هەمیشە دژ بە دیین بوون. هەر شاعیرە و خۆی بە پێغەمبەرێك زانیوە، چونكە ئەوان پێیان وابووە شیعرەكانیان باشترینە و دژ بە دیین بەكاریانهێناوە. بەڵام هەموو ئەم ئەدەبیاتەی دژ بە دین بووە بێگومان دواتر پەراوێزخراوە، لەبەرئەوەی دژی دین و ئەو ئەخلاقیاتە دینی و نەریتگەرایانە بوون كە لە ئارادا بوون.

**نینار:** باشە ئەی بۆچی تا ئێستا شۆڕشێكی ڕاستەقینە ڕووینەداوە؟

**ئەدۆنیس:** زۆر بزوتنەوەی پێشكەوتووخواز هەبوون، داوای سێكولاریزەكردنیان كردووە.

**نینار:** كەی؟

**ئەدۆنیس:** لە مێژووی تازەماندا. زۆر لە پارت و خەڵكانی ڕۆشنبیر لە وڵاتانی عەرەبیدا ئەم جۆرە داوایانەیان كردووە، بەڵام هەموویان ئەو شەڕانەیان دۆڕاندووە. ئەوان زۆر ئاسان لەبەردەم ئەو تۆڕە گشتییەی كۆمەڵگادا شكستیان هێناوەو تووشی بەرپەرچدانەوە بوون، چونكە بیروبۆچوونیان جێی قبوڵكردن نەبووە.

**نینار:** باشە بۆچی؟

**ئەدۆنیس:** لەبەرئەوەی دەسەڵاتی دیین زۆر بەهێز بووە.

**نینار:** هەروەها داب و نەریتیش.

**ئەدۆنیس:** داب و نەریت و دامەزراوە ئاینییەكانیش.

**نینار:** ئەی باشە بۆچی شۆڕش لە كۆمەڵگا ئەوروپییەكاندا توانی سەركەوتن بەدەست بهێنێت؟

**ئەدۆنیس:** لەبەرئەوەی یەكێك لەو هۆیانەی لە هەموویان گرنگترە و لە پشت شكستهێنانی هەموو شۆڕشەكانەوەیە، ئەوەیە كە دینی ئیسلام تەنها دینی ئیمان و باوەڕهێنان نییە بە خودا، بەڵكە دینی ئیسلام جۆرێكیشە لە شێوازی ژیان، دیین بناغەیەكە بۆ پێكەوە نانی هاوسەرێتی و كولتور و خێزان و چەندان شتی تر.

**نینار:** وەك لە دینی مەسیحییەت و جولەكەشدا هاتووە. لە چوارچێوەی هەموو دیینە تاكخواییەكاندا ئەو بەحەرامكردنانە بە ئاشكرا دیارن، بۆ نمونە: بۆت نییە وا بكەیت، بەڵام باشە وا بكەیت. بۆت نییە بەو شێوەیە عەشق لەگەڵ ئافرەتدا بكەیت، بەڵام بۆت هەیە بەم شێوەیە بیكەیت!

**ئەدۆنیس:** ئا، دیارە كاتێك شۆڕش بە باشی دەستیكرد بە گۆڕانكاری و پیادەكردن، ئەوكات هەندێك شت پێبەپێی ئەو شۆڕشە دەگۆڕێن. لە ئەوروپادا شۆڕشی تایبەت و گەورە ڕویاندا كە لەو چەشنە لە وڵاتانی عەرەبیدا ڕوویان نەداوە. شۆڕش هەر لە خۆوە ڕوونادات، بەڵكو

پێویستی بە کەشوهەوایەکی وەها هەیە کە هەڵگری هەڵگیرسانی ئەو شۆڕشە و کۆمەککردنی بێت.

**نینار:** مەبەستت ئەوەیە ئەو کەشوهەوا کلتوری و کۆمەڵایەتییەی لەناو دنیای عەرەبی ئیسلامیدا هەیە، ناتوانێت ببێت بە پاڵپشت بۆ ئەم جۆرە شۆڕشانە، وایە؟

**ئەدۆنیس:** وایە ڕاستە. کۆمەڵگەیەک کاتێک دەتوانێت بگۆڕێت و پێشبکەوێت کە بەشێک لە رۆشنبیران هۆشیار و پێشکەوتوو سیکولار و شۆڕشگێڕبن. بۆ نموونە لە لوبناندا شۆڕشگێڕی زۆر هەن، بەڵام کۆمەڵگە تەنها بەمە ناگۆڕێت. کۆمەڵگەیەک ناتوانێت بگۆڕێت ئەگەر دەزگاکانی نەگۆڕبن، هەروەها گەر بنەمای دەسەڵات و بنەمای خێزان تێیدا نەگۆڕێت. کاتێک کە دەزگاکان دەگۆڕێن هەموو کۆمەڵگەش لەگەڵیدا دەگۆڕێت، بەڵام تەنها بیرۆکەی گۆڕان بەس نییە بۆ گۆڕینی دەزگاکان. دەبێت لە ڕاستیدا شۆڕشێک بەرپا بکرێت، دەبێت خەڵکی قبوڵی گۆڕان بکات، بە تایبەتی گۆڕانی دەزگاکان.

**نینار:** چۆن وا لە خەڵکی بکرێت قبوڵی ئەو گۆڕانکاریانە بکەن؟

**ئەدۆنیس:** دەکرێت خەڵکی هەندێك لەو گۆڕانانە قبوڵبکەن، بەڵام کاری وا کاتی دەوێت. ئاسان نییە تۆ شۆڕشەکان بەیەکتری بەراورد بکەیت.

**نینار:** ناکرێت خەڵکی لە شەوو ڕۆژێکدا ئەو گۆڕانانە قبوڵبکەن. مەبەستت ئەوەیە بڵێیت خەڵکی پێویستی بە کاتە بۆ ئەوەی خۆی ئامادەبکات.

**ئەدۆنیس:** پێویستی بە پرۆژەیەکی بەردەوام و درێژ هەیە. تا ئێستا ئێمە لەم پرۆژەیەدا سەرکەوتوو نەبووین، پێویستە دان بەم ڕاستییەدا بنێین.

**نینار:** مرۆڤ دەتوانێت ڕۆژانە لە نزیکەوە چاودێری ئەم پرۆسەیە بکات؟

**ئەدۆنیس:** دەبێت هەمیشە جەغت لە بیرۆکەکان بکەین. دەبێت بەردەوام قسە لەسەر ئەو بیرۆکانە بکەین و وازنەهێنین تەنها لەبەرئەوەی کەمێك پێشکەوتن هاتۆتە ئاراوە. هەندێك پێشکەوتنی بچووك هەن ڕەنگە بەهۆی هەندێك هۆکارەوە نەبینرێن و دواتر بگەڕێنەوە سەر هەمان دۆخی سەرەتا.

**نینار:** باشە ئەی لێکدانەوەی تۆ چییە بۆ زۆر لە ڕۆشنبیرە چەپەکان و هەندێك جاریش بۆ ئەو ڕۆشنبیرە ڕاسترەوە توندانەی کە دوای جەنگ دەبن بە ئیسلامیی؟ لە ڕاستیدا ئەمە شتێکی هەر زۆر سەیرە!

**ئەدۆنیس:** ئەوە پەیوەندی بەوەوە هەیە کە قەناعەتەکانیان لە سەرەتاوە لەڕێی بیرکردنەوەیەکەوە نەبووە کە خاوەنی ڕەگ و ڕیشە بێت. ئەوانە سیاسی بوون، ئەوەی لای ئەوان گرنگبووە، ئەوە بووە چۆن دەسەڵات بگرنە دەست، بەڵام ئەزموونەکان پیشانیان دا کە ئەوان هەموویان هەڵەبوون. دەسەڵاتگرتنە دەست بە تەنها بێماناییەکی گەورەیە. ئەگەر هات و تەنانەت ئەو دەسەڵاتە لە ڕێگەی شۆڕشیشەوە بەدەستبهێنرێت، چونکە دواتر دەبێتە هۆی گەندەڵییەکی زۆر زیاتر لەوانەی پێشووتر دەسەڵاتیان بەدەستەوە بووە. ئەو پارتە کۆنانەی وەك پارتی نەتەوەییی ناودەبرێن و دوای پرۆسەی ئازادی دەسەڵاتیان گرتۆتە دەست، زۆر لەو پارتانەی کە ئەمڕۆ خۆیان بە پارتی شۆڕشگێڕ دەزانن لەبرەوتر و پارادۆکسالترن.

**نینـــــار:** چ شـتێك لەسـەری چـەپڕەوێكی تونــــدڕەودا ڕوودەدات كـــە دەبێـــت بـــە كەسێكی ئیسلامی؟

**ئەدۆنیس:** زۆر شت ڕوودەدات، چونكە پێش هەرشت بنەمای ئایدۆلۆژییەتی چەپ لە دنیای عەرەبیدا خاوەنی تایبەتمەندییەكی وەهابوو كە وای پیشان دەدا توانـای وەلامدانـەوەی هـەموو پرسیارێكی هەیە. بە تـەواوەتی هـەر وەك دیین وا بوو. لە دنیای عەرەبیدا حیزبی سیاسی بووە دینێكـــی تـــازە. مـــرۆڤ ناتوانێـــت دژایـــەتی دینێك بە دینێكی تر بكات، چونكە بۆ ئـەوەی دژایـــەتی دینێـــك بـــە دینێكـــی تـــر بكـــەیت دەبێت بیرۆكەكانت دەربارەی دنیا بخەیتە ڕوو هـــەروەها خـاوەنی فەلـسەفەیەكیش بیـت كـە جێگای دیین بگرێتەوە.

ئـــەو حیزبانـــە هـــەرگیز خوێندنەوەیـــەكی مێژوویی وایـان لەسـەر ئـەو مەرجانـە نـەكرد كە دەستەلات و بوونی دابوو بە دیین، لە بـری ئـەوە ئـەوان تـەنها چـاویان بڕییـە دەسـتەلات. لـەو بارودۆخـــەدا ئـــەوان توانیـــان دەســـەلات بگرنـــە دەست، بەلام لـەبیریان چوو بۆچی. هـەر لەبـەر ئەمەشە نەیانتوانی سەركەوتووبن.

**نینار:** تۆ ئێستا وتت یـەكێك لـەو مەرجانـەی بۆ ئەوەی بتوانیت شۆڕشێك بەراوردبكـەیت بە شۆڕشـــێكی تـــر، ئەوەیـــە گـــۆڕان لـــە دامودەزگاكانـدا بكـەیت، بـەلام تـۆ پێتوانییـە كۆمەڵگا عەرەبییەكان ئەوەندەی تر بچنەوە نـاو خۆیـان، بۆئـەوەی تـەنها هـەر لـەناو خۆیانـدا تـەواوبن و ئـیتر ڕازینـەبن بـە قبـوڵكردنی هـیچ گۆڕانكارییـەك كـە لـە دەرەوەی خۆیانـەوە دێت؟ ئایـا گەشـەكردنی ئـەو فەناتیكـە دینییـە دوا ڕاچڵەكینی ئـەو كۆنەخوازانـە نییـە كـە دژ بـەو كرانەوەیـەن كـە ناكرێت خۆیـانی لێبشاریتەوە؟

كۆمـەڵگا عەرەبییـەكان بـەبێ هـیچ خـۆ تـازە كردنەوەیـــەك هـــەنگاو دەنـــێن و هـــەموو ئـــەو شتانەشـی پێویـستی پێیانـە باسـی ناكـەن و هێنـدەی تـر دەیـشارنەوە. بۆیـە دەكرێـت ئەمـە دواهـــەمین ڕاچـــڵەكانی نائومێدانـــەی مـــەرگی فەناتیزمەكان بێت.

**ئـــــەدۆنیس:** وایــــە. پاشەكـــشێكردن و خۆشـاردنەوە هەمیـشە خەتەرناكـە. ڕاسـیزم تـا ئـــەمڕۆش خـــەڵكانی ڕەشپێـــست بـــە كۆیلـــە ناودەبـات. دیـین هەمیـشە دەسـتەلاتێكی گـەورە بووە بەسەر هەستەكانی مرۆڤەوە و تا هاتووشـە جێگایەكی گەورەی داگیركردووە. ئەمەش تـەنها لـەناو گۆڕەپـانی فیكـردا ڕووینـەداوە، بـەڵكو بەســـەر هەســـتەكانی مـــرۆڤ و داب و نـــەریت و ژیانی ڕۆژانەشدا هاتووە. هەندێك لـە حیزبـەكان دەڵـێن گـەر دەسـەلات بگرنـە دەسـت ئـەوا بـە دڵنیاییــەوە زۆر شــت دەگــۆڕن، بــەلام حیزبــە تازەكـان بـەم هەڵوێـستەیانەوە توانیویانـە جـار جارێـك لـە نێـوان ئـەم پـەنجا سـاڵەی ڕابـردوودا بگەنـە دەستەلات، كەچی تـا ئێـستا هـیچ شـتێك نـــەگۆڕاوە. لەبەرئـــەوەی هـــەمووان شكـــستیان هێناوە، بۆیە پێویست دەكات كە بۆچوونەكانی خۆیـــان بگـــۆڕن و دەســـتبكەن بـــە دۆزینـــەوەی ڕێگەچـــــارەی تـــــر، بـــــەلام ئـــــەوە بزانـــــە بریـــسكەی ســـەرهەڵدان و هێـــزی گـــۆڕان هـــــەرگیز خـــــامۆش نابێـــــت. لـــــە هـــــەموو كۆمەڵگەیەكدا دوو ئاڕاستەی بیركردنـەوە هەیـە: ئـــــەوەی پارێزگـــــاری ڕابـــــردوو دەكـــــات و كۆنـــەپارێزە، ئەوەشـــی حـــەزی بـــە گـــۆڕان و تازەكردنەوەیـە. ئـەم دوو ئاڕاسـتەیە هەمیـشە لـە كێبەركێـــدان بەرامبـــەر بەیـــەك. بـــۆ ئـــەوەی گـۆڕانێكی ڕادیكاڵانـە یـاخود شۆڕشـێك بـەرپا ببێـت، پێویـستی بـە ڕێكـەوتنێكی مێـژوویی

بەکەڵك هەیە، بۆیە پێویستە مرۆڤ چاوەڕوانی ساتەوەختێکی ئاوا بێت.

**نینـــار:** تـۆ پێتوانییە ئـەم چاوەڕوانکردنە ڕیسکێك بێت بـۆ ئـەو کۆمەڵگایانـە تـا خۆیان لەناو خۆیاندا تەواو بن، ئەم کۆمەڵگایانە قبوڵی گـۆڕان ناکـەن لـە خۆیانـدا تـا وایلێـدێت دواتـر دادەڕزێن و پارچە پارچە دەبن؟

**ئەدۆنیس:** ڕاستە لە ئێستادا ئەمە یەکێکە لە هـەرە هەڕەشـە خەتەرناکەکان بـۆ سـەر کۆمـەڵگا عەرەبییـــــەکانمان. تەنانــــەت بیرۆکـــــەی "خۆرهـــەڵاتی" بوونیـــشمان بـــەرەو فـــەوتان دەڕوات. چـــی لـــە خۆرهـــەڵاتیبوونی عـــەرەب ماوەتـــەوە؟ ئـەو مێـــژووە خۆرهەڵاتناسـیيەی عەرەبی چیتر بوونی نەماوە؟ کۆمەڵگای عەرەبی ئێـستا بەشـێکە لـە کۆمــەڵگای خۆرئـاوایی، چونکە شتێك تایبەت بە خۆی بەرهەمناهێنێت، بـەڵکو لەسـەر بەرهـەمهێنانی خۆرئـاواو وڵاتـانی تر دەژی.

**نینـــار:** هەڵبـەت وایـە. خۆرهـەڵاتیبوونی عـەرەب وەك شـتێکی پـشتگوێخراوو دوورە شار لەلایـــەن ڕۆژئـــاواوە ســـەیر دەکرێــت. عــەرەب خۆشـــی نایـــەوێت لەمـــە تێبگـــات. تـــا ئێستاش باس لـە عـەرەب بـوون و "ئومـە"[1] و شتی وا دەکات.

**ئەدۆنیس:** ئەوەی ئەم وەهمەی تا ئێستا لای عـــەرەب هێـــشتۆتەوە دیینـــە. کۆمـــەڵگا عەرەبییـەکان هەرچی داهێنانە خۆرئاواییەکانـە بەکاریـدەهێنن و کەچـی پێـشیان وایــە ئــەوە خوایە ئەو نیعمەتەی پێداون تا بەکاریان بهێنن. ســـەرباری ئـــەوەی بیروڕاکانیـــان توانـــای خۆڕاگرتنیـــان نـــەماوە، کەچـــی ڕێ بـــەخۆیان دەدەن لەســـەر بیروبـــاوەڕی کۆنینـــەی خۆیـــان بمێننەوە، ئاخر ناشکرێت تا هەتاهەتایە هەروا لەسەر ئەو بیروڕایانە بژین. من جارێکی تریش دەیڵێمـــەوە ئەمـــە کـــاتی پێویـــستە، چـــونکە سیستەمێکی کۆمەڵگای ئاوا کە هـەزار و پێنج سـەد سـاڵە بەردەوامـە، ناکرێـت لـە مـاوەی سـاڵێك و دوانـدا بگۆڕێـت، ڕەنگـە پێـنج سـەد ساڵی بوێت!

**نینـــار:** کەواتە مەبەستی تۆ ئەوەیە بڵێیـت بنـەمای کۆمـەڵگا عەرەبییـەکان لەسـەر ئیـسلام بنیـاتنراوە. ئـەوەش دیینـە کـە بناغـەی ئـەو بنەمایـەی دروســتکردووە، بــەڵام ئایــا هــیچ شـــتێکی تـــر کاریگـــەری لەســـەر ئـــەو بنەمایە نەبووە؟

**ئـــــــــەدۆنیس:** ئیـــسلام ســـــەرەتای ئـــەو کۆمەڵگایانەیـــە، ئیـــسلام بنەمایـــەکی سیاسی و دیینیە.

**نینـــار:** ئـەی پـێش ئیـسلام لـەو کۆمـەڵگا عەرەبیانـەدا چـی ڕوویـدەدا؟ ئیـسلام نزیکـەی هـەزار و پێـنج سـەد سـاڵە هەیـە. پێش ئیسلام شارستانییەتی عەرەبی جیاواز بوو. ئایە ئێستا ئێمـە هـیچ میراتییـەکی ئـەو سـەروەختەمان بـۆ نەماوەتەوە؟

**ئەدۆنیس:** هەموو شتێکیان لەناو برد.

**نینار:** هەموو شتێك؟! بەڕاستی هیچ شتێکی ئەو سەروەختە نەماوە؟

**ئەدۆنیس:** هیچ شتێك نەماوەتەوە.

## ئێوارەی ڕۆژی دواتر

**نینار:**دەستپێبکەینەوە؟

**ئەدۆنیس:** فەرموو! با دەستپێبکەینەوە.

**نینار:** بۆچی لـە ڕاستیدا مرۆڤ پێویستی بـە بوونی بیرۆکەی خودا هەبوو؟ مەبەستم خودای

دیینە یەکتاپەرستیەکان؟ بۆچی مرۆڤ ناتوانێت مرۆڤێکی تر هەڵبژێرێت و بیکات بە خودایەک بۆ خۆی؟ کەسێک کە مرۆڤی هێندە خۆشبوویێت وەک خودایەک سەیری بکات. بەهەرحاڵ من بۆ خۆم کەسێکی، یان لایەنیکەم کەسێکم حەزدەکەم وابم. کاتێک کە پیاوێکم خۆشدەوێت، حەزدەکەم بە هوشیارییەوە وەک خودایەک سەیری بکەم. کاتێکیش جیادەبینەوە دیارە زۆر ناخۆش و قورسە، بەلآم ئیتر ژیانی خۆشەویستی وەهایە و دواتر مرۆڤ سەر لەنوێ عاشقی کەسێکی تر دەبێتەوە و وەک خوایەکی تر دەیبینێت. ئێمەی ئافرەت، خۆمان وەک ژنە خوداوەندێک لە چاوی خۆشەویستەکانماندا نابینین. ئایە پێتوایە ئەم قسەیەی من منداڵانەبێت؟ یاخود ئەمە بەشێکە لە قۆناغی هەرزەکاری من و تا ئێستاش نامەوێت دەستبەرداری بم؟

**ئەدۆنیس:** "بیرۆکەی خودا" مرۆڤ دایهێناوە، بۆ ئەوەی بگات بەو دنیا نادیارە و هەبوونی کێشەی مردن. ئەمە بیرۆکەیەکی هەر زۆر کۆنە کە پێش بوونی بیرۆکەی یەکتاپەرستیەکان بوونی هەبووە. بەلآم ئەم بیرۆکەیە پەرەی پێدراوەو کۆمەڵێ شێوازی جۆراوجۆری لەلایەن کۆمەڵێ خەڵکی جیاوازەوە لەناو کۆمەڵێ قۆناغی جیاوازی مێژوویدا وەرگرتووە. بیرۆکەی خودای یەکتاپەرستیەکان دواهەمین گۆڕانی ئەو بیرۆکانەیە، کە تەنها یەک خودای تاک و تەنها هەیە لە بری ئەو هەموو خودایانەی پێشوو.

خوداش ئەو بیرۆکە ڕێزلێگیراوەیە یارمەتی مرۆڤەکان دەدات مامەڵە لەگەڵ ئەو ترسەدا بکەن لە بەرامبەر ئەو نەزانراوەدا کە هەیە، مەبەستم ئەو شتەیە کە لە دوای مردن دێت. ئەو باوەڕەی پێی وایە لە دوای مردن ژیان هەیە، دەبێت چ جۆرە ژیانێک بێت؟ هەندێک کەس پێیان وایە ئەو شوێنە بەهەشتە و ئەوانەشی لایەنگری خودابوون دەتوانن دوای مردن لەوێدا بمێننەوە، بەلآم زۆر کەسی تریش هەن بە هیچ شێوەیەک باوەڕیان بە خودا نییە. ئەوان پێیانوایە مرۆڤ بەشێکە لە سروشت، بەشێکە لەو هەموو جۆرە بوونەوەرانەی کە لەسەر زەوی هەن. جگە لەوەش ئەوان پێیانوایە هەموو ئەو شتانەی تر وەهمە و پەیوەندی بەو ترسەوە هەیە کە مرۆڤ بەرامبەر بە مەرگی خۆی هەیەتی. بە هەرحاڵ ئەو کەسانەی ئەم بڕوایانەیان هەیە، هەڵگری ڕوونکردنەوە و تێگەیشتنن بەرامبەر بە هەموو ئەو پرسیارانەی دەوروخولی ئەم مەسەلەیە دەدات. دیارە ئەم بابەتە بابەتێك نییە مرۆڤ بتوانێت بیخاتە ناو چوارچێوەیەکی لۆژیکی و عەقلآنیانەوە، چونکە مرۆڤ ناتوانێت ڕەخنە لە باوەڕبوون بە خودایەک بگرێت لە ڕێی بەڵگەهێنانەوەی باوو و ئاشکراوە، چونکە ئەمە پەیوەندی بە هەست و سۆزی دڵی مرۆڤ و ڕۆحیەوە هەیە، پەیوەندی بە ترسی خەڵکی و لاوازیی بیرکردنەوەیانەوە هەیە، لە بەرامبەر مردندا. مرۆڤ دەبێت حورمەتی باوەڕبوون بە خودا بگرێت، بەلآم ئەمە نیشانەی ئەوە نییە ئیتر مادام تۆ حورمەت بۆ ئەو باوەڕانە دادەنێیت، ڕەخنە لە ترسی ئەو باوەڕانە و ئەو بیرە زۆرەملێیانە نەگریت کە هەیانە، بەتایبەتی کاتێک تۆ حورمەت بۆ ئەوەی بەرامبەر دادەنێیت، لە هەمان کاتیشدا دەتەوێت هەڵوێستت هەبێت، ئەوا تەنها شتێك کە دەتوانیت لە بەرامبەریدا بیکەیت ئەوەیە ڕازی نەبیت تۆش بەشداربیت لەگەڵیدا. مرۆڤ دەتوانێت باوەڕی بە زۆر

شتی جیاوازتر هەبێت، بۆ نموونە باوەڕی بە مرۆڤ هەبێت.

**نینار:** ئایا مەرجی ئەوە چییە کە مرۆڤێك وەك خودایەك لە مرۆڤێکی تر بڕوانێت؟

**ئەدۆنیس:** من دەمویست خۆم هەر ئێستا بێمە سەر ئەم باسە، مرۆڤ هەبووە کە هەوڵی ئەوەی داوە کە ببێت بە خودا، تەنانەت لە ناو ئیسلامیشدا ڕوویداوە. وەکو خودا سەیری هەندێك لە مرۆڤەکانیان کردووە. بە چەشنێك باوەڕیان پێهێناون و وەك خودایەك پەیوەندییەکانی خۆیانیان لەگەڵدا هاوسەنگکردوونەتەوە. ئەوان وەك پەیامنێرێکی خودا سەیری ئەو مرۆڤانەیان کردووە، بەڵام ئەو مرۆڤانە خودا نەبوون، بەڵکو ئەوان ڕەنگدانەوەی ئەو نەناسراوەبوون لەلای هەمووان، ئەو نەبینراوەی کە مرۆڤ ناتوانێت ببینێت، تەنها بەهۆی ئەو کەسە بینراوانەوە نەبێت کە خودا لەڕێی ئەوانەوە قسەی خۆی دەکات. بەڵام خەڵکیش هەبوون خودایان لە گوڵێکدا بینیوە، لە خونچەیەکدا، لە ڕووبارێکدا یاخود لە شاخێکدا بینیوە، وەك ئەوانەی باوەڕیان بە کۆمەڵێك خودا هەیە. هەندێك کەسیش هەبوون لە ترسی ئەو مرۆڤانە ناچار بوون وەك خودایەك سەیریان بکەن.

**نینار:** مەبەستت پێغەمبەرەکانە؟

**ئەدۆنیس:** نەخێر پێغەمبەرەکان ئەو کارانەیان نەکردووە، بەڵکە دینە تاکخواییەکان وایانکردووە.

**نینار:** وایە، ئەوە ڕاستە، بەڵام کام لەو مرۆڤانە یارمەتی مرۆڤەکانی تریان داوە تا لەو نەبینراوە بگەن؟ لە ڕاستیدا من ئەو مرۆڤانەم زۆر خۆش دەوێت کە خودا لە گوڵێك، ڕووبارێك یاخود شاخێکدا دەبینن، ئەوانە خەڵکانێکی فرە خاسن.

**ئەدۆنیس:** من نازانم ئایا مرۆڤ هەقی ئەوەی هەیە قسە لەسەر ئەمە بکات یان نا، بەڵام بە تایبەتی زۆرینەی موسڵمانەکان ئەو کەسانە بە بێ دیین دادەنێن، وەك خەڵکی لادەر و ساویلکە سەیریان دەکەن. ئەمەش کارێکی کردووە ڕاونان و چەوسانەوەی ئەوانە کارێکی زۆر ئاسان بێت.

**نینار:** مەبەستت چیە کە دەڵێیت "مرۆڤ هەقی ئەوەی هەیە قسە لەسەر ئەمە بکات"؟

**ئەدۆنیس:** زەحمەتە باس لەمانە بکرێت. بۆ نموونە گروپ هەن باوەڕیان وایە خودا لە ناو عەلیدا خۆی پیشانداوە. بەڵام بۆئەوەی کەسێك بە هەڵە لەمە تێنەگات، دەمەوێت هێما بۆ ئەو خاڵانە بکەم کە ئیمانداران باوەڕیان پێیەتی، بۆ نموونە کاتێك بوونەوەرێك لەدایك دەبێت، نەخۆش دەکەوێت، دەخوات و دەمرێت وەك هەر مرۆڤێکی تر، بە چاوی خودا سەیر ناکرێت. بۆ ئەوەی مرۆڤ وێنەی خودا لەلای خۆی دروستبکات، نابێت وێنەی مرۆڤێك بێت کە قابیلی مردن بێت، بەڵام گروپ هەن کە باوەڕیان وایە عەلی سیمبولێکە بۆ خودا و نوماینەدەی ئەوە. کەچی ئیسلامەکانی تر بۆ نموونە سۆفییەکان ئەم بیرکردنەوەیە توڕدەدەن و باوەڕیان وایە مرۆڤ لە خوداوە وەحی بۆ دێت. بەڵام وەسەنییەکان باوەڕیان بە فرە خودایی هەبووە، هەر لە حاڵەتی تێگەیشتن و بەخودا سەیرکردنی مرۆڤ تا کردنی مرۆڤ بە خودا.

....................

**نینار:** باشە، بۆچی قورئان وەرناگێڕنە سەر هەموو زمانەکان؟

**ئەدۆنیس:** قورئان بۆ زۆر زمان وەرگێڕاوە. بۆ نمونە وەرگێڕاوە بۆ زمانی ئەندەنوسی، ئۆردو، تورکی، بەلاّم ئەوەی بیەوێت خوێندنەوەیەك لە قورئانـدا بکـات دەبێـت ئـەم زمانـە بزانێـت. ئەوانەشـــی خۆیـــان فێـــری عـــەرەبی دەکـــەن زۆرینـــەیان دینـــدارەکانن. ئـــەوان پێیانوایـــە پەیوەنـدی نێـوان زمـانی عـەرەبی و قورعـان پەیوەندییەکی تایبەتە. ئەوانە حەزدەکەن چۆن قورئان لە ئاسمانەوە بۆ پێغەمبەر دابەزیوە هەر ئـاواش بیخوێننـەوە، چـونکە ئـەوان دەیانـەوێت بلّێن عـەرەبی زمـانی ئەسلّی قورئانـە. هـەروەها باوەڕیـــشیان وایـــە نابنـــە خـــاوەن ئیمـــانێکی کاملّ، گەر بێت و بەو زمانە نەیخوێننـەوە کە لـە خوداوە دابەزیوە.

**نینار:** ئیسلامییەکان بانگەشەی ئەوە دەکەن کــە قورئـــان دۆخـــی ئافرەتـــانی بـــەرەو باشـــی بردووە، چونکە پێش ئەوان کچانیان بە ساوایی زیندەبەچالّ کـردووە، ئایـا وابـووە؟ هەمیشەش من لە خۆمم پرسییەوە ئەی چۆن شاعیرانی ئەو سەروەختە ئەو هەموو شیعرە جوانەیان لەسەر عەشـــق و ئـــافرەت نووســـیوە، کەچـــی ڕازیشبوون لە کۆمەلّگایەکدا بژین کە خراپترین تـــاوانی تێـــدا ئەنجامـــدراوە، کـــچانیان بـــە ســـاوایی زیندەبەچـــالّ کـــردووە، تـــەنها هـــەر لەبەرئەوەی کچ بووە.

**ئەدۆنیس:** من باوەڕ ناکەم ئەوە ڕاستبێت، کە گوایـە عەرەبـەکان کـچی سـاوایان زیندەبەچـالّ کردبێـت، ئەمـە مێژوویەکـە ئیسلامەکان خۆیـان دروســتیان کـــردووە. هـــیچ بەلّگەیـــەك نییـــە عەرەبـەکانی ئـەو سـەروەختە کـچە سـاواکانیان لەبەر هەژاری و ترسی ئابڕووچوون زیندەبەچالّ کردبێــت. نابێــت بــاوەڕ بــەم جــۆرە مێــژووە هەلّبەســتراوانە بکرێــت. ســـەرباری ئـــەوەش هەلّەیەکی گەورەیە کە سـەردەمی پێش ئیسلام بــە ســـەردەمی نـــەزانین "جــاهلی" ناوببـــەین، خـەلّکانی ئـەو سـەردەمە پـێش هـاتنی ئیسلام خـاوەنی کلتـوری خۆیـان بـوون. نـاوبردنی ئـەو سـەردەمەش بـە سـەردەمی "جـاهلی" هەلّەیـە و هیچ ڕەوایەتییەکی تێدا نییە. دەبێت مرۆڤ خۆی دوور بگرێـت لـەم جـۆرە تێگەیـشتنانە. هـەموو ئـــەو ئەگەرانـــەی بـــۆ ئـــەو ســـــەردەمە لەبەرچـاودەگیرێت دواتـر گۆڕانیـان بەسـەردا هــاتووەو دەشــبێت بــە بەلّگــەوە دەستنیــشان بکرێـت، یـاخود هـەر بەیـەکجاری وێلّبکـرێن و گوێیان لێنەگیرێت.

**نینار:** دەنا کاتێك مرۆڤ شیعرە عاشقانەکانو ئیرۆتیکییـەکانی ئـەو سـەردەمە دەخوێنیتـەوە، تێـدەگات ئەوسـا چۆن گوزارشت لـە عەشـق و ئافرەت و جوانی ژیان کراوە.

**ئـــەدۆنیس:** لـەوەش زیـاتر کاتێك مـرۆڤ ئـەو شـیعرانە دەخوێنێتـەوە کـە باسـیان لـە ئـازادی ئافرەتــان کــردووە. لــەو ســەروەختە بڕیــاری تەلاّقـــدان ئافرەتـــان داویانـــە و لـــە هـــەموو بارێکیشدا هـەر خۆشیان بڕیاری ئـەوەیان داوە لەگـەلّ چ پیاوێکدابن. چیرۆکێك هەیـە سـەبارەت بـە ئافرەتێـك کـە شـووی بـە چـل پیـاو کـردووە، بەبێ ئەوەی کەسێك بتوانێت لەسـەر ئـەو کـارەی ڕەخنەی لێبگرێت.

**نینـــــــار:** کۆمەلّگـــەی ئـــەو ســـەروەختە دایکسالاری بووە؟

**ئەدۆنیس:** نەخێر، بەلاّم ئافرەتان ئازادییـەکی گەورەیان هەبووە، لە هەندێك خێلّدا...

**نینار:** کافر بوون وانا؟

**ئەدۆنیس:** بەلّێ.

**نینـــــــار:** ئـــەی زۆرینـــەی خوداکانیـــان ئافرەت نەبوون؟

**ئــەدۆنیس:** با وەکو عوزا، مەنات و لات بۆ نموونە ئافرەتبوون.

**نینــــار:** بەڵام خۆ ئێستاشی لەسەر بێت ئیسلامەکان ژنان زیندەبەچاڵ دەکەن...

**ئــەدۆنیس:** ئەو بانگەشە کردنەشی دەڵێت گوایە ئیسلام ئافرەتانی ئازاد کردووە، شتێکە دەبێت لە ئاستێکی زۆر بەرزدا بخرێتە ژێر پرسیارەوە، چونکە پێویستی بە خوێندنەوەی وردی یاسا و پرنسیپەکانی ناو ئیسلامەوە هەیە.

**نینار:** تۆ پێت وایە بەشێوەیەك لە شێوەکان ئەگەری ئەوە هەبێت کە ئیسلام مۆدێرن بکرێت؟

**ئەدۆنیس:** کێشەی بە مۆدێرنکردنی ئیسلام پەیوەندی بەوەوە هەیە تۆ چۆن قورعان دەخوێنیتەوە، چۆن تۆ تێکستێك دەخوێنیتەوە کە پێشوەخت بڕیاری لەسەردراوە واتای چییە. بۆیە کاتێك لە نزیکەوە پەیوەندی نێوان تێکستی قورعان و کۆمەڵگە بە درێژایی هەزار و پێنج سەد ساڵ سەیر دەکەیت، دەبینیت زۆر شت گۆڕاوە. لە ڕاستیدا ئیسلام لەسەرەتاوە دینێکی بەخشندە بووە. لەسەروەختی عەباسییەکاندا هۆمۆسێکسوالییەت ڕێگەپێدراوبووە و قبوڵکراوە. توانراوە کە بوترێت "فلان کەس کوڕەکەی لەگەڵدایە". هەر لەسەر ئەم نموونەیە، من دوێنێ خوێندمەوە کە لە ویلایەتی "مەساتوچێتس" لە ئەمریکا ڕێگا بە هێنانی یەکتری لە نێوان هۆمۆسێکسوالەکاندا دراوە.

**نینار:** کارێکی هەر زۆر باشە.

**ئــەدۆنیس:** شتی ئاوا لە سەردەمەکانی ڕابردوودا لە کۆمەڵگای عەرەبدا کارێکی ڕۆژانەو ئاسایی بووە. ناوەڕۆکی تێکست بریتییە لەوەی کە تۆ چۆن دەیخوێنیتەوە، دەکرێت کۆمەڵگای ئیسلامیش لەم گۆشەنیگایەوە مۆدێرن بکرێت. ئەگەر هەنگاوێکی کراوەو پێشکەوتن لە سیستەمێکی سیاسیدا ڕوویدات کە ڕێگا بدات بە بیروڕای ئازاد و جیاواز، ئەگەر تێکستە دینییەکان لەسەر ڕووناکی گرفتە ڕۆژانەییەکان خوێندنەوەیان بۆ بکرێت، ئەوا دەتوانرێت خوێندنەوەکانیش بۆ قورعان مۆدێرن بکرێت. ئەو تێکستە دینییەی کە هەیە، دەبێت وەك گۆڕانی ژیان گۆڕانی بەسەردا بێت. لە ڕاستیدا ئەم پەردە لەسەر هەڵماڵینەش بۆیە دەکرێت تا یارمەتی مرۆڤەکان بدات بۆ ئەوەی خزمەت بە کۆمەڵگە بکەن، نەك بۆ ئەوەی کۆمەڵگە خزمەت بەوان بکات. دین بۆیە بوونی هەیە تا خزمەت بە مرۆڤ بکات، بۆ ئەوەی ئازادی بکات و پێشیبخات، نەك بە پێچەوانەوە. گەر مرۆڤ ئەم دۆخە قبوڵبکات، مانای ئەوەیە دەبێت تێکستە دینییەکان لە دەرەوەی پێداویستییەکانی مرۆڤەوە بخوێنرێتەوە. لە دەرەوەی ئەو زەمەنەوەی کە ئێستایە و لە دەرەوەی ئەو کێشانەی کە مرۆڤ لە ئێستادا پێیانەوە گیرۆدەیە.

**نینار:** کێ بڕیار لەسەر ئەمە ئەدات؟ مەلا و شێخەکان؟

**ئـــــەدۆنیس:** نەخێر، هاوڵاتیان! گەر دەسەڵاتداران گرێنتی ئەوە بدەن کە هەموو هاوڵاتیان ئازادن و حەقی خۆیانە ئەوانەی باوەڕی دینیان نییە بتوانن هەرچیان هەیە لەسەر دیندارەکان بیڵێن. گەر بهاتایە ئازادییەکی زۆر هەبوایە ئەوا زۆرینە لەسەر ئەوە ڕێکدەکەوتن کە دەبێت بە چەشنێك خوێندنەوە بۆ تێکستە دینییەکان بکرێت کە خوێندنەوەکان لەگەڵ پێداویستییەکانی مرۆڤ و شێوەی ژیانیاندا بگونجێت. بۆیە من پێمواییە

گەورەترین کێشە لای دەسەڵاتدارەکان خۆیانە، چونکە ئەوانن هەمیشە لایەنگر و پشت و پەنای دیندارەکانن.

**نینار:** بەڕاست ئەوان ئا بەو چەشنەن؟

**ئەدۆنیس:** دەسەڵات لەو ئاستەدا، ناوبژیکەر نییە بەڵکە دژە. ئەگەر بهاتایە ئازادی سیاسی هەبوایە، ئەوا کۆمەڵگەی عەرەبی دەیتوانی پێشبکەوێت. ئەم نموونانە هەیە: "بورقیبە" سەرۆکی تونس ئازادییەکی زۆری دا بە ئافرەتانی وڵاتەکەی. زۆر لە موسڵمانە توندئیمانەکان ئەمەیان بەشەڕی دژ بە ئیسلام لە قەڵەمدا، بەڵام ئەم مافە نوێیە دواتر دەنگی بۆ درا. ئێستا ئەو یاسا نوێیانەی کە لەلایەن پاشای مەغریب موحەمەدی شەشەمیشەوە دەرچووە، دەیەوێت بە هەمان ئەم یاسایانە ئازادی بدات بە ئافرەتانی مەغریب، سەرباری ئەوەی ئیسلامەکانی مەغریب دان بەم خوێندنەوانەدا نانێن کە بۆ قورعان کراوە.

بۆیە هەرە هێزی ڕێگر سیاسییە دەسەڵاتدارەکانن، لە بری ئەوەی بەشداری ئەو گفتوگۆیانە بکەن و ڕۆڵی ناوبژیوان و دادوەر ببینن. دەبوو دەسەڵات بەوەی بزانیایە کە ئەو ئازادییەی گفتوگۆ دەخوڵقێنێت، بە شێوەیەکی دیموکراتیانە پشتگیری لێبکردایە. گەر شتێکی بەم چەشنە ببوایە ئەوا تێکستە دینییەکان پێ بەپێی کێشەکان و هەلومەرجی ژیان دەخوێنرانەوەو ڕاڤە دەکران.

خودا خۆی بەپێی گۆڕانی هەلومەرجەکان ئایەتەکان و بەندەکانی گۆڕیوە، تا باشتر لەگەڵ ئەو ساتانەدا بگونجێت. بۆیە دەبێت مرۆڤەکان لاسایی خودا بکەنەوە و بیرتەسکی خۆیان بگۆڕن و ڕازی نەبن بەو ڕاڤەکردنانەی بۆ قورعان دەکرێت. بۆ نمونە کاتێک خودا بینیویەتی بەیتی ئایەتەکان لەگەڵ ئەو ساتانەدا باش نایەتەوە، گۆڕیونی و ئایەتی تری لەبری داناون بۆ ئەوەی پڕاو پڕ بگونجێت.

"ما ننساك من آية أو مستنسخها، نأتي بخير منها أو مثلها"

خودا تەنانەت یاساکانی لەناو ئایەتەکانیشدا گۆڕیوە، کاتێک زانیویەتی چیتر بە واقیعەوە پەیوەندیدارنین. دەبێت مرۆڤ ئەمە وەك نمونەیەك سەیر بکات و چاوی لێبکات. دەبێت مرۆڤەکان هاوتای ئەم شێوازە بدۆزنەوە، بۆ گۆڕان لە ڕاڤەکردنی ئەو تێکستە دینیانەدا کە لەگەڵ ئەو پێویستیانەدا دەگونجێت کە هەن.

**نینار:** گەر وا بێت ئەوا هەر کەس دەتوانێت بیگۆڕێت و یاساکان بە چەشنێك ڕاڤە بکات کە دەیەوێت؟

**ئەدۆنیس:** بە دڵنیاییەوە، لەبەرئەوە پێویستە ڕاڤەکردنەکان زۆر وردبن لە دروستکردنی یاساکاندا.

**نینار:** پێتوایە دیینەکان هەتا هەتایە دژ بەو داهێنانە زانستیانە بوەستنەوە؟ چونکە هەتا بێت داهێنانەکان لەگەڵ دییندا ناتوانن یەکبگرنەوە، وا نییە؟

**ئەدۆنیس:** ئەمە پرسیاری باوەڕە. باوەڕداری وا هەیە پێیوایە هەموو ئەو داهێنانەی زانست پێشوەخت لە قورئاندا نووسراوە.

**نینار:** وایە، منیش دەزانم خەڵکانی وا هەن کە ئەم قسانە دەکەن.

**ئەدۆنیس:** دەبێت مرۆڤ چی بڵێت بەرامبەر بەمە؟ دەتوانم من نووسراوێکت پیشانبدەم کە باوەڕدارێك نووسیویەتی، ناوەڕۆکی بابەتەکەی وا دەڵێت کە کارەساتی 11ی سێپتەمبەر پێشهاتێکە بە دەستی خودا ڕوویداوە.

**نینار:** کێ ئەم نووسینەی نووسیوە؟

**ئەدۆنیس:** یەکێك لە دەمارگیرە ئیسلامییەکان نووسییویەتی. کەسێك بۆی ناردم تا بیخوێنمەوە. هەروەها ناوەڕۆکی بابەتەکەی شتی نابەجێ و بێ مانای تێدا بەیانکراوە.

**نینار:** ..........؟

**ئەدۆنیس:** هەمیشە خەڵکانێك هەن ئینکاری زانست و هەموو ئەو داهێنانە دەکەن کە دێنەکایەوە، یاخود دەڵێ گوایە هەموو ئەو شتانە پێشوەخت لە قورعاندا باسیان لێوە کراوە. بەڵام بەپێی تێگەیشتنی من قورعان ئینکاری واقیع ناکات، بەتایبەتی ئەو شتانەی کە لە دەرەوەی واقیعی رۆژانەوەن. من دووبارە دەیڵێمەوە، ئەوەی قورعان خراپ دەکات ئەوەیە کە ئینکاری واقیع دەکات و هەروەها باوەڕ بەوە دەکات کە قورعان پڕ لە عەقڵ و تێگەیشتن نییە.

**نینار:** جارێکیان گوێم لێت بوو وتت ئیسلام ئینکاری ئەو ویستە ئازادە دەکات یاخود ئیسلام دژ بە ئازادی تاکە، لە بیرتە کە واتووت؟ تۆ ئەمەت بۆ سەلماندم، بەڵام من ئێستا لە بیرم نەماوە ئەو کاتە تۆ پشتت بە هێنانەوەی چ بەڵگەیەك بەستبوو. ئایە پێتوانییە شتێکی وا بکرێت کە دەستکاری دینی ئیسلامی بکرێت؟

**ئەدۆنیس:** من ئەو کات وتم ئیسلام بواری رەهایی و ئازادی وەك بوونەوەرێك بە تاك نادات. دین تاك دەگرێت و دەیبەستێتەوە بە کۆوە، بە گەل و نەتەوە. لەم ئاستە کۆمەڵایەتیی و بیرکردنەوەیەدا گەل گرنگترە وەك لە تاك. بەم پێیە هیچ ئازادییەك لەو ئاستەدا بوونی نییە. تاك تەنها لە چوارچێوەیەکدا ئازادە کە لە ژێر سایەی ئەو یاسا و بەهایانەدایە کە تایبەتە بە گەل و دین و کلتورەوە.

دەربڕینێکی باو هەیە دەڵێت: "ئەو کەسەی لە دەرەوەی دین باس لە دین دەکات، هەموو قسە و تێگەیشتنێکی لە خشتەبردن و گوناهکارییە ئەگەر بێت و هەموو ئەو شتانەشی دەیڵێت راستبن!". ئەم قسەیەش قسەی گەلە نەك قسەی تاك.

**نینار:** وڵاتانی عەرەبی هەر بۆ خۆیان شیزۆفرینیایەکن، دابەشبووە بەسەر شەیدابوون بە ئەورووپا و هەروەها رقهەستان لە خۆرئاوادا کە بەشێکی ئەم رقەش خۆرئاوا خۆی بۆتە مایەی دروستبوونی.

**ئەدۆنیس:** وەك پێشتر بۆم باسکردیت، ئەم جۆرە کۆمەڵگایانە بەهۆی نەبوونی ئازادییەوە بەم شێوەیە دوستدەبن و دوو ئاستی کلتوری وەردەگرن: ئاستی بینراویان ئەو ئاستەیە کە زۆرینەی باوەڕدارەکانی تێدا دەژین و خاوەنی ئاستێکە لە سیستەمی سیاسیدا. ئەو ئاستە نەبینراوو شاراوەیەش ئەو ئاستەیە کە خەڵکانێك پێیانباشترە ژیانی ئازادی خۆی تێدا درێژە پێبدەن. ئەمەش جۆرێکە لە دوو ڕووی و دوو مۆراڵی.

**نینار:** ئاشکرایە کە وایە.

**ئەدۆنیس:** شیزۆفرینیا شتێکی ترە و نەخۆشییەکە، بەڵام ئەمە پەیوەندی بە مرۆڤێکەوە هەیە کە دوو ڕووی هەیە: یەکێکیان نوێژدەکات و زەکات دەدات، ئەویتریشیان سنووری هەموو بەحەرامکراوەکان دەشکێنێت، بۆ نمونە ئەوەی پەیوەندی بە سێکسەوە هەبێت هەموو جۆرە ئازادییەکی خۆی تێدا وەردەگرێت. لە ئاستی بینراوی ناو کۆمەڵگادا پشت بە حەڵاڵ دەبەستێت تا ئاستی ڕێگەپێدراو، بەڵام لە ئاستی نەبینراودا

خەریکی هەموو ئەو شتانە دەبێت کە حەرامە و ڕێگە پێنەدراوە.

**نینار:** چۆن ئەمە دەبێت؟

**ئەدۆنیس:** بەشێوەیەکی سەرەکی هەموو ئەم شتانە پەیوەندی بەو ڕاستیەوە هەیە کە ڕێگا بە ئازادی نادرێت. مرۆڤەکان بەم شێوەیە خۆیان دەشارنەوە بۆ ئەوەی ئازادانە ڕەفتار بکەن.

**نینار:** من پێم سەیرە مرۆڤ چۆن دەتوانێت بەو شێوەیە بژی، ئەمە وەك ئەوە وایە مرۆڤ بەردەوام لە درۆدا بژی.

**ئەدۆنیس:** زۆر ترسناکە، بەڵام مرۆڤ هەمیشە سەرکەوتووبووە لەوەی ئەم ڕێگایە بۆ خۆی بدۆزێتەوە.

**نینار:** چۆن وا دەکەن؟

**ئەدۆنیس:** هەموو مرۆڤێك دەبێت شێوەیەکی نهێنی بدۆزێتەوە بۆئەوەی لەزەت لەو ئازادییە ببینێت، تەنانەت لە ماڵەکەی خۆشیدا. دەبێت خۆیان وا پیشانبدەن ئەوان یاسا دینییەکانیان نەشکاندووە تا پێیان نەزانن و ئاشکرانەبن.

**نینار:** دیارە هەموو کەسێك پێویستی بە بەشێك لە نهێنی هەیە کە پێوەستبێت بە ژیانی خۆیەوە. ئەمەش کاتێك دەبێت کە مرۆڤ بەرەو گەورە بوون دەچێت و دەیەوێت کەسایەتیەك بۆ خۆی دروستبکات، بەتایبەت دوور لە دایك و باوك. مرۆڤ ئەمەش بۆیە دەکات بۆ ئەوەی ببێتە ئەزمونێك بۆ خۆی. مرۆڤی گەنج سنوورەکانی دایك و باوك و هی خۆشی تاقیدەکاتەوە، بۆئەوەی بزانێت تا چەند دەتوانێت بڕوات، بەڵام دواتر ئەو مرۆڤە گەر کچ بێت یان کوڕ دەبێت بەرپرسیاربێت بەرامبەر هەموو کردەوەکانی. مرۆڤ ناتوانێت بەردەوام بێت لە یاریکردن و خۆشاردنەوە، چونکە زۆر ناخایەنێت نهێنییەکان و زەوقبردن لە لەزەتەکان ناشیرین دەبن، وایان لێدێت کە مرۆڤ ناچار بێت بۆ هەمیشە بیانشارێتەوە و هەرگیز لێوەیان نەدوێت، ئەمەش دڵەڕاوکێ و ناڕەحەتی بەردەوام دروستدەکات.

**پەراوێز:**

1-ئومە، میللەت، لە دەقە سویدییەکەشدا هەر بە عەرەبییەکەی نووسراوە.

**سەرچاوە:**

*Samtal med far,Adonis*
*Ninar Esber*
*Oversatting av Carl G Liungman*
*Alhambra 2007*

# تاهر بن جەلون: نووسین بەبێ ژیان مەحاڵە

شوشا گاپی

لە فارسییەوە: دڵشاد خۆشناو

تاهر بن جەللون، یەکێك لە ناسراوترین نووسەرانی فەرەنسایە، دوایین کتێبی، "باوکە پێم بڵێ نەژادپەرستی یانی چی؟"[1] کتێبێکی پڕ فرۆش بووە. ئەو لە ساڵی 1987(خەڵاتی گنکور)ی بۆ ڕۆمانی (شەوی قەدر)[2] بەدەستهێنا، ئەوە یەکەمین کتێبی نووسەرێکی عەرەب بوو کە خەڵاتی گنکور بباتەوە. لە دوو ساڵی کۆتاییدا، ناوی بن جەللون لە لیستی کورتی پاڵێوراوانی خەڵاتی نۆبڵی ئەدەبیات بووە.



بن جەللون لە شاری (فاس)ی مەغریب لەدایکبووە. بنەماڵەکەی لە ماڵێکی بچووك لە گەڕەکی مەدینە، گەڕەکێکی کۆنی سەدەکانی ناوەڕاست و جوانترین شاری مەراکیش دەژیان، چوار منداڵبوون، سێ کوڕو کچێك، باوکی کاسبکارێکی ئاسایی بوو لە بازاڕ دوکانێکی بچوکی بەهارات فرۆشتنی هەبوو، دواتر بوو بە جلدووری و گەلابیەی پیاوانی دەدوری.

بن جەللونیان لە تەمەنی پێنج ساڵی نارده قوتابخانەیەکی ئاینیی، لەوێدا فێربوو کە ئایەتەکانی قورئان لەبەر بکات و بیخوێنێتەوە. دووساڵ دواتر چووە قوتابخانەیەکی دوو زمانەی فەرەنسی –

عـــەرەبی، لەوێـــدا بـــەیانیان فەرەنـــسیان دەخوێنـدو دوای نیوەڕۆیـان عـەرەبی، ئـەوە سـەرەتای ئاشـنایی ئـەو بـوو لەگـەڵ زمـانی فەرەنـسی، خوێنـدکارێکی خۆماندووکـەرو خوێنەرێکی باش بوو، دەڵـێ: "زوو هەستم کـرد کـە دەبـێ لەسـەر پێـی خـۆم بوەسـتم". دواتر لە زانکۆی (ربات) فەلسەفەی خوێند.

بن جەللون لە 1971، لە تەمەنی بیست و شـەش سـاڵی، بـۆ درێـژەدان بـە خوێنـدن دەچـــێتە ســـۆربۆنی فەرەنـــسا، دوای تـەواوکردنی خوێنـدن ماوەیـەك بەناونیـشانی دەروونناس لـەوێ كـاری كـردووە. یەكـەمین ڕۆمـــانی (هـــەڕودە[3]) لـــە ســـاڵی 1973 بڵاوکـردەوە. دوای ئـەوە نـۆ ڕۆمـانی تریـشی نووسـی و بـڵاوی کـردەوە، هـەروەها چـەندین کۆمەڵـە چیرۆك و شیعر و وتـار، ڕەنگـە هـۆی سـەرەکی ناوبـانگی بـن جـەللون سـێیانە (تریولـوژی) ئـەو بێـت لـەبارەی ژیـانی ئەحمەد- زەهرا، ئەحمەد- زەهرا کچێکە کە باوکی لە حەسرەتی خاوەنداری منداڵی کوڕ، ئەوکچە وەکو کوڕ گەورە دەکات.

کتێبەکانی ئـەو سـێیانەیە بـریتی بـوون: (منـداڵی لمـی[4])، کـە لـە فەرەنـسا زۆری لێ فرۆشـرا، (شـەوی قـەدر) و کتێبـی تـازە بڵاوکراوەی (شەوی هەڵەیی[5]).

ئەم چاوپێکەوتنە لە نوسینگەی کارەکەی لە شەقامی (سن ژێرمەن دیپرە) ئەنجام دراوە کـە دووسـەد تـا سێـسەد مـەتر لـە دەزگـای چاپ و بڵاوکردنـەوەی (دووسوی[6]) دورە کە کتێبەکانی بـۆ بڵاودەکاتـەوە، هـەروەها نزیکیشە لە کافتریای دوفلور کە زۆرجار بۆ بینینـی هاوڕێکـانی دەچـێتە ئـەوێ، نوسـینگەی کارەکـەی سـتۆدیۆیەکی بـچووکە لـە دوایـین قـاتی بینایـەکی بـەرز و باریـك و مۆدێرن وەك بڵێی بەزۆر خراوەتە نێوان ئەو بینـا کۆنانـەی ئـەو شـەقامە. ناومـاڵێکی ئاسـایی و کـەمی هەیـە: یـەك دووکورسـی و مێزێکـی گـەورەی کـارکردن کـە هـەمووی بەکاغـەز داپۆشـراو لەگـەڵ تەلـەفۆنێك و کۆمپیوتەرێکی ئاسایی. بەرزی بیناکە بۆتە هـۆی ئـارامی و نەبیستنی دەنگـی هاتوچـۆو ژاوەژاوی شەقامەکە، پەنجەرەکان کە دیمەنی چـەترییینی نـوکی درەختـەکانی لێـوە دیـارە، ڕووناکاییەکی فراوان دابین دەکەن.

بن جەللون، جیا لەو ڕێـزە زۆرەی کە لێـی دەگـــرن، بـــەهۆی سەرنجڕاکێـــشی و خۆشەویـــستی و نەزاکـــەتی خـــۆی خۆشەویـستە، زۆر بـەجوانی و بەڕاسـتی بـە فەرەنـسی قـسەدەکات، تـەنیا کـەمێك لـە قـسەکردن وەکـو خـەڵکی بـاکوری ئـەفریقا قسەدەکات.

**شوشا گـاپی:** تۆ مەغریبیت و لە مەغریب لـەدایك بوویـت و هـەر لـەوێش گـەورەبویت، زمـانی دایکتـان عەرەبییـە، لەگـەڵ ئـەوەش بڕیارت داوە بە فەرەنسی بنووسیت. دەکرێ بڵێی بۆ؟

**بن جـەللون:** من لە ڕاستیدا دوو زمانەم، زمـــانی یەکـــەمم عەرەبیـــە، بـــەڵام لـــە قوتابخانەیـــەکی فەرەنـــسی - عـــەرەبی، خوێندومە، کە دەستم بە نووسین کرد، بەبێ ئـەوەی هـیچ خۆبـەزل زانینـێکم هـەبێت، لـە نوسین بە زمانی فەرەنسی چێژم وەردەگرت، ئەو کاتە هەڵبژاردنێکی ئەنقەست نەبوو.

**شوشـــا گـــاپی:** هۆیەکـەی ئـەوە نیـە کـە نووســـینی فەرەنـــسییەکانت زیـــاتر دەخوێندەوە تا عەرەبەکان؟

**بن جەللون:** ڕەنگە واش بێت، هۆیەکەی تریش ئەوەبوو کە زمانی عەرەبی بۆ من شتێکی ئاسایی و سروشتی بوو، شتێك بوو کە هیچ کات لە دەستم نەدەدا، لە ئەنجامدا زەرور نەبوو کە لەو زەمینەدا هەوڵبدەم، بێ ئەوەی بە خۆم بزانم پێموابوو دەبێ خۆم بۆ زمانی بیانی ماندوو بکەم. ئەو کارەش جۆرێك تاقیکردنەوەی توانا و جۆرە ئامانجێك بوو.

لە تەمەنی بیست ساڵی کە نووسینم بە شێوەی جدی دەسپێکرد، هیچ دوودڵیەکم نەبوو لەوەی کە دەبێ بە فەرەنسی بنوسم. لەگەڵ ئەوەشدا هیچ کات بە ئەنقەست لە نێوان عەرەبی و فەرەنسی هەڵمنەبژارد، واهاتە پێشەوە. هەندێك لە ئەندێشمەندانی عەرەب ڕەخنەم لێدەگرن کە بۆ بە عەرەبی نەمنوسیوە، ئەم ڕەخنانە هەندێ جار زۆر بێرەحمانە بووە. ئەو مەسەلە بۆ من ئەزمونێکی دەردناك بوو، چونکە هەستم دەکرد ئامانجی ئەو ڕەخنانە زۆربەیان بەهەڵە تێگەیشتوون.

**شوشا گاپی:** بێگومان، دوای وەدەستهێنانی خەڵاتی گنکور، و ئەو ناوبانگەی کە لەگەڵ خۆی هێنای، ئێرەییش هاتە ناو ئەو هاوکێشەیە!

**بن جەللون:** لەوانەیە، بەڵام وەڵامی من ئەمەیە: من بە زمانێك دەنووسم کە پتر بەسەریدا زاڵم، دەتوانم وتارێك یان دەقی وتەیەك بە عەرەبی بنووسم، بەڵام ڕۆمان نا، هەربۆیە بەو هۆیەی کە ڕێزم بۆ زمانی عەرەبی هەیە، ئامادە نیم ئەو زمانە تێکبشکێنم.

**شوشا گاپی:** عەرەبی زمانێکی زۆر دەوڵەمەند و نەرمونیانە: بە ڕیشەی یەك وشە کە لە دوو یاسێ بێدەنگ پێکدێت. دەتوانرێت واژەی جۆراوجۆر و جیا بەکارهێنانی وردەوە دروست بکرێت، چەندین شاکاری شیعر و پەخشان لەو زمانەدا خەڵق کراون. لە هەمووی گرنگتر زمانێکی پیرۆزە، وەکو عیبری، خوا بەو زمانە قسەی کردووە. هەر بەو هۆیەشەوە هەر ئەوەی کە گوتت، مرۆڤ دوودڵە لەوەی کە بە ڕووکەش کاری پێ بکات. لە قوتابخانەدا عەرەبیشتان دەخوێند؟

**بن جەللون:** لە دواناوەندی، بەرهەمی کلاسیکی ئەدەبیاتی عەرەبیمان دەخوێند. کاتێك هەستم بە وردەکاری و دەوڵەمەندی زمانی عەرەبی کرد دەستم بەوەرگێڕان کرد.

ئەو هەست کردنەم هۆیەکی تر بوو لەوەی کە ئەو زمانە بە ڕووکەشی وەرنەگرم لەگەڵ ئەوەشدا، بەپێی ئەوەی کە زمانێکی پیرۆزەو خوا ئەو زمانەی لە قاڵبی قورئاندا ناردوە. ترسێنەریشە- مرۆڤ لە بەرانبەریدا هەست بە بێبایەخی دەکات. ئەدۆنیس یەکێك لە شاعیرە گەورەکانی لوبنانی، ڕۆژێ پێی گوتم کە تا ئێستا کەسێك یان نووسەرێك نەبووە کە لەو زمانە بەهێزتر بێت و بەسەریدا زاڵ بێت، ئێمە ئینگلیزی بە زمانی شکسپیر و ئیتاڵی بە زمانی دانتە دەزانین، بەڵام ناڵێین عەرەبی زمانی غەزالییە، عەرەبی هەمیشە زمانی قورئانە، مرۆڤ لە بەکارهێنانیدا کەم و زۆر هەست بە گوناه دەکات.

**شوشا گاپی:** بەڵام لەبیرمان نەچێت، نووسین بە زمانی ئینگلیزی یان فەرەنسی، بەسودە، چونکە خوێنەری بەرفراوانترت هەیە.

**بن جەللون:** ئەو مەسەلە ڕەنگدانەوەیەکە لە بارودۆخی سیاسی جیهانی عەرەب و وێنەی ناخۆشی ئەو، کە کاریگەری خۆی کردۆتە سەر گەشەو کامڵبوونی فەرهەنگی عەرەب. بێویژدانییە، ژمارەیەکی زۆری شاعیرو نووسەری گەورەی عەرەب هەن نەناسراو ماونەتەوە، و دیارە فەرهەنگی وڵاتەکان پەیوەندی بە بارودۆخی ئابوری-سیاسی ئەوانەوە هەیە، عەرەبی زمانی دووسەد ملیۆن خەڵکە، و فارسی کە شیعری زۆر جوانی پێ گوتراوە، زمانی مەلاکانی تاران، ئەو دوو زمانە دوورەپەرێز ماون، ئێستا، چاوی ڕۆژئاوا چۆتە سەر ڕۆژهەڵاتی دوور و خەڵکی خۆرئاوا لەنکاو فەرهەنگی چین و ژاپۆن دەدۆزنەوە. لەبارەی ئەو بارودۆخە لە دەستی کەسدا نییە، تا ئەوکاتەی کە وێنەی وڵاتانی عەرەب لەلایەنی سیاسییەوە تاریک بێت، داهاتووەکەی دەگاتە فەرهەنگی عەرەب.

**شوشا گاپی:** جان ئاپدایك دەیگوت لە سەفەرەکەی بۆ میسر لەگەڵ نووسەرانی گەورەدا دیداری کردوە کە لە ڕۆژئاوادا هەرنەناسراون- ئەوە پەیوەستە بەو کاتەی کە نەجیب مەحفوز هێشتا خەڵاتی نۆبڵی نەبردبووەوە- بەڵام لەگەڵ ئەوەی ئەو نووسەرانی تری ئانگلوساکسۆن دەپژمن، یەکسەر بۆ دە دوانزە زمان وەردەگێڕدرێت لە سەرانسەری جیهاندا، شی دەکرێتەوەو تێڕوانینی لەسەردەکەن.

**بن جەللون:** ئێمە حەزمان لە فەرهەنگی ڕۆژئاوا زیاترە، پێچەوانەکەی ڕاست نییە، من ناتوانم لە ئەمریکا لەبارەی فاکنەرەوە قسە بکەم، هەموو نووسەرانی عەرەبیش هەروا، هیچ کەسیش پێی سەیر نییە، لە کاتێکدا لە خۆرئاوا تەنیا ژمارەیەکی کەم کە بە خۆرهەڵاتناس ناسراون، نووسەرانی ئێمە دەناسن. بەهیوام ڕۆژێ دابێ کە ئەو بارودۆخە بگۆڕێت و بەزوویی گەنجینەی دەوڵەمەندی ئەدەبیاتی عەرەبی و فارسی لە هەموو شوێنێك بدۆزرێتەوە لە بەرژەوەندی مرۆڤایەتیدا.

**شوشا گاپی:** منیش هەروەها، بەڵام ڕەنگە ئێمە لە ڕادەبەدەر خوشبینین، پێتوایە ئەگەر بە عەرەبی بتنووسیبایە کتێبەکانت جیاوازدەبوون؟

**بن جەللون:** بەدڵنیاییەوە. چونکە زمان تەنیا کەرەستەیەکی نووسین نییە، بەڵکو کۆمەڵەیەکە لە پێکهاتەکانی زەین و مێشك، لەگەڵ هەموو ئەو باروبنە فەرهەنگیانەی کە مرۆڤ لەگەڵ خۆیدا دەیباتە ئەمبەر ئەوبەری پێدەکات، فەرهەنگی فەرەنسی زمان کامڵترە لە فەرهەنگی عەرەبی زمان، جگەلەوەش، عەرەبی، وەك ئەوەی کە گوتم، زمانێکی پیرۆزە و نووسەرانی عەرەب لەو شتە ترساون، ناتوانن بە توندوتیژی ڕەفتاری لەگەڵ بکەن.

**شوشا گاپی:** کتێبەکانت لە چ لایەنێکەوە جیاواز دەبوو؟

**بن جەللون:** بەر لە هەموو شتێك، ناوەڕۆکەکانیان جیاواز دەبوو. هەندێ شت هەیە کە لە زمانی عەرەبی نەمدەتوانی ئەنجامی بدەم، بۆ نموونە مەسەلەی سێکسی یا ڕەخنە لە ڕەفتاری ئاینیی هەندێ لە کەسایەتیەکان، بە وردی نازانم لە وردەکاریدا چی جیاواز دەبوو، هەر ئەوەندە

دەزانم کـە لەمپـەرەکانی بـەردەم کـار زیـاتر دەبوون.

**شۆشـا گـاپی:** ئـەو ئەگـەرە نـەبوو کـە بـە شـێوەیەك باسـی مەسـەلە سێکـسیەکان بکەیت؟

**بـن جـەللون:** لـە ئـەدەبیاتی کلاسـیکی عـەرەب، بـۆ نموونـە لـە سـەدەی چواردەم و پانزەم و شانزەمی زایینیی، دەقی ئیرۆتیکی گـرنگ هەیـە، لەوانـە (مێرغـوزاری بۆنـدار[7]) بەرهەمی نوسەرێکی سەدەی چواردەم (شێخ نـزراوی[8]) کـە (کاماسـوترا[9])ی جیهـانی عەرەبـە. منـیش دەمتـوانی بەهـەمان شـێوە بنووسـم، بـەڵام لـەبارەی ئـەو جـۆرە مەسـەلانە ناتوانرێـت دڵنیـا بیـت، چـونکە ئەوکاتـەی کەدەست دەکەیت بە نووسین، بە وردی نـازانی لـە کـوێ سـەر دەردێنێـت، هەنـدێ شـت لـە خۆیـدا ڕوودەدات، هـەر بەمجۆرە پێموایە لە زمانی عەرەبی دەکرێ باسـی مەسـەلەی سێکـسی بکرێـت، بـەڵام زاڵبوونی من بەسەر ئەو زمانەدا هێندە نییە کە بتوانم کارێکی وا بکەم.

**شۆشـا گـاپی:** لەلایـەك کاماسـوترای هینـدیمان هەیـە و لەلایـەکیش شـیعرە ئیرۆتیکـەکانی شـاعیرانی عـەرەب، وەکـو ئەبونـەواس، بـەڵام بـەیان کردنی ئیرۆتیك لە کلتـوری زمانـەکانی جۆراوجـۆر جیـاوازە، نووسـینە ئیرۆتیکـەکانی عـەرەب چ جیاوازیـەکیان لەگـەڵ ئـەو جـۆرە نووسـینەی ڕۆژئاوا هەیە؟

**بن جـەللون:** بەڕای من، چەمکی ئیرۆتیزم لـە خۆرهـەڵات بـەرفراوانترو وردتـرە لـە خۆرئاوا، بۆ نموونـە لە (هـەزار و یەکشەو)دا ڕەگـەزی ئیرۆتیکێکی گرنگ هەیـە کە یـەکێك لە کلیلـەکانی درکی خۆرهەڵاتـە، بـەڵام ئـەمڕۆ لە خۆرهەڵات جۆرێك سانسۆری تەرکەدنیایی هەیە، ڕەنگە هۆیەکەی بونیادگەرایی بێت – خـەڵك وەهمیـان هەیـە لـە شـتە چـاوەڕوان نەکراوەکان.

**شۆشـا گـاپی:** ئەگـەر لـە باکوری ئـەفریقا بـژیابایت بـە عـەرەبیت دەنووسـی، ئـەمڕۆ لـەو کەشـە بونیادگەرایانەیـە دەتتـوانی چی بنووسیت؟

**بـن جـەللون:** نووسـین مـەحاڵ بـوو، خۆکوشـتن بـوو، بونیاتگـەرایی بـە شـێوەی گـشتی دژی ئازادییـە، بـۆ نووسـەر، ئـازادی هـەر ئـەوە نییـە کـە دانیـشێت و بنوسـێت، بیرکردنەوەی ئازادانە دیاریکردنی ئازادانەی خـودیش هەیـە، بـەڕای مـن کۆمـەڵگای بونیاتگـەرا بـەو هۆیـەوە ناتوانێـت شـتێکی هـەبێت جگـە لـە بێـدەنگی یـا ئـەدەبیاتی بـەرگری، ئـەویش لـە دووره وڵات دروست دەبێت.

**شۆشـا گـاپی:** تەمـەنتان چـەند بـوو کـە نووسـینتان دەسـپێکرد، ئـەویش بـە نووسینی شیعر؟

**بن جەللون:** نووسین، ئەوکاتە بۆم بوو بە جـدی کـە خوێنـدکار بـووم، تەمـەنم بیـست و دووسـاڵ بـوو و فەلـسەفەم دەخوێنـد. بەرنامـەی خوێنـدنی زانکـۆی ئێمـە هـەروەکو سۆربۆن بـوو، لـە 1966 مـن و نزیکـەی سـەد خوێنـدکاری تـر بـە تـاوانی چالاکی سیاسـی دەسـگیر کـراین، منـیش ئەوکاتـە، وەکـو زۆربـەی ئـەوانی تـر، مـەیلم بـۆ چـەپ هـەبوو، حکومـەت لـەباتی ئـەوەی ئێمـە ببـات و بمانخاتـە زینـدان و لەئەنجامـدا بـە سـەرکوتکەرمان بـژمێرێت، ئێمـەیان بـەزۆر

نارد بۆ خزمەتی سەربازی کە ئەوکاتە لە مەراکیش شتی وا نەبوو، ئاوا بوو کە لە سەربازخانە سەرمان دەرهێناو خەریکی مەشقی سەربازی بووین، بەلام تێیانگەیاندین کە ئەوە جۆرە سزایەکە. من هەستم بە خنکان دەکرد و بەدزییەوە لە کاردانەوەی ئەو بارودۆخە شیعرێکی درێژم نووسی. هەژدە مانگ دواتر ئازادیان کردین و من بیرم کردەوە کە ئەو شتەی لە (زیندان) نوسیبووم چاپی بکەم، چونکە پێموابوو کە گواستنەوەی ئەو جۆرە تاقیکردنەوانە ئەرکی رۆشنبیرانە. ئەو شیعرە لە بلاوکراوەی (سوفله) چاپ و بلاوکرایەوە، کە شاعیرێکی مەراکیشی بەناوی (عەبدولەتیف لەعەبی)ی بلاویکردەوە.

ئەو شیعرە پێشوازییەکی باشی لێکرا و هەستم کرد خوێنەری باشم هەیە، ئەگەر شیعرەکەم پێشوازی لێ نەکرابوایە، رەنگە بەدوای نووسیندا نەچوبام درێژەم بەنووسین نەدەدا. کاردانەوەی خەلك بەرانبەر یەکەمین هەولی نووسەر زۆر گرنگە.

دوای زانکۆ، سێ سال لە دواناوەندی دەرسی فەلسەفەم گوتەوە، یەکەم لە (تیتوان[10] و دواتر لە کازابلانکا). لە 1971 بارودۆخی سیاسی مەراکیش کەم و زۆر ناجێگربوو.. کودەتا کرا، پێشبینی دەکرا کودەتایەکی تریش بەرێوەبێت و منیش دەمویست واز لە وانەگوتنەوە بهێنم و خەریکی خوێندنی دکتۆرا بم، ئەوەبوو هاتمە پاریس، هاتمە سۆربۆن، هەر لە رێگای کۆرسێکی خوێندن، لە پاریس خۆم لە نێوان خەلکی زۆر خۆشەویست و میواندار دۆزییەوە ئەوکاتە فەرەنسا ولاتێکی گەرم و خۆشەویستانە بوو لە کەشوهەوای ئەمرۆ وێناکردنی سەختە، خەلك وەکو ئەمرۆ لە کابووسی کۆچکردن نەدەترسان.

ئەمرۆکە کە تەنانەت خودی خۆشم، ئەگەر لەنکاو یەکێك بەرانبەرم بێت لە شەقام، هەلدەچم، هەلبەت زۆربەیان دەیانەوێت قسەیەکی خۆشەویستانە بکەن، بەلام هەندێ جار قسەکانیان بێزرێزییەکی نەژادپەرستانەیە، بۆ نموونە "بگەرێوە مالی خۆت، سەگی پیس"، یا قسەی ناشیرینی لەوجۆرە.

لە پاریس، کەسانێکم ناسی کە یارمەتی شایستەیان بە من بەخشی، لەگەل سەرنووسەری لۆمۆند بووم بە هاورێ، ئەو داوای لێکردم کە چەند وتارێك لەبارەی کۆچکردن بە شێوەی گشتی لەبارەی کلتوری عەرەب بنووسم، لەوکاتانە بوو کە یەکەمین رۆمانم، (هەرودە) نووسی ئەوم بردە لای موریس نادۆ[11] لە دەزگای بلاوکردنەوەی دونوئێل[12] و دام بەوان، ئەوکاتە لە هەموو دەزگاکان پتر گرنگی دەدا بە ئەدەبیاتی بیانی- بەو شتانەی کە تازە و هی"شوێنی تر"- بوون. ئەویش پەسەندی کرد، بەم شێوەیە بووکە دەستم پێکرد.

**شۆشا گاپی:** پێش ئەو رۆمانە کتێبێکی شیعرت بلاونەکردبووەوە؟

**بن جەللون:** بۆنا، رۆژێ هەروا چومە نوسینگەی دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی فرانسوا مەسپیرۆ[13] دەستنوسەکەم دایە هاوسەری مەسپیرۆ کە لێپرسراوی بەشی شیعریان بوو، ئەویش بریاریدا کە کتێبەکەم

بلاوبكاتەوە، پێشوازی ڕەخنەگران و خەڵك زۆرباش بوو.

ئەوان دوو هەزار دانەیان لەو كتێبە چاپ كرد كە ئەوكاتە بۆ شیعر تیراژێكی زۆر زۆربوو.

**شوشا گاپی:** ئەوكاتە، نووسەرانی خەڵكی باكوری ئەفریقا لە فەرەنسا زۆربوون، یان تۆ لە دەگمەنەكان بویت؟

**بن جەللون:** چەند كەسێك هەبوون، بەتایبەتی نەوەیەكی تەواو لە نووسەرانی جەزائیری كە بلاوبوونەوەی بەرهەمەكانیان لە دەیەی پەنجاوە دەستی پێكردبوو. وەكو كاتب یاسین، محەمەد دیب[14]، ژان پلگرینی[15]، ت عمروش[16] و ئەوانی تر، بەرهەمەكانی ئەوان بەگشتی لە شەڕی سەربەخۆی جەزائیرەوە هەڵقولابوو. بەلام كە دەڵێم باش پێشوازی لە كتێبی من كرا. ئەو پێشوازیە بۆ دڵخۆش بوونی من یان جۆرێك ڕێككەوتن نەبوو، سەركەوتنی منی ڕەوتێكی لەسەرخۆی هەبوو، من نوسەرێكی جدی بووم، هیچ پەیوەندییەكی بەمرۆوە نەبوو كە هەموو خەڵك دووسێ مانگ لەبارەی نووسەرێك قسەدەكەن پاشان هەموو شتێك تەواو دەبێت، ئەو بزر دەبێت و هیچ شوێنەوارێكی لێ نامێنێتەوە.

ئەوكاتە (هڕودە) سێ هەزار دانە زیاتر نەفرۆشرا، بەلام بەپێچەوانەی ڕۆمانە جەنجاڵییە سەركەوتووەكان، ئێستاش دوای بیست و چوارساڵ هەر هەیە و لە كتێبخانەكان دەفرۆشرێت.

**شوشا گاپی:** ڕۆمانی (هڕودە) زۆر ئەدەبی بوو، بیرۆكەی چیرۆكەكەی زۆر باش بوو، چیرۆكەكەی ڕاستەقینەبوو؟

**بن جەللون:** لە سەردەمی منداڵی كە لە فاس دەژیام، سۆزانیەكی پیر لەو شارەدا هەبوو كە زەینی منداڵان و مێردمنداڵانی سەرقاڵ كردبوو، من جۆرە باوەڕدارێكم لێ دروست كرد.

**شوشا گاپی:** بەلام سەركەوتنی ڕاستەقینە كاتێك ڕووی لە تۆ كرد كە خەلاتی (گنكور)ت وەرگرت. تۆ یەكەمین نووسەری عەرەب و لە ڕاستیشدا یەكەمین نووسەری بیانی بویت كە ئەو خەلاتەت بردەوە.

**بن جەللون:** نووسەرێكی ئەفریقایی لە ساڵی 1934دا ئەو خەلاتەی بردبوەوە، بەلام لە 1987 كە ڕۆمانی من ئەو خەلاتەی وەرگرت، باسی ئەو نەكرا، لە ئەنجامدا هەموو وایان زانی كە من یەكەمین كەس بووم، ئەو خەلاتە بووە هۆی ئەوەی كە ژمارەی خوێنەرانم زۆر زیاد بكات، بەلام ئەوكات ڕۆمانی پێشترم، (منداڵی لمی) كە دووساڵ پێشتر چاپ و بلاو بووەوە، كتێبێكی پڕ فرۆش بوو، سەدوپەنجا هەزار دانەی فرۆشرابوو، كاتێ كە (شەوی قەدر) خەلاتی وەرگرت، كاریگەری لەسەر هەموو كتێبەكانی ترم هەبوو.

**شوشا گاپی:** بێجگە لە بەرنامەی خوێندنی دواناوەندی، كام نووسەر هۆكاری یەكەمی نووسینی لە تۆدا دروست كرد؟

**بن جەللون:** ڕەنگە لاتان سەیر بێت، بەلام زیاتر لەگەڵ هەندێ دەرهێنەرەكان هەستم بە نزیكی دەكرد تا لەگەڵ نووسەران، لەوانە ئورسن ویلز، فدریكو فلینی، یاسوجیرو ئۆزو[17]، ئاكیرا كورساوا، میكل ئەنجیلو ئەنتونیۆنی، – ئەو كەسانەی كە چیرۆكیان دەگێڕایەوە. هەڵبەت كە حەزم لە

نووسینەکانی سارتەر و کامۆ و جینیە هەبوو کاریگەریشیان لەسەرم هەبوو، بەڵام هۆیەکەی زەمانە بوو، ڕۆحی زەمان، زۆرتر ئیلهامم لە ویلز و ئۆزۆ وەردەگرت تا لە ڕۆماننوسەکان.

**شۆشا گاپی:** هەوڵت نەدا ببیتە دەرهێنەری سینەما؟

**بن جەللون:** تەنانەت دەمویست بچمە دەزگای فێرکردنی باڵای سینەما و فیلمسازی و دەرهێنان بخوێنم، بەڵام زۆر زوو تێگەیشتم کە سینەما سنعاتێکە. سنعاتێکی زۆر قورس و ئاڵۆزیش. کاتێ کە وابەستەیت بەو هەموو هەلومەرج و مرۆڤە جۆراوجۆرە، ناتوانیت بەردەوام داهێنەر بیت. من عاشق بوونی سینەما و دروستکردنی فیلمم تێکەڵ کردبوو هەربۆیە، پەشیمان بوومەوە لەو کارە.

**شۆشا گاپی:** سینەما لە فەرەنسا جۆرێك عەشق و خۆشییە، هەرچییەك بێت فەرەنسیەکان ئەو شتەیان داهێنا. لە سەردەمی خوێندکاریت لە پاریس، تۆش وەکو هەموومان، زۆر دەچوویتە سینەما؟

**بن جەللون:** فیلم سیحرم لێ دەکات، ئەو شتەی کە لە سینەما لە هەمووشتێك زیاتر یارمەتی منی دا شێوەیەك بوو کە کەسانی وەکو ویلز و هیچکاك بەکاریان دەهێنا بۆ گێڕانەوەی چیرۆك بەشێوەی فیلم - لە ڕێگای دیمەنەکان-. لە چەند خولەکێکی سەرەتای فیلم، ناساندنی چەند کەسایەتییەك و شوێنەکانیان دەکەوێتە بەرچاو. دوای ئەوە دەکەوێتە ڕێ، ئەمڕۆ کە فیلمە ئەمریکیەکان لەڕادەبەدەر هەوڵ دەدەن کە واقیعی بن.

بۆ نموونە کەسێك ببینی کە خەریکە قاوە دەخواتەوە، لە خواردنگە یان کافتریا نان دەخوات، یان بە مشت لەدەم و چاوی یەکێکی تر دەدات، بەڵام ئوزو و ویلز واقیعیەتیان کۆپی نەدەکرد. گرنگ ئەوەیە کە چیرۆکێك بچنیت و کارێك بکەیت کە بینەر باوەڕ بکات، گرنگ ئەوەیە کاتێ کە لە هۆڵی تاریکی سینەما دانیشتویت، بگوێزرێیتەوە بۆ جیهانێکی تر لە دونیای خەیاڵدا، ئەوە هەر ئەو کارەیە کە من دەمەوێت لە کارەکانمدا ئەنجامی بدەم.

**شۆشا گاپی:** تۆ زۆر دەچویە سینەما، بەڵام خۆتان گوتتان کە زۆر خەریکی خوێندنەوە بوون، نووسینی کام نووسەرت دەخوێندەوە؟ نووسەری بیانیشیان تێدا هەبوو؟

**بن جەللون:** لە سەردەمی نەوجەوانیمدا، نووسینەکانی ئاشتین بەك، دوس پاسۆس، و فاکنەرم دەخوێندەوە، بەڵام جیمز جۆیس زیاتر لە هەموو نووسەرەکان یارمەتی دام. حەزم نەدەکرد درێژەدەری ئەو بم، هۆیەکەشی شەهامەت و بەرزیی ئەوبوو. بە خۆمم دەگوت ئەگەر جویس توانیویەتی تا ئەو ڕادەیە ئازا بێت، کەواتە منیش دەبێت شەهامەتم هەبێت، لە سەردەمی سەربازخانەمدا، داوام لەبرادەرێك کرد کە ئەستورترین کتێب کە دەتوانێت پەیدای بکات بۆم بنێرێت. خوێندنەوە قەدەغەبوو، بۆیە بە دزییەوە دەمخوێندەوە، کتێبێکم دەویست کە خوێندنەوەی زۆر درێژە بکێشێت، بەم شێوەیە بوو کە ئولیس بە قاچاغی هاتە سەرباز خانەکە، جەسارەتێکی زۆر ئەو نووسینە بوێرانەیە منی شاگەشکە کرد، من هیچم لەبارەی ئیرلەنداوە نەدەزانی،

هێڵی ڕۆیشتنی نووسەر و جەسوری ئەو بوو کە سەرنجی منی ڕاکێشا. هەرگیز سەرکەوتوو نەبووم و نەمتوانی (بەئاگایی فینیگانەکان) بخوێنمەوە، بەڕای من، نیگەرانیەکان لەبارەی ئەو کتێبەوە بێ سوودە، کتێبێکی ئاڵۆزە.

**شوشا گاپی:** بەهەرحاڵ، شیعری مۆدێرن، ئەگەرچی ئاڵۆزیش نییە، بەلام زۆربەی نادیارە، حەزت لێیەتی؟

**بن جەللون:** شیعری نادیار بوونی نییە، ئەگەر هەشبێت هەر شیعر نییە، شتێکی ترە شیعری ڕاستەقینە هیچ کات نادیار نییە، تەنانەت شیعری (مالارمە)ش ڕوون و ئاشکرایە، من خۆم شیعرەکانی سان جۆن پرس، رینیەشار، هەندێ لە شیعرەکانی (ئیوبونفو[18] و لویی رنە دیفورە[19])م پەسەند کردوە، هەندێ جار ئەو کتێبە شیعریانە دەخوێنمەوە کە بۆم دەنێرن، بەخۆم دەڵێم: "ئەوە قسەی قۆڕە! هیچ پەیوەندییەکی بە شیعرەوە نییە.) بەلام ئیتر هەندێ جار مرۆڤ هیچی نییە کە بیڵێت، یان قسەیەکی تری نیە کە بیڵێت و هێشتاش هەر درێژە دەدات!

بۆ نموونە ژان لوک گدار بێنە بەرچاوی خۆت، فیلمی یەکەمی هی ئەوە بوو دەستخۆشی لێ بکرێت، دواتر ڕۆژێك هەستم بە دیاردەیەکی سەیرکرد: گدار ئیتر قسەیەکی بۆ گوتن نەبوو، هەڵبەتە ئەو ئێستاش تەکنیکی هەیە- واتە هەمان شێوەی زۆر زیرەکانەی بەکارهێنانی دیمەن ووێنە- بەلام فیلمەکانی ئیتر سەرنجڕاکێش نین، بەتاڵن.

لەبارەی هەندێ شاعیریشەوە هەر وایە، هەربۆیە هەست دەکەم ئێستا شیعر غایبە، لانی کەم لە خۆرئاوا، جۆرێك ترس لە شیعردا هەیە، وەك بڵێی مرۆڤەکان شەهامەتیان لەدەست دابێت. لە فەرەنسا ڕاپەڕینی بەرگری ئیلهام بەخشی شاعیرانی وەکو ئاراگۆن، ئیلوار و رینیەشار بوو، شیعری بێ وێنە ئەوکات نووسران، مەسەلەیەکی چارەنووسساز بۆیان گرنگ بوو کە دەبوایە باسی بکەن.

دەبوایە بەرگری لە چەند بەهایەك بکەن کە کەوتبوونە مەترسییەوە، ئەمڕۆکە شاعیری فەرەنسی چی هەیە بۆ گوتن؟ لەبارەی لوپن[20] شیعر بڵێت؟ یان بێکاری؟ یان خۆکوشتنی لاوەکان؟ ئەو ناوەڕۆکانە سەردەمێکن و کاتیین.

بەرێکەوت نییە کە شاعیرێکی خراپی وەکو بوبن[21]، کە شیعری ئیحساساتی و نیوە ئایینی و کرچوکاڵی دەنووسی، هەرجارەی کە کۆمەڵە شیعرێکی نوێی بڵاودەکاتەوە، دەیان هەزار دانەی دەفرۆشرێت، ڕۆمانی کیمیاگەری کوئیلو کە بەڕای من زۆر ئاساییە یازدە ملیۆن دانەی لێ فرۆشراوە. هۆیەکەی ئەوەیە کە خەڵك پێویستیان بە شیعر هەیە و بەدوای جۆرە مەعنەویەتێکن، پێویستیان بە ئاسوودە دڵی و هیوا هەیە، بەلام ئەوە مەعنەویەتی بە بازارە، مەعنەویەتی (مونوپری)[22].

**شوشا گاپی:** پێموایە ئەمڕۆکە وێنەی شیعری لە نووسینەکانی هەندێ پەخشاننوسدا زۆر هەیە، لە زمانی ئینگلیزیش هەروایە، بۆ نموونە، بەڕای من سەرکەوتنی کتێبەکانی تۆ تاڕادەیەك

پەیوەندی بەوەوە هەیە کە نوسینەکانی تۆ، زەوقی تۆ شاعیرانەیە.

**بن جەللون:** ئەوە میراتی عەرەبی منە، کاتێ کە چیرۆك دەگێڕمەوە، هەست دەکەم مەراکیشیم، وەکو چیرۆکخوانەکانی مەراکیش چیرۆك دەگێڕمەوە، بە وێناکردن و پێکهاتەیەك کە هەمیشە واقیعی نییە، بەڵام شیعر دەتوانێت شوێنێکی باشی تێدا هەبێت.

**شوشا گاپی:** لە (هەزار و یەکشەو)دا کە زۆر وێنەی جوانی تێدایە، نووسەر وێنەکان دروست دەکات، ڕەنگە هۆیەکەی ئەوە بێت کە ئەو چیرۆکانە لە ڕاستیدا سەرزارەکی بوون و چیرۆکخوان ناچاربووە کە گوێگرەکانی شاگەشکە بکات و نەهێڵێت زەینیان پەرشوبڵاو بێت، تۆش چیرۆکەکانت وەکو چیرۆکخوانەکان دەگێڕیتەوە.

**بن جەللون:** من ناڵێم من هاوتای نووسەری (هەزار و یەکشەو)م، خۆشم پەیوەست ناکەم بە هیچ سەردەمێکی تایبەتی مێژووی عەرەبەوە، بەهەرحاڵ، لەکاتی نووسیندا هەست دەکەم، کە کلتوری عەرەب لە مندا خۆی شاردۆتەوە، بۆ ئامادەگیی(شیعر) لە نوسینەکانم لانی کەم ئەم ڕوونکردنەوە لۆژیکییەم هەیە، لەلایەن تەکنیکی گێڕانەوەدا زۆر لە ژێر کاریگەری (ڕۆلان بارت)دا بووم، لە ژێر کاریگەری وتارەکانی لەبارەی پەیوەندی دەق و ئەدەبیات. بەوپێیەی کە ڕۆمانی نوێ لە سەردەمی خوێندندا بۆم زۆر ماندووکەر بوو، حەزم نەدەکرد نووسینەکانم لە ڕۆمانی نوێ بچێت. کارم ئەوەبوو کە هەر بەم شێوەیە بەرەو پێش چووم و لەنکاو داهێنانم کرد، پێمواییە شێوازی من مەراکیشییە، بەڵام لەوانەیە ڕای مەراکیشیەکان ئەوە نەبێت.

**شوشا گاپی:** ناوەڕۆکی ڕۆمانەکانیشت هەر مەراکیشین، چیرۆکەکە هەمیشە لە مەراکیش، یان لانی کەم لە باکوری ئەفریقا، ڕودەدات.

**بن جەللون:** بەڵێ هەروایە، ئەو ناوەڕۆکانە مەغریبییەکی قوڵن، چونکە پەیوەندی بە چەند گرفتێکەوە هەیە کە مێشکی ئێمەی پێوە سەرقاڵە، گرفتی ژیانی ڕۆژانە-پەیوەندی ژنان و پیاوان لە کۆمەڵگایەکی-ئیسلامدا، پەیوەندی حکومەت و یاسا یان تاك و کۆ.

**شوشا گاپی:** لە هەموو وڵاتانی جیهانی سێیەم، بەتایبەت لە وڵاتە ئیسلامیەکاندا، لە ئەنجامی پەیوەندی لەگەڵ مۆدێرنیتە و ڕۆژئاوا بێباوەڕی هەیە، بابەتی یەکەمین کتێبی زۆر سەرکەوتووی تۆ، (منداڵی لمی)یش هەر لەو تەوەرەدا دەخولێتەوە، ئەو کتێبە چیرۆکی کچێکە کە دایك و باوکی وانیشان دەدەن کە کوڕە، چونکە پێش ئەو شەش کچی تریان هەبوو زۆر شەرمەزارن کە کوڕێکیان نییە، ئەم مەسەلەیە بۆ ئەو کچە داهاتووی غەمناکی لێکەوتۆتەوە. ئەو ڕۆمانەت لەسەر بنەمای ڕوداوێکی ڕاستەقینە نووسیوە؟

**بن جەللون:** نەخێر، پێکهاتووی مێشکی خۆمە، دەمویست ڕۆمانێك لەبارەی بارودۆخی ژنان بنووسم لە باکوری ئەفریقیا، بەڵام نەك بە شێوەی مامۆستا و بە ڕەقی، دەمویست کاردانەوەیەکم هەبێت بۆ ئەدەبیاتی فیمنیستی دەیەی 1980. ئەدەبیاتێك کە لیواولێو بوو لە زمانڕێژی و

توندوتیژی و بێ داهێنان، هەربۆیە بیرم کردەوە کە منداڵێك بکەینە تەوەرەی چیرۆك کە چارەنووسەکەی بە زۆر لە ڕێڕەوی ئاساییدا لادراوە، لە ئەنجامدا لە هەردوو جۆر هەلومەرجدا هەلومەرجی نێر و هەلومەرجی مێ دەژیت، دەتوانم، لە هەمان کاتدا چەند گرفتێکی تایبەتیش بەرجەستە بکەم.

**شوشا گاپی:** (شەوی قەدر) هەمان ئەو ڕۆمانەی تۆ کە خەڵاتی (گنکور)ی وەرگرت، درێژەی ئەو چیرۆکەیە، بەرگی دووەمی ئەو سیانەیە، کە بەرگی سێیەمیش (شەوی هەڵە)یە. بەرگی یەکەم واتە (منداڵی لمی) چەندین ئەگەری کۆتایی هەیە کە تۆ بە شێوەی چیرۆکنووسینی خۆرهەڵاتانە هەموویانت نیشان داوە، بەڵام بۆ درێژەی چیرۆك دەبوایە یەکێك لەوانت هەڵبژاردبایە، چۆن بڕیارتدا؟

**بن جەللون:** ئەوە خوێنەران بوون کە داوایان لێکردم کە چیرۆکەکە درێژە پێبدەم، نامەی زۆرم پێدەگەیشت و هەموو دەیانویست ئاگاداری چارەنووسی ئەحمەد- زەهرا بن، مەبەست هەر ئەو کەسایەتیە سەرەکیەی چیرۆکەکە ناسنامەی ڕەگەزی دوانەی هەبوو، ئەو کارە بە جۆرێك قسەکردن بوو لەبارەی ژنانەوە دوور لە بیرگرساوی.

**شوشا گاپی:** ئەگەر خوێنەران ئەو پێشنیارەیان نەکردبایە، هەر درێژەی چیرۆکەکەت دەنووسی؟

**بن جەللون:** دەکرێ پێچەوانەی ئەوەش بڵێین: ئەگەر چیرۆکێك لە گۆڕێ نەبوایە، کە تەواوکەرەکەی بنووسم، خوێنەران پێشنیارێکی وایان دەکرد؟

**شوشا گاپی:** تۆ گوتوتە: (ژن بوون کەموکوڕییەکی سروشتیە و هەموو ئەوە قەبوڵ دەکەن، پیاوبوون تەوەهوم و توندوتیژییە کە هەمووشتێك ئاڕاستە و پشگیری دەکات) ئێوە لە بارودۆخی ژنان لە دنیای ئیسلام، بەتایبەت بە لەبەرچاوگرتنی گەشەی فوندەمێنتالیزم کە بە شێوەیەکی دیاریکراو ژنان دەکاتە ئامانج، بۆچوونی وات هەیە؟ ئەم پرسیارە بەو هۆیەوە دەکەم کە هاوسەنگی سەرکوتکردنی ژنان لەلایەن گروپە بونیاتگەراکانەوە، فیمینیستییەکی ئیسلامی پڕ ڕەونەقیش بوونی هەیە.

مەسەلەی فیمنیستە ئیسلامیەکان لەسەر بنەمای پەروەردە و مێژووی ئیسلام بنیات نراوە، ئەوان لەو باوەڕەدان کە ستەم لە دژی ژنان لە وڵاتە ئیسلامیەکاندا هیچ پەیوەندییەکی بە ئیسلامەوە نییە و ئیسلام لە ڕاستیدا بۆ ئەوان جۆرێك ئازادی بووە و بۆتە هۆی دەرکەوتنی ژنانی بەرجەستە- لە لێپرسراوانی حکومەت بگرە تا دەگاتە سیاسەتمەداران، شاعیران، و عارفان.

یەکێك لە زماندرێژترین و باشترین فیمینستەکانی موسڵمان هاوولاتی تۆیە. فاتیمە مەرنیسی مێژوونووس و کۆمەڵناس، کتێبەکانی ئەو، لەوانە- شاژنە لەبیرکراوەکانی ئیسلام[23]، و ئیسلام و دیموکراسی، و ئەوبەری باڵاپۆشی[24]، نیشانی دەدەن کە فەرمانڕەوایانی گەندەڵ و ڕێبەرانی ئاینیی تا چ ڕادەیەك لە ماهیەتی ئیسلامیان لاداوە، بە سەرنجدانی ئامانجی بنیاتنەری ئەو ئایینە. بەبڕوای ئەو، ئەمڕۆکە ستەم بە ژنان دەگەڕێتەوە بۆ دواکەوتوویی،

هەژاری و نایەکسانی و ئەو گەندەڵییەی کە لە وڵاتانی جیهانی سێیەم برەوی هەیە.

**بن جەللون:** مافی خۆیانە، باڵاپۆشی (حیجاب) ئێستاش لە هەموو ئاینیەکان هەیە، تەنانەت لە مەسیحییەتدا، هەیە، خەڵك کاتێ کە دەچنە ناو کڵێسا یان کەنیسە یان مزگەوت وەکو نیشانەیەکی ڕێز سەری خۆیان دادەپۆشن، ڕاسپێردراوە کە لەکاتی خواپەرستیدا ئەوکارە ئەنجام بدەین، بەڵام بەبڕوای من جیاکردنەوەی دین لە سیاسەت زۆر زەرووره. ئایین مەسەلەیەکی کەسییە کە پەیوەندی بە پەیوەندی تاك و خوایە. ئایین پەیوەندی بە شتێکەوە هەیە ئەبەدییە، و سیاسەت بەگوێرەی ماهیەتەکەی کاتیە. هەربۆیە دەبێ ئەو دووە لەیەکتر جیابکەینەوە، ئەگەر وا نەبێت، وڵاتە ئیسلامیەکان هەرگیز زاڵ نابن بەسەر دواکەوتوویی و زوڵم و زۆردا.

**شوشا گاپی:** بابچینەوە سەر ئەحمەد — زەهرا. ئەو گرفتەکەی چۆن چارەسەر دەکات؟

**بن جەللون:** ئیشی من وەڵامدانەوە یان ڕێگاچارە نیە، بەڵکو خستنەڕووی پرسیارەو لێکۆڵینەوە لە بارودۆخێکی مرۆڤایەتی، بەو ئومێدە چیرۆکێك دەگێڕمەوە کە ئامانجم کاردانەوە و بزواندنی بیری خەڵکە.

**شوشا گاپی:** لە نێوان ئەو کتێبە سێیانە، کتێبێکی بچوکت نووسیوە لەبارەی هاوڕێیەتی، بەناونیشانی (لە دەستخۆشی هاوڕێیەتیدا[25]) لەم کتێبەدا لەبارەی هەموو دۆستانێك قسەت کردووە کە لەماوەی ساڵانی ژیانت یارمەتیان دایت، ژان ژینە یەکێك لەو کەسانەبوو کە بۆ تۆ زۆر گرنگی هەبوو، ئەو کەسایەتیەکی زۆر سەیری هەبوو کەم تا زۆر دەرونی و لە ناوخۆ، بێ متمانە بەخۆبوون، و دوورەپەرێز، تەنیا چەند کەسێکی کەم کەسایەتی ئەویان دەناسی، ئێستا، دوای ڕابوردنی کات، دەربارەی ئەو و کارەکەی چ ڕایەکت هەیە؟

**بن جەللون:** ژان ژینە، کەسێکی کەم وێنەبوو، ڕۆمانی یەکەمم کە بڵاوبووەوە، دانەیەکم بۆ نارد لە ڕێگای دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەکەی، بێئەوەی هیچ ئومێدێکم هەبێت بە وەڵام، چونکە هەموو دەیانزانی ئەو چەند کەمڕوو و لە نێوخۆیەتی، ڕۆژێك یەکێك لە دۆستە کۆمۆنیستەکانم کە بەردەوام ڕۆژنامەی (ئومانیتە)ی دەخوێندەوە، پێی ڕاگەیاندم کە وتارێك لەبارەی منەوە لەو ڕۆژنامەیە چاپ بووە. بەپەلە چووم ئەو ڕۆژنامەیەم کڕی، ئەو وتارە لە ڕاستیدا دەقی بەرنامەیەکی ڕادیۆیی بوو کە ژینە لەبارەی چەندین نووسەری عەرەب ئامادەی کردبوو. لەو وتارەدا هێرشی کردبوە سەر سارتەر و گلەیی ئەوەی لێدەکرد کە وەکو پێویست گرنگی بەو نووسەرانە نەداوە، یەکێك لەوانیش من بووم.

یاداشتێکم بۆ ناردو سوپاسم کرد لەوەی کە کردوویەتی، لەگەڵ ئەوەش ئاماژەم بەوە کرد کە لە بەشی ناوخۆیی زانکۆ دەژیم. ڕۆژی دواتر تەلەفۆنی منی دەویست. ژان ژینە بوو، پێشنیاری دەکرد کە یەکتری ببینین.

ئەوە دەسپێکی دۆستایەتیەکی قووڵ بوو کە تا کۆتایی تەمەن لەگەڵیدا بەردەوام بووم. لە 1979، سەردەمی شۆڕشی (ئیمام خومەینی) لە ئێران پێی گوتم: "ئەو

پیرەمێــردەم خــۆش دەوێــت، چــونکە بــە ئـەمریکاو ڕۆژئـاوا دەڵێـت گـۆڕی باوکتـان!" ناکۆکیـە سیاسـیەکەی نێـوان شـای ئێـران و ئیمـام خـومینی نـەبوو کـە سـەرنجی ئـەوی ڕادەکێشا، بەڵکو مەسەلەی شۆڕشی مرۆڤێك لەبەرانبەر ڕژێمێك، و لە بەرانبەر دونیا، بۆیە جێگــای ســەرنج بــوو، ژینــە بــەردەوام هەڵوێــستێکی تونــدی هــەبوو، چــونکە شۆڕشــگێڕ بــوو، دژی هــەموو جۆرەکــانی دەسەلات بوو.

هاوڕێیەتیــەکی قــووڵ لــە نێوانمانــدا دروسـت بـوو. هەرچـەندە لـە ڕاسـتیدا ئـەو بـاوەڕی بـە هاوڕێیـەتی نـەبوو، ئـازادی و وەفـاداری لەگـەڵ یـەك نـەدەگونجان. لەگـەڵ ئەوەشـدا، هەمیـشە بـۆ مـن هاوڕێیـەکی زۆر باش بوو، پێی دەگوتم: "لەکاتی نووسین بیر لــە خوێنــەران بکــەوە، ســادە بنووســە". هەوڵمــدا ڕاســپاردەکەی جێبــەجێ بکــەم، چونکە هەست دەکەم کە سادەیی نیشانەی پێگەیشتن و کامڵ بوونە.

**شوشــا گــاپی:** لـە ولاتـانی خۆرهـەلاتی ناوەڕاست، هاوڕێیەتی زۆر قووڵە، لە ئێران کـە زۆر سـەیرە، شـتێکە نزیکـی عەشـق، لـە مەراکیش هەروایە؟

**بن جەللون:** نەك بەو توندییە، بەلام هاوڕێ لـە ژیـانی مـن ڕۆڵـی گرنگـی هەیـە، عەشـق شتێکی ترە، زۆر خاڵ لەبەرانبەر هاوڕێیـەتی هەیـە، عەشـق ئـاڵۆزە، لێوانلێـوە لـە گرفـت. هەمیشەیی نییە، وابەستەیە بە چەند شتێك کـە مـرۆڤ زاڵ نییـە بەسـەریاندا. هاوڕێیـەتی ڕێك پێچەوانەی عەشقە- سادە و بە ئارەزوو پایەدار.

**شوشا گاپی:** ڕۆمانی گەندەڵ[26] کە لە 1994 بلاوبـووەوە، باسـی گرفتـی گەنـدەڵی دەکـات لـە ولاتێکـی وەکـو مەراکیـشدا. ئـەو کتێبە سیاسیترین و ڕەخنەگرانەترین کتێبی تۆیـــە، پێتوایـــە سیاســـەت بتوانێـــت بارودۆخــەکان لــە مــەغریب یــان ولاتــانی جیهـانی سـێیەمدا بگۆڕێـت؟ یـان ئـەوەی کـە نوێکردنەوەی ژیانی ئەخلاقی و مەعنەویش پێویستە؟

**بـــن جـــەللون:** نوێبوونـەوەی ژیـانی ئـەخلاقی و مەعنـەوی بـەبێ سیاسـەتی پـاك و بەشـەرەف مەحاڵـە، لـە ئەنجامـدا بنبڕکردنـی گەنـدەڵی بـەواتای هەوڵـدان بـەرەو پـاکی ئەخلاقی و فەرهەنگی کۆمەڵگاشە.

**شوشا گاپی:** ڕۆمانی نوێتان (شەوی هەڵە) سێیەمین بەرگە لـە سێیانەکەتان، کەسایەتی سەرەکی ئەو کتێبەش ژنێکە، ئەو مەسەلەیە کاردانـەوەی تۆیـە بـۆ ئـەو بارودۆخـەی کـە بەسەر ژنانی جەزائیردا دێت؟

**بـن جـەللون:** نـەخێر، ئـەو ڕۆمانـە، باسـی توندوتیژییەکی تایبەت دەکات کە ماوەیـەکی زۆرە لە کەسایەتی ئەو ژنە دیار نەکەوتوە و سەرەنجام تۆڵەی خۆی دەکاتەوە، ئەو ڕۆمانە ڕیالیستی نییە، چیرۆکی توندوتیـژی ژنێکـە کـە ماوەیـەکی زۆر لـە ژێـر زوڵـم و زۆر بـووە. ئـەو توندوتیژیـەش سـەرەنجام دەتەقێتـەوە. بـەلام ئـەو ژنـە واقیعـی نیـە، پەیوەنـدی بـە جیهانی ئەفسانەکانەوە هەیە.

**شوشا گــاپی:** لەبارەی ڕیالیزمی جادویی ڕاتان چییە؟ ئەم جۆرەی ئەدەبیات بەتایبەتی لـە ئـەمریکای باشـور، سـود لـە کەسـایەتی ئەفــسانەیی خۆشەویــست وەردەگــرن بــۆ ڕوونکردنــــەوەی بــــارودۆخی ئێــــستا. ڕۆماننوسـەکانی ئـەمریکای لاتـین جیاوازیـان

هەیە لەگەڵ تۆ؟ بەشێوەیەکی تایبەت کام نووسەر یان کام نووسین پەسەند دەکەیت؟

**بـــــن جـــــەللون:** مـــن زۆر حـــەزم لـــە نووسینەکانی خوان رولفۆ، خوان کارولۆس ئۆنیـــــت[27] و هەنـــدێ لــــە ڕۆمانـــــەکانی ماركیزیشم پێ خۆشە، بەڵام پێموا نیە ئێمە پەیوەنـدیمان بەیـەك قوتابخانـەوە هـەبێت. ئـــەوان لـــە فەرهـــەنگی خۆیـــان ریـــشەیان هەیـــە و منـــیش لـــە فەرهـــەنگی خـــۆم، ئـــەو دوو فەرهەنگـــــــــەش زۆر جیـــــــاوازن، هۆیەکەشـــی تـــەنیا ئیـــسلام نییـــە، هۆکـــاری تـــری وەکـــو مێـــژوو پێگـــەی جـــوگرافیش کاریگەریان هەیە.

**شوشا گا پی:** چۆن کارەکانت ڕێکدەخەیت؟

**بـــن جـــەللون:** هـەموو ڕۆژێـك لـە مـاڵ دەردەچـمو بەدرێـژایی ڕۆژ لێـرە کاردەکـەم و پاشـان دەچـمەوە مـاڵ تـا شـەوەکەی لەگـەڵ خێزانەکـەم، هاوسـەرم و چـوار منداڵەکـەم بەسەربەم.

**شوشـــا گـــا پی:** بەدەسـت دەنووسـیت یـان کۆمپیوتەر؟

**بن جەللون:** بەدەسـت دەنوسـم. کۆمپیوتـەر بۆ نووسینی وتارە، چونکە ڕۆژنامەکان دەق لەسەر دیسك داوادەکەن.

**شوشا گا پی:** بیرۆکەی ڕۆمانی نوێ چۆن بە زەینتـــان دەگـــات؟ کـــاتێ کـــە کتێبێـــك دەنووســــیت، هـــەموو کارەکـــانی تـــرت رادەگریت؟

**بن جەللون:** واز دێنم تا بیرۆکەی ڕۆمان بۆ ماوەیەکی درێژ جێی خۆی بگرێت، نووسین کاتێـك دەسـت پێدەکـەم کـە هەسـت بـە زەرووڕەتێکی تایبەت بکەم. کاتێك خـەریکم کتێـب دەنووسـم، نـاتوانم زۆر بخوێنمـەوە، هەمووکاتەکـەم خـەریکی نووسـین دەبم، ئـەوە تاقە کارە کە چێژی لێ وەردەگرم.

**شوشا گـا پی:** چ شتێك زیـان بـە کارەکانـت دەگەیـەنن؟ هێمنگـوای دەیگـوت تەلـەفۆن لـە هەموو شتێك خراپترە.

**بن جەللون:** بۆڵـەبۆڵ، تووڕەبوونی بچووك، دژیەکیـەکان– چ کۆمەڵایـەتی و چ دەروونـی– ئـەو کاتـەی کـە بـۆ هەنـدێك کاری ناپێویـست خـــەرج دەبێـــت، کارەکـــانی ڕۆژانـــە، بـەڵام نووسـین بـەبێ ژیـان مەحاڵـە، ژیـان بریتیـە لـە هەڵـسوکەوت لەگـەڵ کارمەنـدی پۆســـتە، لێخـــوڕین لـــەکاتی قەڵەباڵغیـــدا ڕووبـــەڕوو بوونـــەوەی پێویـــستیەکانی ڕۆژانەش هەر هەیە.

بـەم شـێوەیە. ئـەوەی کـە کارەکـەم پـەك دەخات دەرەکییە، بەڵام ئەوەی کە بەڕاستی گرفـت دەخاتـە کـار، ونکردنـی ئومێـدە، گەیـشتنە شـوێنێکە کـە مـرۆڤ لـە خـۆی بپرسێت کـە چ سـودێکی هەیـە؟ هـەر کاتێك هەسـت بکـەم ئـەدەبیات بـێ سـوودە. واز لـە نووسـین دێـنم، تـا ئەوکاتـە لەگـەڵ هـەموو دژایـــەتی و ململانێیـــەك بـــەردەوام دەبم، بەکورتی مرۆڤ ئەو کاتە دەوەستێت کە ئیدی هەست بە پێویستی نووسین نەکات.

**شوشا گا پی:**

گۆرڤیـدال[28] کاتێـك گوتویـەتی ڕێـك هـــەروەك ئـــەوەی دووکانـــدار دەچـــێتە دووکانەکـەی هـەموو ڕۆژێـك، یـان پزیـشك دەچــــێتە عیادەکــــەی، نووســــەریش دادەنیـشێتو دەنووسـێت، بـەو مانایـەی کـە نووســـین پیـــشەیەکە، کارێکـــە کـــە نووســـەر ئـــەنجامی دەدات. ڕای ئێـــوەش هەر ئەوەیە؟

**بــن جــەللون:** نــەخێر، ئــەوە تێڕوانینێکی ئەمریکیــە، بــەڕای مــن، ئەگــەر نووســەرێك بــۆ بەســـەربردنی ژیـــان بنووســـێت، ناچـــاری دانوســـتانە، دەبــێ بــەردەوام ئاگاداربێــت کــە چی دەفرۆشرێت یان چی نافرۆشرێت.

کەڵکەڵــەی مــن ئــەوە نییــە، خۆشــحاڵم لەوەی کە خوێنەرانێکم پەیداکردووە، بەڵام مرۆ ناتوانێت تەنیا ئەو شتانە بنووسێت کە لەوانەیە بفرۆشرێن. نووسەر جیاوازە لەگەڵ دووکاندار، ئەو جیهانێکی خەیاڵی دروست دەکات و دەیگوێزێتەوە بۆ خەڵکانی تر.

**شوشـــا گـــاپی:** کەوایــە بــەڕای تــۆ ڕۆڵــی نووســـەر ئەمەیـــە؟ شـــیلی ڕســـتەیەکی بـــەناوبانگی هەیـــە دەڵـــێ شـــاعیران یاســادانەرانی قەدرنەناســی جیهــانن، تــۆش لەگەڵ ئەو ڕایەدایت؟

**بــن جــەللون:** مــن هێنــدە و تــا ئــەو ڕادەیــە بــەرزفڕ نــیم. بــەڕای مــن، نووســەر بینەرێکــە، ئــەو بینــەری ســەردەمی خۆیــەتی لــەمڕووەوە، شــوێنێکی باشــی هەیــە، پێموانییــە نووســەر ڕۆڵـــی دیاریکـــەری هـــەبێت. ئـــەو چـــیرۆك دەگێڕێتەوە و لە ڕێگەی ئەم کارەوە لەبارەی کۆمەڵگای خــۆی و لەبارەی دونیــا ڕای خــۆی دەڵێــت، و لــە ڕێگــای خەیاڵــەوە پەیوەنــدی دروست دەکات.

**شوشـــا گـــاپی:** کــاتێ کــە سکێچی گــشتی چیرۆك ئامادەبوو و دەستت بە نووسین کرد، بەردەوام زاڵیت بەسەر چیرۆکەکە، یان ئەوەی کە هەندێ شتی ناخی چیرۆك جڵەو دەگرێتە دەست؟

**بن جەللون:** وانییە کە هەمیشە بزانم چی ڕودەدات، بــەڵام هەســت بــە ئــازادی دەکــەم، هەســـت ناکـــەم ســـنوردارم یـــان دەســـەڵاتم بەســـــەر چـــــیرۆك لەدەســـــت دەدەم، بەهەســـتی خـــۆم دەچـــمە پـــێش، لەوانەشـــە لــەنکاو بیرۆکــە و ئەگــەری نــوێ بهێنمــە نــاو کارەکــە و گۆڕانکارییــەکی پێــشبینی نــەکراو ئەنجام بدەم.

**شوشا گاپی:** کامیان زووتر دروست دەبن: بیرۆکـــە، یـــان سکێـــچی چـــیرۆك یـــان کەسایەتیەکان؟

**بـــن جـــەللون:** بیرۆکــەی ســەرەکی گرنگــی هەیــە، بــەڵام وشــەش گــرنگن، وشــەکان دەبــێ باش و لــە شــوێنی خۆیــدا هەڵبــژێردرێن و لــە شوێنی خۆیان دابنرێن. دەتوانرێت بگوترێت کارێکی زۆر وردە، ڕەنگە سەرچاوەی چیرۆك شـــتێك بێـــت کـــە مـــن بینیومـــە، یـــا خوێندوومەتـــەوە یـــان بیـــستومە، نووســـەر ئاگاداری هەمووشتێك نییە، ئەگەر ئاگاداری هەموو شتێك بوایە، نووسین دەبووە کارێکی ماندووکەر، ئەو چیرۆك بەڕێوەدەبات، کەش و هـــەوای چـــیرۆکەکەیە، جیهانێکـــە کـــە لـــە دەوروبەری کەسایەتیەك دروست دەبێت، هەر ئــەو کەســایەتیەیە کــە نووســەر بــەرەوپێش دەچێت، چیرۆکەکە خەڵق دەکات.

**شوشا گاپی:** زۆر پاکنووسی دەکەیت؟

**بـــن جـــەللون:** باشــترین دەق ئەوەیــە کــە یــەکجار بنووســرێت، بــەڵام شــتی وا زۆر کــەم ڕودەدات، مەحاڵــە، مـــن هەربەشـــێك لـــە ســەرەتاوە تــا کۆتــایی پــاکنوس دەکــەم، نــەك تەنیا پارەگرافیك لێرە و خەتێك لەوێ، ڕەنگە پارەگرافێك زیاد بکەم یان لای ببەم.

**شوشا گـــاپی:** بۆ داهــاتوو چ بەرنامەیــەکت هەیە؟

**بــن جــەللون:** ئێــستا خــەریکی نووســینی ڕۆمـــانێکی نـــوێم کـــە لـــە نـــاپۆل ڕودەدات

یەکەمین جارە کە هەوڵ دەدەم لە مەراکیش دەربچم. ماوەیەك لەمەوبەر وتارێکم لەبارەی نەژادپەرستی نووسیبوو لە ژێر ناونیشانی (میوانداری فەرەنسی) کە لە 1984 بڵاوببووەوە. بەم دواییە سەرلەنوێ پیایدا چوومەوەو بەرفراوانم کرد. پێشەکیەکی درێژم بۆ نووسی تا ڕوونی بکەمەوە کە لەو سیانزە ساڵە چ گۆڕانکارییەك ڕوویداوە و بارودۆخ چەند خراپتربووە.

**شوشا گاپی:** ڕەنگە من لە ڕادەبەردەر خۆشبینبم، بەڵام پێموایە کێشەی لوپن لادانێکی کاتییەو فەرەنسیەکان بەم زوانە نەریتی پەنادانی ئازار چەشتوان و ئەشکەنجە دراوان دێننەوە گۆڕێ. هەرچی بێت، کلتوری فەرەنسا سوودی زۆری لەو مەسەلەیە وەرگرتووە. سەیرکە لە سەدساڵی ڕابردوو چەند شاعیر و نووسەر و ئەندێشمەند لە وڵاتانی تر هاتونەتە فەرەنسا.

**بن جەللون:** بەخۆشیەوە ئارەزووم وایە تۆ ڕاست بکەیت، لە ئێستادا ئەوەی کە لەدەست ئێمەبێت - ئێمەی نووسەر و هونەرمەند و بیرمەندەکان- تەنیا لە ڕێگای کارمان و لە ڕێگاو شێوازی خۆمانە.

## پەراوێزەکان:

*1-Le Racism explique a ma filles,*

*2-La Nuit sacree.*

*3-Harruda.*

*4-La Nuit de l'erreur.*

*5-L 'Enfant de sable.*

*6-Editions du Seuil.*

*7-The Scented Meadow.*

*8-Sheikh Naszawi.*

*9-Kama Sutra.* ناونیشانی نامەیەکی دێرینە لەبارەی هونەری عاشقبوون

*10-Tetouan.*

*11-Maurice Nadeau.*

*12-Denoel.*

*13-Francois Maspero.*

*14-Mohammad Dib.*

*15-Jean Pelegrini.*

*16-T.Amrouche.*

*17-Yasujiro Ozu* دەرهێنەری بەناوبانگی ژاپۆنی .

*18-Yves Bonnefoy.*

*19-Louis-Rene des Forets.*

*20-Jean-Mari Le Pen* لەدایك بووی 1928 سیاسەتمەداری فەرەنسی و دەرچوی کۆلێژی ماف.

*21-Bobin*

*22-Monoprix* فرۆشگایەکی گەورەی فەرەنسا کە لە هەموو فەرەنسادا هەیە.

*23-The Forgotten Queens of Islam.*

*24-Beyond the veil.*

*25-L'Eloge de L'Amittie.*

*26-l'homme rom pu*

*27-Juan Carlos Onetti.*

*28-Goe vidal*

### سەرچاوە

*The paris Rivuew 152, Fall 1999*

# زستان

زوویا پیرزاد

لەفارسییەوە: نەجیبە ئەحمەد

بەفر دەبارێ. ریزە خانووەکانی ئەمبەر و ئەوبەری کۆڵانە باریك و درێژەکە دەڵێی بۆ ئەوەی گەرم دابێن پێکەوە چەسپاون.

لەودیو پەنجەرەکەوە ژنێك پەردەکە لادەبات و سەیرێکی دەرەوە دەکات. پشیلەیەکی خۆڵەمێشی باز دەداتە سەر چوارچێوەی پەنجەرەکە، قژە سپییەکەی ژنەکە و سپێتی تۆڕی پەردەکە ئاوێتە دەبن و دەبنە یەك. لەوبەری کۆڵانەکەو لەبەردەم ماڵەکەی بەرامبەردا، لە ناو دەنکە دەنکەی بەفرەکەوە ئەمبولانسێك دیارە. پشیلەکە باوێشکێك دەدات و خۆی رادەوەشێنێ. دەستێکی ژنەکە چنگ لە پەردەکە دەدات و دەستەکەی تریشی بە چەپکێ دەماری شینەوە لە گیرفانی تەنوورە رەشەکەیدا گوم دەبێ.

لە ماڵەکەی بەرامبەرەوە دوو پیاوی گەنج ژنێکی لەڕو لاواز بەسەر دەستەبەرەیەکەوە دەهێننە دەرەوە. دەنکە بەفرەکان دەرژێنە سەر قژە زیوینەکەی ژنەکە. دەرگای پشتەوەی ئەمبولانسەکە دەکرێتەوە. لەودیو پەنجەرەکەوە چاوە سەوزەکانی پشیلەکە شوێن دانە بەفرێك دەکەوێ، چرچەکانی دەوری چاوی ژنەکەش دەچنەوە یەك. لەسەر دەستەبەرەکەوە سەری ژنێك دەسووڕێ و چاو دەبڕێتە پەنجەرەکەی بەرامبەر. لەودیو پەنجەرەکەوە ژنە بە هەردوو دەست دەمی نیوە داچەقاوی دادەپۆشێ. لە نێوان دەزوولەی بەفرەکەوە جووتێ نیگا رێگا دەکەنەوەو وردە وردە دەچنە پێشەوە و بەیەك دەگەن.

*****

بەفر دەبارێ لە کۆڵانێکی تەنگەبەری درێژدا دوو کچۆڵە یاری دەکەن. یەکێکیان قژێکی خاوو درێژی هەیە، قردێلەیەکی نارنجیش بە

نـووکی پەلکـەی دووەمییانـەوە پەپوولەیـەکی دروسـت کـردووە. کـچۆڵەکان قریوەقریـو و ڕاکـە ڕاك تۆپەڵە بەفر دەگرنە یەکتری.

*****

بەفر دەبارێ. دوو کچی جحێڵ لە ناوەڕاستی کۆڵانـدا وەسـتاون. یـەکێکیان دەسـتی دێنێتـە پێـشەوە. دەنکـێ بـەفر دەکەوێتـە سـەر ئەڵقـە ئاڵتونییەکـەی پەنجـەی و یەکسەر دەتوێتـەوە، تۆپەڵـە بـەفرێکیش بـەر سـەری کـچەکەی تـر دەکـەوێت و قـژە خـاو و درێژەکـەی تێك دەدات. کــچۆڵەکان بــە قریــوە قریــوو پێکــەنین دوور دەکەونــەوە، کــچە جحێڵــەکانیش پێدەکــەنن. یـەکێکیان دادەنەوێتـەوەو قردێلەیـەکی نـارنجی لەسەر بەفرەکە هەڵدەگرێ و لـە دەوری پەنجـەی دەپێچێ.

*****

بـەفر دەبـارێ دوو ژنـی جـوان و جحێـڵ بـە کۆڵاندا تێدەپەڕن. هەریەکەیان دەستی منـاڵێکی لە دەستدایە. مناڵێکیان پێی هەڵدەخلیسکێ و دەکەوێتــــە ســــەر زەوی. کــــچێکی جحێــــڵ قردێلەیـەکی نـارنجی فرێدەداتـە سـەر بەفرەکـە و دادەنەوێتــەوە و لــە بەرزکردنــەوەی مناڵەکــەدا یارمــەتی دەدات. دایکەکــە قــژە هۆنراوەکــەی هەڵدەداتـەوە پـشتەوە و سوپاسـی دەکـات. دوو کــچی جحێــڵ بــە دەم بــزەو پێکەنینــەوە دوور دەکەونەوە.

*****

بــەفر دەبــارێ. دوو ژنــی بەسالاچــوو، بــە لەشـولارێکی قورسـەوە و لـە دوو مـاڵی بەرامبـەر بەیەکەوە دێنە دەرەوە. بە دڵنیایی و ئارامییەوە کلیلـــەکان دەخەنـــە قـــوفڵی دەرگاکانـــەوەو دەیانــچەرخێنن. زۆر بــە وریاییــەوە هــەنگا و هەڵــدەگرن و لــە ناوەڕاســتی کۆڵانەکــەدا پێــك دەگــەن. دەوەســتن و پێکــەوە قــسە دەکــەن. یــەکێکیان زەرفێکــی نامــە لــە گیرفــانی پــاڵتۆ هەراوەکـــەی دەردەهـــێنێ، زەرفەکـــە چـــەند وێنەیەکی تێدایە، کە دەریاندەهێنێ وێنەیەکیان دەکەوێتـە سـەر بەفرەکـە. ژنەکـە لـەتاو ئـازاری دانەواندنـەوە بـە تـرس و نیگەرانییـەوە سـەیری وێنەکــە دەکــات و بــە دەســت دەکێــشێ بــەلا رووەمــەتی خۆیــدا. ژنێکــی جحێــڵ کــە بەلایــدا تێدەپەڕێ دەستی مناڵەکەی بەردەدات و گورج و چـالاك دادەنەوێتـەوە و وێنەکـە هەڵدەگرێتـەوە. ژنــە بەسالاچــووەکە سوپاســی دەکــات، ئینجــا تەڕایی بەفرەکە لەسەر وێنەکە لادەبات.

*****

بەفرەکـــە نیـــازی خۆشـــکردنەوەی نییـــە. تاریکـــایی نـــاو ئەمبولانـــسەکە پەیکـــەری لەڕولاوازی ژنە قووت دەدات. لەودیو پەنجەرەی ماڵەکـــەی بەرامبـــەرەوە، ژنـــە پێیـــەکانی دەنووشــتێنەوە. تــەنوورە رەشــەکەی لەســەر زەویەکە پان و بڵاو دەبێتەوە. پشیلەکە خۆی لـە تەنوورەکــە هەڵدەســوێ. لــە دەرەوەو لــە نــاو کۆڵانەکـەدا قردێلەیـەکی نـارنجی بـە بەفرەکـەوە نووساوە تاوەکو با نەیبات.

**سەرچاوە:**

لە کۆمەڵە چیرۆکی (مثل همەی عصرها) وەرگیراوە.

# کوێرەو براکەی

ئارتۆر شنیتسلەر

لە فارسییەوە: دلاوەر عەبدوڵا

(جێرۆنیمۆ) کوێر لەسەر ئەو قەنەفەیەی دانیشتبوو هەستاو دەستیدایە گیتارەکەی لە نزیک ئەو مێزەی پێکێك شەرابی لەسەر بوو، ئینجا کەوتە ژەنینی گیتارەکەی. چونکە گوێبیستی دەنگی یەکەم ئەو ئەڕەبانانە بوو کە گەشتیارانی دەگواستەوە، بە کوێرە کوێر بەرەو دەرگاکە ڕۆشت، کە باش شارەزای ڕێگاکەی بوو. چەند پلەیەکی لە پەیژە تەختەکە بڕی، کە بەرەو حەوشەکە دەچوو، براکەشی دوایکەوت. هەردووکیان لە پاڵ دیوارەکە راوەستان تا لە (با)کە پەنابگرن. (با)یەکی ساردی شێدار بەسەر خاکە تەڕەکەدا دەکشاو خۆی بە نێو دەرگا کراوەکاندا دەکرد.

هەموو ئەو ئەرەبانانەی بە گەردەنەی (ستلڤیۆ)دا تێپەڕدەبوون بەناچاری بە ژێر تاقی ئەم کاروانسەرا کۆنەدا دەڕۆیشتن و ئەو گەشتیارانەشی لە (ئیتالیا)وە دەهاتن و دەیانویست قەلاّی (تیرۆل) ببڕن، ئێرە دوا وێستگەیان بوو، بەلاّم هەرگیز لەوێدا نەدەمانەوە، چونکە لەسەر ئەو راستە ڕێگایەی بە گردۆڵکەی روتەن دەورە درابوو گەشتیار چەندی بکردایە نەیدەتوانی بە تەواوی ئاسمان ببینێت.

کوێرەو براکەی هەردوك ئیتاڵی بوون و هاوینیان لەم دەڤەرەدا دەگوزەراند و وەك ماڵی خۆیان ئاشنای ببون. ئەرەبانەیەکی پۆستەو چەند گالیسکەیەك پێکەوە گەیشتن. زۆر لە گەشتیار و ڕێبوارەکان لە جێگای خۆیان نەدەبزوتن و بە بەتانی و شانێل خۆیان داپۆشیبوو. هەندێکیان، کە پەلەکردنیان پێوەدیار بوو، دابەزین و سەد هەنگاوێك بە پیادە بە ژێر تاقەکەدا ڕەتبوون. دنیا بەرەو تاریکبون دەچوو، بارانێکی سارد دایکردبوو. پاش بەسەرچونی ڕۆژانێکی گەرم و هەتاوی

دیاربوو، پایز بێ هیچ پێشەکییەك گەیشتنی خۆی رادەگەیاند.

کوێرە گیتاری دەژەنی و گۆرانی دەچڕی. وەك هەموو جارێکی دی، کە دەیخواردەوە ئاوازی دەنگی زیقن دەبوو. جار جارەش سەری بۆ ئاسمان هەڵدەبڕی، وەك ئەوەی بێهودە نزا بکات. بە هۆی لچ و لێوی شینهەڵگەڕاو و پەڵە پەڵەی نەتاشراوی ڕیشیەوە روخساری راستەقینەی بە پەنهانی مابۆوە.

برا گەورەکەی بێدەنگ لە تەنیشتیەوە راوەستابوو. ئەگەر کەسێك دراوێکی فرێبدایەتە ناو ئەو کڵاوەی بە دەستیەوە بوو سەری سوپاسگوزاری بۆ دادەنەواندو بە نیگایەکی وێڵەوە لە بەخشندەییەکەی دەنواڕی و پاشان بە پەرێشانیەوە چاوی وەك کوێرەی برای وەردەگێڕاو لەبەرپێی خۆی دەبڕییەوە، وەك ئەوەی لە بۆنی بینایی و بینینی روناکی شەرمەزار بێت، چونکە هیچ کام لە درەوشاوەترین تیشکەکانی روناکی نەیاندەتوانی هێندەی دەلاقەیەك روناکی بخزێننە ناو دیدەی براکەیەوە.

-(جیرۆنیمۆ) وتی:برۆ مەیم بۆ بێنە!

-(کارلۆ)ش، کە راهاتبوو فەرمانەکانی بەجێبێنێت، بەپەلە رۆشت. کاتێك بە پلیکانەکاندا سەردەکەوت دووبارە (جیرۆنیمۆ) دەستیکردەوە بە گۆرانی وتن و دەمانێك بوو گۆرانیەکانی خۆی نەدەبیست، بەڵام باش پەیی بەو شتانە دەبرد لە دەوری رویاندەدا. باش گوێی لە دوو کەس بوو، ژن و پیاوێکی لاو، کە بە هێواشی لەگەڵ یەکتردا گفتوگۆیان دەکرد. لە خۆی پرسی دەبێت ئەو دوانە ئەمە چەندەمین جاریان بێت بێنە ئێرەو لێرەوە تێپەڕن؟!. چونکە یەکەم کوێر و دووەمیش زۆر جار مەست بوو وایدەزانی بەردەوام کۆمەڵێك خەڵکی دیاریکراون بەو ملەیەدا هاتوچۆدەکەن، هەندێکجار لە باکورەوە بۆ باشوور و هەندێکجاری دیکەش لە باشوورەوە بۆ باکور دەڕۆن. لەو ڕووەوە زۆر دەمانێك بوو ئەو دوانەی دەناسی.

(کارلۆ) گەڕایەوە و پێکێك مەی دایە دەستی. کوێرەش گلاسەکەی بەرەو ئەو دوانە بەرز کردەوە و گوتی:

-بەڕێزان.. بەخۆشی ئێوە!.

-پیاوە لاوەکە وتی: سوپاس، بەڵام ژنەکە لە کوێرەکە ترساو کەمێك هاوڕێکەی دوور خستەوە.

ئەرەبانەیەك ڕاوەستا، کە خێزانێکی قەرەباڵغی پێکهاتوو لە دایك و باوك و سێ منداڵ و خزمەتکارێکی هەڵگرتبوو.

-(جیرۆنیمۆ) چرپاندی بە گوێی براکەیدا: خێزانێکی ئەڵمانین.

باوکەکەی سەرو دراوی بە منداڵەکانی دا، ئەوانیش رۆشتن و کردیانە کڵاوی سواڵکەرەکەوە. (جیرۆنیمۆ)ش وەك سوپاس هەموو جارێك سەری دادەنەواند. کوڕە گەورەکەیان بە ترس و گومانەوە لە کوێرەی دەنواڕی. (کارلۆ)ش لە منداڵەکان ورد دەبۆوە، وەك هەمیشە هەرکات منداڵی لەو تەمەنەدا دەبینی دەهاتەوە یادی (جیرۆنیمۆ)ش هاوتەمەنی ئەو منداڵە بوو، کە بیست ساڵ لەوەوبەر بەهۆی روداوە ترسناکەکەوە چاوی کوێر ببوو. لەلای ئەم هێشتا تۆزقاڵێکیش لەو بیرەوەرییە لەیادنەچۆتەوە، هێشتا زریکەی نائاسایی (جیرۆنیمۆ)ی منداڵی دێتەبەرگوێ، کە لەگەڵ کەوتنیدا لەناو باخەکەدا لێیوە بەرزبۆوە. هێشتا تیرۆژی جوانی خۆری سەر دیواری سپی

باخـــچەکەی لەبەرچـــاودا مـــاوەو گـــوێی لـــە لێـدانی زەنگـی کڵێـساکەیە، کـە دروسـت لـەو کاتەدا لێدرا.

وەك زۆر جـاران لـەو ڕۆژەدا ئـەم لـە نزیـك پەنجەرەی ژوورەکەوە گەمەی دەکرد و ساچمەی دەگرتـــە دار بناوەکـــەی نزیـــك دیوارەکـــەی بەرامبەر. لە بیستنی هاواری برابچوکەکەیەوە هـــەر زوو لـــەوە تێگەیـــشت مناڵەکـــە، کـــە ویستویەتی بە ڕاکردن بە باخەکەدا تێپەڕێت، بریندار بووە. لولەکی ساچمە هاویشتنەکەی فرێـداو بـەرەو مناڵەکـە ڕۆیـشت، کـە لەسـەر سەوزەلانیەکە کەوتبوو، دەستەکانی بە ڕوویەوە گرتبوو، دەینالاندا و پێچی دەخوارد. دڵۆپێك خـوێن لەسـەر ڕوومـەتی لای ڕاسـتیەوە بـۆ ژێـر چـەناگەی ڕێـچکەی بەسـتبوو. دەرگـای باخـچە بچوکەکە کرایـەوەو لـە هـەمان کاتدا باوکە، کە لەسەر کێڵگە دەگەڕایەوە، لێیان نزیك کەوتـەوە. هـەردووکیان لەبـەردەم مناڵەکـەدا ڕۆنیشتن، کـە بـــەردەوام دەیزریکانـــد و ژیـــر نـــەدەبۆوە. هاوسێکان هاتن. دواجار (ڤانلی) پیرەژن توانی روخساری مناڵەکە ببینێت. ئـەو ئاسـنگەرەش هـات، کـە (کارلۆ) لای شاگردی دەکرد، چونکە وایرادەگەیانـــد دەســـتی پزیـــشکی هەیـــە و دەمودەست وتی چاوی ڕاستی چاکنابێتەوە. بە پەلـە (پسـچبیاود)ی پزیـشکیان هێنـاو ئـەویش هەمان شتی دوپات کردەوە. شەویش پێشبینی ئـەوەی کـرد مەترسـی لەسـەر چـاوی چـەپی هەیە و لەمەشدا بە هەڵە نەچوو بوو. ئیدی پاش ساڵێك هەموو دنیا بۆ (جیرۆنیمۆ) تاریك بوو، چاوەکانی کوێراییان داهات. سەرەتا ویستیان لـەوە دڵنیـای بکـەن کـە لـە داهـاتودا چارەسـەر دەکرێت، دیار بوو بڕوای کردبوو. (کارلۆ)، کە ڕاســتیەکەی دەزانــی، لەســەر ڕێگــای نێــوان بێسان و بێشەکەدا شەووڕۆژ پیاسـەی دەکـرد. بیری لە خۆکوشتن دەکردەوە. بەڵام ئـەو ڕازەی لای قەشـــەیەك درکانـــد، قەشـــەکە پێیڕاگەیانـــد ئـەرکی ئـەو ئەوەیـە بـە زینـدوێتی بمێنێتـەوەو ژیانی خۆی بخاتە پێناوی براکەی. (کارلۆ) پەی بـــە گرنگـــی پەیامەکـــەی بـــرد و هەســـتێکی میهرەبـــانی بـــەردەوام ئەشـــکەنجەی دەدا و هەتوانی دەردەکەی خۆی بۆ نەدەکرا مەگەر ئـەو ساتانە نەبێت کە لە پاڵ برا بچوکەکەیدا بوو. دەسـتی بەسـەری براکەیـدا دەهێنـا، ناوچـەوانی ماچ دەکرد، چیرۆکی درێـژی بۆ دەگێڕایەوە تا سـەرقاڵی بکـات. پێکـەوە لـە کێڵگـەدا پیاسـەیان دەکـرد و بـەناو ڕەزەکـانی سـەر گردۆڵکەکانـدا ڕێنـــوێنی دەکـــرد. (کـــارلۆ) دەســـتی لـــە کـــاری ئاسنگەرییەکەی کێشابۆوەو بۆ یـەك خولـەکیش لە براکەی دوور نەدەکەوتەوە. باوکی، کە تـەواو نیگـــەرانی دوا ڕۆژی کـــوڕە گەورەکـــەی ببـــوو، ئامۆژگـــاری کـــرد تـــا دووبـــارە بـــچێتەوە بـــە پیۆشوێنی کاری خۆیەوە، بەڵام (کارلۆ) گوێی لە باوکی نەگرت. (کارلۆ) ڕۆژێکیـان هەستیکرد ئیـدی (جیرۆنیمـۆ) باسـی دەردی خـۆی ناکـات وایلێکدایـەوە کـە کوێرە لـەوە گەیـشتووە ئیـدی هـەرگیز ئاسمـان، گردەکـان، شـەقام و خـەڵکی نابینێتـــەوە. (کـــارلۆ) زۆر زۆر خـــەمبار بـــوو. بێهـودە دڵـی خـۆی بـەوە دەدایـەوە، کـە ئـەم سەرچاوەی بەدبەختی براکەی بووە، بەڵام بە بێئـــەوەی مەبەســـتی بووبێـــت. هەنـــدێکجار بەیانیان زوو پێشئەوەی براکەی لە خەو ڕابێت هەڵدەستا و بە ناو باخچەکەدا رایدەکرد، چونکە ترسێکی زۆری هەبوو لە بینینی ئەو چاوانەی بەیانیان دەکرانەوەو بۆ ڕوناکی دەگەڕان.

هـــەر لـــەو دەمانـــەدا بـــیری کـــردەوە، کـــە (جیرۆنیمـــۆ) دەنگێکـــی ســـازی هـــەبوو، فێـــری

مۆزیکی بکات. مامۆستای قوتابخانەی (تلا)، کە هەندێك یەکشەممان دەهات بۆ بینینیان، (جیرۆنیمۆ)ی فێری گیتار ژەنین کرد. کوێرە گومانی لەوە نەبوو ئەو کارەی ئێستا فێری دەکەن لە داهاتودا دەبێتە مایەی نان پەیداکردنی.

پێدەچوو لە مێژووی خەمئەنگێزی ئەو رۆژە هاوینە بە دواوە ئیدی بەدبەختی بەشێوەیەکی هەمیشەیی بوبێتە میوانی ناو خێزانی (لاگاردی) پیر. بەرهەم لە سالآن کەمتر دەبوو. بە هەڵگرتنەوەی پاشبەندی ولآغەکان لەلایەن یەکێك لە خزمانەوە کەمێك پارەیان چنگکەوت، کە بە هەموو سەرمایەکەیان دادەنرا. دواجار لە رۆژێکی گەرمی مانگی ئابدا لە نێو کێڵگەدا باوکیان بە جەڵدە مردو هیچی لە پاش بەجێنەما، تەنها قەرز نەبێت. سامانە بچوکەکەیان فرۆشرا. ئیدی دوو براکە بە گیرفانی بەتاڵەوە گوندەکەیان بەجێهێشت.

(کارلۆ) تەمەنی بیست ساڵ و (جیرۆنیمۆ) پانزە سالآن بوو. هەر لەو کاتەشەوە ژیانی کۆڵبەکۆڵی و دەربەدەریان دەستپێکرد، کە هەتا ئێستاش بەردەوامە. (کارلۆ) بیری کردبۆوە کارێك بدۆزێتەوە تا بژێوی خۆی و براکەی دابین بکات، بەلآم سەرکەوتوو نەبوو. بە تایبەتی سەبارەت بە (جیرۆنیمۆ)، کە نەیدەتوانی ئارام دابنیشێت و ئارەزوی لەوێڵگەری و سەرجادەکان بوو.

بیست ساڵ بوو چیاو دۆڵەکانی ئیتالیایان لە باکور و (تیرل) لە باشوریان تەی دەکرد و تا چەندی بۆیانبکرایە خۆیان دەگەیاندە ئەو شوێنانەی هاموشۆی گەشتیار و رێبوارانی بەسەرەوە بوو.

پاش چەندین ساڵ لە کارەکەی لە ڕاستیدا هەستی بەو غەم و پەژارە نەدەکرد، کە پێشتر بە هۆی بینینی بازنەی خۆر و دیمەنێکی جوانەوە براکەی دەهاتەوە یاد، بەلآم ئێستا ئەو هەستە بۆ بەزەییەکی گەورە گۆڕابوو، کە خۆی تیا دەخواردەوەو ئەو بارەش بۆ ئەم وەك لێدانی دڵ و هەناسەدانی سروشتی لێهاتبوو، کاتێکیش (جیرۆنیمۆ)ی مەست دەکرد هەستی بە بەختەوەری زیاتر دەکرد.

ئەو ئەرەبانەیەی خێزانە ئەڵمانیەکەی دەگواستەوە دوور کەوتەوە. (کارلۆ)، وەك حەزی بەوە بوو، لەسەر پلیکانەکە چیچکەی کرد. (جیرۆنیمۆ) بە پێوە کە دەستەکانی لەیەکەوە ئالآندبوو، سەری بۆ ئاسمان هەڵبڕیبوو. (ماریا)ی خزمەتکار لە ژووری کاروانسەراکەوە هاتە دەرەوەو لە سەرەوە بانگی لێکردن: (هیچتان چنگ کەوت؟). (کارلۆ) تەنانەت ئاوڕیشی لێنەدایەوە. کوێرە نوشتایەوە و پێکە شەرابەکەی لەسەر زەوییەکە بوو هەڵگرتەوەو بەرەو خزمەتکارەکە هەڵیبڕی، وەك ئەوەی بەخۆشی ئەوەوە بینۆشێت. هەندێکجار ئەو خزمەتکارە شەوانە لە کاروانسەراکەدا لەبەردەم (جیرۆنیمۆ) رۆدەنیشت و ئەویش وا هەستی دەکرد ئەم ژنە زۆر جوانە.

(کارلۆ) چەمایەوەو لە رێگاکە وردبۆوە. (با) گڤەی دەهات و بارانێکی بە لێزمە دەباری، بە جۆرێك دەنگی ئەو ئەرەبانەی نزیکدەبۆوە لە نێو وژەوژدا بزردەبوو، هەستاو چوو لە جێگاکەی خۆی لەبەردەم براکەیدا راوەستا.

(جیرۆنیمۆ) دووبارە دەستیکردەوە بە گۆرانی وتن و لە هەمان کاتیشدا ئەڕەبانەیەك

گەیــشت، کــە تاکــە کەســێکی تێــدا بــوو. ئەرەبانچییەکە ئەسپەکانی کردەوەو خۆیکرد بە کاروانـــسەراکەدا. ڕێبوارەکـــە سەرشـــانێکی خۆڵەمێشی لـە خـۆوە ئالاَنـدبوو، تـا ماوەیـەك هــەروا بــە بێجوڵــە لــە نــاو ئارەبانەکــەدا هــەر ڕۆنیــشتبوو. پێدەچــوو گــوێی لــە گۆرانیەکــە نـەبێت، پـاش کـەمێك لـە ئەرەبانەکـە دابـەزی و بێئەوەی دوور بکەوێتەوە سەرەو خوار و سەرەو ژوور کەوتـــە پیاســـەکردن. دەســـتەکانی لێکدەخشاند تا گەرم دابێن. لە ناکاو سەرنجی سواڵکەرەکانی دا. هات و لەبەردەمیاندا چەقی، بــە وردی بــە چــاو کەوتــە هەڵــسەنگاندنیان. (کــارلۆ) بەســـەر لەقانــدنێك ســلاَوی لێکــرد. موســافیرێکی لاوی بۆشــناخ بــوو، بــە جوتێــك چـــاوی درەوشـــاوەو ریـــشی تاشـــراوەوە. پاشئەوەی ماوەیەك هەروا بەرامبەریان ڕاوەستا بە بیرکردنـەوەوە سـەرێکی بـۆ لەقانـدن و بـەرەو ئەرەبانەکە گەڕایەوە.

–(جیرۆنیمۆ) وتی: ئێ چیبوو؟

–(کارلۆ) وەلاَمیدایەوە: هێشتا هیچ، دیارە پێشئەوەی بڕوات شتێکمان پێدەدات.

ڕێبوارەکـە دووبـارە گەڕایـەوە بـۆ لایـان و کێـشای بــە تەنیــشتی ئەرەبانەکــەدا. کــوێرە دووبــارە دەســتیکردەوە بــە گــۆرانی چــڕین، وایدەزانی کابرای ڕێبوار بە هەموو هەستیەوە گــوێیڕادێراوە. مەیتەرەکــە ئەســپەکانی بــە ئەرەبانەکـەوە بەسـتەوە، ئینجا لاوە ڕێبوارەکـە وەك ئـەوەی شـتێکی بیرکەوتبێتـەوە، دراوێکـی یەك فرانکی بە (کارلۆ)دا.

–(کارلۆ) وتـی: دەسـتتان خـۆش، دەستتان خۆشبێت.

ڕێبوارەکـە سـوار ئەرەبانەکـە بـووەوەو سـەر شـانیەکەی لـە خۆیـەوە پێـچا. (کـارلۆ) پێکـە شەرابەکەی لەسەر زەوییەکە هەڵگرتەوەو بەسەر پلیکانــە تەختەکانــدا بــەرەو ســەرەوە ڕۆشــت. (جیرۆنیمۆ) گۆرانی دەچڕی. لاوە ڕێبوارەکە، کە لـە ئەرەبانەکـەدا خـۆی گرمۆڵـە کردبـوو سـەری بادا و لە ناکاو بیرۆکەیەك بە مێشکیدا گوزەری کرد، بزەیەك گرتی، کە هەروا دوو هەنگاوێك لە کوێرەکەوە دوور بوو گوتی:

–ناوت چییە؟

–(جیرۆنیمۆ)

–زۆر باشە، بەلاَم (جیرۆنیمۆ) وریابە کلاَوت نەچێتە سەر!

ئەرەبانـــچییەکە گەیـــشتە ســـەر دوایـــن پلیکانەکانی سەرەوە.

–بەڕێز.. چۆن کلاَو نەچێتە سەرم؟

–دراوێکی ئاڵتونیم بە هاوڕێکەت بەخشی.

–زۆر سوپاس بەڕێز.. دەستتان خۆش بێت.

–باشە، بەلاَم ئاگاداری خۆتبە!

–بەڕێز.. ئەوە برامە و فێڵ لە من ناکات.

لاوەکــە کەمـــــێك دوو دڵی نواند، بەلاَم ئەرەبانچییەکە گەیشتە سەر جێگاکەی خۆی و ڕەشمـــەکانی بەدەســـتەوە گــرت. ڕێبوارەکـــە پــێش ئــەوەی خــۆی بــە درۆ بخاتــەوە لــە نــاو ئارەبانەکـــەد جێگـــای خـــۆی خۆشـــکرد و بـــە جۆرێــك ســەری لەقانــد، کــە واتــای ئــەوە بــوو (بیــدەرە دەســت قــەدەر) و ئیــدی ئەســپەکان کەوتنە ڕۆشتن.

کـوێرە لـە دوورەوە هـەر سوپاسـی دەکـرد و دەستەکانی بۆ ڕادەتەکان. گوێی لێبوو (کارلۆ) لە ژووری کاروانسەراکە هاتە دەرەوە.

–(کـارلۆ) وتـی: (جیرۆنیمـۆ).. خێراکـە وەرە سەرەوە، (ماریا) ئاگری کردۆتەوە.

کــوێرە ســـەری ڕاوەشـــاند و گیتارەکـــەی لـــەبن هـــەنگڵینا، بـــە پەلـــەکوتێ بەســـەر

پلیکانەکانـدا سـەرکەوت. بـەدەم ڕێگاکـەوە بـە براکەی وت:

–بێنە با دەستی لێبدەم، زۆر دەمێکە دەستم بەر دراوی ئاڵتونی نەکەوتوە.

–(کـارلۆ) پرسـی: چـی دەڵێیـت؟ مەبەسـتت لە چییە؟

(جیرۆنیمۆ) نزیك بۆوە و سەری براکەی لە نـاو دەسـتەکانی گـرت، کـە ئەمـە جوڵەیـەکی تایبـەتی ئـەو بـوو بـۆ دەربـڕینی میهرەبـانی و خۆشحاڵی خۆی. ئینجا وتی:

–برای ئازیزم کارلۆ.. خەڵکی دەستکراوەش هەیە.

–(کارلۆ) وەڵامیدایەوە: تا ئێستا دوو لیرەو سـی سـەنتمان کۆکردۆتـەوە، ئەمـە سـەرەڕای پـارەی کـابرای نەمـسایش، کـە بەهاکـەی نیـو لیرەیە.

–(جیرۆنیمـۆ) هـاواری کـرد: ئـەی بیـست فرانکەکە؟ بیست فرانکەکە، من دەزانم

کـە چـونە ژوورەکـەوە کـوێرە بەملاوئـەولادا دەکـــەوت و بـــە شـــەکەتیەوە خۆیـــدا بەســـەر قەنەفەکەدا.

–(کارلۆ) پرسی: چی دەزانیت؟

–گاڵتـــەکردن بەســـە.. دراوەکـــەم بـــدەرێ. ماوەیـەکی زۆرە دراوی ئـاڵتونیم بـە دەسـتەوە نەگرتووە.

–چـیت لـە مـن دەوێـت؟ دەتـەوێت لـە کـوێ دراوی ئاڵتونیت بۆ پەیدا بکەم؟ ئێمە دوو سێ لیرە زیاترمان نییە!.

–کـوێرە کێـشای بـە مێزەکـەدا: تـا ئێـرە بەسـە.. تێدەگـەیت؟ ئایـا دەتـەوێت ئـەو دراوە ئاڵتونیە لە من بشاریتەوە؟

–(کـارلۆ) بـە پەرێـشانی و نیگەرانیـەوە لـە براکـەی نـواڕی. بـۆ ئـەوەی ئـارامی بکاتـەوە لـە تەنیشتیەوە ڕۆنیشت و باسکی گـرت و گـوتی: گوێ بگرە.. من هیچم لە تۆ نەشاردۆتەوە. چۆن باوەڕ بە شتی وا دەکەیت؟ کەس دراوی ئاڵتونی بە من نەداوە.

–بەڵام ئەو خۆی بە منی وت!

–کێ؟

–کوڕە لاوەکەی هەر پیاسەی دەکرد.

–چۆن؟ تێناگەم!

–وتـی نـاوت چـییە؟ پاشـان وتـی: وریابـە کلاوت نەچێتە سەر!.

–(جیرۆنیمۆ) تـۆ خـەونت بینیـوەو ئاگـات لـە خۆت نییە.

–ئاگام لە خـۆم نییـە؟ بـەڵام گـوێم لێبـوو، مـن بـاش دەبیـستم. وتـی: نـەهێڵیت فێلـت لێبکـات، مـن دراوێکـی بیـست فـرانکیم پێـداوە.. نـا.. نـا وتی: دراوێکی ئاڵتونیم پێبەخشیوە.

خاوەنی کاروانسەراکە هاتە ژوورەوە، وتی:

–چیدەکەن لێرە، بۆچـی دەسـتتان لـە کـار و کاسبی هەڵگرتووە؟ ئەڕەبانەیەکی چوار ئەسپی گەیشتووە.

–(کـــارلۆی) وتـــی: پەلـــە بکـــە بـــا بڕۆینـــە خوارەوە.

–(جیرۆنیمـۆ) لـە جێگـای خـۆی نـەبزوت: بۆچـی، بۆچـی بـڕێم، سـودی چـییە؟ تـۆ لـە تەنیشتمەوەیت و تۆ..

–(کارلۆ) باسکی گرت: هیچ مەڵێ.. با بڕۆنە خوارەوە.

(جیرۆنیمـۆ) پێملـی براکـەی بـوو. بـە دەم ڕێـــوە بـــەخۆی دەگـــوت: دەزانـــی دوایـــی گفتوگۆ دەکەین.

(کـارلۆ) لـەوەی ڕویـدابوو سـەری تەقـەی دەهـات. لـە خـۆی دەپرسـی بڵێیـت (جیرۆنیمـۆ) شـێت نـەبوو بێـت. دەیزانـی هەنـدێکجار

لەسەرخۆی نامێنێت و توڕە دەبێت، بەڵام هەرگیز نەیبیستبوو بەو جۆرە بدوێت.

ئەو ئەرەبانەیەی گەیشتبوو دوو کەسی ئینگلیزی هێنابوو. (کارلۆ) کڵاوەکەی گرتەوەو کوێرە دەستیکردە گۆرانی چڕین. یەکێك لە ئینگلیزەکان دابەزی و چەند وردەیەکی لە کڵاوەکەی (کارلۆ) هاویشت.

-(کارلۆ) وتی: دەستتان خۆش بێت. ئینجا کەمێك هێواشی تر وتی: بیست سەنتیە.

(جیرۆنیمۆ) گوێی بە قسەکەی نەداو گۆرانییەکی دیکەی تێهەڵکرد. ئەرەبانەکە کەوتەوە ڕێ و دوو براکەش بە بێدەنگی سەرکەوتنەوە.

(جیرۆنیمۆ) لەسەر قەنەفەیەك ڕۆنیشت. (کارلۆ) چوە پاڵ کورە هەڵمییەکە.

-(جیرۆنیمۆ) پرسی: بۆچی هیچ ناڵێیت؟

-(کارلۆ) وەڵامیدایەوە: هەر ئەوەبوو کەوتم.

-چیت وت؟

-دەبێت ئەو شێت بووبێت!

-شێت؟ باشە هەنجەتێکت دۆزییەوە. ئەگەر کەسێك بڵێت من بیست فرانکم بە براکەت بەخشیوە شێتە!.

باشە بۆچی دوپاتی کردەوە و گوتی: نەهێڵێت گۆڵت لێبکەن.. ها؟

-لەوانەشە شێت نەبوو بێت، بەڵام کەسانی نارەسەن هەن چارەرەشەکان دەکەنە دەسکەڵا.

-(جیرۆنیمۆ) هاواریکرد: نا.. گاڵتەی کردووە؟ وەك چاوەڕوانم دەکرد.. دیارە دەستیدایە بوتڵە شەرابەکەی بەردەمی و هەمووی نا بەسەریەوە.

-(کارلۆ) بە گەروی گیراو و شڵەژاوییەوە وتی: بەڵام (جیرۆنیمۆ) بۆچی دەتەوێت کە.. چۆن باوەڕ دەکەیت کە من..

-بۆچی دەنگت دەلەرزێت.. ها؟ بۆچی .. ها؟

-(جیرۆنیمۆ) سوێندت بۆ دەخۆم.

-نا.. منیش باوەڕت پێناکەم.. بە من رادەبوێری.. دەزانم گاڵتەم پێدەکەیت.

-دەنگی مەیتەرەکە لە خوارەوە هات: هێی کوێرە موشتەری هات.

دوو براکە پەکپێ ڕاستبونەوەو لە پلەکان چونە خوارەوە، لە هەمان کاتیشدا دوو ئەرەبانە گەیشتن. ئەرەبانەیەکیان سێ پیاو، ئەوی دیکەشیان ژن و پیاوێکیان تێدابوو. (جیرۆنیمۆ) گۆرانی دەگوت، لە کاتێکدا (کارلۆ)، کە لە تەنیشتیەوە بوو، بە زەحمەت خۆی ڕاگیر کردبوو. ئایا دەبێت چی بکات؟ براکەی باوەڕ بە قسەکانی ناکات! بۆچی دەبێت شتی وا رووبدات؟!. بە نیگەرانیەوە دزە نیگایەکی روخساری (جیرۆنیمۆ)ی کرد، کە بە سۆزەوە گۆرانییەکی خەمناکی دابەستبوو. وای بۆچوو کە ئەندێشەی نوێ بەو کەللەیەدا تێدەپەڕێت.

ئەرەبانەکان ڕۆشتن و (جیرۆنیمۆ) بەردەوامبوو لەسەر گۆرانی وتنەکەی. (کارلۆ) زاتی ئەوەی نەبوو گۆرانیەکەی پێببڕێت، نەیدەزانی چی پێبڵێت؟!. دەترسا دوبارە دەنگی بلەرزێت!.

-لە سەروی پلیکانەکانەوە دەنگی قاقای (ماریا) بەرزبۆوە، کە دەیگوت: ئەوە بۆچی بەردەوامیت لە گۆرانی وتن، وا دەزانیت منیش شتێکت پێدەدەم؟!.

(جیرۆنیمۆ) بێئەوەی گۆرانیەکەی تەواو بکات لەپڕ بێدەنگ بوو، وەك ئەوەی دەنگی لەگەڵ پچڕانی تاڵی گیتارەکە یەکدەم بێت. دووبارە بە پلیکانەکاندا سەرکەوتەوەو (کارلۆ)ش بەدوایدا ڕۆشت و لە ژوورەکەدا لە

تەنیشتیەوە ڕۆنیشت. (کارلۆ) بیری دەکردەوە چیبکات؟. دوبارە هەوڵیدا قەناعەت بە براکەی بکات و گوتی:

-(جیرۆنیمۆ) سوێند دەخۆم.. باش بیربکەرەوە. چۆن تۆ لەو بڕوایەدایت کە من..

(جیرۆنیمۆ) بێدەنگ بوو. وا دیاربوو بە چاوە مردوەکانی لە بزمارە خاکییە زۆرەکانی پشت پەنجەرەکەی دەنواڕی.

-(کارلۆ) دوبارە درێژەی بە قسەکانی دا: نەخێر، ئەو کەسە شێت نەبوە، بەلاّم دیارە بە هەڵەدا چووە.. باش بۆی چوم، بەلاّم پاشان هەستی کرد ئەو قسانە قەناعەتی پێناکات.

(جیرۆنیمۆ) لە ڕووی بێحەوسەڵەییەوە بە جوڵەیەك ئەوی لە خۆی دوور خستەوە، بەلاّم (کارلۆ) بە گەرمییەکی نوێوە دەستی بە قسەکردن کردەوە:

-بۆچی کاری لەو جۆرە دەکەم؟ خۆت دەزانیت نە لە تۆ زیاتر دەخۆم و نەزیاتریش دەخۆمەوە، خۆ ئەگەر بمویستایە کۆتێکی بکڕم پرسم بە تۆ دەکرد. ئیدی بۆچی ئەو پارەیەت لێحەشاردەدەم؟ دەتوانم چی پێبکەم؟

-کوێرە لە ژێر لێوەوە وتی: درۆ مەکە، دەزانم درۆ دەکەیت!.

-(کارلۆ) بە پەرێشانیەوە وتی: (جیرۆنیمۆ) من درۆ ناکەم، نەخێر درۆ ناکەم.

-ئایا پێشەکیت بەو کچەداوە.. ها؟ یان لە پاشاندا پێیدەدەیت؟

-کێ.. ماریا دەڵێیت؟

-بەڵێ، ماریا، ئەی دەتەوێت کێ بڵێت؟ ها.. ئەی دزی درۆزن؟!. سیخورمەیەکی سرەوانده لاقەبرغەی براکەی، وەك ئەوەی ئیدی نەیەوێت لە تەنیشتیەوە دانیشێت.

(کارلۆ) هەستایە سەرپێ و بە واقوڕماوییەوە بۆ کوێرەی ڕوانی. پاشان بەرەو پلیکانەو دەرگای حەوشە ملینا و بە چاوی ئاو تێزاوەوە لە ڕێگاکەی ڕوانی، کە لە ژێر تەمێکی قورسی زەردا نغرۆ دەبوو. بارانەکە هێواشی کردبۆوە. دەستەکانی بە گیرفانەکانیدا رۆکردو بە هاوەڵی ئەو هەستە تاڵەوە، کە براکەی لە خۆی دووری خستەوە، ڕۆشت هەناسەیەکی ئازاد هەڵمژێت. چ پێشهاتێکی سەرسوڕهێنەرە؟ نەیدەتوانی بزانێت ئەو پیاوەی یەك فرانکیەکەی پێدابوو، کەچی لای براکەی وتبوی بیست فرانکی پێداوە، کێ بوو؟. دیارە بێمەبەست ئەو کارەی نەکردووە. (کارلۆ) یادەوەرییەکانی رابردووی بەیادا هێنایەوە، بەڵکو دوژمنێکیان هەبوو بێت و ئەم کەسەی بۆ تۆڵەسەندنەوە ناردبێت.. بەلاّم لێکدانەوەکانی بێسودبوو. هەرگیز لە یادی نییە دڵی کەسێکی رەنجاندبێت، هیچ ڕووبەڕوبونەوەیەکی لە یادا نەبوو. بیست ساڵ بوو ژیانی سواڵکردن و وێڵگەڕی کردبووە پیشەی خۆی لە کەنار شەقامەکاندا کلاّوی لە خەڵك پاندەکردەوە.

ئایا کەسێك لەسەر ژن کاری لەو جۆرەی دەرهەق دەکات؟ ئەمەش دوور بوو، چونکە ماوەیەکی زۆرە لە هیچ ژنێك نزیك نەبۆتەوە. خزمەتکارەکەی مەیخانەکەی (دلارۆزا) دواهەمینیان بوو، کە ئەویش لە بەهاری رابردودا بوو. خۆ کەسیش لەو جیهانەدا هەڵناکەوێت لە پێناوی ئەو چارەڕەشەدا ئیرەیی پێببات!.. نەخێر.. نەیدەتوانی لەوە بگات چۆن کەسانی لەو جۆرە پەیدا دەبن. خەڵکی ئەم جیهانە گەورەیەی ئەم نایانناسێت.. ئەو خەڵکانەی لە هەموو ئاڕاستەکانی جیهانەوە دێن!. چی دەربارەی ئەوانە دەزانی؟

قسەکانی ئەو ڕێبوارەی بە براکەی وتبوو بیست فرانکم داوەتێ نهێنیەکیان لە پشتەوە بوو. (کارلۆ) ئەوەی پەسەند دەکرد، بەلاَم لە خۆی دەپرسی (چی دەستدەکەوێت؟!). ئەوەی ئاشکرابوو ئەوەبوو براکەی لێیکەوتبوە گومانەوە، ئەمیش نەیدەتوانی تەحەمولی ئەو بیرۆکەیە بکات.. نەیدەتوانی بهێڵێت کارەکان بەو ئاڕاستەیەدا بڕۆن. بە خێرایی بە پلیکانەکاندا سەرکەوت.

(جیرۆنیمۆ) لەسەر قەنەفەیەك درێژبوو. خۆی وا پیشاندا ئاگای لە هاتنە ژوورەوەی ئەم نییە. (ماریا) خواردنی بۆ دانان و بە درێژایی کاتی خواردنەکە هیچیان ورتەیان لێوەنەهات. کاتێك (ماریا) دەستیکرد بە کۆکردنەوەی سفرەکەیان لە پڕێکدا (جیرۆنیمۆ) بە پێکەنینەوە وتی:

-(ماریا).. بەو دراوە زێڕە چی دەکرێت؟

-دراوی چی؟!

-باشە، بڵێ بزانم گوارە یان بازنی نوێ دەکرێت؟

-(ماریا)، کە ڕوی لە (کارلۆ) کرد پرسی: چی لە گیانی من دەوێت؟

لە حەوشەکەوە دەنگی چەرخەی ئەڕەبانەیەکی بارهەڵگر بەئاستەم دەهات، ورتە ورتی چەند کەسێکیش، کە بە دەنگی بەرز دەدوان. (ماریا) بە دەسەپاچەییەوە بە پرتاو بەرەو خوارەوە ڕۆشت. پاش کەمێك چوار کەسی ولاَغدار هاتنە ژوورەکەوەو لەبەردەم مێزێك ڕۆنیشتن. خاوەنی کاروانسەراکە هات و سلاَوی لێکردن، ئەمان لە دەست کەشەکە گەلەك سەغڵەت بون.

-یەکێکیان وتی: ئەمشەو بەفر دەبارێت!

کەسی دووەم باسی لەوە کرد، کە ساڵێکیان لەناو بەفری ئەوێدا گیریخواردوەو هێندەی نەمابوو لەتاو سەرما زایە ببێت. (ماریا) هات و لەبەردەمیاندا ڕاوەستا. مەیتەرەکە هات و هەواڵی خزمەکانی خۆی لێپرسین، کە لە (پرمیۆ) نیشتەجێ بوون.

هەوڵدرا ئەڕەبانەیەك گەیشتوە. دەمودەست (جیرۆنیمۆ) و (کارلۆ) بەرەو خوارەوە ڕۆشتن. (جیرۆنیمۆ)گۆرانی دەوت و (کارلۆ)ش کلاَوەکەی بە دەستەوە گرتبوو، ڕێبوارەکان پارەی خێریان لە کلاَوەکە کرد. (جیرۆنیمۆ) ئارام دەهاتە پێشچاو، تەنها دەیپرسی (چەند بوو؟!) و بەسەر لەقاندنیش ئاماژەی بەڵێی بۆ وەلاَمەکەی (کارلۆ) دەدایەوە. (کارلۆ) بێهودە هۆکاری دادەتاشی و لە هیچ حاڵی نەدەبوو، هەر هێندە نەبێت کە بەدبەختیەکی ترسناك ڕوی تێکردوەو ئەمیش بێبەرگریکردن ماوەتەوە.

کە دوو براکە بۆ سەرەوە گەڕانەوە، ولاَغدارەکان شەرابیان دەنۆشی و بە پێکەنینەوە پێشوازیان لێکردن. ئەوەیان لە هەموویان لاوتر بوو بە (جیرۆنیمۆ)ی وت:

-شتێکمان بۆ بڵێ، دراویشت پێدەدەم. ئینجا ڕویکردە هاوەڵەکانی و گوتی (وانییە؟)

-(ماریا)، کە بە بوتڵە شەرابێکی سورەوە دەگەڕایەوە وتی: وێڵی کەن! ئەمڕۆ زەوقی جۆر نییە.

(جیرۆنیمۆ)، کە لە ناوەڕاستی ژوورەکەدا وەستابوو، لە وەلاَمی (ماریا)دا هەڵیکردە گۆرانی. دوای تەواوبونی گۆرانیەکە ولاَغدارەکان چەپڵەیان بۆ کوتا.

-یەکێك لە ولاَغدارەکان وتی: (کارلۆ) وەرە ئێرە دەمانەوێت وەك گەشتیارەکان دراو لە کلاَوەکەت ڕۆبکەین.

ئینجا دراوێکی بچوکی دەرهێنا و لەسەر کلاوەکەی (کارلۆ) گرتبویەوە روو بە ئەو رایگرت، بەڵام (جیرۆنیمۆ) دەستی ولاغدارەکەی گێڕایەوەو بە توندی وتی:

-بیدەی بە خۆم باشترە، لەوانەیە ئەو دراوە بکەوێتە جێگایەکی دیکەوە. بەڵێ جێگەیەکی دیکە!.

-چۆن بۆ جێگایەکی دیکە؟

-بەڵێ، بۆ ناولنگی ماریا!

هەموویان بە خاوەن کاروانسەراو (ماریا)شەوە دایانە قاقای پێکەنین. تەنها (کارلۆ) متەقی لە خۆی بڕیبوو، چونکە هەرگیز براکەی ئەو جۆرە گاڵتانەی لەگەڵدا نەکردبوو.

ولاغدارەکان دەنگیاندا: وەرە لە تەنیشتمانەوە دانیشە و گوتیان (کەسێکی چەند قسە خۆشە!).

خۆیان فشاردا تا جێگای بۆ بکەنەوەو هەراوهوریا بڵندبوو. کوێرە لەو نێوەندەدا قسەی نەستەقی دەردەپەڕان و زیاد لە سروشتیش قسەکانی خەندەهێنەر و خۆش بوو، یەك لە دوای یەك شەرابی فڕدەکرد. کە (ماریا) بە وێدا تێپەڕی کوێرە ویستی بیخاتە باوەشی خۆیەوە. یەکێك لە ولاغدارەکان وتی:

-دیارە وا دەزانیت جوانە، بەڵام پیر و ناشیرینە).

بەڵام کوێرە (ماریا)ی گرت و لەسەر کۆشی خۆوە دایناو گوتی:

-ئێوە ئەقڵتان وەك پارچە بەردە، من پێویستم بە چاو نییە تا بیبینم!.. ئەوە (کارلۆ) لە کوێیە.. ها؟ دیارە لە نزیك کورەکەیەو دەستەکانی لە گیرفانی رۆناوەو بزە دەیگرێ.

هەموویان رویان بەرەو (کارلۆ) وەرگێڕا، کە پشتی لە کورەکە و دەستەکانی لە گیرفانەکانی رۆکردبوو، بە هۆی بزەیەکی بەزۆرەوە دەمی داچەقاندبوو، چونکە حەزی دەکرد بە پێی هەستی براکەی رەفتار بکات.

مەیتەرەکە هاتە ژوورەوەو بە ولاغدارەکانی راگەیاند هێندە کاتیان لەبەردەمدا نییە پێشئەوەی شەودابێت بگەنە (پرمیۆ). هەموویان هەستان و بە پێکەنینەوە رۆشتن. دوو براکە بە تەنها لە ژوورەکەدا مانەوە. پێدەچوو کاروانسەراکە پاش فراوین لە خەوی پاشنیوەڕۆدا بێت. (جیرۆنیمۆ) سەری خستبوە سەر مێزەکەو خۆی وا پیشاندەدا باوێشك دەدات. (کارلۆ) بۆ چەند خولەکێك بە درێژی و پانی ژوورەکەدا هاتوچۆی کرد و ئینجا دانیشت. بێئەندازە شەکەت بوو، وەك ئەوەی مێردزمەیەکی ترسناك هاریبێتی. بیرکردنەوەکانی پەرێشان و پچڕپچڕ بوو. هەموو شتەکانی ئەو بەیانیە بینیبوی لە دیدیەوە دوور و نادیار بون. ئەو رۆژە گەرمانەی هاتوە یاد بە هاوەڵی براکەی رێگای دووری نغرۆی ناو تەپوتۆزیان دەبڕی. هەموو ئەوانە لەبەرچاویدا دوور و بزر و جێگای باوەڕ نەبون، وەك ئەوەی ئەگەر نەبوو هەرگیز روویدەن.

ولاغدارێکی لە (تینزل)ەوە دەهات لە دەوروبەری عەسردا گەیشت. لە دوای ئەمیشەوە چەند ئەرەبانەیەکی دیکە هەبوون، کە هەریەکەیان ماوەیەکیان لە نێواندابوو، هەموشیان بەرەو خۆرئاوا دەرۆیشتن. دوو براکە چوار جار سەرەو خواریان کرد. ئاسمان زەردەپەڕ بوو، کەمکەمە تاریکی دادەهات، کاتێك پاش بەرێکەوتنی دوایین ئەرەبانە بۆ سەرەوە گەڕانەوە. چرایەکی رۆن لە پێشەبانەکەوە هەڵواسرابوو، بە زەردی دەگڕا. ئەو کرێکارانە گەیشتن، کە کەمێك دوورتر

لەوێوە لە کانێکی ئەو ناوە کاریان دەکرد و لە نزیك کاروانسەراکەوە شوێنی نیشتەجێبونیان بۆ خۆیان سازکردبوو. (جیرۆنیمۆ) چووە تەنیشتیان و (کارلۆ)ش بە تەنها لەسەر مێزەکە مایەوە، ئەم تەنهاییە لای ئەم زۆر دژوار بوو. لە دوورەوە گوێی لە دەنگی بەرزی (جیرۆنیمۆ)بوو کە بەدەنگی بەرز باسی لە منالّی خۆی دەکرد. باسی لەو شتانە دەکرد بە چاو بینیبونی و لە یادی مابوو. لە یادێتی باوکی لە کێڵگەدا کاری دەکرد، باخێکی بچوك، دربناوێك لە نزیك پەنجەرەی ماڵەکەیانەوە، دوو کچی پینەچی، تەپۆلکەکانی پشت کڵێسا، کە ڕەز بوو. هەروەها روخساری منالّی خۆشی، وەك ئەوەی لە ئاوێنەدا بینیبوی. (کارلۆ) زۆر جاران گوێبیستی ئەو رستانە ببوو، بەلاّم ئەمشەو نەیدەتوانی ئەوانە ببیستێت. هەستیدەکرد ئاوازەکەی گۆڕاوەو واتایەکی نوێ لە پشت هەریەك لەو وشانەوە خۆی حەشارداوە. سەرزەنیشتکردنێکی سمبولیانەیە، کە جنێوی پێدەدەن.

نیوەشەو بوو، (کارلۆ) بە نهێنی خۆی بۆ لای دەرگاکە کێشایەوەو بەرەو شارێکە ملینا. باران لییکردبوّوەو کەش ساردبوو. (کارلۆ) بیری کردەوە بینی حەز دەکات بڕوات و خۆی وێڵ بکات. لەو تاریکیە خۆشەدا سەربنێتەوە. لە چاڵێکدا بنوێت و ئیدی بێدار نەبێتەوە. لە ناکاو دەنگی چەرخەی ئەرەبانەیەك سەری پێهەڵبڕی. رووناکی دوو چرای بینی بە هێوری نزیك دەبونەوە.

دوو پیاو لە ئەرەبانەکەدا بوون. یەکێکیان بە ڕوخسارێکی ریش تاشراوی پەژموردەوە. کە سێبەرەکەی (کارلۆ)ی بینی لە ناو تاریکیەکەدا بەرامبەر رووناکی دوو چراکە راوەستاوە، لە جێگای خۆی وشك هەلاّت. (کارلۆ) وەستاو کلاّوەکەی داگرت. ئەرەبانەکە بزربوو. روناکیەکەش رەوییەوە. (کارلۆ) دووبارە لە تاریکیدا مایەوەو کەوتە لەرزەو ترسی لێنیشت. یەکەمجار بوو لە ژیانیدا سڵ لە تاریکی بکاتەوە، جۆرە ترسێك کە هەستیدەکرد بەشێوەیەکی سمبولیانە لەگەڵ بەزەیی بۆ براکەی هاوبەندە. پێی هەڵگرت، وەك ئەوەی کەسێك رەدوی کەوتبێت بە هەناسەبڕکێوە گەیشتەوە کاروانسەراکە.

کاتێك دەرگای ژوورە بچوکەکەی ترازاند دوو کەسەکەی کەمێك پێشتر بە ئەرەبانەکەوە بەلایدا ڕەتبوون لەبەردەم مێزێك ڕۆنیشتون، کە بوتڵێك شەرابی لەسەرەو بە جۆرێك سەرگەرمی گفتوگۆبوون ئاگایان لەم نەبوو.

خاوەنی کاروانسەراکە هەر لە دوورەوە (کارلۆ)ی بینی وتی:

-تۆ لە کوێ بویت؟!. بۆچی براکەت بە تەنها بەجێدێڵیت؟.

-(کارلۆ) بە پەرۆشەوە وتی: بۆچی چیبوە؟!

-(جیرۆنیمۆ) سەریکردۆتە سەر خواردنەوە. تۆ دەزانیت لای من وەك یەکە، بەلاّم تۆ دەبێت لە بیری رۆژانی خراپی داهاتوشدا بیت.

(کارلۆ) چووە تەنیشت براکەی و باسکی گرت و گوتی:

-بابڕۆین.

-کوێرە وتی: چیت لە رۆحی من دەوێت؟!

-کارلۆ) وتی: بابڕۆین بخەوین.

-دەست لەیەخەم بەردەو وازبێنە، ئەوە منم پارە پەیدا دەکەم و هەرچیش دڵم بخوازێت ئەوە دەکەم!. تێگەیشتیت. تۆ ناتوانیت هەمووی لە گیرفانەکانت بپەستیت!. لەوانەیە وا بزانن هەمووی بە من دەدات؟! هەرگیز!.. من کەسێکی

کوێری بێچارەم، بەڵام کەسانێك هەن بەخشندەو بە بەزەیین و دەڵێن (بیست فرانکم بە براکەت بەخشیوە!).

کرێکارەکان لە قاقایاندا.

-(کارلۆ) وتی: بەسە.. هەستە وەرە لەگەڵمدا.

براکەی بەرەو پلیکانەیەکی باریك کێش کرد، کەمیچی دەرگای ژوورێك بوو، ئەو جێگایەی تیایدا دەخەوتن. بەدەم ڕۆشتنەوە (جیرۆنیمۆ) هاواری کرد:

-دەستەکەت کەوتەڕوو، چاکەی پیاو چاك دەرکەوت، بەڵێ.. هەموی لەلام ئاشکرایە، ئیدی دەبێت چاوەڕوانی بکێشیت. ئەی (ماریا) لە کوێیە؟!. دیارە دراوەکەت لە دەغیلەکەی ئەو هاویشتوە!. ئەوە منم گۆرانی دەبێژم و گیتار دەژەنم، منم ناندەری تۆ، بەڵام تۆ دزیت)..

خۆیدا بەسەر جێگاکەیدا. ئەو ڕوناکییە کەمەی لە حەوشەکەوە دزەی دەکرد تا ژێر پلیکانەکان درێژ دەبۆوەو ئەو دەرگایەی تاکە هاوسێی ژوورەکەیان بوو نیوە کراوە بوو، (ماریا) جێخەوەکانی ناو ئەو ژوورەی ئامادە دەکرد. (کارلۆ) لە تەنیشت براکەیەوە ڕاوەستاو لێیوردبۆوە، بە ڕوخساری هەڵماسیوو، لێوی شینهەڵگەڕاو و پەرچەمی مناڵانەی چەسپاوی سەرناوچاوانیەوە لە تەمەنی خۆی پیرتر دەینواند. (کارلۆ) خەریکبوو پەیی بەوە دەبرد کە خانەگومانی براکەی هی ئەمڕۆ نییە و بەڵکو لە کۆنەوە لە دڵیدا چەسپیوەو بۆی نەڕەخساوە هەستەکانی دەرببڕێت. (جیرۆنیمۆ)ش هیچی لەو بارەیەوە نەدرکاندبوو. واتە نەیدەوێرا دان بەوەدا بنێت و هەموو ئەو ئەرك و ڕەنجەی لەگەڵیدا دابوی بەزایە چووە، هەموو خەم و پەژارەو فیداکارییەکانی سەردەمی لاوێتی

هەموو ئەوانە بێهودەبوو. ئایا دەبێت چیبکات؟! ئایا دەبێت درێژە بەو پیشەیەی بدات؟ چاوساغی هەنگاوەکانی براکەی بێت، گەدایی بۆ بکات، چاودێری بکات و هەموو ڕۆژەکانی ژیانی لەو پێناوەدا دابنێت؟. لە کاتێکدا جگە لە سوکایەتی و بێمتمانەیی هیچ دەستکەوتێکی نەبوو!. ئەگەر براکەی وا دەزانێت ئەم دزە ئیدی هەر بێگانەیەکی دیکە دەتوانێت لای (جیرۆنیمۆ) باش جێگای بگرێتەوە. تاکە شتێکی مابۆوە ئەوەبوو بەجێبێڵێت و بۆ هەتا هەتایە دەسبەرداری ببێت. لەوانەیە بەو جۆرە (جیرۆنیمۆ) هەست بەو ستەمە بکات دەرهەق بە براکەی کردویەتی و ئەو کاتە تێدەگات و چارەڕەش دەبێت. ئەی خوایە دەبێت چی بەسەر بێت؟!، بەڵام بۆ ئەم، کە هێشتا لاو بوو، کار قاتی نەبوو، دەیتوانی لە کێڵگەیەکدا کار پەیدا بکات. (کارلۆ) بەو حەیران و سەرەخولێیەوە چاوی کەوتە سەر ڕوخساری براکەی. وا هاتە پێشچاوی کە براکەی لە لاڕێیەکداو لەبەرتیشکی سوتێنەری خۆردا ڕۆنیشتوە، چاوە گەورە سپییەکانی، کە نابینن، لە ئاسمان بڕیوەو بە دەستەکانی دەیەوێت ئەو تاریکاییە بەرجەستە بکات کە دەوری گرتووە. بەمپێیە (کارلۆ) هەستیکرد نەك هەر کوێرە جگە لە ئەم کەسی نییە، بەڵکو ئەمیش نەیدەتوانی دەستبەرداری براکەی ببێت و ئەو میهرەبانیەی لە دڵیدا بۆ ئەو هەیبوو هۆی بەهێزی دڵی بوو بۆ ژیان..

لەگەڵ ئەوەشدا یەکەمجار بوو لەوە گەیشت دڵنیایی و میهرەبانیی لە هەردوولاوە و پۆزش هێنانەوەی کوێرە بۆ ئەم شتێکی ناچاری بون تا بتوانێت شانبداتە بەر بەدبەختیەکانی ئەو هەموو ئەرکە. نەیتوانی بەو زوانە چاو لەو

هیوایە بپۆشێت و پێویستی بە براکەی هەبوو. هەروەك چۆن براکەشی پێویستی بە ئەم هەبوو. چەندە سەریهێناو برد نەیویست و نەیتوانی دەست لە براکەی بەربدات. کەواتە یان دەبێت شانبداتە بەر توانج و پلاری ناڕەوای براکەی یان بە یەکجاری ئەو ناڕەوایی و قسە و قسەلۆکانەی براکەی بڕەوێنێتەوە..

ئاخ، ئەگەر دەیتوانی دراوێکی ئالتونی بەدەستبێنێت! ئەگەر بیتوانیایە سبەینێ بە براکەی بڵێت شاردویەتیەوە.. نەوەك لەگەڵ ئەم خەڵکانە لە خواردنەوەدا سەرفی بکات تا لێیزەوت نەکەن.

دەنگی پێ لەسەر پلیکانە تەختەکانەوە نزیك دەبۆوە. رێبوارەکان بون چونە ژورەکەی خۆیان. بیری کردەوە بچێت لە دەرگاکەیان بدات و رووداوی ئەو رۆژەیان بۆ بگێڕێتەوەو داوای بیست فرانکیان لێبکات، بەڵام هەر زوو تێگەیشت ئەم ئەزمونە بێهودەیە، چونکە کەس بڕوای پێناکات. کەوتەوە یادی، کە پیاوە گەنجە رەنگ پەڕیوەکەی ناو ئەرەبانەکەی بەلایدا تێپەڕی، کە ئەمی لە تاریکیەکەدا بینی چەند ترساو خۆیدا بەسەر جزدانە هەڵاوساوەکەیدا. شەو تاریك بوو، دەنگی پێی قورسی کرێکارەکان دەبیسترا، کە بەسەر پلیکانە تەختەکاندا دەچونە خوارەوەو لەگەڵ دوور کەوتنەوەیان هەر گفتوگۆیان بوو.

دوو دەرگای کاروانسەراکە داخران. مەیتەرەکە جارێکی دیکەش بەسەر پلیکانەکاندا رەت بوو. خامۆشی باڵی بەسەر هەموو شوێنێکدا کێشا. (کارلۆ) جگە لەپرخەپرخی براکەی هیچی دیکەی نەدەهاتە بەرگوێ. پێشئەوەی خەو بیباتەوە مێشکی زۆر جەنجاڵ بوو. کە لە خەو راچڵەکی هێشتا دنیا تاریك بوو. لە پەنجەرەی ژوورەکەی روانی، لەناو تاریکیەکەدا هەستی بە چوارگۆشەیەکی خاکی کرد. هێشتا (جیرۆنیمۆ)، وەك خەوی قورسی مەی خۆرێك، لە پرخەی خەودابوو. (کارلۆ) بیری لەو رۆژە کردەوە لەبەردەمیدایە و لەرز دایگرت تاڕادەیەك ئەو رۆژەی هاتەبەرچاو، شەوەکەی و رۆژەکەی دیکە و ئیدی هەموو ئایندەی خۆی بینی. لەو رۆژ و تەنھاییەی دوچاری دەبێت تۆقیبوو. بۆچی شەو ئەو ئازایەتیەی نەنواند؟ داوای بیست فرانکی لەو هەندەرانیانە نەکرد، لەوانەیە بەزەییان بجولایە!. کێ چوزانێت؟! لەوانەیە وا باشتر بووبێت.. بەڵێ، بەڵام بۆچی باشتر بوو؟!. لە جێگاکەی ڕاستبۆوەو دانیشت. هەستی بە لێدانی دڵی خۆی کرد. دەیزانی بۆچی واباشتر بوو چاو شۆڕبکات، چونکە لە دیدی ئەواندا وەك گوماندارێك دەمایەوە، کە بەو جۆرە.. لە پەڵە لێڵەکەی روانی کە بەرەو سپێتی هەڵدەگەڕا. ئەو بیرۆکەیەی بەبێ ویستی خۆی بە مێشکیدا هات کاری کردە نەبوو..! نەشیاو بوو...!. بێگومان دەرگاکەیان کڵۆمداوەو پاشانیش بێدار دەبنەوە. گەردو گوڵی بەیان هەڵاتنی خۆری بەو زووانە رادەگەیاند.

(کارلۆ) هەستاو چووە نزیك پەنجەرەکەو ناوچاوانی بە شوشە ساردەکەوە نوساند. بۆچی لە خەو بێدار ببۆوە، بۆ بیرکردنەوە؟.. بۆئەوەی کارێك ئەنجام بدات، چجۆرە کارێك؟ دەشیزانی ئەوە کاری کردە نییە و سەرەڕای ئەوەش تاوانە.. تاوان!.

ئایا بیست فرانك چ گرنگیەکی هەیە؟ بە تایبەت بۆ کەسانێك کە گەشتێکی هێندە گرانیان لەبەردەمدایە و بە تەنیاش بۆ خۆشگوزەرانیە. ئەی ئایا پەی بە بزربونی ئەو

بڕە پارەیە دەبەن؟. بەرەو دەرگاکە ڕۆشت و لەسەرخۆ کردییەوە. سێ هەنگاو واوەتر ئەو دەرگایە بوو، کە دەبوو کلۆم درابێت. بە مێخی سەر دیوارەکەوە پۆشاکی دەرەوەی ڕێبوارەکان هەڵواسرابوو. (کارلۆ) بە بێدەنگی کەوتە پشکنینی ئەو پۆشاکانە. ئاخ.. ئەگەر مرۆڤەکان بیانکردایە بە خوو جزدانەکانیان لەناو گیرفانەکانیان بەجێهێشتایە ژیان ئاسان دەبوو!..

بەڵام گیرفانەکان بەتاڵ بوون. دەبێت چیبکات؟. بگەڕێتەوە بۆ ئەو جێگایەی لێوەی هاتوە؟ بەڵکو بتوانێت ڕێگایەکی دیکە بۆ بەدەستهێنانی بیست فرانک بدۆزێتەوە، چارەسەرێکی کەمتر مەترسیدار و زیاتر عادلانەتر ئەگەر هەوڵ بدات لە دەستگیرۆییەکانی ڕۆژانە شتێك لابدات تا ئەو بڕە پارە پێویستە یان دراوە ئاڵتونییە کۆ دەکاتەوە، بەڵام ئەو کارە هێندە زۆر دەخایەنێت.. بۆ ئەو کارە.. چەند مانگێك و لەوانەیە ساڵێکیش پێویست بێت.. بۆ سەرەوە بچم.. کەمێك غیرەت، بەڵام هەروا لە ڕاڕەوەکەدا چەقی بوو، لەبەردەمی خۆی دەنواڕی. ئەو تروسکاییە ئاسۆییە چیبوو، کەوا دیاربوو لە دەرگاکەوە بۆ سەر ڕاڕەوەکە راکشاوە؟! ئایا ئەگەر هەبوو ڕێبوارەکان لە یادیان کردبێت دەرگاکە لە پشتەوە کلۆم بدەن؟ بۆچی سەراسیمەبوو؟ مانگێك دەبوو ئەو دەرگایە دانەدەخراو هەرچیشیان لەگەڵ دەکرد سودێکی نەبوو. بەهەرحاڵ بە درێژایی هەموو هاوین ئەو ژوورە سێجار نەبێت کەسی تێدا نیشتەجێ نەبوە. دووجاریان لەلایەن دوو کرێکاری ڕێبوارەوەو جاری سێیەمیش لەلایەن جیهانگەڕێکەوە، کە قاچی شکابوو. ئاخ.. بەڵام دەبێت کەمێك ئازاو جەربەزە بێت و بەختیش یاوەری بێت. هەر کەمێك دلێری. خۆ ئەگەر بەئاگاهاتنەوە دەبێت بەهانەیەکیان بۆ ئامادە بکات. لە درزی دەرگا کراوەکەوە چاوێکی خێرای بە ژوورەکەدا گێڕا. لەناو تاریکییەکەدا جەستەی دوو ڕێبوارەکەی هەڵاوێرد، کە لەسەر جێخەوەکەیان درێژ ببون، گوێی لە هەناسەدانی ڕێکوپێکیان بوو. بەهێوری دەرگاکەی ترازاند و بەپێی پەتی چووە ژوورەوە. بەرامبەر بە پەنجەرەکە لە پاڵ دیواری ژوورەکەدا دوو جێگا خەو هەبوون. (کارلۆ) یەکڕاست بەرەو مێزی ناوەڕاستی ژوورەکە ڕۆشت و بەدەستەکوتێی خێرا شتەکانی پشکنی، بەستەیەك کلیل، قەڵەمبڕێك، کتێبێکی بچوك و هیچی دیکە. دیار بوو هیوادار بوو دراوەکە لەسەر مێزەکە ببینێتەوە!.. دەبێت بکشێتەوە، بەڵام کەمێك ئازایەتی و وریایی دەیتوانی ڕزگاری بکات.. لە جێخەوی نزیك دەرگاکە چوە پێشەوە. شتێك لەسەر کورسییەکە بوو، دەستی درێژکرد، دەمانچەیەك بوو. (کارلۆ) داچڵەکی.. ئایا نابێت هەڵیگرێت؟! ئەی بۆچی ئەم کابرایە چەکەکەی لەبەردەستیدا داناوە.. گەر لەخەو رابێت و ئەم ببینێت.. چ گرنگییەکی هەیە، دەڵێت: (بەڕێز هەستە، سێ سەعات لە کاتەکە تێپەڕیوە!).

چەکەکەی لە جێگای خۆی دانایەوەو دەستی بە گەڕان کردەوە. لە کورسییەکەی دیکەش نزیك بۆوە، ئەمە کراسە، پاشان ئەی خوای گەورە ئەمە ئەو شتەیە وێڵە بە دوایدا، جزدانێکی پارەیە. توند لە ناو دەستیدا گرتی. دەنگی خشە خشێك هات. (کارلۆ) بە پەلە خۆی خزاندە ژێر یەکێك لە جێخەوەکانەوە. دەنگێکی دیکە بەرز بۆوە. ئینجا دەنگێکی بەرزی یەکێك لە خەوتوەکان. باوێشکێکی لەسەرخۆو ئینجا

خامۆشی و بێدەنگییەکی قوڵ. (کارلۆ) پارەکەی لە چنگدابوو، بە بێجوڵە لە جێگای خۆی وشك ببوو، هیچ شتێك جوڵەی تێدا نەمابوو.

ئاسـۆ رونـاك بـۆوە. (کـارلۆ)ش نەیـدەوێرا هەسـتێتەوە. تـاوی دایـە خـۆی و بـە گاگۆڵکـە خـۆی بـەنێو دەرگاکـەدا کـرد و خـۆی گەیانـدە راڕەوەکە. لەسەرخۆ هەستایەوە، هەناسەیەکی نـوێی هەڵمـژی، جزدانەکـەی کـردەوە، کـە سـێ بـەش بـوو. لـە بەشـەکانی لای راسـت و چـەپ چەند دراوێکی زیوی تێدابوو. بەشی ناوەڕاست بە زنجیرێکی تایبەت داخرابوو. (کارلۆ) ئەرکی خۆی دەزانی، کە دەبێت بیکاتەوە، ئینجا دوو پەنجـەی تێڕۆکـرد. پەنجـەی بـەر سـێ دراوی ئـاڵتونی کـەوت. سـەرەتا ویـستی دوو دانـەیان دەربهێنێت، بەڵام هەرزوو پەشیمان بۆوە.

یـەکێك لـە بیـست فرانکییـەکانی دەرهێنـاو دایخستەوە. دوبارە کەوتەوە سەر چۆك و بەرەو دەرگا نیوە کراوەکە گەڕایەوە، دووبارە بێدەنگی باڵی بەسەر ژوورەکەدا کێشابوو. لەگەڵ ئەوەی لە ژوورەوەی روانی بەزەبر جزدانەکەی توڕداو کەوتـە ژێـر جێخـەوی دووەم. ئەگـەر رێبوارەکـە بێـداربۆوە وا دەزانێـت لەسـەر کورسـییەکە کەوتۆتـە خـوارەوەو خزاوەتـە ژێـرەوە. (کـارلۆ) لەسـەرخۆ هەسـتایەوە. گـوێی لـە خشەخـشێك بـوو، ئینجـا دەنگێـك هـاواریکرد: (چـییە.. چیبوە؟).

(کارلۆ) هەناسەی خۆی توندگرت و بە چەند شـەقاوێکی لەسـەرخۆ خـۆی خزانـدەوە ژووری ژێر پلیکانەکان. ئیدی لەوێدا دڵنیابۆوە. گوێی هەڵخست.. جیرەی جێخەوەکەی بیست، پاشان بێدەنگی. دراوە ئاڵتونیەکەی لەناو قولەمستیدا توند گرتبوو. بە مورادی دڵی خۆی گەیشتبوو. بیـست فرانکـی هـەبوو، دەیتـوانی بـە براکـەی بڵێـت: (مـن دز نـیم). لەگـەڵ سـپێدەی بەیانیـدا دەکەونــە رێ، بــەرەو باشــور دەڕۆن، بــەرەو (برمیۆ) و پاشان بۆ (فالتلین، تیرانۆ، ئادل، برنـۆ تــا دەریاچــەی ئیــزۆ). کــەس گومــان لــەو رۆشــتنە کتوپڕەیــان ناکــات، چــونکە دوێــنێ خــاوەن کاروانــسەراکەی لــە بڕیارەکــەیان ئاگاداركردبوو. پێیگوتبوو (چەند رۆژێکی دیکە دەڕۆین).

تــاریکی شــەو رەوییــەوە. ژووری ژێــر پلیکانەکان بە روناکییەکی خاکی رۆشن بۆوە. ئێستا دەبێـت (جیرۆنیمـۆ) بێدار بێتـەوە تا لـە سـپێدەدا بکەونـەڕێ، چـونکە سـەفەری پیـادە دەبێــت بــەیانیان زوو دەســتپێبکات. پــاش ماڵئاواییـەکی خێرا لەگەڵ خاوەن کاروانسەرا، مەیتــەر و (ماریــا) بــڕوات. کاتێـك ماوەیــەکی باشیان بڕی و پاش چەند سەعات کە گەیشتنە دۆڵەکە ئیدی لەگەڵ (جیرۆنیمۆ) گفتوگۆ دەکات.

(جیرۆنیمۆ) هێشتا لەناو جێگاکەیدا کینگڵی دەداو خۆی دەکێشایەوە.

–کارلۆ وتی: (جیرۆنیمۆ)!

–چی رویداوە؟!.

بــە یاریــدەی (کــارلۆ) هەســتاو لەســەر جێگاکەی دانیشت.

–(جیرۆنیمۆ) بڕۆین؟!

–بۆچی؟!! بە هێمنی دوو چاوە مردوەکەی لە براکە کرد.

(کارلۆ) دەیزانی کوێرە کەمکەمە روداوەکانی رۆژی رابـردوی دێتـەوە یـاد، بـەڵام هـیچ ناڵێـت، مەگەر مەست بێت.

–(جیرۆنیمــۆ).. کــەش ســاردی کــردووەو دەبێــت ئێــستا بکەوینــەڕێ. وەرزی خــۆش بەسەرچــوو، بــابڕۆین.. بــۆ نیــوەڕۆ دەگەینــە (بلادەر).

(جیرۆنیمۆ) هەستا. لە هەموو لایەکەوە جموجۆڵی لە خەوڕابون دەبیسترا. لە حەوشەکەدا خاوەنی کاروانسەراکە لەگەڵ مەیتەرەکەدا دەدوا. (کارلۆ) جێگاکەی ڕێکخستو چووە خوارەوە. لە ڕاستیدا (کارلۆ) بەیانیان زوو لە خەو رادەبوو، زۆر جار پێش خۆرکەوتن لەسەر شاڕێکە پیاسەی دەکرد. بۆ لای خاوەنی کاروانسەراکە رۆشت و وتی:

-ئیدی ئێمە دەڕۆین.

-کاروانسەراکە پرسی: ئەمڕۆ دەکەونە ڕێ؟

-بەڵێ. جێگاکەمان زۆر ساردە و لەگەڵ ئەو (با) کزەی هەڵدەکات دەمانبەستێ.

-زۆر باشە، بەڵام لە زمانی منەوە سڵاو لە (باڵدتی) بکە، ئەگەر بینیتان، بڵێ ئەو زەیتە لە یاد نەکات، کە بەڵێنی پێدابوم.

-پەیامەکەت دەگەیەنم. دەربارەی کرێی ئەمشەومان.. ئینجا دەستی بە گیرفانیدا رۆکرد.

-خاوەنی کاروانسەراکە وەڵامیدایەوە: نامەوێت. ئەو بیست سەنتە بۆ براکەت.. خۆ منیش گوێم لە ئاواز و گۆرانیەکانی گرتوە. خواتان لەگەڵ.

-(کارلۆ) وتی: دەستتان خۆش.. هەرچۆنێك بێت دەتبینمەوە. هێندە دەسەپاچە نین و هەر دەگەڕێینەوەو (برمیۆ)ش هەر دەمێنێ. ئینجا بزەیەکی کرد و بە پلیکانە تەختەکاندا سەرکەوت.

(جیرۆنیمۆ)، کە لە ژووری ژێر پلیکانەکاندا وەستابوو گوتی:

-ئامادەی رۆشتنم.

-(کارلۆ) وەڵامیدایەوە: هەر ئێستا.

کەلوپەلەکانیان، کە لە باوەڵێکی بچوکدا بوو، بە چاوتروکانێك کۆکرایەوە. ئینجا (کارلۆ) وتی:

-رۆژێکی خۆشە، بەڵام ساردە.

-کوێرە وەڵامیدایەوە: بەڵێ، دەزانم.

هەردوکیان لە ژوورەکە هاتنە خوارەوە.

-(کارلۆ) وتی: کەمێك لەسەرخۆ، ئەو دوو کەسەی دوێنێ شەو گەیشتن هێشتا لە خەودان.

بەهێوری بەرەو خوارەوە رۆشتن.

-(کارلۆ) وتی: خاوەنی کاروانسەراکە رایسپاردم سڵاویت پێبگەیەنم، چووە بۆ لای هەرزاڵەکان و پاش دوو سەعاتی دیکە دەگەڕێتەوە. بیست سانتی کرێکەشی بە تۆ بەخشی. ساڵی ئایندە دووبارە دەیبینینەوە.

(جیرۆنیمۆ) هیچی نەگوت و ملی شاڕێکەیان گرت، کە لە ژێر بومەلێڵدا درێژ دەبوەوە. (کارلۆ) باسکی چەپی براکەی گرت، هەردوکیان بە هێمنی بەرەو دۆڵەکە کەوتنە ڕێ. پاش ماوەیەك بە جێگایەك گەیشتن رێگاکە پێچاوپێچی زۆری تێدابوو، تەم دەوروبەریانی تەنیبوو. وا دەردەکەوت لوتکەی چیاکان کەوتبنە ژێر فشاری هەورەکانەوە.

(کارلۆ) بیری کردەوە (ئێستا پێیدەڵێم). بەبێئەوەی هیچ بڵێت دراوە ئاڵتونیەکەی لە گیرفانی دەرهێناو لەناو مستی براکەی رۆکرد و (جیرۆنیمۆ)ش، کە دراوەکەی لە نێو پەنجەکانیدا هەڵسوو، لە روخساری خۆی نزیك کردەوەو گوتی:

-خۆم دەمزانی!

-(کارلۆ) بە سەرسوڕمانەوە لە (جیرۆنیمۆ)ی ڕوانی و خاوەخاو گوتی: بەڵێ!

-ئەگەر ئەو پیاوە هەندەرانیەش باسی نەکردایە خۆم هەردەمزانی!.

-(کارلۆ) بە سەراسیمەبونەوە وتیەوە: بەڵێ، بەڵێ. ئایا دەزانیت بۆچی نەمویست لەوێ لەبەردەمی ئەو خەڵکەدا بتدەمێ؟ دەترسام

هەموی بەفیرۆ بدەیت.. وانییە؟. وا بزانم کاتی ئەوە هاتووە کراس و جوتێك پێلاوی نوێت بۆ بکرم. هەر لەبەرئەوە بوو من..

–کوێرە بە توندی سەری رادەوەشاند: بۆچی؟ دەستی بۆ جلەکانی برد، ئەمە باشە، گەرمە و ئیدی بەرەو باشوریش دەڕۆین.

(کارلۆ) سەری لەوە سوڕدەما (جیرۆنیمۆ) چۆن لە شتەکان تێدەگات، پێنەدەچوو رازی بێت و داوای پۆزشی نەکرد.

–(کارلۆ) وتی: (جیرۆنیمۆ) بڕوانە، بڵێ کە من راست بوم، بۆچی خۆشحاڵ نەبویت؟!. خۆ ئێستا دراوەکەمان هەیە، دراوە ئاڵتونیەکەت وەك خۆی ماوە، ئەگەر لەوێ بە تۆم بگوتایە کێ چوزانێت.. نەخێر، وا باشتر بوو بەو جۆرە بجوڵێمەوە..

–(جیرۆنیمۆ) هاواریکرد: کەمتر درۆ بکە.. بەسە.

–(کارلۆ) باسکی براکەی بەرداو ڕاوەستا: من درۆ ناکەم.

–من دەزانم تۆ درۆ دەکەیت. تۆ هەمیشە درۆ دەکەیت.. تۆ زۆر جار درۆت لەگەڵ من کردووە. تۆ دەتویست هەموی بۆ خۆت هەڵگریت، بەڵام ترسایت و.. تەواو.

(کارلۆ) سەری داخست، بێئەوەی وەڵام بداتەوە دوبارە باسکی کوێرەی گرتەوەو کەوتنەوە رێ. لە قسەکانی براکەی کەمێك نیگەران بوو، بەڵام بەلایەوە سەیر بوو دڵی نەڕەنجاوە.

تەمەکە دەڕەوییەوە، ئەمجارە پاش ماوەیەك (جیرۆنیمۆ) دری بە بێدەنگییەکەدا و گوتی:

–کەش خەریکە گەرم دابێت.

بەڵام ئەوەی بە ئاوازێکی سادەو سروشتیانە درکاند، وەك ئەوەی هەر هیچ روینەدابێت.

لە راستیشدا (کارلۆ) هەستی بەوە کرد هیچ خراپ حاڵی بونێك لە نێوانیاندا روینەداوە، چونکە براکەی هەمیشە هەر بە دز سەیری کردووە.

–لە کوێرەی پرسی: برسیتە؟

(جیرۆنیمۆ) بەسەر لەقاندنێك وەڵامی بە بەڵێ دایەوە. هەر بە رێگاوە پارچە نان و پەنیرێکی لە گیرفانی هێلەکەکەی دەرهێناو دەستیکرد بە خواردنی.

ئەرەبانەیەکی پۆستەی بۆ (برمیۆ) دەبرد بەلایاندا رابورد و ئەرەبانچییەکە لەسەر جێگاکەی خۆیەوە پرسی:

–تازە لە دەربەنەکەوە دێن؟

ئەرەبانەی دیکەش بەلای چەپ و راستیاندا رەت بوون.

–(جیرۆنیمۆ) وتی: هەوای دەشتایی!.. هەر لەوکاتەدا رێگاکە پێچی دەکردەوەو (ڤالتلین) دەرکەوت.

(کارلۆ) بیری کردەوە (لە راستیدا هیچ نەگۆڕاوە، لە پێناوی ئەودا دزیم کرد و زەحمەتەکەشم بەهەدەرچوو). لە خوارەوە تەمەکە چڕییەکەی نەمابوو، تیرۆژەی خۆر بە نێویدا دزەی دەکرد. (کارلۆ) بە بیرکردنەوەی خۆیدا رۆچووبوو. ئایا لەروی تەگبیر وەرگرتنەوەبوو بەو زووە کاروانسەراکەی بەجێهێشت؟ بلێی لەو کاتەی جزدانەکەی فرێدابوە ژوورەکەوە ئەوانی بە ئاگا هێنابێت؟ بەڵام هەموو ئەوانەی لەلا یەکسان بوو. ئایا دەبێت چ پێشهاتێکی چاوەڕوان نەکراو بەخەی گرێت؟!.

براکەی، کە بەهۆی هەڵەی ئەمەوە لەبینین بێبەش ببوو، گومانی هەبوو دزی و فێڵی لێکردوە. زۆر لە کۆنەوە ئەوە هەستی بوەو

هەرواش دەبێت. ئایا دەبێت لەمە خراپتر چی بەسەر بێت؟!.

هوتێلێکی تەلار سپی گەورە کەوتبوە سەر ڕێگایان و دیوارەکانی بەهۆی تیشکی خۆرەکەوە شەوقی دەدایەوە. کەمێك دورتر لەوێوە لە دەشتاییەکەدا، کە دۆڵچەکە بەرفراوان دەبوو، گوندێك بە درێژایی دۆڵەکە درێژبوبۆوە. هەردوو براکە مات بوون. بەبێئەوەی بۆ ساتێکیش دەستی (کارلۆ) لە باسکی براکەی شل ببێت پێکەوە ڕێیان دەبڕی. کاتێك بە کەنار باخچەی هوتێلەکەدا ڕەتبوون (کارلۆ) موسافیرەکانی بینی بە بەرگی کراوەوە لە ژێر خۆرەتاوەکەدا دانیشتون و سەرقاڵی ناشتاکردنن. پرسی:

–دەتەوێت لە کوێ پشویەك بدەین؟

–وەك هەمیشە لە مەیخانەی هەڵۆ.

بەناو گوندەکەدا ڕەت بوون و لەبەردەم مەیخانەکە راوەستان. پاش ئەوەی دانیشتن داوای شەرابیان کرد.

–خاوەنی مەیخانەکە پرسی: بەمزووە چیدەکەن لێرە؟!

–ئەم پرسیارە کەمێك (کارلۆ)ی هەراسان کرد. وتی: کەش زوو گۆڕا. ئەی ئێمە لەدەو یانزەی سێپتەمبەردا نین؟

–ساڵی پار درەنگتر هاتن!

–(کارلۆ) وەڵامیدایەوە: ئەو سەرەوە ساردبوو. دوێنێ شەو لە سەرماندا ڕەق هەڵاتین. سەرەڕای ئەوە خاوەنی کاروانسەراکە رایسپاردم ناردنی زەیتەکە بە یاد بێنمەوە.

لە مەیخانەکەدا مرۆۋ تەنگە نەفەس دەبوو. (کارلۆ) دەستیکردبوو بە ناڕەزایی دەربڕین و حەزیدەکرد بچێتە دەرەوە هەوایەکی پاك هەڵمژێت، بچێتە سەر شارێکەی بەرەو (تیرانۆ و ئادا) دەچوو، بەرەو (ئادل)، بەرەو دەریاچەی (ئایزۆ) دوورتریش. لەناکاو لە جێگای خۆی هەستا.

–(جیرۆنیمۆ) وتی: هەروا زوو.

–بەڵێ. چونکە دەبێت پاشنیوەڕۆ لە (یلادەر) بین و لە میوانخانەی (گوزن) شتێك بخۆین، کە وێستگەی ئەرەبانەکانە.. ئەوێ شوێنێکی خۆشە.

کەوتنە ڕێ.

–(بنۆزی) دەلاك لەبەردەم دوکانەکەیدا وەستابوو جگەرەی دەکێشا. بانگی لێکردن: سڵاو.. دەنگوباسی ئەو سەرەوە چییە، لەوانەیە دوێنێ شەو بەفر باریبێت!.

–(کارلۆ) کە زیاتر پێیهەڵگرت وتی: بەڵێ.. بەڵێ.

پشتیان لە گوندەکە هەڵکرد و ملی ئەو ڕێگایەیان گرت، کە لەبەردەمیاندا هەر درێژ دەبۆوە. چەمەکە بە دەنگی قەڵبەزەوە بەناو باخ و چەمنزارەکاندا ڕەت دەبوو. ئاسمان ساماڵ و ڕۆشن بوو. (کارلۆ) بیری کردەوە (بۆچی ئەو کارەم کرد؟!).

دزەنیگایەکی گرتە براکەی: (روخساری نەگۆڕاوە، هەروەك خۆیەتی. هەموو ئەو ڕۆژانە من هەر تەنها و تەنیا بوم، چونکە ئەو هەرگیز لە باوەڕی خۆی پاشگەز نەبوو، کە من دزم و بێزارە لێم). لەوەدوا وای هەست دەکرد بارێکی قورس بەسەر کۆڵییەوەیە و هەرواش ڕێگا دەبڕێت. دەیزانی مافی ئەوەی نییە باوەڕەکانی پێبگۆڕێت. ئەو روناکییەی بەسەر ڕێگاکەدا دەخشا بە ئەم نەدەگەیشت. هەستیدەکرد لە شەوێکی نوتەکدا ڕێگا دەبڕێت، زۆر تاریکتر لەو شەوەی وادەوری براکەی تەنیبوو.

بەردەوام ڕێگایان دەبڕی و هەردەڕۆشتن. چەندین سەعات تێپەڕی. جار جارە (جیرۆنیمۆ) لەسەر بەردێکی لاڕێکە ڕۆدەنیشت، هەندێکجاریش بۆ حەوانەوە خۆیان بەسەر نەردەی پردێکدا دەدا. دووبارە گوندێکی دیکە. ئەرەبانەکانی لەبەردەم کاروانسەراکاندا راوەستابون، کە بەڵگەی هاتوچۆکردنی گەشتیاران بوو، بەڵام ئەو دوو وێڵە نەوەستان و دووبارە کەوتنە ڕێ. لەسەر شاڕێکە خۆر لە ئاسماندا بەرز هەڵدەکشا، نزیک نیوەڕۆ بوو. دووبارە ڕۆژێکی دیکەی وەك هەزاران ڕۆژی دیکە.

–(جیرۆنیمۆ) وتی: تاوەری بلادەر!

(کارلۆ) سەری هەڵبڕی و سەری سوڕما لەوەی (جیرۆنیمۆ) چۆن ئەو ماوەیەی پێواوە؟!. تاوەری (بلادەر)، کە سەری لە کەشکەلانی فەلەك دەسوو، دەرکەوت. (کارلۆ) بینی لە دوورەوە کەسێك بەرەو پیریان دێت. لای وا بوو ئەو کەسە لە کەنار ڕێگاکە دانیشتبوو، هەر لەگەڵ ئەوەی ئەمانی بینی هەستایە سەر پێ. تارماییەکەی بەرەو ڕوویان دەهات و (کارلۆ) هەر لە دوورەوە ڕوخساری پۆلیسێکی تێدا بەدیکرد. هەرچەندە بەو جۆرە ڕێکەوتانە ڕاهاتبوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە جێگای خۆی چەقی. بەڵام کاتێك (تەنلی) ناسییەوە ئارا بۆوە، چونکە پێش شەش مانگ لە (مەرنین) لەگەڵ (لاگان)ی مەیخانەچی پێکەوە مەییان نۆشیبوو. پۆلیسەکەش چیرۆکی ترسناکی ئەو چەتەیەی بۆ گێڕابونەوە، کە ویستبوی بە خەنجەر لێیبدات.

–(جیرۆنیمۆ)وتی کەس لەسەر ڕێمانە؟

–(کارلۆ) وەڵامیدایەوە: (تەنلی) پۆلیسە.

لەبەردەم پۆلیسەکەدا ڕاوەستان:

سڵاو تەنلی!

–پۆلیسەکە وتی: من هیچم لە دەست نایەت، جگە لەوەی بە پەلە بۆ هۆبەی (بلادەر)تان ببەم.

–کوێرە هاواریکرد: چی؟

(کارلۆ) ڕەنگی پەڕی و لە دڵی خۆیدا وتی: (ئایا شتی وا دەبێت؟!، بەڵام دیارە پەیوەندی بەوەوە نییە و لێرە هێشتا کەس گومانی لێیان نییە).

–پۆلیسەکە بە خەندەوە وتی: خۆ (بلادەر) لەسەر ڕێتانە، بێگومان پێتان ناخۆش نابێت لە دواتانەوە بڕۆم.

–(جیرۆنیمۆ) پرسی: (کارلۆ) بۆ هیچ ناڵێیت؟!

–چۆن؟ بێدەنگ نابم!.. ببوورە کاکی پۆلیس.. چۆن دەبێت!.. چیت لە ئێمە دەوێت؟.. یان چیت لە من دەوێت؟.. بەڕاستی هیچ تێناگەم!

–پەیوەندی بە منەوە نییە، لەوانەیە تۆ بێتاوان بیت، ئەوەش ئەگەرێکە، بەڵام بڕیاری دەستگیرکردنتان گەیشتۆتە بنکەی پۆلیسی (بلادەر)، چونکە گومانیان لە ئێوە هەیە لەو سەرەوە دراوتان لە گیرفانی ڕێبواران دزی بێت.. هەرچۆنێك بێت ئەگەر هەیە ڕاست نەبێت. ئێستا بکەونەڕێ.

–(جیرۆنیمۆ) وتی: (کارلۆ) بۆ هیچ ناڵێیت؟!

–ئەوە نییە خەریکە قسە دەکەم. دەمەوێت قسە بکەم..

–بڕۆن.. خێراتر بڕۆن. چ سودێکی هەیە لەسەر ئەم ڕێگایە بوەستن؟ خۆرەکە هەڵدەکشێت و یەك سەعاتی دیکە ترسم لێدەنیشێت، دەی پەلە بکەن!.

(کارلۆ) باسکی (جیرۆنیمۆ)ی گرتەوەو بە جوڵەیەکی تایبەت، کە ئەو ئاشنای بوو، کەوتنەوە ڕێ و پۆلیسەکەش بەدویان کەوت.

-(جیرۆنیمۆ) بۆ سێیەمین جار وتیەوە: (کارلۆ) بۆ هیچ ناڵێیت؟

-(جیرۆنیمۆ) چیت لێم دەوێت؟ دەتەوێت چی بڵێم، دواجار ئاشکرا دەبێت.. نازانم!

بیری کردەوە (ئایا پێشئەوەی پرسیارمان لێبکەن چیرۆکەکە بگێڕمەوە؟.. کارێکی ئاسان نییە و لەبەردەم ئەم پۆلیسە گوێمان لێناگرێت چ گرنگییەکی هەیە؟. پاشان لە لێکۆڵینەوەدا راستیەکەیان لا دەدرکێنم. دەڵێم: دادوەری بەڕێز، ئەمە دزییەکی ئاسایی نییە. مەبەستەکە ئەوەیە..). ئینجا بۆ ئەوەی قەناعەت بەدادوەر بکات بۆ وشەی گونجاو دەگەڕا تا باش روداوەکە شیبکاتەوە!.. (پیاوێك لە ناو ئەرەبانەیەکدا بە گەردەنەی (ستلڤییۆ)دا تێپەڕی، بێگومان کەسێکی شێت ئاسابوو. لەوانەشە بە هەڵەدا چووبێت.. ئەم کابرایە هەر زوو..

هەموو ئەمانە وڕێنەن: کێ باوەڕ دەکات؟ لەوانەیە نەهێڵن قسەکانی تەواو بکات.. کەسیش بڕوا بەو ئەفسانەیە ناکات. هەر وەك چۆن خودی (جیرۆنیمۆ)ش باوەڕ ناکات. لە ژێرەوە نیگایەکی براکەی کرد و بینی کوێرە وەك هەمیشەی شەقاوەکانی لەگەڵ جوڵەی سەری رێکخستووە. سیمای رازداربوو، چاوە پوچەڵەکانی بەردەوام لە بۆشاییدا دەسوڕانەوە. (کارلۆ) گومانی هەبوو بتوانێت بە ئاسانی ئەو بیرۆکانە بخوێنێتەوە بەو پشتە سەرەدا تێدەپەڕین. لەوانەیە ئێستا کوێرە بە خۆی بڵێت: (زۆرباشە، ئەمە شتێکی نوێیە، (کارلۆ) نەك هەر دزی لە من دەکات، ئەوەتا دزی لە کەسانی دیش دەکات. ئەو خۆشحاڵەو چاوەکانی ساغەو بە کەڵکی دێن). بێگومان دەبێت ئەمە ئەو شتە بێت (جیرۆنیمۆ) بیری لێدەکردەوە. (کارلۆ) دووبارە بیری کردەوە: (لەوەی دراوەکە لای من نادۆزنەوە نە لای دادوەر و نە لای (جیرۆنیمۆ) بێتاوان دەرناچم. لە بەندیخانەم دەخزێنن.. و ئەویش.. ئەویش فرێدەدەنە زیندانەوە، چونکە دراوە ئاڵتونیەکە لای ئەوە).

بیرکردنەوەکانی پەرێشان و ئاڵۆزکان. هێندە نیگەران بوو وایهەستدەکرد لەو گرفتە سەردەرناکات. بەڵام ئامادەبوو لەجیاتی ساڵێك دەساڵ زیندانی بچێژێت بەو مەرجەی براکەی دواجار تێبگات دز نییە و ئەوەی تەنها لەبەردڵی ئەو ئەنجامداوە.

لە ناکاو (جیرۆنیمۆ) چەقی و (کارلۆ)ش بە ناچاری راوەستا.

-پۆلیسەکە بە ناڕازییەوە پرسی: چیبووە؟ بۆ پێشەوە بجوڵێن!.

بەڵام بە سەرسوڕمانەوە بینی کوێرە گیتارەکەی رۆناو دەستەکانی بەرزکردەوەو بە کوێرانە کەوتە دەستلێدانی روخساری (کارلۆ)ی برای و پێشئەوەی ئەو لە مەبەستەکەی بگات کوێرە سەری براکەی لە نێو دەستەکانی خۆیدا توند گرت، دەمی لە لێوی نزیك کردەوەو رایموسی.

-پۆلیسەکە وتی: ئەگەر بە هەڵەدا نەچوبم ئێوە تەواو نین.. دەی پەلە بکەن. نامەوێت لەبەرخۆرەکەدا ببمە کەباب.

(جیرۆنیمۆ) بە بێئەوەی یەك وشەش بدرکێنێت گیتارەکەی هەڵگرتەوە. (کارلۆ) هەناسەیەکی سەرفرازی هەڵمژی و بازوی کوێرەی گرتەوە. ئایا ئەبێت خراپ حاڵی بونی

براكەی سڕابێتەوە؟ لەوانەیە پەی بەوە بردبێت؟ بە گومانەوە نیگایەكی كرد.

-پۆلیسەكە هاواریكرد: بڕۆ.. دەڕۆیت یان نا؟!. ئینجا مشتەكۆڵەیەكی سرەواندە پشتی (كارلۆ).

(كارلۆ)، كە بە توندگرتنی بازوی براكەی رێنمای دەكرد، لە جاران زیاتر دڵخۆش و شادانە دەڕۆشت و خێراتر پێیهەڵگرت. چونكە زەردەخەنەكەی سەرلێوی (جیرۆنیمۆ)ی بینی لەگەڵ میهرەبانیەك ئاوێتە بووە، كە لە مناڵیدا نەبێت ئەو دیاردەیەی تێدا نەبینیوە. (كارلۆش) لەلای خۆیەوە زەردەیەك گرتی. ئایا ئێستا دەبوو چ ڕوداوێكی ناخۆش بەرۆكی بگرێت؟. دادگای سزا و هەموو دنیاش لە بەرامبەریدا بێتوانابوو. ئەو دووبارە براكەی بەدەستهێنابۆوە.. ئاخ، نا، لەوەش باشتر دڵی ئەوی بەدەستهێنابوو.

**سەرچاوە:**

گراكوسی شكارچی و داستان های دیگر، ترجمە صادق هیدایت.

# لە هونەری ئەکتەرەوە لەلای ستانسلافسکی
# بەرەو پێرفۆرمانکار لەلای کرۆتۆفسکی

ڤیرجینی ماینات

لە فەرەنسییەوە: مستەفا قەسیم

### بەشی دووەم و کۆتایی

**ئۆرگانگەرایی ( *organicite* )**

وشەی ئۆرگانگەرایی بەلای هەردوو رێژیسۆرەوە پەیوەستە بە ژیانی ئەنتیمی جەستەوە. کرۆتۆفسکی جەستەی مرۆڤ بەراورد دەکات لەگەڵ ئاژەڵێك و دەڵێ کە ئۆرگانگەرایی واتە (ژیانێکی تەبا لەگەڵ یاسا سروشتیەکان، بەڵام ئەوە لە ژیانێکی بەرایییدا). لەم پێناسەیەوە مەبەستیەتی بڵێ کە (منداڵ هەمیشە بە نزیکی بوونەوەرێکی ئۆرگانیکە). ئەکتەر بۆ ئەوەی کارەکەی لەسەر بنچینەی تەوژمەکان دامەزرێنێ، واتە ئۆرگانیکی بێت، دەبێ کار بکا و بکۆشێ کە (هەمیشە فۆرم بخاتە پێش ئەو شتەی کە دەبێ پێش فۆرم بکەوێ، لە رێگای پرۆسەیەکی کارکردنەوە کە ڕووەو فۆرم ملدەنێ دەبێ بیخاتە پێش). زنجیرە کۆنفرانسەکانی کرۆتۆفسکی کە لە چوارچێوەی وتنەوەی وانەکانیدا بوون و لە کۆلێجی فرانس پێشکەشی کردن لە ژێر ناونیشانی (بنەچە ئۆرگانیکیەکان لە شانۆ و لە رێتواڵدا) بوون. لە یەکێ لە وتووێژەکاندا کرۆتۆفسکی ڕوونی دەکردەوە کە، لە کردەی خوڵقاندا ئەوە تێبینی دەکات کە دوو جەمسەری هەمیشە هاودژ خۆیاندەنوێنن. جەمسەری (ئۆرگانگەرایی) و جەمسەری (دروستکراو – تصنع) بە واتە بەرزەکەی ئەو وشەیە.

ئۆرگانگەرایی پشتدەبەستێ بە بوونی پرۆسەیەکی ڕەسەن و زیندووە کە دەستنیشانی (گوزارشتێك پێشوەخت ئامادەکاری بۆنەکرابێ) دەکات. کرۆتۆفسکی جووڵەی ئەو درەختەی بە نموونە دەهێنایەوە کە چۆن لە کاتی ڕەشەبادا ئەمدیوو ئەودیو دەکات، یان هەڵکشان و داکشانی شەپۆلەکان بەرەو قەراغ دەریای بە نمونە دەهێنایەوە. ئەو تێبینی دەکرد کە، ئەو (گوزارشتئامێزیە) کە، مرۆڤ لە نێو ئەو دیاردە سروشتیانەوە هەستی پێدەکات، بۆ خۆی ئامانجی هێماکردن بۆ، یان نواندنی هیچ شتێكو هیچ مەبەستێك نیە، لەبەر نەبوونی چاودێرێك (شایەتێك) ئەو دیاردە ئۆرگانیکانە بەردەوام دەبن خۆیان بەرهەمبهێنەوەو دووبارە بکەنەوە. ئەوەی پەیوەندی هەیە بە دروستکاریەوە (تصنع)، بریتیە لە سیما و بینراوێك کە تێکڕای هەوڵ و کۆششە مرۆیەکان دەستنیشان دەکات لە پێناو بەفۆرمکردن یان دانانی ستورکتورێك یان پێکهێنانی کۆمەڵێ کەرەستە بۆ خوڵقاندنی بابەتێك، شاکارێك، بە مەبەستی بینین و هەستپێکردنی لەلایەن مرۆڤەوە. کەواتە گشت ئەنجامدانێکی هونەری بریتیە لە کارێکی دروستکراو (*artificiel*). بۆ نمونە، ئاشکرایە کە ریالیزم لە شانۆدا وەك پێویست ئەولەویەت نادات بە ئۆرگانگەرایی، بەو پێیەی گشت رێژییەکان، ریالیست بن یان ریالیست نەبن، تا ڕادەیەك پشتدەبەستن بە پیشەگەرایی. لەبەر ئەو هۆیە کرۆتۆفسکی توانی پەرە بدات بە، هەوڵەکانی ستانیسلافسکی لە بواری کارکردن لەسەر تەوژمەکان، کە لە بنەڕەتدا بۆ ڕاڤەکردنی ڕێپێرتوارە ریالیستەکان ئامادە کرابوون و، بۆئەوەی لە کارەکانی خۆیدا، لەودیو سنووری ریالیست لە شانۆدا، پیادەیان بکات. بۆ نمونە چەمکی مۆنتاجکردن، کە بە شێوەیەکی تایبەتی کارێکی گونجاوو تەبا بوو لە رێژیەکانیدا، سەر بە جەمسەری پیشەگەرایی بوون، بەلام کارکردن لەسەر بیرو وێنە بانگەوازکراوەکان کە پابەندی تەوژمەکان بوون دەچوونە پاڵ جەمسەری ئۆرگانگەراییەوە. ستانیسلافسکی هەمیشە لایەنگری ئەوەی دەکرد کە خۆی بە (ژیانی ناوەوە) ناوی دەبرد. بەلام لەگەڵ ئەوەش بەردەوام داوای دەکرد کە ئەکتەرەکانی دەبێ دیقەتێکی لە ڕادەبەدەر و شارەزاییەکی بەرز و دروستیان هەبێ لە پیشەکەیاندا. بەو پێیە کۆمەڵێ نمونەی زۆر لە نێو نووسینەکانی بەدیدەکرێن کە لایەنگری ئەو بۆ ئۆرگانگەرایی دەسەلمێنن. بەتایبەتی لە دوا لاپەڕەکانی کتێبی (بنیاتنانی کارەکتەر) دەبینین کە زۆر ستایشی توانا سەرسوڕهێن و خوڵقێنەرەکانی سروشت دەکات و دەڵێ (مەحاڵە بتوانین ڕەخنە بگرین لە بروسکە و زریان و گێژەڵوکەو باوبۆران گزنگ و بەرەبەیانو...) ئەو دیاردە سروشتیانە بەراورد دەکات بەو چرکەساتانەی خوڵقاندن لەلای ئەکتەر کە هەندێ جار وەك شەپۆلە هەڵچووە شێلگیرەکان لە پڕێکدا، لە کاتی نواندنی ڕۆڵێك ڕوودەدەن کە خودی ئەکتەر بە ساتەوەختی رزگاربوون ناو دەبات. ئەو دەڵێ ئەگەر هاتوو ساتەوەختێکی بەهاداری لەو چەشنە ئەکتەریش لە ڕێڕەوی سەرەکی ڕۆڵەکەی دوور بخاتەوە، کە جێگای نیگەرانیە، بەلام تەقینەوە تەقینەوەیە و ئاوە هەرە قوڵەکان دەهەژێنێ. ئەوە ڕووداوێکە هەرگیز لە یادناکرێ و ڕووداوی ژیانێکی سەرتاپاگیرە. ستانیسلافسکی دەڵێ ئەو چرکەساتانە دەگمەنن، بەلام پشتگیری لەوەش دەکات کە ئەو ساتەوەختانە گشت ئەو ئافراندنانە تێدەپەڕێنن

که دەرئەنجامی بۆچوونێکی تەکنیکی ڕاست و دروستیش بن و تەنانەت ڕادەی بەرزی دیقەت و ئاڵۆزی و وردەکاریشیان هەچی چۆنێك بێ.

دەرئەنجامی کتێبەکەی بە دانپیانانێك تەواو دەکات کە زۆر بە ڕاشکاوی و سادەییەوە باس لەوە دەکات کە ئەو زانیاریەکی ئەوتۆی لەلا نیە سەبارەت بە (نهێنیەکان) کە بواری نەست و حەدەس ڕێکدەخەن و بەڕێوەدەبەن.

لە درێژەی ئەو لێکۆڵینەوانەی کە، بە ئامانجی ئازادکردنی هێزە خوڵقێنەرەکانی ئەکتەر، دەیگرتنە بەر، ستانیسلافسکی هەمیشە دید و بۆچوونێکی دەپاراست کە لە هەمان کاتدا سترکتور و ئۆرگانگەرایی تێدا بەرزو بە بەها دادەنا. ئەو بۆچوونەش بە شێوەیەکی تایبەتی دەرئەنجامی ئەو شێوازە تایبەتیە بوو کە لە ئاراستەکردن و بەڕێوەبردنی ئەکتەرەکان لە کارەکانیاندا پیادەی دەکرد و، کاتێ دەیووت (تێدەگەم) یان (تێناگەم) هەروەها (بڕوادەکەم) یان (بڕوا ناکەم). لە کاتێکدا کە کردەی تێگەیشتن دەگەڕێتەوە بۆ ڕوون و ئاشکرایی لە پێکهێنانەکاندا – کۆپۆزیسیون، کە خۆی لە پێویستی بینەر دەبینێتەوە بەرامبەر لۆجیکێك و ڕێزبەندی و یەکگرتوویەك کە پەیوەستە بە کاری ئەکتەرەوە. بەڵام کردەی بڕواکردن یان بڕوانەکردن، سەبارەت بەوەی لەسەر شانۆ دەگوزەرێ، پابەندە بە ژیانی ناوەوە و بەسەر تێکڕای پرۆسەی کاری ئەکتەر ڕەنگدەداتەوە. هەروەها ریشارد وەك شایەتحاڵێك لە بەرامبەر بەکارهێنانی ئەو چەمك و بۆچوونانەی کە کرۆتۆفسکی پیادەیدەکردن و کە لە ستانیسلافسکیەوە بۆی مابوونەوە، دەڵێ (بۆ نمونە لە کاتی ڕاڤەکردن و شیکردنەوەی کاری یەکێك لە ئەکتەرەکان، زۆرجار کرۆتۆفسکی دوو پرسیاری لێدەکردین، سەرەتا دەیوت چی تێگەیشتن؟ پاشان پرسیاری دووەمی ئەوە بوو دەیوت، ئایا بڕواتان هەبوو بەوەی کرا؟ ریشارد دەڵێ، کاتێ یەکێك وەڵامی دەدایەوە و دەیوت (تێنەگەیشتم بەڵام بڕوام پێ هەبوو) ئیتر لەو کاتەوە بە جۆرێك مەزەندەی کارەکە دەکرا وەك ئەوەی چوبێتە نێو ئاڕاستەیەکی دروستەوە.

ئەو نمونەیە ئەوە پێشاندەدات کە وەکوو ستانیسلافسکی کرۆتۆفسکیش لە قۆناغی بەرایی کارکردندا، ئەولەویەتی دەدا بە ئۆرگانگەرایی لەوەی زیاتر بیدات بە کۆمپۆزیسیون. ئەم کارەش خۆی لە میانەی کۆنفرانسەکانیدا جەختی لەسەر دەکردەوە. هەروەها دەیوت فاختانگۆڤ هەوڵیداوە کارو لێکۆڵینەوەکانی لە هەمان کاتدا، لەسەر بنچینەی پرۆسەی گەشەکردنی ئەکتەر و لەسەر بنچینەی فۆرم دابمەزرێنێ. بەو پێیە کرۆتۆفسکی هەستی دەکرد لە میانەی پیشەگەریێتیدا، دید و بۆچوونەکانی نزیکن لە فاختانگۆڤەوە، کە مردنی پێشوەختی ڕێگای نەدا توێژینەوەکانی بە ئەنجام بگەن، بەڵام لەگەڵ ئەوەش توانی سەرکەوتوانە خۆی دووربخاتەوە لە حەشوکردنی ریالیزم و بێپاساوی فۆرمالیستەکان. کارو توێژینەوەکانی لە خاڵێکی بەیەکگەیشتنی نێوان، ڕۆچوون و کەشفکردنەکانی ژیانی ناوەوە و ئەزمونی ئاگایی، خۆیاندەبینیەوە. هەر ئەو بابەتە چەقی گرنگی پێدانی ستانیسلافسکی بوو کە، مایەر هۆڵدیش بۆی بەجۆش بوو لە ڕێگای چەمکی بە شانۆیی کردن و بە شانۆی مەرجئامێزی ئاگایی (*convention consciente*) ناوەندیدەکرد. بەو شێوەیە فاختانگۆڤ پێشانیداوە کە ئۆرگانگەرایی دەتوانێ لە ناوجەرگەی دید و بۆچوونێکی ناڕیالیزمدا، لە پرۆسەی نواندن

لەلای ئەکتەر، سەرکەوتن ئەنجامبدات. بەو جۆرە ئەولەویەتی بە کردەی بە شانۆیی کردن دەدا لەوەی گرنگیەکی زیاتر بە جۆرێك جووڵە و هەڵسوکەوتی ناتوریالیستیانە بدات کە لەبەرگیراوەی ژیانی رۆژانەن.

## بیرو وێنە بانگەوازکراوەکان ( *associations* )

لە درێژەی کۆنفرانسەکاندا کرۆتۆفسکی تێبینی دەکرد کە ئۆرگانگەرایی خۆی لە خۆیدا وەك پێویست گەرەنتی ئافراندن نەبووە، بۆیە ئەو دەیووت پرۆسەیەکی ڕاستەقینەی ئافراندن هەمیشە بەشێوەیەکی ئەنتیم پەیوەستە بە شەپۆلی بیرو وێنە بانگەوازکراوەکان. پاشان ڕوونیدەکردەوە کە کارکردن لەگەڵ چەمکی بیرو وێنە بانگەوازکراوەکان، لە هەندێ حاڵەتدا، کە بێبایەخیەك لە خۆ دەگرێ، بۆ نمونە، (کاتێك شتێك دەکەین.. بیرووێنەیەکی بانگەوازکراو دەهێنینە ئاراوە) دواتر کرۆتۆفسکی ئانیشکی ڕاستی خستە سەر ئەو مێزەی لە بەردەمیدا بوو، ئینجا سەری دانەواند و خستیە نابەینی دەست و قۆڵیەوە دەستیشی درێژکرد و بردی بۆ سەر شانی چەپی نزیك بە ملی. وتی ئەمە وەکوو ئەوەی کردارێکی رۆژانەیی نیە، زنجیرەیەك بیرووێنەی بانگەوازکراوی کەسێتی بەرهەمدەهێنێ، ئەگەر بە شێوازێکی زیاتر مەرجئامێزی ئەنجامبدرێ، ئەو کات بیرو وێنە بانگەوازکراوەکان خودی کردارەکە تێدەپەڕێنن. کرۆتۆفسکی ڕوونکردنەوەی دەدا کە بیرو وێنە بانگەوازکراوەکان دەکرێ پابەندی کۆمەڵێ شتبن کە لە ڕابووردوودا ڕویاندابێ لێمان، یان لەوانە بوو ڕویانبدابا، یان شتێکی ڕیشەداکوتر لە نێو ژیانی کەسێتیماندا بێ بۆ نمونە پێویستیەکی هەرگیز تێر نەکراو.

یەکێك لەو نمونانەی کە دەریدەخەن چۆن ستانیسلافسکی چەمکی بیرو وێنە بانگەوازکراوەکانی بەکارهێناوە، لەلایەن میکایل چیخۆفەوە ئاماژەی پێدراوە لە کتێبەکەی بە ناوی (هونەری نواندن). ئەوەی میکایل پێیدەڵێ (جووڵەی سایکۆلۆژی) و کە لەسەر بنچینەی پەیوەندی نێوان کردارەکان و وێنەکان و هەستەکان و میزاجەکان دامەزراوە لە ستانیسلافسکیەوە وەریگرتووەو لە ئەوەوە سەرچاوە دەگرێ، ئەویش کاتێك لەسەر موفەتیشی گشتی پرۆڤەیان دەکرد. میکایل دەڵێ:

(کاتێك ستانیسلافسکی سەبارەت بە کەسایەتی خلیستاکۆف ئامۆژگاریەکانی دەدامێ، لە ناکاو چەند جووڵەیەکی خێرای وەك بروسك کرد، وەك ئەوەی دەست و شان و قۆڵی بۆ سەرەوە بەرزبکاتەوەو پەنجەکانی و تەنانەت دەست و شانیشی لەگەڵ بلەرزێنێ. فەرموو ئەوەیە سایکۆلۆژی خلیستاکۆف. بە پێکەنینەوە ئەوەی پێوتم. لە ڕاستیدا جووڵەکانی هەزەلیبوون، بەلاّم ئیتر لەو کاتەوە کەوتمە ژێر کاریگەری سیخری ئەو کردارەی ستانیسلافسکیەوە. دەسبەجێ دەستم کرد بە نواندنی تەواوی ئەو ڕۆڵە، لە سەرەتاوە تا کۆتایی بەبێ هیچ گیروگرفتێك. لەو ساتەوە ئیتر دەمزانی خلیستاکۆڤ چۆن دەجووڵێتەوە، چۆن دەدوێ، هەست بە چی دەکات، بیر لە چی دەکاتەوە و ئارەزووی چیدەکات، بەو شێوەیە تا دوایی)

لەلایەکی ترەوە ستانیسلافسکی بیرو وێنە بانگەوازکراوە کەسێتیەکانی ئەکتەری لە ڕێگای وشەی (ئەگەر) سیحریەوە دەفریواندن. ئەم خاڵەش زۆر بە ئاشکرا لە وەرگێڕانەکەی *Jean*

*benedtti* بـۆ یەکـەم کتـێبی ستانیسلافـسکی دەردەکـەوێ کـە تۆرسـتۆڤ بـە قوتابیـەکانی ڕادەگەیەنێ:

نهـێنی (ئەگـەر)، وەك هێزێکـی وروژێنـەر، لەوەدایـە کـە روداوە راستەقینەکان نـاوروژێنێ، بەڵکو ئەوانـەی ئەگەری رودانیان هەیە. وشەی ئەگــەر چــالاکیەکانی نــاوەوەو دەرەوەی هونەرمەنـد بێـدار دەکاتـەوە، بـەلاّم دەبـێ بـێ زۆرلێکـردن و بـە شـێوەیەکی سروشـتی بـێ. وشـەی ئەگـەر هانـدەر و وروژێنـەرێکی چالاکیە خوڵقێنـەرە ناوەکیەکانـە) لەگـەڵ ئـەوەش بـەلای کرۆتۆفـسکیەوە ئـەوەی فریـودەری ئەکتـەرە پرۆسەی ناوەکیە:

بـــەلای ستانیسلافـــسکیەوە بـــیرو وێنـــە بانگـــەوازکراوەکان لـــەو هەلومەرجـــە دیاریکراوەکانەوە سەرهەڵدەدەن کە پابەندن بە ڕەوشێکی کۆمەلاّیەتی واقیعیەوە، بە مەرجێ کە ئـــەو حاڵەتـــەی پێـــشنیاز دەکـــرێ دەبـێ وروژێنـەرێکی چـاك بـێ بـۆ ئەکتـەر، هـــەر ئـــەوەش کاریگـــەری ئـــەو وشـــە سیحریە دەردەخات.

بـەلای کرۆتۆفـسکیەوە، ئـەوە پرۆسـەی ناوەکیانەیـە کـە ئەکتـەر هانـدەدات: هـوروژمی وێنەکان و هەست و شعورەکان و یادەوەریـەکان پابەنـدن بـە ڕێـچکەی بـەردەوامی ئـەو هەڵـچوونانەی تـەواوی جەسـتە دەخاتـە نێـو کردارێکـی دیـاریکراو و بـە دیقـەت و ئۆرگانیکیـەوە. دەسـتەواژەی (جووڵـەی سـایکۆلۆژی) کـە لەلایـەن خـودی میکایـل چـیخۆفەوە داهێنـراوە خـۆی لـە خۆیـدا خیانەتکردنـە لـەو کـارەی ئەکتـەری ستانیسلافسکی پێی هەڵدەستێ، کـە ئـەویش تەرکیزکردنیـەتی لەسـەر بـە (جەسـتەکردنی) دەرەکیانـەی هەڵـچونە بـچوکەکانە. کاتێـك ئـەو هەڵـچوونە بـچوکانە، وەك کرۆتۆفـسکی دەڵـێ (بەرستی پێست) دەبەزێنن، و دەبن بە بینـراو، ئـەو کـات لـە ژێـر سـیمای فـۆرمی جوولـەی گوزارشـتکراوە رۆژانەییـەکان، لـە ڕێگـای ئەندامـەکانی جەسـتەوە ئـەو کـارە بەئـەنجام دەگـات. (میکایـل چـیخۆف ئـەو جوڵەیـەی ستانیسلافسکی دێنێتـەوە یـاد کـە لـە ڕێگـای باسـکەکانی و دەسـتەکانی و پەنجـەکانی و ئانیـشکی و شـانی و قۆڵیـەوە کردوویـەتی). کرۆتۆفـسکی پـشتگیری ئـەوە دەکـات و دەڵـێ (کاتێـك لـە هەڵـچوونەکان دادەبـڕێین، واتـە لەوانەی لە قولاّیی بوونی ئێمەدان و بە بڕبڕەی پـشتدا تێدەپـەڕن، ئـەو کاتـە ئـەوەی سـەیتەرە دەکات جووڵەکانە. ئەندامەکانی جەستەیە (سەر و دەسـت و قـۆڵ و قـاچ). کرۆتۆفسکی داوا لـە ئەکتەر دەکات کە ئەو جوولاّنە بگۆڕێ بە کردارە فیزیکیـەکان و جێیانبگرێتـەوە کـە، لـە توانایاندایە تێکڕای جەستە مۆبیلیزە بکەن، بەو ئامانجـەی پەیوەندیـەك دروسـتبکەن لەگـەڵ ژیـانێکی ناوەکیانـەی دەوڵەمەندتر و جەوهـەری تـر لـەو پەیوەندیـەی پابەنـدە بـە جووڵـەکانی ژیانی رۆژانەوە.

بـەپێی هەریـەك لـە ستانیسلافـسکی و کرۆتۆفـسکی بـیرو وێنـە بانگـەوازکراوەکان لـە ڕێگای هوروژم هێنانی هەڵچوونەکانەوە لـەدایك دەبـن. هەرچـەندە لـەلای ستانیسلافـسکی ئەو هەڵچوونانە بە کردارە بچوکە رۆژانەیـەکان دەبـێ سـنوربەند بکـرێن، لـە کاتێکـدا لـەلای کرۆتۆفسکی ئـەو هەڵچوونانە بـە قووڵی لە نێو جەستەی ئەکتـەردا ڕیشەیان داکوتیوە. هـەر بـە هـەمان شـێوەی گرنگیـدانیان بـە هەڵـچوونەکان هـەردووکیان ئامـاژە دەدەن بـە گرنگـی کـارکردن لەسـەر بـیرو وێنـە بانگەوازکراوەکان.

## پارادۆکسی میتۆدی کرداره فیزیکیه‌کان

*Les Paradoxe De La Methode Des Action Physique*

خاڵێکی جه‌وهه‌ری هاوبه‌شی دیکه‌، که‌ ده‌توانرێ له‌ کاره‌کانی ئه‌و دوو بلیمه‌ته‌ به‌دیبکرێ، ئه‌ویش ئه‌و په‌یوه‌ندیه‌ هاوبه‌شه‌یه‌ که‌ له‌ نێوان جه‌سته‌یی و رۆحیدایه‌، له‌ کاتی خوڵقاندنی رۆڵێکدا. تۆرستۆف (هێڵی که‌سی فیزیك) ناوزه‌نده‌کات به‌ (هێڵێکی نه‌پچڕاوی کرداره‌ فیزیکیه‌کان). دواتر ڕوونیده‌کاته‌وه‌ که‌ چۆن (که‌سی ڕۆحی) پابه‌نده‌ به‌ (که‌سی فیزیکه‌وه‌)

(پێده‌چێ که‌ که‌سی رۆحی – ده‌روونی – پێشتر له‌ نێو منـدا ده‌ستی به‌ دروستبوون کردبێ، له‌ خۆیه‌وه‌، به‌ شێوه‌یه‌کی سه‌ربه‌ستانه‌و دوور له‌ ئیراده‌ی من و بێئه‌وه‌ی منیش ئاگام لێبووبێ. به‌ڵگه‌ش ئه‌وه‌یه‌ که‌ ئه‌وه‌تا که‌مێك له‌مه‌وبه‌ر که‌ کرداره‌ فیزیکیه‌کانم ئه‌نجامدا به‌شێوه‌یه‌کی وشك و ڕوکه‌ش و بێگیان نه‌بوو به‌ڵکو به‌شێوه‌یه‌کی زیندوو له‌گه‌ڵ پاساوهێنانه‌وه‌ی ناوه‌کیانه‌ بوو)

له‌ کاتی کۆنفرانسه‌کاندا کرۆتۆفسکی جه‌ختی له‌سه‌ر ئه‌وه‌ ده‌کرد که‌ وه‌سفکردن و ناولێنانی کاره‌کانی شانۆ تاقیگه‌ به‌ (شانۆیه‌کی فیزیکی) کارێکی بێمانایه‌. ئه‌و رایده‌گه‌یاند که‌ ئه‌وه‌ (ئه‌فسانه‌یه‌کی به‌رده‌وامه‌) له‌وه‌ته‌ی ئه‌و شانۆیه‌ دروستبووه‌ به‌دواوه‌یه‌تی و له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌ی جه‌سته‌ی ئه‌کته‌ر بۆ خۆی هه‌رگیز سه‌نته‌ری لێکۆڵینه‌وه‌کان نه‌بووه‌. ئه‌و ڕوونی ده‌کرده‌وه‌ که‌ ئه‌و مه‌شق و ڕاهێنانه‌ جه‌سته‌یانه‌ی له‌لایه‌ن ئه‌کته‌ره‌کانی ئه‌و تیپه‌وه‌ گه‌شه‌یان پێده‌درا، ته‌رخانکرابوون بۆ (نه‌هێشتنی به‌رگرییه‌ جه‌سته‌یه‌کان). بۆئه‌وه‌ی هێرشی هه‌ڵچوونه‌کان بتوانن سه‌ربه‌ستانه‌ به‌ جه‌سته‌دا گوزه‌ر بکه‌ن و بێئه‌وه‌ی جه‌سته‌ ڕێگریان له‌ پێش دابنێ. هه‌روه‌ها ده‌یوت، به‌ زمانی پۆلۆنی به‌و کاره‌مان ده‌ووت (پرۆسه‌ی ڕۆحئامێزی بینراو). پێده‌چێ ستانیسلافیکیش ئاماژه‌ بۆ بوونی پرۆسه‌یه‌کی هاوشێوه‌ بکات، له‌ میانه‌ی وته‌کانی تۆرستۆفه‌وه‌ که‌ ده‌ڵێ (ئه‌و په‌یوه‌ندیه‌ پته‌وه‌ی له‌ نێوان جه‌سته‌و ده‌رووندا دروست ده‌بێ جه‌سته‌و ده‌روون ده‌کات به‌ نه‌بینراو. ژیانی هه‌ریه‌که‌یان ژیانی ئه‌ویتر ده‌خوڵقێنێ و به‌ پێچه‌وانه‌شه‌وه‌. له‌ نێو هه‌ر کردارێکی فیزیکیدا، ته‌نها له‌و حاڵه‌ته‌دا نه‌بێ که‌ ئه‌و کرداره‌ ته‌واو میکانیکی بێ، کردارێکی ناوه‌کیانه‌، هه‌ستێك خۆی حه‌شارداوه‌. کاتێك گه‌مه‌ ده‌که‌م، ئه‌و کات له‌ حاڵه‌تی گوێگرتن ده‌بم له‌ خودی خۆم و، هاوته‌ریب له‌گه‌ڵ هێڵی کرداره‌ فیزیکییه‌ نه‌پچڕاوه‌کان هه‌ست ده‌که‌م هێڵێکی تر ڕێده‌کات، ئه‌و هێڵه‌ی په‌یوه‌نده‌ به‌ ژیانی رحی رۆڵه‌که‌م. که‌ له‌ ڕێگای کرده‌ جه‌سته‌ییه‌کانه‌وه‌ هاتۆته‌ به‌رو، په‌یوه‌سته‌ پێوه‌ی. چه‌ند زیاتر ژیانی فیزیکی رۆڵه‌که‌م دووباره‌ بکه‌مه‌وه‌، هێنده‌ش هێڵی ڕۆحی ڕوونیی و ئاشکرایی و دڵنیایی به‌خۆوه‌ ده‌بینێ).

کاتێك تۆرستۆف باس له‌ ئه‌رکی دوانه‌یی ئه‌کته‌ر ده‌کات که‌ له‌ یه‌کاتدا، خۆی له‌ گه‌مه‌کردن و له‌ گوێگرتن له‌ خودی خۆی ده‌بینێته‌وه‌، بۆ ئه‌و مه‌به‌سته‌یه‌ ئه‌کته‌ر به‌ ئاگایی بمێنێته‌وه‌ به‌رامبه‌ر ئه‌و په‌یوه‌ندیه‌ هاوبه‌شه‌ی له‌ نێوان ئه‌و دوو هێڵه‌دا هه‌یه‌. پرۆسه‌یه‌کی هاوشێوه‌ش له‌لای کرۆتۆفسکی ده‌بینینه‌وه‌، که‌ له‌ ڕێگای ئه‌و تێکسته‌وه‌ باسی لێده‌کات که‌ به‌ ناونیشانی (من – من) وه‌یه‌.

کەواتە سیمای کاری دوانەیی ئەکتەر چ لەلای ستانیسلافسکی لەسەر هێڵی رۆحی دەبێتە ئیلهام بەخشی چەمکی (ریالیزمی رۆحئامێز) لەلای ئەو، ئەو چەمکەی دواتر بەرەو پێکهێنانی میتۆدی کردارە فیزیکیەکانی دەبات. لە نێو ئەو میتۆدەدا هێڵی رۆحی دەبوو بە ئامانج لە کاتێکدا هێڵی فیزیکی دەبوو بە هۆکار. کەواتە تەوەرەی سەرەکی و هاوبەش لە رێرەوی کارەکانی ئەو دوو مرۆڤە بریتیە لە پەیوەندی و تەوافق لە نابەینی هێڵی رۆحی و هێڵی فیزیکیدا، لە نێو جەرگەی پرۆسەی ئۆرگانیکی لەلای ئەکتەر. لەگەڵ ئەوەی میتۆدی کردارە فیزیکیەکان جەخت لەسەر هێڵی فیزیکی دەکات بەڵام ئەم پرۆسەیە تەنها وەك ئامرازێك وایە کە رێگا بە ئەکتەر دەدات لە پەیوەندیکردنێکی بەردەوامدا لەگەڵ هێڵی رۆحیدا بمێنێتەوە. کەواتە لەبەر ئەو هۆیەیە کە کرۆتۆفسکی گرنگی دەدا بەو هۆکارانەی کە دەتوانن پرۆسەی رۆحئامێزی بکەن بە بینراو لە کاری ئەکتەردا، ئەم کارەش کە پێشتر لەلایەن میتۆدی کردارە فیزیکیەکانەوە تەبەناکرابوو، هەروەها جۆرێك لەو راهێنانە فیزیکیانە داهێنێ کە لەسەر بنەمای تەوژمەکان و هەڵچوونەکان و بیرو وێنە بانگەوازکراوەکان پێکدێن.

### مەترسی (رۆژی حەشر)

***Sle Risque D Apocalypsi***

پرۆژەی کارکردنی کرۆتۆفسکی لەگەڵ ئەکتەرەکانی شانۆی تاقیگە، لە ژێر سێبەری تەحەدایەکی بەردەوامدا بوون کە، خۆی دەبینیەوە لە گۆرینی ئیزدواجیەتی نێوان ئۆرگانگەرایی و پیشەگەرایی و، خۆرسکی و سترکتورو، تەوژم و هەڵچوونەکان و کۆپۆزیسیون بۆ هونەرێکی یەکگرتوو.

لەو کاتەوەی ئیتر کە (شارەزایی) هونەری لە نمایشی میری کۆڵنەدەردا توانی بگاتە ترۆپك، ئەندامانی شانۆی تاقیگە لەگەڵ کێشەی (تەکنیکی پێرفۆرماسی) خۆیان و، ئیغرابوونیان تەنها بە دووبارە کردنەوەی دیاردەکانی ئۆرگانگەرایی، کەوتنە رووبەرووبونەوە. بەمجۆرە لەبەردەم مەحاڵی دۆزینەوەی ئەگەرە نوێکاندا بوون. کرۆتۆفسکی جەختی لەسەر ئەوە دەکرد کە چەندە لە هەوڵ و کۆششدا بین بۆ سەرکەوتن بەسەر بەربەستە تەکنیکیەکاندا، کارەکان بەردەوام بەهۆی لێکۆڵینەوە لە چارەسەرە پراکتیکیەکان پاڵپشت دەکرێن و بەرەبەرە گەشە دەکەن و دەوڵەمەند دەبن تا ئەو رادەیەی ئەگەرە نوێکان سەرهەڵدەدەن. کەواتە دەرئەنجام دەبێ (بەردەوام بین لە گەران و توێژینەوەکان، چونکە ئەگەر لەو باوەرەدا بوون کە وەڵامەکانمان دۆزیوەتەوە، ئەو کاتە ئیتر پرۆسەکە دەوەستێ و دەگۆردرێ و دەبێت بە مەزهەب — *doctrine*) پاش دەستەبەرکردن و جڵەوکردنی تەکنیکی هونەرەکەیان، ئەندامانی ئەو گروپە کەلەلایەن کرۆتۆفسکیەوە سەرپەرشتی دەکران، ئیتر لەو کاتەوە رووبەرووی ئەوە بوونەوە کە چۆن بتوانن هونەرەکەیان بە زیندوویی بهێڵنەوە. ئەمە چیرۆکی لەدایکبوونی پرۆژەی (رۆژی حەشر *apocalypsis*)، دوا بەرهەمی شانۆی تاقیگەیە کە، لە دەرئەنجامی پێویستیەکی بنەرەتیەوە بەرامبەر پرسیارکردن لە خودی پرۆسەی کارەکانیانەوە سەرهەڵدەدات. ئەو نمایشە بیرۆکەی دوا مجازەفەیەکی رادەگەیاند، کە دەکرێ بتوانین خۆمانی لێبدەین کاتێك پێش هەموو شتێك

ئارەزووی ئەوەمان هەبێ سەبارەت بە مانا سروشتیەکەی ئازادی، لە نێو فۆرمە هەرە ئەنتیمەکەیدا بەوەفاداری بمێنینەوە.

ئەو پرۆسەیەی کە دەبێتە مایەی لەدایك بوونی رۆژی حەشر و، هەروەها ناوەرۆکی ئەم ئەفراندنە، ئەو دەرگا لەسەر دوو بابەت دەکاتەوە کە هەردووکیان پابەندی پێویستی رەفزکردنی هەموو ئەو شتانەی دەتوانن ببنە رێگر لەبەردەم ئینسانێك کە بیەوێ بە شێوەیەکی راستەقینە زیندوو بێت. ئەم کارە رەفزکردنی ئاینێکی ئۆرگانیزەکراویشی دەگرتەوە. ئاینێك بە بڕوای کرۆتۆفسکی دڵنیایی و حەوانەوەی رۆحی بۆ تاکەکان دابین دەکات لە بەرامبەر ملکەچکردنێکی بێمەرجدار. لە رۆمانی برایانی کارامازۆفدا، ئەو بەشەی بە (موحەقیقی گەورە) ناسراوە دەبێتە یەکێك لەو بنەمایانەی ئەو نمایشەی لەسەر دادەمەزرێ. ئەو دەقە دوو شتی هاودژ بەیەك دەخاتە ڕوو. ئەوەی مەسیح بۆ مرۆڤ پێشنیاری دەکات (لە ژێر سێبەری راڤەکردنێکی کرۆتۆفسکی بۆ ئینجیل لە تاق لاوێتیدا کە مەسیح پاڵەوانێکی مرۆیی بوو لە بەرگی مرۆڤێکی ئازادا دەحوولاّیەوەو ئەو تەحەدایەی دەخستە پێش مرۆڤ کە وەکو ئەو مامەڵە بکەن) و ئەوەی کەنیسە دەیەوێ بەسەر ئیماندارەکاندا فەرزی بکات. واتە دەستبەرداربوونیان لەو ئازادیە بنەڕەتیەی کە لەوەتەی ئەم دونیایە خوڵقاوە مرۆڤی پێ مەحکوم کراوە، لە دیدی کرۆتۆفسکیەوە، هۆکاری شاراوەی بەڕێوەبەرانی کەنیسە، کە ئەو مافە بەخۆیان دەدەن لە لێپرسراوێتی بەڕێوەبردنی تەواوی مرۆڤایەتی بەرەو رێگای رزگاری، سڕینەوەی مەسیحەو لەبری ئەو بیروباوەڕی خۆیان، وەك دەسەلاّتێکی ڕەها، پیادە بکەن. ئەمانە وتەکانی موحەقیقی گەورەیە لە بەرامبەر مەسیح کاتێك کە دەگەڕێتەوە بۆ سەر زەوی:

(دووبارەی دەکەمەوە، بەلای مرۆڤەوە، هیچ خەم و پەژارەیەك تاڵتر و بەسوێ تر نیە لەوەی کە ببینێ کەسێك نوێنەرایەتی ئەو بەخششەی ئازادی بکات کە هەر لە ساتەوەختی لەدایکبوونیەوە لەگەڵ خۆی هەڵیدەگرێ. بۆئەوەی دەستبگیرێ بەسەر ئازادی مرۆڤدا دەبێ ئارامی دەروونی بۆ دەستەبەر بکرێ. بەلاّم تۆ لەجیاتی ئەوەی دەستبگری بەسەر ئازادی مرۆییدا چوویت ئەو ئازادیەت بەربلاّوتر کرد. ئەی تۆ ئەوەت لە یاد نەبوو کە مرۆڤ ئارامی هەڵدەبژێرێ، تەنانەت مردنیش هەڵدەبژێرێ لەجیاتی ئازادی جیاکردنەوەی چاکە و خراپە؟ خۆ تۆ لە خاچەکەت نەهاتیتە خوارێ کاتێك گاڵتەیان پێدەکردی و هۆیهایان لێدەکردی و دەیانووت، لەو خاچە وەرە خوارەوە بڕوات پێدەکەین. تۆ ئەو کارەت نەکرد. لەبەرئەوەی تۆ دیسان نەتویست مرۆڤ بکەی بە کۆیلەی موعجیزەیەك و، تۆ حەزت بە بڕوایەکی ئازاد دەکرد، نەك لە ئەفسون و سەرسوڕماندنەوە سەرچاوەی گرتبێ.

ئێمە هاتین پەیامەکانی تۆمان ڕاستکردەوە. لەسەر بنچینەی نهێنی و موعجیزە و دەسەلاّت دامانڕشتنەوە. بێگومان ئەوان ناچاری ئیشکردن دەکەین، بەلاّم لە کاتی پشوو کات بەسەربردندا، وەك گەمەی منالاّن بە گۆرانی و تەراتیل و کۆرس و جووڵە و سەما بێمەبەستەکان (نوێژ و دوعا) ژیانیان ڕێکدەخەینەوە.

لە کاتی مردندا، لەسەرخۆ ناوی تۆ دەهێنن و رادەکشێن، بە هێمنیەوە دەمرن، لەودیو ئەوەشەوە لە مردن زیاتر هیچی تر

نابیننەوە. بەڵام ئێمە ئەو نهێنیە لەلای خۆمان دەپارێزین. بە پاداشتێکی تاهەتای ئاسمانی رایاندەژەنین، لەپێناو بەختیاری ئەوان).

لە درێـژەی کۆنفرانسەکانی، سەبارەت بەو مەترسیە گەورەیەی کە ئەگەری گرتنەبەری هەیە کاتێك ئەو ئازادیەمان قبوڵبێ کە دیستیوفسکی ئامـاژەی بۆ دەکات، هەڵوێستی کرۆتۆفسکی زۆر ڕوون و ئاشکرابوو. لەگەڵ ئەوەش بەلای کرۆتۆفسکیەوە گرتنەبەری ئەو مەترسیە بەشێوەیەکی جەوهەری و لەناوەڕۆکدا پەیوەستە بە کاری هونەرمەندەوە. ئەکتەری پیرۆز (دەستەواژەیەکە لە کتێبی بەرەو شانۆی هەژار بەرچاو دەکەوێ) ئەو ئەکتەرەیە کە بە شێوەیەکی دژاودژ ڕەفزی ئەنجامدانی موعجیزەکان دەکات لەپێناو کۆیلەکردنی بینەردا، یاخود وەها بڕوانێ کە کارەکەی پێکنایەت لە هیچی تر بێجگە لە گەمەیەکی منداڵان (لەگەڵ گۆرانی و تراتیل و کۆرس و جووڵە و سەما بێمەبەستەکان).

بەلای کرۆتۆفسکیەوە، کردەی ئەفراندن کە رێگا لەبەردەم بەکام گەیاندنێکی کردەیەکی راستەقینەی هونەری دەکاتەوە، بە شێوەیەکی حەتمی پەیوەستە بەوەی کە دەکرێ بە کردەیەکی رۆحئامێز ناوزەندی بکەین. ئەو تێبینی دەکرد کە لە رۆژگاری ئێمەدا وشەی رۆح دەخرێتە پاڵ بیرو عەقڵەوە، یان هەندێ جار وەك واتایەکی خوازراو لە چوارچێوەی بـواری هونەری چارەسەرە جیاجیاکان بەکاردەهێنرێ. وەك ئەوەی بوارە جیاجیاکانی بزوتنەوەی (سەردەمی نوێ) لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەستنیشانی دەکەن. کرۆتۆفسکی تەئکیدی دەکرد کە (لەگەڵ دەرکەوتنی زاراوەی رۆح واتا پیرۆزەکەی خۆی لەدەستدەدا). دواتر نمونەی پاکژبوونەوە — (*cathartis*)ی هێنایەوە، کە وشەیەکە لە گریکی کۆنەوە بۆمان بەجێماوە و دەتوانرێ وەك (کردەی جنێودان یان تەکفیر کردن بە واقعێکی ئەفسانە ئامێز لە ناخماندا) تەماشا بکرێ کە، دەرئەنجامەکەی پاکژبوونەوەیە. ئەو ڕونیدەکردەوە کە چۆن ئەکتەرەکانی شانۆی تاقیگە و بینەرە پۆلۆنیەکان توانیویانە ئەزمونێکی هاوبەش (لە ناخ هەژاندن) بە ئەنجام بگەیەنن لە کاتی نمایشی میری کۆڵنەدەردا. (وەك ئەوەی هەورە گرمە بەسەریاندا بدا). لەبەرئەوەی ئەو کردارە جنێو ئامێزە — تەکفیریە — دوورکەوتنەوەیەکی دراماتێکی (مەبەست زەمەنە، و) دەخوڵقاند و لە هەمانکاتیشدا بوونی میراتگیریەکی رۆحی و کلتوری هاوبەشی دەسەلماند. ئەو ئامـاژەی دەدا کە لەو کاتەدا مەسەلەکە پەیوەستبووە بە (شۆکێك و بە پەیوەندیەکی قووڵ لەلایەن بینەرەوە، وەك ئەوەی ئەویش داوا بکات ڕێی پێبدرێ ئەو تێڕوانینە جنێو ئامێزەو ئەو تێڕوانینە نوێیەی هەبێ). هەروەها دەیوت، فۆرمی ئەو تەحەدا کردنە (پەیوەستە بە بنەچەکان و بە چارەنووسی نەتەوەیی و بە شتە مێژینەو کۆنەکان *archaique* بە شتگەلێکەوە کە هی ئێمەن تەنانەت ئەگەر باوەڕیشمان پێیان نەبێ). لەلایەکی ترەوە کرۆتۆفسکی پێشتر لە (بەرەو شانۆیەکی هەژار) دەڵێ، بۆئەوەی نمایشێك بتوانێ کاریگەرییەکی لەو جۆرە بەسەر ئەکتەرو بینەر بەرپا بکات (دەبێ وەك شەڕ و ململانێیەك دژی بەها کۆنەکان و بەها هاوچەرخەکان تەماشا بکرێ، لەو کاتەدا سنور بەزاندنەکان سەرهەڵدەدەن). لە پوختەیەکەدا دەڵێ (ناتوانرێ ڕاسگۆییەکی نوێکراوە ببینرێتەوە تەنها لە نێو دوانەیی گەمەی ئەو بەهایانەدا

نەبێ، لە نێو پەیوەندی بەستن و ڕەفز کردن، یاخیبوون و ملکەچکردن)

ئەم دید و بۆچوونانە نزیکدەبنەوە لە حەدەسەکانی ئارتۆوە، کە لە نێو فۆرمە کۆنەکانی شانۆی ڕۆژهەڵاتدا (ئەسەرەکانی ئەو ترسە میتافیزیکیە مەزنەی کە بنچینەی هەموو شانۆیەکی کۆنە) دەبینیەوە، (ئەو شانۆیەی کۆدەکان بەشێوەیەك پێچەوانەی مانا واقیعێکان، بەڵام پڕ فەڕ پڕ بەها ڕاڤە دەکرد). ئارتۆ بە پێویستی دەزانی کە شانۆی ڕۆژئاوایی دەبێ پەیوەندی ببەستێ لەگەڵ بیرۆکەی ئەو خەتەرناکیە، لەبەرئەوەی، بەڕای ئەو، تەنها خەتەرناکیە دەتوانێ مانایەك بە شانۆ بدات. گرتنە بەری مەترسیەکان لە شانۆی ئەمڕۆدا، هەستەکانمان و ئینتماکردن بە کۆمەڵگاوە دەخاتە ژێر پرسیار و پیاچوونەوەیەکی وجودیانەوە. ئەو کۆمەڵگایەی وەك زۆربەی کۆمەڵگا مرۆیەکان ژیان تێیدا بە زەرورەت لەسەر بنچینەی کۆمەڵێ سازشکردن دامەزراوەو ئێمەش بە ویست و ئارەزووی خۆمان قبوڵیان دەکەین بۆ ئەوەی بتوانین یەك لە تەك ئەوەی تردا بژین.

لە میانەی ئەو کۆنفرانسەی لە ساڵی 1987 لە ژێر ناونیشانی (تۆ کوڕی یەکێکی) پێشکەشیکرد، کرۆتۆفسکی بەو جۆرە وەسفی کاری هونەرمەندی دەکرد، وەك ململانێیەك بێ دژی هەموو جۆرێك لە فۆرمە بنبەستکراوەکان، ئەوانەی بە هۆی ڕەوشە دەرەکیەکانەوە سەپێنراون یان ئەوانەی لەلایەن خودی ئەکتەرەوە دەسەپێنرێن.

(من لە پێناوی داڕشتنی وتارەکان کارناکەم، بەڵکو بە مەبەستی فراوانکردنی ئەو دوورگەی ئازادیەیە کە لە ناخمدایە. دەبێ پرسی ئازادیو زۆرداری بەهۆی ڕێگاچارە پراکتیکیەکانەوە چارەسەر بکەم. بەو مانایەی دەبێ چالاکیەکانم ئەسەری بەجێبهێڵن، نمونەگەلێ بن بۆ ئازادی. ئایا ئەم ژیانەی کە دەیژێنین پێداویستیەکان دابین دەکات؟ نەخێر. کەواتە بۆیە شتێك دەکەین، شتێك پێشنیاز دەکەین، شتێك بە ئاکام دەگەیەنین کە وەکو وەڵامێکن بۆ ئەو کەماسیە. مەسەلەکە پەیوەست نیە بە کەماسیەك لە وێنەی شێوازی کۆمەڵگادا، بەڵکو بە کەماسی لە شێوازی ئەو ژیانەی دەیژێنین. هونەر بە قووڵی یاخیە، هونەرمەندە خراپەکان قسە لەسەر یاخیبوون دەکەن، بەڵام هونەرمەندە ڕاستەقینەکان یاخیبوون بەرپا دەکەن. لە ڕێگای کردارەوە وەڵامی ڕێسا سەپێنراو و باوەکان دەدەنەوە، لێرەدا ئەو خاڵە گرنگ و خەتەرناکە دەبینرێ. هونەر وەك یاخیبوون بەئاکام گەیاندنی کردارێك دەخوڵقێنێ، کە ئەو سنورانەی لەلایەن کۆمەڵگاوە سەپێنراون دەشکێنێ، یان لە نێو سیستەمێکی زۆرداردا ئەو بەربەستانەی لەلایەن دەسەڵاتەوە سەپێنراون. بەڵام ناتوانی ئەو سنورانە بشکێنی ئەگەر جێگای باوەڕ پێکردن نەبێت. لە چوارچێوەی یاخیبونتدا ئەگەر شارەزایی لەو هەڵوێستەدا دەستەبەر نەکەیت ئەوا هەموو شتەکان لەو شەڕەدا دەدۆڕێنی با زۆر ڕاستگۆش بیت.

هەرچەندە (مەیلی یاخیبوون) لە ڕێڕەوی هونەری ستانیسلافسکیدا روون و ئاشکرا نیە بەڵام ئەو تەواو لەو باوەڕەدا بوو کە ئەکتەر دەبێ سنورە کەسێتیەکانی بشکێنێ لەپێناو فراوانکردنی ئەو دوورگەی ئازادیەی لە ناخیدایە. بەو شێوەیە توانی بوێرانە چەمکی ئەکتەری خوڵقێنەر دابهێنێ و چەمکی باوی

ئەکتەری ڕاڤەکار ڕەتبکاتەوە. لە ڕاستیدا چەند سالێك پێش مردنی کاتێك میوانداری ژنە ئەکتەری ئەمریکی نۆریس هارتۆن دەکات ستانیسلافسکی پێی دەڵێ:

(بۆ دامەزراندنی شانۆیەك دەبێ شۆڕشگێڕبی، بەلاَم نەك بە واتا سیاسییەکەی، بەڵکو دەبێ جۆشدراوی ناڕازیبوونێك بیت بەرامبەر بە حاڵەتی هەنووکەیی شتەکان).

ئەو (یاخیبوون و ناڕەزاییەی) ستانیسلافسکی و کرۆتۆفسکی ئاماژەی بۆ دەکەن، کەواتە دەبنە سەرچاوەیەك بۆ داهێنانە تایبەتمەندیەکانیان، لە پرۆسەی کاری ئەکتەردا، لەبەرئەوەی لە (کەماسیەکی – نقص– شێوازی ئەو ژیانەی دەژین) سەرچاوە دەگرن، هەروەها لە ئارەزوویەکی قووڵی جێبەجێکردنی کردارێك کە ببێتە (وەلاَم بۆ ئەو کەماسیە).

## گەڕانەوە بۆ سەرچاوە
*Le Rtour a lordigine*

ئەو مێتۆدە شۆڕشگێڕەی کردارە فیزیکیەکان کە لەلایەن ستانیسلافسکیەوە دادەڕێژرا هەروا بە ئاسانی و بێ بەربەرەکانی لەلایەن ئەکتەرانی شانۆی هونەری مۆسکۆوە پێشوازی لێنەدەکرا. لە ڕاستیدا ئەو هەمیشە کاریگەری و کارایی (سیستەم)ی دەخستە ژێر پرسیار و گومانەوە، هەر بۆیە بە مەبەستەوە ئاوڕی بۆ هەنگاوە سەرەتایەکانی دەدایەوە، بۆ ئەوەی بگەڕێتەوە بۆ سەرچاوەی پرۆسەی ئەکتەر، واتە گەڕانەوە بۆ تەوژمی هەڵچوونەکان کە کردارە فیزیکیەکان دەخولقێنن.

(ئەو شتەی دوێنێ چاك و لەبار بوو ناتوانێ خزمەت بە ئەمڕۆ بگەیەنێ. پێرفۆرمانسی ئەمڕۆ جیاواز دەبێ لەوەی سبەینێ. هونەرێکی لەم جۆرە پێویستی بە تەکنیکێکی تایبەتمەندە، نەك تەکنیکی میتۆدێکی چەسپاو، بەڵکو تەکنیکێك ئامانجی جڵەوکردنی ئەو یاسایانە بێ کە سروشتی خولقاندن لەلای مرۆڤ لەخۆ دەگرن. لە کۆتاییەکانی ڕۆژگاری تەمەنمدا دەمەوێ بنەما بنچینەییەکانی ئەو تەکنیکەتان بۆ جێبێڵم. مەحاڵە بتوانم لە ڕێگای وشەوە گوزارشتیان لێبکەم، دەبێ لە میانەی کاری پراکتیکیەوە بشوبهێنرێن و بخرێنە ڕوو. ئەگەر لەم کارەماندا بگەین بە ئەنجامێکی باش ئەوا ئێوە دەتوانن دواتر زیاتر گەشەی پێبدەن و بەربلاَوی بکەن).

لە کتێبەکەیدا، (ستانیسلافسکی لە کاتی پرۆڤەکردندا)، تۆپۆرکۆڤ *toporkov* ویستویەتی بەڵگەیەکی نوسراو سەبارەت بە گەشەکردنی دوا قۆناغەکانی (سیستەم) پێشانبدات. ئەو وەك ئەندامێکی کارا بەشداری دوا کاری ستۆدیوی ستانیسلافسکی کردووەو وەك شایەتێکی ئەکتیڤ لەسەر دید و بۆچوونە نوێکانی بەڕێوەبەری شانۆی هونەری مۆسکۆ لە کاتی کارکردنیان لەسەر شانۆنامەی تەرتوف دەدوێ. لە نێو تێبینیەکانی کە لە کاتی پرۆڤەکردندا تۆماری کردوون، تۆپۆرکۆڤ جەختدەکات لەسەر ئەوەی کە ستانیسلافسکی ڕەفزیدەکرد وەلاَمی ئەو پرسیارانە بداتەوە کە دەربارەی (سۆز) و حاڵەتە سۆزداریەکان دەکران. ڕێژیسۆری روسی لەوەو دوا بەکارهێنانی (یادەوەریە سۆزداریەکانی) ڕەتدەکردەوە. لەبەرئەوەی تەئکیدی دەکرد کە مەحاڵە بتوانرێ (سۆزەکان چەسپاو بکرێن) بەلاَم دەتوانین بە تەنها کردارە فیزیکیەکان جێگیر بکەین. بەو ئەکتەرانەی لەو کاتەدا ئاماژەیان بەو تێبینیانە دەدا کە پێشتر

تۆماریـــان کردبـــوو، لـــە کـــاتی پرۆڤـــەی شانۆنامەکانی دیکە کە لە ژێر بەڕێوەبەرایەتی ئـەودا ئەنجامـدرابوون، ستانیسلافـسکی پێـی دەوتن و ئامۆژگاری دەکردن (هـەموو ئـەو شتانە بـسوتێنن و لەناوبـەرن) حاڵەتـە سـۆزداریەکان! ئێوە باسی چیدەکەن؟ من هـەرگیز شتێکم لـەو بارەیـەوە نەبیـستووە. بـەو شـێوەیە وەڵامـی هەوادارانی (سیستەمی) دەدایەوە و سەرسامی بەرامبـەر بـە وتـەکانی ڕابـردووی پیـشاندەدا. هەروەها دەیوت:

(بەخێرایی بە دوای سۆزەکاندا مەڕۆن، بەڵام فێـــرببن بـــە شـــێوازێکی دروســـت بتـــوانن کاردانـــەوەکان ئەنجامبـــدەن. ئارەزوویـــەکی دروســـت ســـۆزێکی ڕاســـت دێنێتـــە ئـــاراوە. لەبەرئـــەوەی کـــــردار هەمیـــــشە ئـــــەو ئارەزووانـــە دەبـــزوێنێ کـــە دروســـتن و ئـارەزووە دروسـتەکانیش سـۆزە پێویـستەکان دەوروژێنن).

ئـەو بڕیـارەی کرۆتۆفـسکی سـەبارەت بـە وەرگـرتنی میتـۆدی کـرداره فیزیکیـەکان وەك خاڵی دەسپێك بۆ کار و لێکۆڵینەوەکانی دەبێتە موجازەفەیـــەك، لەبەرئـــەوەی ئـــەو بڕیـــاری ستانیسلافسکی دێنێتەوە یاد کە سەبارەت بە ڕەتکردنـەوەی ئاکامـەکانی کارەکـانی پێـشووی دەیـدا، لـە پێنـاو تـەرکیزکردن بـە تـەنها لەسـەر کـرداره فیزیکیـەکان. ئـەو بڕیـاره جـێگیرەی کـە ستانیسلافـــسکی پێـــشاندەدا لـــە بەرامبـــەر ئـــارەزووی فێڵکـــردن و دووبـــاره کردنـــەوەو لاســاییکردنەوە یــان لێکدانــەوەی پێــشوەخت، دەبنـە مـۆدێلێکی کـارکردن بـۆ کرۆتۆفـسکی و ئاراسـتەی دەکـەن لـە نێـو کـارو توێژینـەوە قووڵەکانی سەبارەت بە پرۆسەی پێرفۆرمانس. ئەمە ڕێژیسۆری پۆلۆنی هاندەدات کە خۆی لە هـەموو ئـەو هـەوڵ و کۆششانە دوور ڕاگرێ کە دەیانەوێ شێوازە لە ئەژماردن نەهاتووەکان کە ژیـان لـە ڕێگایانـەوە خـۆی پێشاندەدات بخەنـە قـاڵبی سیـستەمێکی چەسـپاوەوە. ئـەو لـەو باوەڕەدابوو کە پرۆسەیەك بەو ڕادەیە پێشبینی نەکراو بێ و بەو ڕادەیە لە گۆڕاندابێ ناتوانرێ تەواو و بە تەنها لـە ڕێگای ئەقڵ و زمانەوە یان (ماشێنی بیرکردنەوەوە) جڵەو بکرێ.

کۆنفرانسەکانی کرۆتۆفسکی بە تایبەتی لە (کۆنـسێرفاتواری بـاڵا نیـشتمانی بـۆ هونـەری دراما) لـە پـاریس ئەنجامـدەدران، ئـەو شوێنەی کـە بـە ناوەنـدێك دادەنـرێ بـۆ ئامـادەکردنی ئـەو ئەکتەرانـەی دوا ڕۆژ دەبن بە ئەندام لـە شانۆی (کۆمیـدی – فەرەنـسی) و کـە لـە وێـدا ئـەو ئەکتەرانە فێردەکرێن (چۆن بە دەوری مێزێکدا دابنیـشن و خۆیـان ئەشـکەنجە بـدەن لـە پێنـاو شـیکردنەوەی بـیری نووسـەر و پاڵنـەرەکانی کارەکتەرەکان) یان (چۆن بە ڕۆیشتنەوە دەقێك بخوێننـــەوەو ئـــادای بکـــەن). کرۆتۆفـــسکی چـالاکیەکی لـەم شـێوەیەی تـەواو بـە بێبـەر دادەناو بە هونەری لە قەڵەم نەدەدا.

لەسەر تەختـەی شانۆیەك کە بە شێوازێکی نیمـچە کـۆن ڕازابـۆوە، کرۆتۆفـسکی لەبـەردەم مێزێکی بچوك دانیشتبوو، پاشان کردارێکی بە ئەنجامگەیاند کە ئیحای بۆ کەسێك دەکرد کە چۆن لە نێو دارستانێکی چڕدا دەیەوێ توولە ڕێگایـەك بکاتـەوە. دواتـر ڕوونیـدەکردەوە کـە کـارێکی چـەندە بێهـودە دەکەوێتـەوە ئەگـەر هەوڵـــدەین دونیایـــەکی فـــراوان و نەناســـراو کەشـفکەین و پاشـان لـە شـێوازێکدا جـێگیری بکەین. (بۆ نمونە، دوای ئەم درەختە درەختێکی دیکە دێ.. پاشان درەختێکی دیکە و.. هتد). ئـەو تەئکیـدی دەکـرد کـە جۆرێـك لـە (نهێنی) هەیـە، یـان (نهێنیـەك بـە زمـان نـاوترێ) و پەیوەستی کارکردنە، دەبێ لێگەڕێن وەکو خۆی

بمێنێتەوە. هەروەها ئاماژەی بە وێنەی ئەو ڕووبارە دەدا کە قەراغ و لێوارەکانی دەناسین بەڵام لەگەڵ ئەوەش دەبێ لێگەڕێن سەربەستانە گوزەر بکات.

دوا بە دوای نمایشی ڕۆژی حەشر (*apocalypsis cum fuguis*)، شانۆ بۆ کرۆتۆفسکی دەبێتە بوارێکی زۆر سنوردار بۆ کارو توێژینەوە قووڵەکانی. کرۆتۆفسکی سەرکێشیەکی نوێ دەگرێتە بەر، لە ترۆپکی ناوبانگی جیهانیدا بەمەبەستەوە واز لە بواری ڕێژی شانۆیی دەهێنێ و لەو پێناوەدا خۆی تەرخان دەکات بۆ لێکۆڵینەوە دەربارەی پارا – شانۆیی (*par thratral*).

قۆناغەکانی ئەو لێکۆڵینەوانە ناسراون بە (کلتوری ئەکتیف) و (شانۆی سەرچاوەکان) و دوا بە دوای ئەمانەش (دەرهاویشتەی ئامانجی دراما) دێت. تێکڕای ئەو هەولأنە لە زانکۆی کالیفۆرنیا لە ئێرڤین ئەنجامدران. هەر ئەو قۆناغە دەبێتە هۆکاری دامەزراندنی (مەڵبەندی توێژینەوەی جێرزی کرۆتۆفسکی) لە شارۆچکەی پۆنتێدێرا لە ئیتالیا. لە دەقێکدا بە ناونیشانی (ئەوەی دێتەوە یادم) کە لە بڵاوکراوەکانی ***workcentre*** و دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی 1988 کرۆتۆفسکی دەڵێ:

هەر جارێك کە شتێك کەشفدەکەم – ئاشکرا دەکەم–، ئەو هەستەم لەلا دروست دەبێ کە ئەو شتەم یاد دێتەوە. کەشفکردنەکان لە پشتمانەوەن، دەبێ گەشت بۆ دواوە بکەین تاکوو بیانگەینێ. لەگەڵ کردنەوەی هەر دەلاقەیەك – وەك گەڕانەوەی دوور خراوێك – ئایا دەتوانین دەست بۆ هەر شتێ ببەین پابەندنەبێ بە بنەچەوە، ئەگەر بوێرم و بڵێم بە سەرەتاوە؟ من لەو باوەڕەدام کەوایە.

دەرئەنجام کرۆتۆفسکی بە شێوەیەك لە شێوەکان ئەو ئاواتەی ستانیسلافسکی بەرجەستە دەکات کە سەبارەت بە گەیشتن بوو بە ریالیزمی ڕۆحی، کە ئاشکراکەری قووڵاییەکانی دەروونی مرۆڤە، لە ڕێگای کاری ئەکتەر لەسەر خودی خۆی. لە نێو زانستی وشەکانیدا – تێرمینۆلۆجی– ڕێژیسۆری پۆلۆنی وشەی (ئاشکراکەر) بەکاردەهێنێ لە بەرامبەر کەشفکردنی شتێکی ئەنتیم بەڵام کە پابەند دەمێنێتەوە بە سەرچاوەیەکی لەبیر کراو، بەو واتایە زۆرێك لە ئێمە دوور خراوەین. کرۆتۆفسکی دەڵێ:

(وشەیەك هەیە کە لە نێو چەندین زمانی جیاوازدا دوو – مانایی خۆی پاراستووە. ئەویش وشەی ئاشکراکردنە – کەشفکردنە *decouvrir*. ئەم وشەیە واتای دۆزینەوە و هەروەها واتای ڕووپۆش هەڵماڵینە لەو شتەی شاراوە بووە. ئەگەر بمانەوێ خۆمان ئاشکرا بکەین (وەك دونیایەك تاکوو ئێستا نەناسرابێ) پێویستە ڕووپۆش لە خۆمان هەڵماڵین، خۆمان ڕووتبکەینەوە. ئەو کەسەی تەنها لەگەڵ بەشێك لە خودی خۆی کاردانەوە و جولأنەوە بەئەنجام دەگەیەنێ، بە هەمان شێوە تەنها لەگەڵ بەشێك لە سروشتی خۆی دەژی. واتە ژیانێکی جوزئیو بەرتەسك دەژی. هەردوو کێشەی، خۆ نەشاردنەوەو نەبوون بە دوو بەشەوە، لە یەك کێشە زیاتر نیە.)

لەو کاتەوەی لێکۆڵینەوەکانی لە پرۆسەی ئەکتەرەوە بەرە بەرە دەگۆڕان بۆ ئەو شتەی ئەو پێی دەووت (هێڵی ناوەوەی مرۆڤ)، ئیدی وشەی ئەکتەر لە نێو تێرمینۆلۆجی کرۆتۆفسکی بەرچاو نەدەکەوت. لەوەو دوا وشەی پێرفۆرمانکاری ***performer*** بەکار

دەهێنا. ئیتر خۆنەشاردنەوە دەبوو بە كارێكی جەوهەری گەر پێرفۆرمانكار بیویستبا كردارێكی گشتگیر total acte بە ئاكام بگەیاندایە، بە شێوەیەك دەبوو تێكڕای بوونی خۆی لە خزمەت ئەو كردارە بەكاربهێنایە، لەبەرئەوەی بەڕای كرۆتۆفسكی بۆئەوەی بتوانین گەشتی گەڕانەوە بۆ سەرچاوە ئەنجامبدەین، پێویستە خودی خۆمان ئاشكرا بكەین.

بەلأم بەشێوەیەكی هاودژ، دەبینین ئەو ڕێگایەی لەگەڵ میتۆدی كردارە فیزیكیەكانی ستانیسلافسكی دەستی پێكرد، كرۆتۆفسكی دەبات بۆ ئەودیو سنورەكانی شانۆ، دەیگوێزێتەوە تا كەنارەكانی ناوچەیەك كە لە یەكەم نیگادا پێدەچێ زۆر دوور بێ لەوەی ستانیسلافسكی كەشفی دەكا.

لە درێژەی كۆنفراسەكانیدا، لە وەلأمی ئەو پرسیارانەی بەردەوام لێدەكران سەبارەت بە هەڵوێستی ئەو لە بەرامبەر شانۆ، كرۆتۆفسكی دەیووت، كە شانۆ (بۆ گەڕان و توێژینەوەكانی كێڵگەیەكی گرنگی پێكدەهێنا). لەبەرئەوەی، بۆ ئەو، كردار جێگەیەكی سەنتراڵی هەبووە لە شانۆدا، كە جەستە و دەروونی گرتۆتەوەو بەرەو (شتێكی بالأتر) ئاڕاستە دەكرا. بەو پێیە پرۆژەی كرۆتۆفسكی دواجار فۆرمی كەشفكردنێك وەردەگرێ، لەسەر (ئەزموون و شارەزایەكانی مرۆڤ، لەگەڵ توانا شاراوەكانی و نهێنیە تایبەتیەكانی).

لە بواری توێژینەوەكانیەوە لە سەر پرۆسەی ئەكتەر كرۆتۆفسكی بوونی (ئاسۆیەكی دووەم) دەدۆزێتەوەو دەیخاتە ڕوو و دەبێت بە هەلومەرجێكی پێویست بۆ پێرفۆرمانكار كە بەرامبەر ئاستێكی دیكەی تێڕوانین بۆ ژیان خۆ والأ بكات.

بۆ ڕوونكردنەوەی چەمكی ئاسۆی دووەم كرۆتۆفسكی ئەزموونی ئەكتەرێكی پۆلۆنی زۆر ناسراوی بە نمونە دەهێنایەوە، كە چۆن نزیك لە كۆتایی ژیانی هونەریدا، پزیشكەكان ئامۆژگاری دەكەن كە گەر بێتوو واز لە كاری نواندن نەهێنێ ڕەنگە تووشی دڵ وەستان بێ و لەسەر شانۆ گیان لە دەستبدا. ئەو ئەكتەرە بڕیاری بەردەوام بوون دەدا بەلأم دید و بۆچوونەكانی دەگۆڕدرێن، چونكە ئیتر دەیزانی هەر نمایشێك لەوەو دوا ڕەنگە دوا نمایش بێ. بۆیە كە شتێكی دەكرد وەك ئەوە وابوو ئەو شتە مانایەكی تایبەتی لەگەڵ خۆیدا هەڵبگرێ، یان وەك ئەوەی خۆی ئاڕاستەی شتێكی بەرزتر و بالأتر بكا، لەبەر هۆیەك كە ئیتر ئەو تێیپەراندبوو، بەلأم هەر ئەو هۆیە پاڵپێوەنەری بوو بۆ بەردەوامبوون.

كرۆتۆفسكی ڕونیدەكردەوە كە ئاسۆی دووەم تێڕوانینێكی دیكە لەودیو سنوری دیاردەی پێرفۆرمانسەوە پێشكەش دەكرد. هەروەها باسی لە خۆزگە و ئاواتێكی تایبەتی خۆی دەكرد سەبارەت بە شتێكی بنچینەیی. كە لە سالی 1974 دا ئەوكات وەسفی سروشتی ئەو ئاواتەی لە چاوپێكەوتنێكدا لەگەڵ بۆنارسكی كردوە لە گۆڤاری ***skultura*** پۆلۆنیدا. ئەو دەیوت:

(بۆ من، ئازادی پەیوەندە بە ئەزمونێكی بالأوە. لە پێناوی تاكەكاندا بوونی هەیە، تەنانەت گەر لێی بێئاگاشبین. بەلأم زۆر جار ئازادی لێرەو لەوێ بە فیڕۆ چووە، وەك ئەوەی مەسەلەكە پەیوەندی هەبێ بە پاشماوەی كۆمەڵێ وێرانەوەو لە بیركرابێ و لە دەسچووبێ. هەروەها دەتوانرێ بە ئارەزوویەكی بالأدەس ناوزەندی بكەین، واتە ئەو شتەی دەكەوێتە سەرووی هەموو شتەكانەوە و لە هەموو ئەوانی

تر گرنگترەو، تەنانەت لەو حاڵەتەشدا کە ئەوەی سەرنجمان ڕادەکێشێ شتێکی هاوبەش و گشتی و خەیاڵئامێزیش بێ. کەسێك بە بێوچان ڕێگای ئەو شتە بنچینەییە تا ئەوپەڕی سنوورەکانی بگرێتە بەر هەڵبەت تاڕادەیەك ئەزموونێکی باڵادەس (سام، عال) بەرجەستە دەکات و ئەزموونە بێبەها سواو و ڕۆژانەییەکان تێدەپەڕێنێ. ئەو بابەتە زیاتر حەقیقەتی خۆی دەسەلمێنێ گەر، ئارەزووەکەی شتێکی دیکە بێ لە ئارەزوویەکی سواو بێمانا. من لێرەدا، ئازادی نە لەگەڵ ئازادی هەڵبژاردن و نە لەگەڵ ئازادی ویستگەرایی *volontarisme* تێکەڵناکەم. بەڵکو مەبەست (شەپۆلێکە) و بەستنەوەیەتی بە نقومبوونی خود لەنێو ئەو شەپۆلە چڕو پڕەدا، هاوگونجاو لەگەڵ ئارەزووی ئەو خودەدا. کاتێ باس لە ئارەزوو دەکەم وەکئەوەیە مەبەستم بێ باس لە گرنگی ئاو بەلای تینویەکەوە لەسەحرایەکدا بکەم، یان مەبەست ئەو بڕە هەوایە بێ بۆ کەسێك کە خەریکە نقومدەبێ و دەخنکێ).

قۆناغی گواستنەوە لەلای کرۆتۆفسکی، لە (هونەر وەك پێشکەشکردن) بۆ (هونەر وەك ئامرازی گواستنەوە – *art comme vehicul* – کە لە ژێر کاریگەری بوونی (ئاسۆیەکی دووەم) وروژێنراوەو هاتۆتە ئاراوە، پەیوەستە بەو تویژینانەوە کە دەکەونە پێش دیاردەی پراکتیکەکردنی شانۆ لەلای ئەو. لەو کاتەی کە لەسەر بابەتێکی تایبەتی گەڕان و بەدواچوونی دەکرد، کرۆتۆفسکی سەرسام دەبێ بەرامبەر ئەگەری کەشفکردنی (تەکنیکێکی سەرتاپاگیر – کامل – لە لای مرۆڤ). ئیدی دەکەوێتە کار و هەڵدان بە دوای ئەو کەرەستەو ئامرازانەی لە توانایاندایە گۆڕانکاری لە ووزەدا ئەنجامبدەن. بە شێوازێك کە پێرفۆرمانکار بتوانێ لە بەکارهێنانی ووزەیەکی زیندووی زۆر چڕ و پڕەوە هەنگاو بنێ و بچێ بەرەو بەکارهێنانی ووزەیەکی دیکەی زۆر وورد و ناسك و کارا. کرۆتۆفسکی لە گەڕاندا بوو بە دوای جۆرێك لە (مەشقە کۆن و بەراییەکان). لە میانەی یەکێ لە کۆنفرانسەکانیدا وێنەیەکی لە (پەیژەی یەعقوب) وەك نمونە بە کاردەهێنا، کە وەك ڕێچکەیەك یان ئامرازێکی گواستنەوە بەرەو ئاستێکی ئاگایی بەرزتر کاردەکا، لە هەمان کاتیشدا ڕێگا بە پێرفۆرمانکار دەدا بە ڕیشە داکوتراوی لە نێو چڕی هەڵچوونەکانی جەستەیدا بمێنێتەوە. ئەو ڕایدەگەیاند کە: (دوای چەندین ئەزموونی پراکتیکی جۆراوجۆر کە هەندێ هونەرمەند لە کلتور و ترادیسیونە کۆنەکان تێدا بەشدار بوون، توانیم باوەڕبهێنم بە توانا و کاریگەری چەند جۆرێك لە گۆڕانی ڕیتوالییەکان کە لە هەمانکاتدا (تەوەرێکی لەرینەوە – دەنگ) و (پاڵپشتێك) یان بۆ هەڵچوونە زیندووەکان پێکدەهێنا).

کرۆتۆفسکی ڕوونیدەکردەوە کە لاساییکردنەوەیەکی سادە و ساکاری ئەو گۆڕانیانەی لەلایەن کۆمەڵێ مامۆستای شارەزا لە کلتور و ترادیسیونە کۆنەکان فێر دەکران، نەدەبووە ئامانج لەلای پێرفۆرمانکار، نە لە زانکۆی کالیفۆرنیا و نە لە بنکەی پۆنتێدێرا. بەلام دەبوایە دیاردە تەکنیکیەکان بە تەواوی بخرابانە نێو کارەکانەوەو کار لە سەر گونجاندنیان بکرابا، لە پێناوی ئەوەی بتوانرێ گۆڕانیەکان توانای کارگێڕی خۆیان بسەلمێنن. کرۆتۆفسکی باوەڕی وابوو کە لە میانەی پراکتیکێکی قورس و دژواری ئەو گۆڕانیە ڕیتوالیانەوە (جۆرێکی دیکە لە ژیان) لە ساتەوەختی جێبەجێکردندا، خۆی پێشاندەدا. وەکئەوەی ئەو کارە پەیوەندی هەبێ بە (نهێنی

دڵ و دەروونەوە)و پێشاندەری وەلاٚمێك بێ بۆ نوستالجیە ئەبەدیەکان. ئەو لێکۆڵینەوانە کرۆتۆفسکیان برد بەرەو ئەوەی کە بیسەلمێنێ کە، کاتێ هەندێ لەو ڕیتوالاٚنە بە شێوەیەکی بابەتیانە (*objective*) بەکارهاتن، دەتوانن جێبەجێکاری ئەو گۆرانیانە ببەن بەرەو گەیشتن بە ئاستێکی ئاگایی بەرزتر.

(کاتێ قسە دەکەم لەسەر (هونەر وەك ئامرازی گواستنەوە)، دەگەڕێمەوە بۆ ئەو مۆنتاجەی کە بارەگاکەی لە نێو تێڕوانینی بینەردا نیە، بەڵکو لەلای جێبەجێکارە. ئەو کارە پەیوەست نیە بەوەی کە دەبێ ڕەزامەندی و هاوتەبایی دەربڕێ بەرامبەر تێڕوانینە جیاوازەکانی نێوان جێبەجێکاران، بەرامبەر ئەو شتەی دەبێتە مۆنتاجی هاوبەش و گشتی. بەڵکو لە میانەی خودی کردارەکانەوە پێویستە کەشفی بکەی چۆن هەنگاو بە هەنگاو نزیکدەبیتەوە لەو شتەی جەوهەری و سەرەکیە. دەتوانین گوزارشتێکی تر بەکاربهێنین، بۆ نمونە، (ئەسانسۆر – مصعد). نمایش لە (هونەر وەك پێشکەشکردن)دا وەکو ئەسانسۆرێکی گەورەیە، لە کاتێکدا ئەکتەر دەبێتە ئیشپێکەری ئەو ئەسانسۆرە. لە نێو ئەو ئەسانسۆرە بینەری تێدایە، نمایشەکە ئەوان لە فۆرمی ڕووداوێکەوە بۆ فۆرمی ڕووداوێکی دیکە دەگوێزێتەوە. گەر بێتوو ئەو ئەسانسۆرە بۆ بینەر بە باشی کار بکا ئەوا ئەو کاتە مۆنتاجیش بە باشی کراوە. (هونەر وەك ئامرازی گواستنەوە) وەکو ئاسانسۆرێکی زۆر سادە و سەرەتاییە. سەبەتەیەکی گەورەیە، ئێمە خۆمان بە گوریسێك رادەکێشین و هەر بەو گوریسەوە ئەکتەر بەرەو ووزەیەکی وورد و کارا بەرز هەڵدەکشێ، بۆ ئەوەی، لەگەڵ ئەو ووزەیەوە، بۆ سەر بێئاگایی جەستەمان دابەزێ. ئەمەیە کاری بابەتیانەی ریتواڵ. ئەگەر هونەر وەك ئامرازی گواستنەوە لە کارکردندا بێ، ئەو کارە بابەتیە دێتە ئاراوەو ئەو کات سەبەتەکە لە ئاستێکەوە بۆ ئاستێکی تر دەجووڵێ، بۆ ئەوانەی کە کردارەکان ئەنجامدەدەن. لە کاتی هەوڵ و گەڕانی بەدوای ئەو ئامرازانەی لە پێناو یارمەتیدانی ئەکتەر بوون بۆ دروستکردنی پەیوەندی لەگەڵ ژیانی ناوەوەدا ستانیسلافسکی بابەتی (کارکردن لەسەر خودی خۆت)ی داهێنا. ئەو کارەش بەشێوەیەکی پێویست تەرکیزکردنێکی نەپچڕاوی لە خۆدەگرت. چ لەسەر ئاستی رۆحی یان لەسەر ئاستی جەستەیی. (تەرکیزکردن کە نەك بە تەنها بینین و بیستن بگرێتەوە، بەڵکو باڵی دەکێشا بەسەر تەواوی هەستە مرۆییەکان و هەروەها هەموو جەستە و بیرکردنەوەو رۆح و ویست و یادەوەری و وێناکردنیشی لەخۆ دەگرت). ستانیسلافسکی بە (حەدەس)، پێشبینی کردووە کە کارکردن لەسەر دەنگ دەبێتە ئامرازێك کە دەتوانێ تەواوی بوونی مرۆڤ مۆبلیزە بکا. ئەو حەدەسە بەشێوەیەکی تایبەتی دەبێتە سەرچاوەیەکی ئیلهام بۆ ئەو توێژینەوانەی کرۆتۆفسکی کە دواتر لەسەر گۆرانیە ریتواڵیەکان ئەنجامیان دەدات.

ستانیسلافسکی دەڵێ:

(ئایا ئێمە، هونەرمەندانی شانۆ، بەو شێوەیە، بەهۆی ماتەڕیاڵئامێزی جەستەمانەوە دەبێ بۆ تاهەتایی، مەحکومکرابین بە تەنها هەر لە خزمەتی واقعێکی زبر و ڕەقوتەقدا بین و لەو زیاتر نەتوانین گوزارشت لە هیچی دیکە بکەین؟ بۆچی ئەکتەرەکانمان ناتوانن خۆیان لەو بابەتە رزگار بکەن؟ بۆچی ئێمە

ناتوانین خۆمان لە جەستە جیابكەینەوە، لەو مەتەڕیالە بێینە دەرەوە؟ پێویستە كار لەسەر جەستە بكەین بۆ ئەوەی باری مەتڕیالی لەسەر سوك بكەین. دەنگی مرۆڤ دەبێ هێندە ماتەڕیالّیی و زبر بێ كە نەتوانێ گوزارشت بكا لەو شتەی ئەبستراكە، باڵادەستە، پایە بڵندە یان لە ئازار و كڵوڵی ژیانو نهێنی بوون و ئەبەدیەت؟).

كرۆتۆفسكی لەلای خۆیەوە، لە درێژەی كۆنفرانسەكانیدا باسی لە (چۆنیەتی تێپەراندنی هەلومەرجە سروشتیە زبرەكانمان) دەكرد. ئەو وێنەی كەسێكی بە نمونە دەهێنایەوە كە چۆن هەوڵدەدات (بازێك لەسەروو سەری خۆیەوە بدات). هەروەها دەیووت كە توێژینەوەكانی لەسەر گۆرانی رتواڵیەكان پشتیان بەستووە و بەندن بە (هەندێك شتەوە) كە توانیویانە لە تێپەربوونی زەمەن بەسەریاندا رزگاریان بێ و بەزیندوویی بمێننەوەو، لە نێو چۆنیەتی لەرینەوەكان ئەو گۆرانیانە سەرهەڵبدەنەوە.

گەشتی هونەری كرۆتۆفسكی كە بە كارێكی شانۆیی دەسپێدەكا بەرەبەرە بە گەڕانەوەیەك بەرەو سەرچاوەكان دەگۆڕدرێ، كە رێژیسۆری پۆلۆنی دەبات بۆ ئەودیو سنوورەكانی شانۆوە، ئەمەش ئەو دەگەیەننە سەر ئەو سەرچاوانەی لە دەرەوەی زەمەن و لە دەرەوەی ژیانی رۆژانەدان.

لە میانەی دوا كۆنفرانسدا، كرۆتۆفسكی میتافۆرێكی سۆفیزمی بە نمونە دەهێنایەوە: گایەك گالیسكەیەك بە نێو تونێلێكدا ڕادەكێشێ، تا چەند بەرەو پێشەوە مل بنێ و بڕوات هێندە و زیاتریش تاریكی هەموو شتەكان دادەپۆشێ. بۆ ئەوەی بەرەو خاڵی دەسپێكردن بڕوات دەبێ گالیسكەكە بە پێچەوانەی ئاراستەكەی پێچ پێبكاتەوە، بۆ ئەوەی بتوانێ گەشتەكەی بۆ دواوە دەسپێبكا تاكو بگات بە سەرەتای سەرچاوەی ڕوناكی. ئەمە وا دەگەیەنێ كە پێرفۆرمانكار دەبێ دەستبەرداری ئەو جەنگە وێستگەراییەی (من) ببێ كە، من خۆی تێیدا تەئكید دەكات، كاتێ رایدەگەیەنێ (من كردار ئەنجام دەدەم)، ئەمەش لە پێناوی ئەوەی بتوانێ بگات بە جڵەو شلكردنێك و قبوڵكردنی پرۆسەیەكی ناوەكیانە، لەو میانەوە بوترێ (ئەوە ئەنجامدەدرێ).

كرۆتۆفسكی بەتایبەتی جەختی لەسەر ئەو ڕاستیە دەكردەوە كە سروشتی بەردەوامبون لە كارەكانیدا تەواو پراكتیكی بووەو تێكڕای كارو پرۆژەكان لە ئەنجامی (كاركردنەوە) رێیاندەكرد. ئەو دەیووت، پێویستی نەدەكرد (نە لە كارە هونەریەكان و نە لە ئاسۆی دووەم) دا بگەڕێین بەدوای شێوازدا. (لەبەرئەوەی چەند هەوڵدەین بگەڕێین بە دوای شێوازێك هێندە ئەقڵ و بیركردنەوە ئاسودەیی بەخۆوە دەبینێ، بەڵام لە هەمان كاتیشدا هێندەش جەستەمان بلۆك دەبێ). هەر بە هەمان شێوە تەئكیدی دەكرد كە ئەو هەوڵانەی توێژینەوەكان و شیكردنەوەكان دەیدەن بۆ دەستنیشانكردن و ریزبەندكردنی هەڵچونەكان، بە ئامانجی پێكهێنانی تیوریەك، هیچ ئەنجام نادەن كوشتنی پرۆسەی ئۆرگانیك نەبێ. هەروەها رایدەگەیان كە (زۆر گرنگە كاری پراكتیكی نەگۆڕدرێ بۆ مەزهەب). لەبەرئەوەی ئامانجی مەزهەب بە تەنها كردنەوەی دەرگایەكە یان پێشنیاركردنی ئەگەرەكانە. ئەو ئامۆژگاری دەدا بەو كەسانەی پراكتیزەی كاری شانۆیی دەكەن، لە گەڕان و توێژینەوەكانیدا بگەڕێن بەدوای ئەوەی بەڕاستی ئەفسونیان دەكات و ئیلهامیان پێدەبەخشێ. گەڕان و لێكۆڵینەوە

پێویسته سەرچاوەکانی ژیانی هەر تاکێك بکا بە بنەما. بەبێ ئەو ئیلتیزامە کرۆتۆفسکی تەواو باوەڕی وەها بوو کە هونەرمەند ناتوانێ بگات بە ئاستێکی بەرز لە بەدەستهێنانی شارەزایی و لێهاتووی و بە پێچەوانەوە کارەکەی دەبێتە مایەی کات بەسەربردن نەك داهێنانی راستەقینە.

لە دووی شوباتی 1998 دا کاتێك، گەیشتمە شانۆی رۆندپۆوا، بە مەبەستی ئامادەبوونم لە دەیەمین کۆنفرانسی کرۆتۆفسکیدا، بینیم لەسەر لەوحەیەك نوسرابوو، بەهۆی باری تەندروستیەوە کۆنفرانسەکە ناتوانرێ سازبکرێ. لە کۆنفرانسەکانی پێشوودا کرۆتۆفسکی واقیعیانە و دوور لە سۆزداریەوە روونیدەکردەوە کە ماوەیەکە بە هۆی نەخۆشی دڵەوە زۆر ئازار دەکێشێ و ئەو نەخۆشیە بەشێوەیەکی گەورە بۆتە رێگر لەبەردەم چالاکیەکانی.

*Mario biagini* یاریدەدەری کرۆتۆفسکی لە کاتی کۆنفرانسەکان و ئەندام و سەرۆکی بنکەی جیزی کرۆتۆفسکی لە پۆنتێدێرا، سەرقاڵی وەلامدانەوەی پرسیارەکانی ئەو کەسانە بوو کە لە هۆڵەکە کۆببوونەوە، دوای ئەوەی توانیم چەند رستەیەکی لەگەڵ بڵێم، بۆم دەرکەوت کە سەرباری خراپی باری تەندروستی کرۆتۆفسکی ئەو هەر سوور بووە لەسەر بەردەوامبوون لە کارەکانی و درێژەدان بە کۆنفرانسەکانی تا ئەو ساتەی ئیتر نەخۆشیەکەی بە تەواوی پەکی خستووە. هەرچەندە پێدەچوو هەندێك قورسبێ قبوڵی ئەوە بکەین کە داهێنەرێکی وەکو ئەو گیرۆدەی لاوازی جەستەیی و شکست بێ، لە کاتێکدا لە کۆنفرانسەکانی پێشوودا دەمانبینی چۆن زیندوێتی و لێهاتووی پێشاندەدا بەرامبەر

جەماوەرێکی پاریس، چ ئەوانەی پەرۆش و شەیدای زانیاریەکانی بوون چ ئەوانەی پسپۆربوون لە شانۆ و چ ئەوانەشی بە دوو دڵی راڕایەوە تێیاندەڕوانی. بەهەرەو توانای دامەزرێنەری شانۆی تاقیگە لە کێشکردنی سەرنجی ئامادەبوان بەدوای شوێن رێچکەی خەیاڵی بیرۆکە بەردەوامەکانی ئەو بیرو وێنە بانگەوازکراوانەی ئاماژەی بۆ دەدان و، بەستنەوەو گرێدانیان لە هەمانکاتدا بەو پرسانەی لە ساتەوەختی ئێستادا باسی لێوەدەکردن و ئەوانەی لە کۆنفرانسەکانی رابوردوودا باسی لێوە کردبوون، قوڵی بەپێزیو یەکگرتوویی لێکۆڵینەوەکانی ئەویان پێشاندەدا.

کرۆتۆفسکی شێوازێکی زۆر زیندوو و زۆر تایبەت بەخۆی هەبوو لە بەکارهێنانی زمانێك کە زمانی دایکی نەبوو، تێڕوانینێکی گەش و روون و ئاشکرا و تیژبین لە تەك بزەو زەردەخەنەیەك کە پێدەچوو تەعبیر لە تەحدایەکی وەسفنەکراو بکەن.

ئەو شێوازەی ئەو دەیگرتە بەر دەربارەی باسکردنی دیاردە هەرە ئاڵۆزەکانی کارەکانی و روونکردنەوە و شرۆڤەکردنیان لە رێگای کۆمەڵێ وێنەوەو لە رێگای هەندێ نمونەی سادە لە ئەزموونی ژیانی ئەوەوە وەك مرۆڤێك، هەموو ئەمانە وەك کۆمەڵێ هەست و یادەوەری لە دەرئەنجامی ئامادەبوونی ئەو دیدارانەوە لەلامان دروستبوون، بەرامبەر مرۆڤێکی بێوێنە، هونەرمەندێك، لێکۆڵەرەوەیەك، مامۆستاو پیشەکارێك کە بیرو بۆچونەکانی بەردەوام (کاریگەریەکی نەبینراو) بەسەر شانۆی سەدەی بیست و یەکەوە پیادەدەکەن. بابەت و بیرۆکە دووپاتبووەکانی نێو ئەو دیدارانە گوزارشتیان لە پێویستیەکی بێ تەمومژ دەکرد لە بەرامبەر

دۆزینــەوەی ڕێـچکەیەکی تایبــەت بــە خــودی کرۆتۆفـسکی. ســەرباری ســەختی و ڕەدیقـەتی پـــەیامی هەریەکـــەیان، دەتـــوانین بڵـــێین دوا پەیوەنـدی کـە کرۆتۆفـسکی دەبەسـتێتەوە بـە ستانیسلافــسکیەوە، بێگومـــان لـــەنێو ئـــەو ڕاســتیەدا خــۆی دەبینێتــەوە کــە، مەبەســتی کۆتـــایی بـــیرو بۆچـــوونە تایبەتیـــەکانیان جیانابنـــەوەو پەیوەســـتن بـــە گـــەڕان و بەدواداچـــوون و توێژینــەوەکانیان. هــەروەکو تۆماس ریشارد ئاماژەی بۆ دەکات:

(کارەکـانی کرۆتۆفـسکی بـە هـیچ شـێوازێك ئینکـاری رابـردوو ناکـەن، بـەڵکو لـەو نێوانـەوە دەگـەڕێن بـە دوای ئـەو کەرەسـتەو ئامرازانـەی بتـوانن پارمەتیـدەربن لـە کارەکانیـدا. (میتـۆدی تایبەتی بەخۆت داهێنە، خۆت پەیوەست مەکە بە تەنها بە میتۆدی منەوە، شتێك بدۆزەرەوە بۆ خـــۆت بەکـــەڵك بـــێ) ئەمانـــە ئـــەو وتانـــەی ستانیسلافـسکین کـە کرۆتۆفـسکی دەقـاودەق جێبەجێی کردن).

لەگـەڵ ئـەوەش یـەکێك لـەو پەیوەندیـە هـەرە هەســتپێکراوانەی کــە ئــەو دوو مرۆڤــە لێــك نزیکدەکاتــەوە ڕەنگــە لــەو بیرۆکەیــەدا خــۆی بنـــوێنێ کـــە دەڵـــێ: سروشـــتی پراکتیکـــی کارەکانیان هۆکارە تیوریەکان دەخەنە دەرەوەی بازنـــــەی نـــــەقڵکردن و گواســـــتنەوەوە. ستانیسلافـــسکی زۆر بـــەئاگابوو لـــە دژواری نەقڵکردنی مۆدێلێك کە پەیوەستی ئەزمونێکە. هـــەروەها زۆر دەترســـا لـــە پرۆســـەی بـــە دەزگـــاکردنی میتۆدەکـــەی و وتنـــەوەی لـــە خوێنـــدنگاکانی روســـیا. ئـــەو هەســـتی بـــە نارەحـــەتی و بێـــزاری دەکـــرد ســـەبارەت بـــەو بابەتەی دەیویست دوا قۆنـاغی لێکۆڵینەوەکانی (بـە هەڵوێـستی تازەشـیەوە دەربـارەی بابـەتی سۆزداری) بخرێتە نێو ئەو پرۆگرامانەوەو دوای مردنـی لـە قوتابخانـەکان بوترێنـەوە. سـەرباری نیگـەرانی لــە بەرامبــەر نــەقڵ و گواســتنەوە، دیاردەیەکی دیکەی سەرنج راکێش بەدیدەکەین لـەلای ستانیسلافـسکی، ئـەویش ڕەفزکردنـی روون و ئاشـــکرای ئـــەوە بەرامبـــەر بـــە (پیرۆزکردنیەتی).

ســـەبارەت بـــە کرۆتۆفـــسکی، جارێکیـــان وتویەتی (قوتابیە ڕاستەقینەکان هەرگیز قوتابی ئاسایی نین). بەپێی بۆچوونی ئەو، مایەرهۆڵد قوتابیەکی ڕاستەقینەی ستانیسلافسکی بووە، بـەو پێیـەی کـە ئـەو، هـەر بـە هـەمان شـێوەی فاختانگۆف، سیستەمەکەی هەرگیز بە شێوازی قوتابخانـەیی ***scolastique*** جێبـەجێ نـەکردووە. مایـەر هۆڵـد وەڵامـی تایبـەت بـە خـۆی هـەبوو لـە بەرامبەر ئەو سیستەمە.

کەواتــە کرۆتۆفــسکی بــاوەڕی وا بــوو کــە (قوتـابی ڕاسـتەقینە بـە گـەورەییـەوە خیانـەت لـە مامۆستاکەی دەکات). بەلای ئەوەوە ئەو جۆرە خیانەتکردنە مەرجی سەرەکیە لە بەردەم هەموو گواستنەوەیەکی ڕاستەقینە لە داهێنەرێکەوە بۆ داهێنـەرێکی دیکـە، لەبەرئـەوەی ئـەم پرۆسـەیە (گۆرانکاری) لە خۆدەگرێ.

ئـیرادەی کرۆتۆفـسکی لـە ڕەفزکردنـی گـشت ئـــەو وەڵامـــە حازرکراوانـــەی بەشـــداری لـــە پێکهێنـانی تیوریـەکان و فەلـسەفە و مەزهـەب و ئاینـەکان دەکـەن، ئـەوە رووندەکاتـەوە کـە ئـەو شتەی ناجۆر و نەگونجاو لەبار نیە ئەوەیە کە لە قوتابیـــەکی ســـادە و ســـاکار زیـــاتر نـــەبێت. کرۆتۆفسکی بـاوەڕی وابـوو کـە کەسـەکان بۆیـە شـەعائیرەکان دەخـوڵقێنن بۆئـەوەی لـە پرسـیارە ڕاســـتەقینەکان دووربکەونـــەوە. ئـــەوەش بـــە مەبەستی پشتگوێ خستنی ئەگەر و تواناکـانی تـرەو هـەروەها بـۆ ئـەوەی بەڕاسـتی ئـەو شـتە ئـەنجام نـەدەن کـە بـە قووڵیـەوە پێویـستیان بـە

ئەنجامدانیەتی. بەم شێوەیە دەبینین کە گەشتی ناوەکیانــەی کرۆتۆفــسکی لەســـەر بنــچینەی میراتی منداڵی دادەمەزرێ، یان وەك خۆی دەڵێ (ئامادەیی توانستە یەکەمەکان، پێش خواستە هونەریەکان) لەگـەڵ ئـەوەی شتەکان لـەو کاتـەدا پەیوەستن بـە ئاگاییـەکی (زۆر ساویلکەییەوە) بەڵام ئەو تێبینی دەکرد کە ئەو ئاگاییە ڕەسەن و جەوهەرییـە لەبەرئـەوەی شـتێك نمـایش دەکـا (شـتێك لـە نێـو ژیانمانـدا دێرینـە) شـتێك بـە شـــێوەیەکی قـــووڵ ئەزموونـــەکانمان تێـــدا ریـــشەداکوتراون. بـــەلای کرۆتۆفـــسکیەوە گرتنەبـەری (ژیانێـك لـە نێـو هونـەردا) پـێش هـەموو شـتێ پابەنـدی پێویـستیەکی شەخسی بووە کە کەوتۆتـە پـێش مەسـەلەی پسپۆریەوە. وەك (چـــاوەڕوانکردنی کەســـێکی تـــر کـــە بمانگەیەنێ بە بەختیاری) پێناسە دەکرد. بەڵام وشەی بەختیاری لە ژیانی مۆدێرنماندا وشـەی (خۆشی یان ئارەزوو) جێگای دەگرێتەوە.

ئـــەو لـــەو بـــاوەڕەدا بـــوو کـــە کەســـێك بەدواداچـــونێکی لـــەو جـــۆرە ئەنجامبـــدات، دەتـوانێ (مانایـەك بـە ژیـان ببەخشێ). ئەمـەش گوزارشتێك بوو کرۆتۆفسکی بەکاری دەهێنا کە پێدەچـوو لـە هـەمان کاتـدا ئامـاژە بکـات بـۆ (گرتنەبـــەری ئاڕاســـتەیەك لـــە ژیانـــدا و مانابەخـــشینێك بـــە ژیـــان). ئەمـــەش ئـــەوە دەگەیەنێ کە بەدواچوونێکی لەو جۆرە بێگومان بـۆ هەریـەکێك لـە ئێمـە جیـاوازە و شـێوازی تایبەتی خۆی وەردەگرێ.

لە درێـژەی ئـەو دوو کۆنفرانسەی کۆتاییدا، ئەو ڕژێسۆرو لێکۆڵەرەوەو هونەرمەندە کە پێش هـــەموو شـــتێ تێدەکۆشـــا بـــە ڕاســـتگۆیی و وەفـاداری بەرامبـەر خـۆی بمێنێتـەوە، تێبـینی دەدا کـــە (گـــەورەیی تایبەتمەنـــدی ژیـــانی خوڵقێنەرانەی ستانیسلافسکی) سەرچاوەیەکی ئیلـهامی مـەزن بـووە بـۆ ئـەو. کرۆتۆفـسکی رایدەگەیانـد، ئـەو کـارە وەك ئـەوە بـوو کـە ستانیسلافسکی (کۆمـەڵێ پرسـیارم لێبکـات لـە کـاتی گێڕانـەوەی ئـەو کارانـەی کردوونـی و شـێوەی ئـەو ئەزموونـەی بـەجێی گەیانـدووە). هـەروەها بەشـێوەی ستانیسلافـسکی ئـەویش هەوڵیـدەدا لـە ڕێگـای ئـەو کۆنفرانسانەوە لـەو گەشـتە هونەریـە تایبەتیـەی خـۆی بەشـدارمان بکـات وەك چـۆن ستانیسلافـسکی ئـەو کـارەی لەگـەڵ ئـەودا ئەنجامـدا، ئـەو دەیویـست بڵـێ (سەرکێشیەکانی من بەم جۆرە بوون).

**سەرچاوە:**

ناونیشانی وتارەکە

*Cette vie est pas suffisante*

*de l acteur selon stanislavski au performer selon grotowski*

نووسینی : *virginie magnat*

# دڵدارە هەرە ئازیزەکەم
## نامەی نێوان ئانتوان چیخۆف و ئۆڵگاکنیپەر

لە فارسییەوە: ڕەووف بێگەرد






کنیپەر

31ی ئۆگەست

مۆسکۆ- شەو

ئازیزترینم، ئەمڕۆ تەنیا چەند دێڕێکت بۆ دەنووسم، مێشکم ماندوەو قینم لە هەموو کەس و هەموو شتێکە، هیچ لە بارەی ژیانەوە نازانم، (...) شتی ناپەسەندم بۆ مەنووسە تەنیا لەبەرئەوەی نامەکانم کورتن، ناتوانم لەگەڵ بێ تۆییدا ڕابێم، خۆشم دەوێیت وەك هەمیشە و هەردەم بیرت دەکەم، تۆ ئەمە دەزانیت (...)

ئۆڵگاکەت.

*ئەم نامەیە لە فارسیەکەدا نیە و لە دەقە ئینگلیزیەکەوە کراوەتە کوردی.(وەرگێڕ)

* * * * * *

**چیخۆف**

**1ی سێپتەمبەر**

**یاڵتا**

تووتەڵە خۆشەویستەکەم، تۆ گشت ڕۆژێك بـۆم دەنووسـیت، خۆشـم دەوێیـت، دەسـت خۆشیت لێ دەکەم بۆ ئەوە، بەردەوام بە لە کارە باشـەکەتدا، کـچێکی زرنگبـە و لـە "نمیروڤیچ" بپرسـە ئایـا ئەگـەری ئـەوە هەیـە لـە شـانۆگەریەکەی بـزانین (...) زۆر بـە وردی و خۆشیەوە دەیخوێنمەوە، هیوادارم داواکاریەکەم نەداتە دواوە (...) هەموو ڕۆژێك خاوێنم دەکەن بەڵام نەك وەك تۆ (...) بە "ڤیشنی ڤسکی" بڵێ کـە لـە یاڵتـاوە دێـم بـۆ ئـەوەی پرۆڤـەی "سـێ خوشـکەکە"ببیـنم. ئەگـەر هـیچ نـەبوو ئەوسا شانۆگەریەکە نابینم.

**ئانتونیو**

*ئـەم نامەیـە نەکراوەتـە فارسـی و لـە ئینگلیزیەکەوە وەرگیراوە.(وەرگێڕ)

* * * * * *

**کنیپەر**

**2ی سێپتەمبەر - مۆسکۆ**

ئـازیزترینم، ئـەمڕۆ ڕۆژێکـی زۆر خـۆش و گەرمـە، خێزانەکـەم داوایـان لێکـردم بڕۆینـە دەرەوەی شـار، بـەڵام حـەزم نـەکرد بـچم، پـێم خۆش نەبوو لەبەرئەوەی تۆ لێرە نیت و هەست دەکـەم سـەر لێـشێواوو مـردووم، بـەڵام هـەتاو گەرمەو هەوا خۆشە، تازە لە خەو هەستاوم.

دوێـنێ ئەوەنـدە شـەکەت بـووم نـەمتوانی هیچت بۆ بنووسم، تەنیا وێنەکەتم ماچ کرد و هەسـتم کـرد زۆر لێمـەوە نزیکیـت، زۆرنزیـك.. دیمـەنی خۆرنـشینی دوێـنێ زۆر جـوان بـوو، ڕەنگەکان فرە قەشەنگ بوون و ئەو زەنگانەی تۆ پێـت خۆشـن لێیـان دەدا. ئـەم شـتانە زۆریـان وروژاندم، پێویستم بە دۆخێك بوو کە قەتیسم نەکات. من سۆزدارێکی گەلحۆم، خەڵکانی دی حـەز لـە ژیـانی نـاو شـار دەکـەن و بەڕاسـتیش بەخۆشـی تیایدا ڕادەبوێرن، مـن حـەز بـە ژیـانی شار ناکەم، تیا دەژیم بەڵام نایشمەوێت، هەست دەکـەم ژیـانی شـار بارێکـە بەسەرشـانمەوە، هەست دەکەم ئەمە ژیانی ڕاستەقینە نیە، ئینجا بیرێکی ناخۆشم بۆ دێت کە لەوانەیە لە پڕێکدا هەموو شتێك کۆتایی بێت، وەك هێزێکی نادیار تۆ داگیر بکات. وانـەزانیت مـن بیر لـە خۆکـوژی دەکەمەوە، مـن "سولیرزتـسکی"م خـۆش دەوێـت لەبەرئـەو شـێوە ژیانـە خێڵەکیـەی کـە بـەبێ دەمامکە (...) سبەینێ "ماشا" دەبینم و هـەموو شـتێکم لـەبارەی تـۆوە پـێ دەڵێـت ئازیزەکـەم، بـەیانی دەسـت بـە گواسـتنەوە دەکـەم بـۆ خانوەکە، دایکم دوو دڵە دەکات چونکە دەڵێت ژوورەکـان بـچووکن، ئـەوە دەمترسـێنێت. بـەڵام لەبەرئـەوەی هەواکـەی باشـەو خـەڵکی تـری تیـا نیـە ئەگـەر زۆر گـەرم بـوو دەتـوانین پەنجـەرە بکەینەوە و هەواکە بگۆڕین. مەبەستت لەوە چیە کە دەڵێیت ژوورەکەم لـە پاڵ نووسینگەکەدایە؟ هـەر ئەوەیـە کـە دەرگـای ژوورەکـەت و دەرگـای شـوێنەکانی تـر دەچـنەوە سـەر هـەمان داڵان. دەتوانین یان چا بخۆینەوە یان یاری کرۆکێت لە حەوشـەی پێـشەوە بکـەین. ڕێـك وەك لادێ، دەبێت زوو بێیت، کەش و هەوا زۆر خۆشە (...) دوێنێ نمایشێکی "قازی کێوی"ەکانم بینی، بە زۆر خۆم بۆ گیرا، تا ماوەیەکی درەنگ، ئەوەندە مانـدوو بـووم کـە نەمـدەتوانی وەك ڕۆژانـی ئاسایی بۆت بنووسم، وەرە با پێکەوە ببینین و بۆچـوونەکانمان ئـاڵوگۆڕ بکـەین. تـۆ شانۆگەریەکەی "نمیروڤیچ" دەخوێنیتـەوە (...)

ئەو دەڕوات بۆ "زڤینی گۆرۆد" بۆئەوەی ڕێکی بخاتەوەو دووبارە بینووسێتەوە، واتا دوا پەردە بەهێزتر بکات، هێشتا "کریمەر"م نەدیوە، بەلاَم زۆر سەرنجی راکێشاوم.

تووتکەکەت.

*ئــەم نامەیــە لــە فارســیەکەدا نیــە و لــە ئینگلیزیەکەوە کراوەتە کوردی.(وەرگێڕ)

* * * * * *

**کنیپەر**

**2ی سێپتەمبەر**

**مۆسکۆ – شەو**

ئــانتونی ئــازیز. ئــەم بەیانیــە نامــەم بــۆ نووســیت، ئێــستایش وا دەچــم بنــووم و ئــەم نامەیەت بۆ دەنووسم. ئای کە ژنێکی باشم! ئەم ئێوارەیە هەر باسی تۆم کردووە (...)

"ماشا"م بینی و زۆرم پیێ خۆشبوو، قسەم لەگەڵدا کرد، پاشان پێکەوە چووین بۆ بینینی ئاپارتمانە تازەکە، ئەوییش لای باشبوو، نانی ئێوارەمان بە خۆشی خوارد، هەر کەسە و لە هەوای خۆیدا بوو بە دەنگی بەرز قسەیان دەکرد، بەلاَم بەشەڕ نەهاتن. خێزانەکەمان زۆر بلّێن (...) لە قیتارەکەدا "ماشا" پێی وتم کە هەموو کەسێك باسی من و تۆ دەکات – خەڵکانی پیرو قوتابییش – هەموو کەس تاریفیان لە هەڵبژاردنەکەت دەکرد، وتیان ژنێکی چاکت هەڵبژاردووە، – تێدەگەیت–؟...

ئۆڵگا.

*ئــەم نامەیــە نەکراوەتــە فارســی و لــە ئینگلیزیەکەوە کراوەتە کوردی.(وەرگێڕ)

* * * * * *

**چیخۆف**

**3ی سێپتەمبەر – یالّتا**

رۆژباش ئۆڵگای ئازیزو چکۆڵەم! دوێنێ نامەم بۆ نەنووسیت، لەبەرئەوەی یەکەم میوانێکی زۆرم هەبوو، دووەمیش کاتم نەبوو، کە میوانەکان رۆیشتن کەوتمە کارکردن لەسەر چیرۆکی (قەشە)کەم.

سوپاسگوزارم ئازیز، دایکم نامەکەتی زۆر پیێ خۆشبوو، خوێندیەوەو پاشان دای بە من تا بە دەنگی بەرز بۆی بخوێنمەوە، بە چاکی باست دەکات، رەنگە لەبەرئەوە بێت کە ئەو کاتەی دەنووسیت هەستی ئیرەییت هەبێت، وەلیێ تۆ روونــاکبیر و دڵپاکیــت و ئــەو گریمانەیــەی لەبارەی ئیرەیی خۆتەوە لێی دەدوێیت لە پشت کەسایەتیتەوەیە. دەڵێیت "ماشا" هەرگیز تۆی قبوولّ نییە، ئەسڵەن ئەمە قسەیەکی بیێ مانایە! ئاسایی دەتەوێت زۆری پێوە بنێیت و ئەو باوەڕە چ بنەمایەکی نیە، لەوە دەترسم لە دواییدا بیکەیتە شەڕ لەگەڵیا. گوێ بگرە، ساڵێك ئۆقرە بگرە و هیچ مەڵێ، ئەوسا هەموو شتێکت بۆ ڕوون دەبێتەوە، هەر کەسێك هەرچیەکت پیێ دەڵێت، کاروبار چۆن دەڕوات، تۆ گوێ بە قسەی خەڵکی مەدە، دەستبەرداری ئازادی خۆت مەبە. بۆ ئەوانەی تازە هاوسەرن بەختەوەری پێش هەر شتێك بریتییە لە گوێ پیێ نەدان. چیت پیێ دەڵێم گوێم لیێ بگرە ئازیزترین ئازیزم و لەم بارەیەوە ئاقڵبە.

هەر ئەوەندەی پێم بڵێی من دێم، بەلاَم نەك لە پێش 15ی سپتامبەردا، با بە ئارەزووی تۆ بێت. بەلاَم پیێ دەچێت من ئارامم لەبەر هەڵگیرابێت، تاوەکو دیسامبەر ئەوەندەت لەگەڵدا دەبم کە خۆت دەرم بکەیت.

چاکە ئەڵمانیە چکۆلأنەکەم، نمایشنامەکەی "نمیروڤیچ"م بۆ بنێرە، لەگەڵ خۆمدا دەیبەم، بە وردی دەیخوێنمەوە.

جل و بەرگی زۆر لەگەڵ خۆمدا ناهێنم، ئەوانی تری لە مۆسکۆ دەکڕم، دەرپێیەکی گەرمو پاڵتاوێك، بەلأم پەتوویەك و گالوشەکانم دەهێنم، (پاڵتاوە کۆنەکەم لەبەردەکەم و یەك ڕێ بەسووکەڵەیی دێم).

کۆمەڵێك بەرگم بۆ خۆم و ژنەکەم داوە بە کرد، ژنەکەم جەربەزەیە، ناچارم ژیانی بۆ خۆش بکەم، دوێنێ قژم بە ئالکهول شت.

ئازیزی دێرینم ماچ دەکەم، خوات لەگەڵ، بەم زوانە یەکدی دەبینین، بنووسە، بنووسە، دڵەکەم، بنووسە! بێجگە لە تۆ هەرگیز ژنێکی ترم خۆش ناوێت.

تەندروست و شادیت

ئانتۆنی مێردت

* * * * * *

کنیپەر

4ی سێپتەمبەر - مۆسکۆ

دیسانەوە شەو نامەم بۆ نەنووسیت ئازیزم چونکە "ماشا" گەیشت، هەموو ڕۆژەکە حاڵەتێکی نامۆم هەبوو سەرم پڕ بوو لە شتی بێ مانا.

لە سەعات 9ی بەیانیەوە تا 1ی دوای نیوەڕۆ لە وێزگە چاوەڕێی "ماشا" بووم، چونکە ژنێکی ناسیاوم لێی پرسیم چاوەڕوانی کێم و پاشان وتی "ماشا" بە قەتاری تیژڕەو دێت و زۆر دوادەکەوێت (...) چووین بۆ ماڵەوە، "ماشا" خانوەکەی زۆر پێ ناخۆشبوو، ئاپارتمانێکی گونجاو بە 1000 ڕۆبڵ کەمتر بە کرێی نادەن. من وام بیرکردەوە کە وا چاکە دەست بگرینەوە و وا بژین کە ناچار نەبین زیادە خەرجی بکەین. ئێستا زۆر لەوە نیگەرانم کە تۆ لات باش نەبێت و بە ڕاستیش لەوە پەشیمانم کە بە دوای ئاپارتماندا گەڕاوم. من هەرگیز ئەزموونی ئەم شتانەم نیە و ئەمەیش زۆر بێتاقەتی کردووم، ئەگەر تۆ پەسەندی نەکەیت دیدەینە دواوەو ژوور دەگرین. ئەمە چاکترین کارە.

ئەمڕۆ "ماشا" ماڵ دەگوێزێتەوەو سبەی من دەڕۆم، هیوادارم ڕۆژی دواتر کەم تا زۆرێك بارمان ئاسایی بێتەوە "ماشا" چاوەڕێی منە، ئادیو، ماچێکی گەورەی دلۆڤانەی من! سوپاس بۆ نامەکەت، زۆر سوپاس، ماچێکی گەورە.

تووتکەکەت.

* * * * * *

چیخۆف

5ی سێپتەمبەر - یاڵتا

تووتەڵەی ئازیز و چکۆلەم، ئەمڕۆ نامەی تۆم پێ نەگەیشتووەو نامەکەی دوێنێیشت کورت و تووڕە بوو، بۆ؟ سێ ڕۆژە حاڵم هێندە باش نیە، بڕبڕەی پشتم دێشێت، دەستم دێشێت و ورەم خراپ نیە، بەلأم هێشتا بە ئومێدەوە تەماشای ئایندە دەکەم، تەنانەت ئەمڕۆ دوو میوانی نیوەڕۆم هەیە (...)

مێردت، ئا. چیخۆف

* * * * * *

چیخۆف

6ی سێپتەمبەر - یاڵتا

دڵداری ئازیزم، ئەگەرچی تا ئێستا هەموو

شـتێك ترسـناكە بـەڵام ئـەمڕۆ باشـترم، رۆژی پانزە یان حەڤدەیـەم دێم بۆ مۆسكۆ، ئەمە دوا بڕیارە (...)

ئانتۆنیۆكەت.

* * * * * *

كنیپەر

7ی سێپتەمبەر

موسكۆ – تەلگورام

هەواكـەی هاوینەیـەو ئاپارتمـان ئامادەیـە، زوو وەرە، تەلگورام بكە، ماچێكی زۆر.

* * * * * *

چیخۆف

7ی سێپتەمبەر - یاڵتا

مـن رۆژی 17 سـپتامبەر دەگەمـە ئـەوێ، رۆژی پـانزە "یاڵتـا" بەجێـدەهێڵم، بڕیـارە و بڕاوەتـەوە. تـەلگورافێكت بـۆ دەكـەم و تـەنیا دەنووسـم "دووشـەممە" مانـای وایـە بـەیانیی دووشـەممە دەگەمـە مۆسـكۆ. ئـەمڕۆ زیاتر هەست بە تەندروستی دەكەم و ئەگەر ئەم كۆكینـە نەبوایـە كـە دەبـوا نـەمێنێت حـاڵم چاكتر دەبوو.

لـە بـارەی ئاپارتمانەكـەوە نامەیـەكی نائومێدانەت نووسیبوو پێم گەیشت، نازانم بۆ ئەمەندە خۆت سەغڵەت دەكەیت، پێ دەچێت ئاپارتمانەكـە بـاش بێـت و ئەگـەر كـەمێك بچووكیش بێت چ كێشەیەكی نیە.

ئانتۆنیۆكەت.

خۆت بێ حەوسەڵە مەكە ئازیزترینم، چی روودەدات مەشـڵەژێ، وەكـوو دەڵـێن هـەموو شتێك چاكتر دەبێت، بە راستیی هەموو شتێك.

كە رۆژی دووشەممە گەیشتمە ئەوێ راست دەچمە حەمام و پاشان هەموو رۆژەكە لە ماڵـەوە دەبەمە سەر، رۆژی سێ شەممە تۆ كوێت بوێت من دێم.

هێشتا ناوی ئەو خانوەم لانیە كە تۆ بۆی دەگوێزیتەوە، ناونیشانم لا نیە.

* * * * * *

كنیپەر

9ی سێپتەمبەر

مۆسكۆ – تەلگورام

باسی تەندروستی خۆتم بۆ بنووسە، رۆژی هاتنت، نامە نانێرم، چاوەڕێتم "مەجەرستانی"

* * * * * *

چیخۆف

9ی سێپتەمبەر - یاڵتا

نـازانم بـۆ دوو رۆژە نامـەت نییـە؟ بـۆ ناونیشانی ماڵە تازەكەم نادەیتێ؟ نووسیوتە كە دەتـەوێت بگوێزیتـەوە بـۆ "سنێری دونوكا"[(1)] بەڵام نازانم بۆ كام خانوو.

شـەممەی پـانزەی مـانگ دەجـووڵێم، بلیـتم هەیـە، دووشـەممەی حەڤـدەی مـانگ دەگـەم، تەندروستیم تەواو باشە.

ئانتۆنیۆكەت.

* * * * * *

چیخۆف

9ی سێپتەمبەر

یاڵتا – تەلگورام

تەندروستم، دووشەممە دەكەومەڕێ.

* * * * * *

**چیخۆف**

**10ی سێپتەمبەر - یاڵتا**

دەمێکە نامەت نیە، 5 ڕۆژم ماوە ڕێ بکەوم، واتا 5 ڕۆژ بێ نامە، هێشتا ناونیشانەکەتم نەدیوە، بۆیە بەناونیشانی کۆڵانی "لیونوڤسکی"[2] نامەکانم دەنووسم. چ هەواڵێك نییە، کەم و زۆر تەندروستم (...)

**ئانتەکەت.**

* * * * * *

**کنیپەر**

**10ی سێپتەمبەر - مۆسکۆ**

ئانتۆنی ئازیزترینم، وامزانی پێویستت بە نووسین نیە، وامزانی بەتەواوی وەڵامی تەلگورافەکەمم وەرگرتووە "من دێم" و کەچی دوای ئەوە هەفتەیەکە من چاوەڕێم، بۆ، بۆ، بۆ دواکەوتیت؟ هیچت نەنوسیوە، نەخۆشیت؟ بەلآم ئەمڕۆ بیستم کە تەندروستیت چاکترە، گەلێك لەوە نیگەران بووم کە دەمێکە نامەی منت پێ نەگەیشتووە، پێنج ڕۆژە من نامەم نەنووسیوە، وام بە بیردا هات کە لە "یالتا" نامەکەمت بە دەست ناگات، بێ سنوور بیرت دەکەم ئازیزترینم، نائومێد و بێزارم، حەزناکەم کەس ببینم، هەمووم لەبەرچاو بێزراوە، نازانم چییان پێ بڵێم.

دوێنێ ساڵیادی لەدایك بوونم بوو، بەیانیەکەی کردم بە هەرا، شەویش هەروا، ئەگەر ئەوانم لە دەور نەبوونایە هەموو ڕۆژەکە هەر لە هەراو زەنادا بووم. گشت خێزانەکە لێرە کۆبوونەوە و کێك و شتی سووکەڵەیان خوارد، پاشان بۆ نیوەڕۆخۆری چووینە دەرەوە (...) ماڵەکەمان گەلێك هێورەو من دڵنیام تۆ پێت خۆش دەبێت، ژوورەکان بچووکن بەلآم زۆر گەرم و ئارامن، ژووری خوێندنەوە زۆر جوانە و من بە درێژایی ڕۆژ لە خەونی ئەو چرکەساتانەدام کە لەم ژوورەدا بەسەری دەبەین، بێ تۆ من بوونم نییە، ئەمساڵ گەلێك دژوار دەبێت وەلێ دوایی هەموو شتێك دەگۆڕێت، کاری شانۆ ماندوو بوون و بێ مانایە. تاڕادەیەك حەزم لە شانۆ نەماوە (...)

**تووتکەکەت.**

* * * * * *

**کنیپەر**

**10ی سێپتەمبەر**

**مۆسکۆ – شەو**

دڵداری ئازیزم، دیسانەوە بۆت دەنووسم بۆ ئەوەی تا دوا ڕۆژ نامەت لە هاوسەرەکەتەوە پێ بگات.

ئازیزم کەی سەرمات بوو؟ کەواتە هەقم بوو ئەم ڕۆژانە لە دڵەڕاوکێدا بم، بێگومان دەڵێیت "نەنەپیرە" باشە بیڵێ، میوان بێزاریان کردوویت؟ دیسانەوە دەتەوێت بەشێکی بوونی خۆت ببەخشیتە خەڵکی بێ کارە؟ گەر بێیتە مۆسکۆیش هەروا دەبێت؟ ئەسڵەن پێم خۆش نیە. چەند چرکەیەك لەگەڵ مندا دەبیت و دیسانەوە دەچیتەوە لای میوانی بێزارکەر، بەلآم تۆ زوو وەرە! ناتوانیت زووتر بێیت؟ من وەك ئەڵمانیەکی ڕاست قسە دەکەم، تۆ بڕیاری ڕۆژی پانزەهەمت داوەو ئیتر پرسیار و وەڵامی ناوێت کە تا پانزە هەقی مانەوەت لەوێ هەیە، مەگەر خۆت بتەوێت نەیەیت، تەنیا دوو بیانوو شیاوی قبووڵ کردنە، تەندروستی و کارکردن و هیچی دی.

بڕیــاره کــه هاتیــت دارکــاریم بکــەیت؟ خۆشحاڵم، زۆر خۆشحاڵم (...) ئێمه دەچین بۆ "رازوموسکی"[3] لەم کاتەی وەرزی ساڵدا زۆر جوانه، من له رۆژی هەشتا لەگەڵ "ماشا"دا چووم بۆ ئەوێ و سەرسام بووم، بڕوام بەو هەموو جوانییه نەدەکرد، نائاسایی ئارام و جوان و شکۆدار بوو، زۆریش خەم هێن بوو، بێدەنگیەکەی تەنیا کەوتنی گەڵاکان دەیشکاندو من ترسم لێ دەنیشت، ئاه ئانتۆن خۆزگا بمتوانیایه تاریفی ئەو هەموو جوانییەم بۆ بکردیتایه، تەنیا ئەوەم له یاده که دڵم کەوته ترپه ترپ و فرمێسک له چاوم زا، له کەنار ئاوەکەدا دانیشتم "ماشا" شتی دەنووسی و من بێدەنگ دانیشتبووم و بیرم دەکردەوه، بەهار بەو هەموو رەندی و ژیانەوه که هەیەتی هەرگیز ئەوەندە ئەفسووناوی نابێت. ئاه زوو وەره، حەز دەکەم لێره لەگەڵ تۆدا بم، تۆ هەرگیز باس له هەستی خۆت ناکەیت هەرچەند که من له هەر گەردیلەیەکی بوونتا لەو هەسته دەگەم (...)

به هێوریی بنوو (...) ماچت دەکەم، ماچت دەکەم و چاوەڕێتم، چاوەڕێتم.

تووتکەکەت

* * * * * *

**چیخۆف**

**15ی سێپتەمبەر**

**سڤاستۆل – تەلگوراف**

**دووشەممه. ئانتونیو.**

چیخۆف تا 26ی ئۆکتۆبەر له مۆسکۆ مایەوه. له پرۆڤەی "سێ خوشکەکه"دا ئامادە دەبوو نمایشێکیشی بینی. بۆ هاوڕێیەکی خۆی نووسیبوو که نمایشەکه له دەقه ئەسڵیەکه چاکتر بووه، پاشان چوو بۆ "تولا" و لەوێوه گەڕایەوه بۆ "یاڵتا"

* * * * * *

**كنیپەر**

**26ی ئۆکتۆبەر**

**مۆسکۆ – شەو**

نازدارترینم، ئێستا له کوێیت؟ دەتوانم وێنای ئەوه بکەم که له واگۆنێکی رەنگ شینی ئاوێنەداردا دانیشتوویت، به ڕوویەکی میهرەبان و ئارام و نیگایەکی ناسك و بزەیەکی ماتەوه که من زۆرم حەز لێیەتی، تازه له نمایشی چوارەم پەردە بوومەوه، که له پاڵ ستوونەکەدا دانیشتم و گوێم له مۆسیقاکه گرت نەمتوانی جڵەوی فرمێسکەکانم بگرم و تۆ له بەرانبەرمەوه دەرکەوتیت، به ڕاستیی نازانم چۆن توانیم دوا ڕستەکانم بڵێم، که پەردە دادرایەوه زۆر گریام و بردمیانه شوێنی خۆ گۆڕین و ئیدی نەمتوانی له دەستخۆشی لێ کردنی بینەراندا دەربکەوم، نەمتوانی خۆم بگرم.

هەموویان سەریان لێ شێواو گەوجانه ناردیان به دوای پزیشکا کەهەڵبەته من نەمبینی. ئێستا له ماڵەوەم و ئانتۆنی ئازیزمی لێ نیه، ماڵێکی رێك و پاکژ بەڵام بێزارکەر "ماشا"یش لەماڵەوه نیه، چووەته دەرەوه، تەختی خەوەکەتم چاك نەکرد، نەمتوانی، دەمەوێت وا بزانم که هێشتا لەگەڵمایت، هەموو لایەك کرە (...)

دەستم به پاك کردنەوەی ژوورەکان کرد، له هەلومەرجی وادا چاکتر وایه بەردەوام خۆت به ئەنجامدانی شتێکەوه سەرقاڵ بکەیت (...)

سبەینێ دوای پرۆڤەی "کریمەر"[(4)] نامەت بۆ دەنووسم.

تونکەکەت

* * * * * *

کنیپەر

27ی ئۆکتۆبەر

2 بەیانی- مۆسکۆ

بەیانیت باش ئازیزم، سەفەرکەری ئازیزا! زۆر شتم بۆ وتن پێیە و نازانم لە کوێوە دەست پێبکەم (...)

ڕەنگە ئەم قسەیە گەمژانە بێت بەڵام پێم بڵێ بزانم ئانتۆنەکەم تۆ لە کوێیت؟ هێشتا ناتوانم بڕوا بە خۆم بێنم کە لێرە نیت..

"کریمەر" لەسەر شانۆیە، پێ ناچێت زۆر سەرکەوتوو بووبێت. ڕەفتاری بینەران زۆر ناشیرین بوو، دەکۆکین و کەپویان پاک دەکردەوە، کردبوویانە ژاوەژاو، پێم وایە لە پەردەی دووەمدا کە نواندنی باوک و کوڕەکەیە زیاتر سەرنجی ڕاکێشان "ستانسلافسکی"یان بانگ کردە سەر شانۆ (...) بیستم دوای پەردەی دووەم زۆر ئاگای لێ نەما، نەچووم بیبینم، بینەران خۆشیان لە "لیلینا" و "موسکوین" هاتبوو، بە ڕاستیی ناتوانم هەموو شتەکان بێنمەوە بەرزەینم، سبەینێ بۆت دەنووسم، لە دوێنێوە شەکەتم و بیرم پەرش و بڵاوە (...).

"نمیرۆڤیچ" لە نمایشنامەی "لە خەوما"دا ڕۆڵی "جولیا"ی بۆ پێشنیاز کردوم و بارێکی ناجۆری بۆ هێناومەتە پێش. "لیلینا" دەخوازێت پرۆڤەکان هەفتەیەك دوابخات بەڵام بڕیارە سبەینێ دەست پێ بکەین. ئاسایی من پێشنیازەکەیم قبوول نەکرد و ئەویش وتی کەواتە دەبێت "شوارتز" ڕۆڵەکە ببینێت (...) پێیشی وتم ئامادەیە کاستێکم بۆ دابنێت بۆئەوەی ماندوونەبم، زۆر فێڵزانە وانیە؟ چی بکەم؟ سەرسەختی کردن و بێدەنگیم زۆر پێ باش نیە، بەڵام ڕاستت دەوێت ئەو ڕۆڵە بێگیانە حەز لێ ناکەم. بەلامەوە ڕۆڵێکی بێ مانا و بێزراوە، تۆ دەڵێی چی؟ بنووسە ئازیزم. پێم خۆشە کە دەست بەتاڵم، بەڵام ئێستا بڕیاری کارێکم بۆ دراوە کە نە ڕام دەکێشێت و نە ڕازیم دەکات (...)

تونکەکەت.

* * * * * *

چیخۆف

28ی ئۆکتۆبەر

سڤاستۆپۆڵ - یەك شەممە

دەریا لە چەپۆکانداية، بیستم بەلەمگەلێکی گواستنەوەی پۆست بە یاڵتادا تێدەپەڕن، دەڕۆم بۆ پۆستەخانە، هەوا ساردە (...)

ئانتەکەت.

لە چاوەڕوانی نامەتدام لە "یاڵتا" هەموو شتێکم بۆ بنووسە.

* * * * * *

کنیپەر

28ی ئۆکتۆبەر

مۆسکۆ – شەو

عەشقە زێڕینەکەم – دەبێت ئێستا گەیشتبیتە ماڵەوە، پێ دەچێت باسی مۆسکۆ و ئێمە بۆ دایکت بکەیت. باشە حاڵت چۆنە؟ چاکیت؟ خراپیت؟ ڕەنگە هێشتا هەست بە ناڕەحەتی بکەیت، ژوورەکان بۆنی

تەنیاییان لێ دێت. لە نارێك و پێكی ئازیز و شاعیرانەكەت باسێك نییە، ڕۆژنامەكان پەرش و بڵاونین (...)

ئەمڕۆ زۆر خرۆشاوم، لەگەڵ ماڵەوەماندا نانی نیوەڕۆمان خوارد و قسەی بێ سەرەو بەرەمان كرد و من هێند پێكەنیم كە ماسوولكەكانی دەم و چاوم دێشێت، بە تەواوی لە بیرم چووبوەوە كە ژنم بەڵكوو كچۆڵەیەكم (...)

ئەم بەیانیە حەزم نەدەكرد لە خەو هەستم، شەكەت بووم (...) سەعات 12 چووم بۆ شانۆ كە كاتی پرۆڤە بوو، دەبوو لەگەڵ "نمیروڤیچ"دا لەبارەی چەند شتێكەوە قسە بكەم، بەلاّم پرۆڤە نەكرا، چونكە نیوەی هونەرمەندەكان لەوێ نەبوون و "نمیروڤیچ"یش لەوێ نەبوو (...)

لە شانۆدا هەموو دەربارەی سەرنەكەوتن دەپەیڤن و لەوە دەچێت "سەرۆك"[5] تەواو خۆی لەدەست دابێت. هەموو هونەرمەندەكان لاسایی كۆكینەكەی "ستانسلاڤسكی" دەكەنەوە لە ڕۆڵی "كریمەر"داو نوكتەی لەسەر دەكەن، بەلاّم نەك بە خراپی. ڕۆژنامەكان "مسكوین" و "لیلینا"یان بەرزنرخاندووە. سبەینێ ڕەخنەكان دەخوێنمەوە (...)

تووتكەكەت.

* * * * * *

چیخۆف

29ی ئۆكتۆبەر - یاڵتا

هاوسەری ئازیزم، هۆشمەند و زرنگەكەم، ڕۆژباش. لە ماڵەوەم و هەستێكی زۆر نامۆم هەیە (...) سەفەرێكی باشبوو، كەشتییەك دەچوو بۆ "یاڵتا" و ئیدی پێویستی نەدەكرد لە "سڤاستۆپۆڵ" گالێسكە بگرم، لەگەڵ ئەوەیشدا كە سەرما بوو سەفەرەكەیش كەمی خایاند (...)بنووسە.

ئانتۆنەكەت.

* * * * * *

كنیپەر

30ی ئۆكتۆبەر

مۆسكۆ – 8 بەیانی

ئازیزترینم، سەعات 8ی بەیانییە و من هێشتا نەچوومەتە ناو جێگا. بە جلی خەوەوە نامەت بۆ دەنووسم، بۆ هیچت لە بارەی سەفەرەكەتەوە نەنووسیوە؟ تەنیا نامەیەكت لە "تولا"وە گەیشتووە، پێ دەچێت نامەی "سڤاستۆپۆڵ" بەیانی بەدەستم بگات (...) دەرەوە زستانە، بەفرێكی زۆر باریوە هەرچەندە لە تواندنەوەدایە، بەبێ تۆ هەموو شتێك خاڵی و بێتامە. (...)

دوێنێ بۆ پرۆڤە چووم "سانین" بەرپرسی نمایشنامەكەیە، "نمیروڤیچ" لە شانۆ نیە. من لەگەڵ ئەوەی كە لە ناوەوەی خۆمدا حەزی لێ ناكەم و زۆریش بێزارم بەلاّم ڕۆڵەكەم قبووڵ كرد.

"سانین" لەناو ئاپوورەی شانۆكەدایە، مەبەستم كۆرسی خوێندكارانە لە پەردەی یەكەمدا (...) نازانم "كرێمەر" دوێنێ چۆن بوو (...) وای بۆ دەچم كە "مسكوین" ئەو ستایشەی شایانیەتی پێی نەدراوە. رات لەسەر ئەو ڕەخنانە چییە كە خوێندوتنەتەوە؟ (...)

وێنەكەت لەسەر مێزەكەمە بەتەنیشت وێنەی ماڵەكەی "یاڵتا"تەوە، سەیریان دەكەم و بیردەكەمەوەو بەرەو لات دێم، بۆ ژوورەكەت، دەتوانم وێنای بكەم "ئازیزەكەم" چۆن ئەو كەسەی هی منە بە دەوری ژوورەكەدا دەگەڕێت،

لە پشت مێزەکەیەوە دادەنیشێت یان لەسەر کورسیەکەی خۆی بیر دەکاتەوە. بنووسە و پێم بڵێ کە حاڵت باشە و هەموو شتێك ڕێك و پێکە، بە ڕاشکاوی بۆم بنووسە چۆن نان دەخۆیت. لە کریسمسدا چەند خەم دام دەگرێت کە دەبینم ئێوە هەموو پێکەوەن. فەرامۆشم مەکە ئانتۆن ماچی گەورە، پەرۆشی تەماشاکردنی چاوو روخسارتم، لەبارەی خۆتەوە بنووسە، ماچی زۆر.

تووتکەکەت

* * * * * *

**کنیپەر**

**31ی ئۆکتۆبەر**

**مۆسکۆ – سەرلەبەیانی**

ئەم بەیانیە هیچ پێم خۆش نەبوو لە جێگاکەم بێمە دەرەوە، حەزم دەکرد هەموو رۆژەکە رابکشێم و خەون ببینم.

بە نائومێدیەوە چاوەڕوانی نامەیەکتم، دەمەوێت بزانم سەفەرەکەت چۆن بووەو تەندروستیت لە چیدایە (...) سەفەری دەریا چۆن بوو، ئاوو هەوا ئێستا چۆنە، گەرم بوو؟ خێزانەکەت چۆن بینی؟ ئایا دەقت بە ژیانی رۆژانەی "یاڵتا" وە گرتۆتەوە؟ بنووسە و هەموو شتێکم پێ بڵێ، خەمباریت یان بەوە خۆشحاڵیت کە لە یەکتر دوورکەوتووینەتەوە؟

لێرە هەموو شتێك زۆر بە سستی دەڕوات، دوێنێ و ئەمڕۆ بەیانی و ئێوارە لە شانۆ بووم، کتێبێکی ئینگلیزیم لەگەڵ خۆمدا بۆ دانیشتنی پرۆڤەکان برد و خوێندمەوە، پاشان رۆژنامەکانم خوێندەوە، کاری زۆرمان لەسەر شانۆ نیە، "سانین" هێشتا سەرگەرمی کۆرسەکەیە. دەست کردن بەم نمایشنامەیە تا قیامەت درێژە دەکێشێت، دوێنێ تەلگورامێکت بۆ هات (خەرجیەکەیشی درابوو)[6] من کردمەوە بۆئەوەی ئەگەر شتێکی زۆر پەلەی تێدا بێت یەکسەر تەلگورامت بۆ بکەم، داوای مۆڵەتیان لێ کردبوویت کە بۆ سوودی گشتی "سێ خوشکەکە" لە پتروزبورگ نمایش بکەن، من داوام لە "نمیروڤیچ" کرد وەڵامیان بداتەوە، کارێکی باشم کرد؟ تۆ پێت ناخۆش نیە کە خۆت بڕیارت نەداوە – وانیە؟ وا بزانم نمایشنامەکە ئەوەندەی هی تۆیە هی ئێمەیشە وانیە؟ بڕیارە لیستی بەرنامەکانی شانۆت بۆ بنێرن.

تووتکەکەت

* * * * * *

**چیخۆف**

**1ی نۆڤەمبەر - یاڵتا**

دەمزانی لە نمایشنامەکەی "نمیروڤیچ"دا بەشداری دەکەیت، سەرزەنشتت ناکەم تەنیا دەمەوێت وەڵامی نامەکەت بدەمەوە. لە نووسینی رۆژنامەکانەوە وا دەردەکەوێت کە "کریمەر" ئەو سەرکەوتنەی نەبووە کە من چاوەڕێم دەکرد. ئەمەم زۆر پێ ناخۆشە. بینەرانی ئێمە زیاتر گاڵتەجاڕیان گەرەکە نەك نمایشنامە.

لە بارەی نائومێدی و دڵساردی "ستانسلاڤسکی"یەوە کە باست کردبوو بەلامەوە گەمژەیی و ناخۆشە، بەخۆی نازانێت کە کارێکی باشی کردووە.

ئانتۆنەکەت

"ئۆڵگا" لەوە نیگەران بوو کە "ماشا" حەزی لە خانوە تازەکە نیە و هەوڵی گرتنی جێگایەکی تری دا.

* * * * * *

کنیپەر

1ی نۆڤەمبەر

مۆسکۆ – بەیانی

نزیکەی هەفتەیەکە رۆیشتوویت و من تەنیا دوو کارتم لە تۆوە پێگەیشتووە. لە دوێنێوە بە تاسەوە چاوم لە دەرەوەی پەنجەرەکە بڕیوە ئاخۆ پۆستەچی کەی دەگات. کە لە پرۆڤە گەڕامەوە گشت مێزەکانم پشکنی بەڵکوو نامەیەکی تۆیان تیا بێت. وەلێ هیچم وەگیر نەکەوت! ئاخر سەروەختێك کە لە "مرۆڤە تەنیاکان" گەڕامەوە کارتێکم بینی کە لە "سڤاستوپۆڵ"ەوە بۆت ناردبووم. ئازیزم بێگومان لە رێگای گەڕانەوەتدا بۆ "یاڵتا" کەش و هەوا زۆر سارد بووە، کوێستانەکان گەلێك ساردبوون مەگەرنا؟ دەبێت لە چ سەفەرێکی ناخۆشدا بووبیت! تەنیا بوویت؟ خواردنت لەگەڵ خۆتدا هەڵگرتبوو؟ (...)

لەگەڵ "ماشا"دا دەچم بۆ بینینی ئاپارتمانەکە، دوێنێ "ڤیشنیڤسکی" بە دوایدا ناردم تا پێم بڵێت لە پاڵ خانووەکەی ئەواندا خانووەیەك هەیە، لەسەر شەقامەو 5 ژووری ڕوناك و گەرمەو کارەبایان تیایە، کرێکەی 1000 یان 1100 رۆبڵە، بەڵکو ژوورێك لەوێ بگرین.

"نمیروڤیچ" خوازیاری ئەوەیە پێت بڵێم هەر کە کورتە چیرۆکێکت نووسی خێرا بۆی بنێریت. دەیەوێت دوانیوەڕۆیەك بۆ خوێندکارە دەست کورتەکان ساز بکات کە "شالیاپین" و "سوبینوف" گۆرانی تیا بڵێن و ئەویش چیرۆکەکەی تۆی تیا بخوێنێتەوە، نرخی بلیت 10 رۆبڵ دەبێت. بیرێکی باشە، ئەگەر قایلیت بینووسە (...).

دوێنێ لە کاتی پرۆڤەدا لە ژووری خۆگۆڕین دانیشتم و بیرم لە تۆ کردەوە ئازیزم. زۆر پێم دژوار بوو کە بەیانی لەناو جێگا بێمە دەرێ، ئارەزووی ژیان و خۆ گۆڕینم نەبوو.

تا سبەی، تەندروست بیت ئازیزم، نامەم بۆ بنووسە، ئایا هەموو نامەکانمت پێدەگات؟ وا بزانم ئەمە شەشەمین نامەیە کەبۆت دەنووسم راستە؟

ماچی زۆر بۆ شاعیرەکەم، هەزاران ماچ.

چیخۆف هانی گۆرکی دەدات کە بۆ شانۆی هونەری نمایشنامە بنووسێت، ئەنجامەکەی گۆرکی دوو نمایشنامەی بەناوی "مرۆڤە سووکەکان" و " لە قووڵاییدا"ی نووسی.

* * * * * *

چیخۆف

2ی نۆڤەمبەر - یاڵتا

رۆژباش تووتەڵە ئازیزەکەم! لە نامەکەتدا پرسیوتە کەش و هەوا چۆنە؟ (...) خۆش و گەرمە بەڵام تەماویە (...) باخەکە هەر بۆ تەماشاکردنەو گوڵە داودیەکان شکۆفەیان کردووە، گوڵە باخەکانیش. بە کورتی پێت بڵێم ژیان لە خەون دەچێت، دوێنێ و ئەمڕۆم بە هەڵەچنی گوزەراند کە زۆر لێی بێزارم، وەلێ هەموویم تەواو کرد، ئیتر هیچم بۆ ناهێنن.

تەندروستیم باشە، هەرچەندە دوێنێ و پێرێ و لە ڕاستیدا لەو رۆژەوە کە گەڕاومەتەوە تەندروستیم تەواو باش نەبووەو دوێنێ ناچار بووم کەمێك ڕۆن گەرچەك بخۆم، بەڵام پێم خۆشە تۆ حاڵت باشە و لەسەر خۆتی، ئەمە شادم دەکات، زۆرم پێ باشە نیوە ئەڵمانیەکی

چكۆڵەت هەبێت كە بتوانێت سەرت گەرم بكات و ژیانت پڕ بكاتەوە، دەبێت ئەو كارە هەر بكەیت. تۆ چی دەڵێیت؟ بەم زوانە "گۆركی" دێت بۆ مۆسكۆ. بۆی نووسیوم كە ڕۆژی 10 نۆڤەمبەر "نیژنی"[7] (نۆڤگرود) بەجێدێڵێت، بەڵێنی داوە لە شانۆگەریی "مرۆڤە چكۆڵەكان"دا ڕۆڵی تۆ بگۆڕێت، لە ڕاستیدا زیاتر پەرەی بداتێ. بە گشتی بەڵێنی زۆری داوە، من بەوە خۆشحاڵم چونكە ئەگەر وا بێت نمایشنامەكە چاكتر دەبێت (...)

ئۆلیا، هاوسەرەكەم پیرۆزبایییم لێ بكە، قژی سەرم چاك كرد!!! دوێنێ بۆ یەكەمین جار لەو ڕۆژەوە كە هاتوومەتەوە پێڵاوەكانم پاك كردەوە. هێشتا جلەكانم پاك نین بەڵام هەموو ڕۆژێك كراس دەگۆڕم و سەرم ماساژ دەكەم (...)

پۆستەری "خاڵ ڤانیا"ی پراگت بۆ دەنێرم (...) وەكو قەشەیەك دەژیم و تەنیا لە خەونی تۆدام. ڕاستە كە خۆشەویستی دەرخستن لە تەمەنی 40 ساڵیدا شەرمەزاریە بەڵام بە دەست خۆم نیە و دیسانەوە بە تۆ دەڵێم تووتەڵەكەم بە قووڵی و بێگەردیەكی تەواوەوە خۆشم دەوێیت. توند لە ئامێزت دەگرم.

تەندروست بیت، كامەران و شاد.

ئانتۆنەكەت.

* * * * * *

كنیپەر

2ی نۆڤەمبەر

مۆسكۆ – بەیانی

بەیانیت باش ئازیزترینم، تاقانەكەم! ئەمشەو هەمووی خەونم بە تۆوە دەبینی كە دەیانەوێت لە مۆسكۆ ڕەوانەت بكەن. خەڵكێكی زۆر بوون، قسەیان دەكرد، شیعریان دەخوێندەوە، كردبوویانە هەراوزەنا، تۆ بەرگێكی شینت لەبەردا بوو و لەسەر پلیكانەكان وەستابوویت و چاوت بچووك كردبوەوە.. هەموو دوێنێم لە چاوەڕوانیەكی بێ هوودەی نامەی تۆدا بەسەربردوو وردە وردە خەریكم نیگەران دەبم.

دوێنێ لەگەڵ "ڤیشنیڤسكی"دا چووم بۆ بینینی ئەو ئاپارتمانەی كە پێشنیازی دەكرد، بنمیچی ژوورەكانی زۆر بەرزن، گەرمیەكەی مەركەزیە. گڵۆپی كارەبا – پێنج ژوور – ە نان خواردنێكی گەورە و ژوورێك بۆ "ماشا" ژوورەكانی تر باریك و درێژن، پەنجەرەكانی گەلێك گەورەن، چینی خوارەوە بە چوار پلیكانە بۆی دەچیت، ئێمە ژوورێك دەگرین. كرێی ئاپارتمانەكە 1300 ڕۆبڵە بەڵام بە 1100 یان 1200 كە گەرم كردنەكەیش دەگرێتەوە دەیدەن. نازانم چی ڕوودەدات، چەندە بێزاركەرە، هێشتا بە دوای ئاپارتماندا دەگەڕێین، پرۆڤەكان ناجۆرو بێزاركەرن و بە ناخۆشی كاتم پێ بەسەردەبەن، "سانین" هاوار دەكات، دەقیرێنێت و دەستوورەكانی وەك چەكوش بوەشێنێت وایە. بڕیارە ئەمڕۆ لەبارەی جلەكانەوە قسە بكەین. بە "ستانسلافسكی" دەڵێم ڕۆڵی "جولیا" نابینم. "لیلینا" حەساوەتەوەو توانای پرۆڤەكردنی هەیە. ئەمڕۆ "سێ خوشكەكە" نمایش دەكەین "كریمەر" چاك بەرەو پێش دەچێت، لاوەكان و خوێندكاران پێیان خۆشە (...)

ئاخۆ بەم زوانە نامەی تۆم پێدەگات؟ ژیان بەبێ نامەی تۆ بۆش و بەتاڵە.

تووتكەكەت.

* * * * * *

کنیپەر

3ی نۆڤەمبەر

مۆسکۆ – بەیانی

*Bonjour,mon mari*[8] ، ماچ بارانێکی نامەکەت، نامەی ئازیز و پڕ لە میهرەبانیت دڵدارەکەم، بەختەوەرم سەفەرەکەت چاک و تەندروستیت باشە و خەمبارنیت، دڵتەنگ نیت، لە بیرت نەچێت من موڵکی تۆم، ژیان لێرە بۆ من خەفەتە، لەوە دەترسم ناچار بم لە سووچێکدا دابنیشم و دیق بکەم، دڵ و سەری ئەوەم نیە بڕۆم بۆ جێگایەك، لەم ڕۆژانەدا حەز دەکەم واز لە هەموو شتێك بهێنم و تەنیا بخوێنمەوە، مانەوە لە تەنیا شوێنێکدا وەڕزم دەکات، شانۆ وەڕزکەرە، کارێك نییە بیکەین، مەبەستم تەنیا خۆم نییە.

ئەمەی دەیڵێم ڕەنگە لای هەندێك سووك و بێ مانابێت، لەوانەیە، هەست دەکەم وەك هونەرمەندێك گەلێك بێ توانایيم تێدایە، پێم خۆشە ڕۆڵەکانی پێشووم ببینمەوە، لە قۆناغێکدام بڕوام بەوە نیە کە هونەرمەندیش بم، نواندنەکەم ترسناك و خاوە، من دەتوانم تەنیا ڕۆڵی هونەرمەندێکی واقیعی ببینم.

خۆشیت لە فەلسەفاندن نایەت وایە؟ بمبورە لەو قسە بێ مانایە[9]. لە شانۆ هەموو هەواڵت دەپرسن و سلاوت لێ دەکەن (...) ئێستا هەوای "یاڵتا" گەرمە؟ ئازیزم هەوڵ بدە هەموو ڕۆژێك پیاسە بکەیت تەنانەت ئەگەر کرا بە دەوری باخەکەدا بگەڕێ، کەمێك بجووڵێ. بۆ خۆت باشە، زۆر بخۆ، شیر دەخۆیتەوە؟ ماچی گەورە بۆ ئازیزەکەم.

ئۆلیاکەت.

* * * * * *

چیخۆف

4ی نۆڤەمبەر - یاڵتا

(...)هەوا باشە، ئارام و هێورە، هەتاوە، بەڵام زستانی مۆسکۆ لەمەیش چاکترە. بێ تۆ ژیان خەماویە، ناچارم نامەی زۆرت بۆ بنووسم (....) بڕیارە گۆرکی بێت، دوێنێ هاوڕێیەك ویستی ئاپارتمانێکی بۆ بگرێت و سەرنەکەوت. لەوە دەچێت لە شوێنێکدا نیشتەجێ بێت نزیك بە "گاسپرا"[10] کە تۆلستۆی لێیە. هێشتا دوکتۆر (سرێدین)م نەدیوە، نەچووم بۆ شار (...)

مێردەکەت!!!

* * * * * *

کنیپەر

5ی نۆڤەمبەر

مۆسکۆ – بەیانی

دوێنێ نامەم بۆ نەنووسیت ئازیزم چونکە دوای ئەنجومەنی ئەدەبی درەنگ لە خەو هەستام و ڕاست چووم بۆ پرۆڤە. "خاڵ ڤانیا"مان نمایش کرد(...)

کە نامەکەتم پێ گەیشت هێشتا لەناو جێگادا بووم، سوپاس ئازیزم، باوەڕم پێ بکە خۆشم دەوێیت، تۆ تاقەکەسی منیت. خوات لەگەڵ تا ئەمشەو.

تووتکەکەت

* * * * * *

کنیپەر

6ی نۆڤەمبەر (لە ڕۆژی چوارەمەوە دەستم پێ کردووە) مۆسکۆ

بەیانیت باش ئازیزترینم!

دوێــنێ نامــەت نــەبوو! هیــوادارم ئــەمڕۆ نامەیـەکت بگـات، ئەگەر ناتوانیت نامەی درێـژ بنووسـیت چـەند دێـڕێکم بـۆ ڕەشـەوە کـەو بـۆم بنێرە. کە نامەی تۆم پێدەگات گەلێك شاد دەبم.

ئازیزم، دوێنێ چووم‌ە دەرەوە بۆ ناو خەڵك‌و لەگـــەڵ خێزانـــی "لوژســـکی" پێکـــەوە نـــانی نیوەڕۆمان خوارد و پاشان چووین بۆ یانە، کە لە پرۆڤە گەڕامەوە دوکتۆر "ئوبۆلۆنسکی"[11] گەیـشت (...) بـۆ مەسـەلەی ئاپارتمانەکـە ئـەو هاوکاری چارەسـەرکردنیمان دەکات. تا مـانگی ئاب بە کارەباوە بـە 1100 ڕۆبڵ دەماندەنێ، تا دوو سـێ ڕۆژی تـر پێویـستە بڕیـاری خۆمـان بدەین (...)

ڕۆژی یەکشەممە چووم بۆ پرۆڤە و دەستمان بە پەردەی دووەم کرد "سانین" هاواری دەکـرد، تـووڕە دەبـوو، قـسەی بـێ سـەروبەرەی دەکـرد (...) "نمیروڤـیچ" لەگـەڵ ژنەکەیـدا سـەفەریان کـــردووە! ڕۆژی شـــەممە ڕۆشـــت (...) دوای پرۆڤـە، بەپەلـە نـانی نیـوەڕۆم لەگـەڵ دایکمـا خـوارد و چووم بۆ نمایـشکردنی "خـاڵ ڤانیـا" دوو پەردەی یەکەم نواندنم زۆر خراپ بوو، بەڵام لـە پـەردەی سـێیەمدا بـاش بـوو، (...) دوای نمـایش "ماشـا" هـات و شـەو تـا سـەعات 4ی بەیانی بەخواردنەوەوە بردمانە سەر (...)

ســـەعات 12 یـــەو دەبێـــت بەپەلـــە ئـــەم نامەیـە پۆسـت بکـەم، بۆئـەوەی تـۆ هـەموو ڕۆژێـك ئاگـات لـە هـەواڵی مـن بێـت ئـازیزم، زێڕەکەم.

**تووتەڵە هەمیشەییەکەت.**

کۆتـایی 1901 و سـەرەتای 1902 شـانۆی هونەریان چاك کرد، لە پێشدا باس لەوە کرابوو کـە تـەلاری تـازەی بـۆ دروسـت بکـەن، دەبـوو سـەرمایەداری کارەکـە بـە تایبـەتی لـە ئەستۆی "سـاراموروزۆف"ی هـاوڕێی "ستانسلاڤسکی" دا بێـــت کـــە پـــشکی ســـەرەکی تیادایـــە. "مـوروزۆف" لەگـەڵ پێـشنیازی "نمیروڤـیچ"دا نـــەبوو کـــە بـــەپێی پلانـــی تـــازە پێویـــستە ئەکتـەرەکان پـشکیان لـەو کـارەدا هـەبێت. ئەمـە بوو بەهۆی ناکۆکی لەناو شانۆدا و لە ئەنجامدا هەنـــدێك لـــە ئەندامـــە ســـەرەکیەکانی وەك "مایرهۆڵـد" و "چـیخۆف" کـە لـە سـەرەتاوە بڕیاریانـدابوو بـە پـارە بەشـداری لـە سـەرمایە دانانـدا بکـەن وەك نـاڕەزایی دەربـڕین کـشانە دواوە. ئـەوە سـەرەتای نـاکۆکی تـازەی نێـوان "ستانسلاڤسکی" و "نمیروڤیچ" بوو کە کنیپـەر هۆشیارانە ئاگاداری بوو.

* * * * * *

**چیخۆف**

**6ی نۆڤەمبەر - یاڵتا**

باشـە ئـازیزم، دوێـنێ چـووم بـۆ دیـدەنیی "تۆلستۆی" لە ناو جێگادا بوو، تووشی هێدمە بوەو ئێستا لە حەسانەوەدایە، باری جەستەیی چاکترە هەرچـەندە هـەوا ئەوەنـدە گـەرم نیـە و زســـتانیش بـــەم دوا ڕۆژانـــەی ئۆکتۆبـــەرەوە خەریکـــە دەگـــات. تۆڵـــستۆی بـــە بینیـــنم شـادمان بـوو، منـیش ئـەمجارە بەتایبـەتی لـە دیدەنیەکـــە خۆشـــحاڵ بـــووم. هەرچـــەندە تەمـــەنێکی بەســـەربردووەو دەشـــێت نـــاوی پیری لـێ بنێیت بـەڵام گوێـت لـێ دەگرێـت و بـە جـوانی وەڵامـت دەداتـەوە. "کریمـەر"ی خـۆش دەوێت (...)

دەتانـەوێت شـانۆیەکی دی بسازێنن؟ کـەی؟ بـــۆم بنووســـە ژنـــی ئـــازیزم، هـــەموو شـــتێك وەرزکەرەو من وا هەست دەکەم بیست ساڵە ژنم هێنـــاوەو هـــەر لـــە ســـاڵی یەکەمـــەوە لـــە تـــۆ

جیابوومەتەوە. لە کانوونی دووەمدا دێم، خۆم دەپێچمەوەو لە ماڵ ناڕۆمە دەرێ (...)

ئانتۆنیۆکەت.

* * * * * *

کنیپەر

6ی نۆڤەمبەر

مۆسکۆ – عەسر

ئانتۆنی ئازیز، دانیشتم تا نامەیەکت بۆ بنووسم، هەست بە شەرمەزاری دەکەم، دەبوو من لای تۆ بوومایە، نەفرەتم لە خۆم کرد کە وازم لە شانۆ نەهێناوە. بەڕاست نازانم چیم بەسەر هاتووە، ئەمە تووڕەم دەکات. تەنانەت قینم لەوەیە کە تۆ لەوێ بە تەنیا لەخەم و ناخۆشیدا بیت و منیش لەباتی ئەوەی گوێ لە هەستی خۆم بگرم خۆم سەرقاڵی کاری بێ هوودە کردووە. چی ڕێم لێ دەگرێت؟ کەواتە من زۆر پێویستم بە نیوە ئەڵمانیەکی چکۆلانە هەیە! بۆ ئەم ڕستەیەتم: "نیوە ئەڵمانیەك بتوانێت سەرگەرمت بکات و ژیانت پڕ بکات" لە یادماوە؟ بۆچی ئەوەی تۆ دەیڵێیت ئەمەندە لای من روون و ئاشکرایە؟ من دەزانم چۆن بیر لە من دەکەیتەوە، بەڵام رەنگە وایش نەبێت. سەرم لێ شێواوە، لەگەڵ خۆمدا لە شەڕدام، دەمەوێت لە نێو ئەم پەرێشانیەدا وەك مرۆڤێك بێمە دەرەوە.

وا دەزانم زۆر بە پەراگەندەیی دەنووسم و تۆ لەمەبەستەکەم تێ ناگەیت. بەڵام هەوڵ بدە بە تەنیا وشەکان نەخوێنیتەوە.

چۆن ئەم زستانە بەسەر بەرم؟! ئانتۆن زۆرم بۆ بنووسە. پێم بڵێ خۆشم دەوێیت، ئەمە هەستێکی چاکم پێ دەبەخشێت، من کاتێك دەتوانم بژیم کە یەکێك خۆشی بوێم، بەم ئەنجامە گەیشتووم. من زۆر بێ توانام ئانتۆن! ئانتۆن!

ژیان چی بە ئێمە دەبەخشێت و چەند بە ئاسانی لە دەستی دەدەین، چەند ترسناکە کاتێك بەم ئەنجامە گەیشتم کە چ مرۆڤێکی بێ نرخم، ترسناکە!

## پەراوێزەکان:

*1-sniridonovska*

*2- Leonievsky*

*3-Razumousky*

*4-Kramer*

5- ناوێك بوو "ستانسلافسکی"یان پێ بانگ دەکرد.

6- ئەو تەلگورامانەی نێرەرەکە لەپێشدا کرێی وەڵامدانەوەکەی دەدا بۆ ئەوە بوو تەواو لە وەڵامدانەوەکە دڵنیابێت.

*7-Nizhni*

8- رۆژباش مێردەکەم

9-کنیپەر ئاماژە بەیەکەم پەردەی "سێ خوشکەکە" دەکات کە سولیونی دەڵێت"کە پیاوێ: دەفەلسەفێنێ بەرئەنجامەکەی فەلسەفاندن یان سەفسەتەیە، بەڵام کە ژنێك یان دوان دەست بە فەلسەفاندن دەکەن ئەنجامەکەی قسەی بێ سەروبەرەی رووتە"

*10-Gaspry*

*11-obolonski*

## سەرچاوە:

کتێبی دلبند عزیزترینم.

# وێستگەکانی سەردەم

- خوێندنەوەیەك بۆ كتێبی (ئیسلام: مێژوویەكی كورت )

كارێن ئارمسترۆنگ

لە ئینگلیزیەوە: عەزیز ڕەئووف

- كافكا لە كەناردا

لە عەرەبییەوە:. سەردەم

- كوخەكەی هایدگەر

لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد

- فەلسەفەی سیاسی

لۆك ڤێری و ئالان ڕینۆ

لە عەرەبییەوە: هەورامان وریا قانع

- لێگەڕێ منداڵیەكەت ڕابەریت بكات

خوزییە سارا ماگۆ لە "یادەوەرییە بچووكەكان"

لە عەرەبییەوە: ساكار رەئووف

- ژیاننامەو فیكری جۆن لۆك

ڕۆجێر ولهاوس

لە عەرەبییەوە: هەورامان وریا قانع

# خوێندنەوەیەك بۆ كتێبی ( ئیسلام : مێژوویەكی كورت )

كارێن ئارمسترۆنگ

لە ئینگلیزیەوە: عەزیز ڕەئووف

هیچ ئاینێك نیە لە دنیای مۆدێرندا بارتەقای ئاینی ئیسلام بە هەڵە بخوێندرێتەوە. تەفسیراتی زۆرینەی خۆرئاوا وەك بیروباوەڕێكی توندڕەو لە ئاینی ئیسلام دەڕوانن. خەڵك لە خۆرئاوا وا تەماشای ئاینی ئیسلام دەكات كە ئاینێكە بۆ چەوسانەوەی ژنان و شەڕی ناوخۆ و تیرۆریزم.

ئارم سترۆنگی نوسەر دەستی بۆ بابەتێكی زۆر هەستیار بردووە كە ئەویش قسەكردنە لەسەر ئاینێك كە بەنسبەت خۆرئاواوە گرنگی خۆی هەیە. نوسین لەبارەی ئاینێكی نێونەتەوەیی وەكو ئیسلام هەروا كارێكی سانا نیە. بەڵام بە ئەزموونی تاكەكەسی خۆی چ لەگەڵ موسوڵمانانی خۆرئاوا و چ بە خوێندنەوەی تەفسیرە ئاینیەكان نوسەر توانیویەتی زۆر سەركەوتووانە خوێندنەوە بۆ مێژووی ئیسلام بكات.

سەبجێكتی سەرەكی كتێبەكەی ئارم سترۆنگ بریتیە لە فەندەمێنتالیزم. دەركەوتەكانی فەندەمێنتالیزم لە جیهانی ئیسلامیدا تەوەری سەرەكی كتێبەكەی ئارم سترۆنگە. ئەو لەم كتێبەدا پێمان دەڵێت ئەوەی ئاینی ئیسلام وەك ئاینێكی خوێناوی وێنا دەكات ئەو كارەكتەرە فەندەمێنتالیستانەن تەنها ئاین لەڕێی شمشێرەوە دەبینن. بەبۆچوونی نوسەر قسەكردن لەسەر فەندەمێنتالیزم قسەكردنێكی تەواو ئیشكالئامێزە، بەو پێیەی كە دیاردەی فەندەمێنتالیزم دیاردەیەكی تەواو ئاڵۆزە.

"ئیسلام: مێژوویەكی كورت" سەرەتا بە كۆچی محەمەد و خانەوادەكەی لە مەدینە دەستپێدەكات لە سەدەی حەوتەمی زاینیدا و سەرگوزشتەی بنیادنانی یەكەمین مزگەوت لە مێژووی ئیسلامدا دەگێڕێتەوە. سەرباری ئەمەش نوسەر باس

له سەرەتاکانی کێشەی نێوان خەلیفەکان و لەتبوونی ئاینی ئیسلام بۆ شیعە و سوننە دەکات و دەرکەوتنەکانی بیروباوەری "سۆفیگەری" لە ئیسلامدا تاوتوێ دەکات. نوسەر هەر لەم کتێبەدا باس لە بڵاوبوونەوەی ئاینی ئیسلام دەکات لە باکوری ئەفریقا و ئاسیا دەکات.

بەڵام گرنگترین تەوەرێك کە نوسەر بایەخی زیاتری پێدەدات مەسەلەی یەکەمین شەر و بەیەکدادانە لەنێوان ئیسلام و ئەوانی تردا. ئەمەش بە سەرەتایەك دادەنرێت بۆ ئەو قەیرانانەی کە ئاینی ئیسلامی داگیر کردووە تا ئەم چرکەساتەی ئیستەمان.

نوسەر لەو مێژووە کورتەوە دێتە سەر باسی فەندەمێنتالیزم لە دنیای مۆدرێندا و هۆکار و دەرئەنجامەکانی دەرکەوتنی کارەکتەری فەندەمێنتاڵ لە دنیای ئیسلامدا راڤە دەکات.

ئەم کتێبەی کارێن ئارم سترۆنگ لە دنیای خۆرئاوادا بە کتێبێکی ناوازە دادەنرێت بەوەی کە نوسەر زۆر ئازایانە توانیوێتی دەست بۆ بابەتێکی هەستیار ببات کە کارەکتەری فەندەمێنتالیستی ئیسلامی سانا نیە قبوڵی بکات. هەر بۆیە خودی نوسەر سەبارەت




بە کتێبەکەی لە چاوپێکەوتنێکدا دەڵێت: "کاتێك من لەبارەی ئیسلام و فەندەمێنتالیزمەوە دەدویێم بێشك باس لە سەردەمێك دەکەم کە 11ی سێیتەمبەر رویداوە و دنیا بەدەست کارەکتەری فەندەمێنتالیستەوە گیری خواردووە".

کارێن ئارمسترۆنگ یەکێکە پێشەنگی لێکۆڵەرەوە لە بواری کاروباری ئاینیدا. ئەم کچە سەرباری کتێبی " ئیسلام: مێژوویەکی کورت" چەندین کتێبی دانسقەی تریشی لە کتێبخانەکاندایە لەوانە:" شەرکردن بۆ خودا" و " بودا" و "ئۆرشەلیم" و "مێژووی خودا" و "لە دەرگایەکی تەنگەبەرەوە". سەرجەم کتێبەکانی کارێن ئارمسترۆنگ قسەکردنە لە بون و مێژوو و سەرهەڵدانی ئاینە جوداخوازەکان لە جیهاندا.

کتێبی " ئیسلام: مێژوویەکی کورت"، رێك و رەوان سەرگوزشتەی ئاینێکمان بۆ دەگێرێتەوە کە هەر لەسەرەتاوە بە رەتکردنەوەی ئەویتر دەستپێدەکات. کتێبی ئەم خاتوونە کتێبگەلێکی ئازا و بێشەرمن. بەبێ ترس نوسەر رووداوە مێژووییەکان دەنوسێتەوە بەبێ ئەوەی

لەسەر ناشرینیەکانی مێژووی ئیسلام هەڵوێستە بکات. کتێبی "ئیسلام: مێژوویەکی کورت" لەسەر سێ گریمانە وەستاوە:

یەکەم: ئیسلام دەتوانێ بەرەو جیاکاری و جەهل جیهان پەلکێش بکات.

دووەم: ئیسلام دەتوانێت شەڕی دەرەوەی خۆی بکات، شەڕی بەجیهانیکردن و جیهانی ئازاد.

سێیەم: لانی کەم ئیسلام دەتوانێت لە سەردەمی جیهانگیریدا خۆی بگونجێنێت یاخود دەتوانێت ریفۆرمی رادیکاڵی لەنێو خۆیدا بکات.

سەرباری تەفسیر و راڤەکردنی ئاینی ئیسلام، نوسەر نایشارێتەوە کە ئاینی ئیسلام ئاینی زۆرێك لە خەڵکە لە گروپ و نەتەوە و زمان و وڵاتە جیاجیاکانی جیهاندا، ئەمەش رۆڵی هەیە لەوەی کە موسوڵمان زۆر بەسانایی بتوانێت لە هەموو سوچێکی جیهاندا جێیەك بۆخۆی داگیر بکات.

هەرچۆنێك بێت ئەم کتێبەی کارێن ئارمسترۆنگ کتێبێك نیە وا بە سانایی بتوانین لێی دەرباز بین. سیحری ئەم کتێبە لەوەدایە کە بە نهێنیە مێژووییەکانی ئاینێك ئاشنامان دەکات کە ئێستا لە بەریەککەوتنێکی بەهێزدایە لەگەڵ خۆرئاوادا.

**سەرچاوە:**

*bookreview.com*

# کافکا لە کەناردا

لە عەرەبییەوە: سەردەم

پیرەمێردێك زمانی پشیلە چاك دەزانێت، ماسی لە ئاسمانەوە دادەبارێت، سەربازگەلێك لە جەنگی دووەمی جیهانییەوە لە دوورگەیەکدا دەژین، بەردێکی ئەفسوناوی دنیا بەرەو وێرانی یان رزگار بوون دەبات، دۆخێکی سەیر و سەرسوڕهێنەر کە هەموو رۆمانی "کافکا لە کەناردا"ی نووسەری ژاپۆنی هاروکی موراکامی داگرتووە.

دوو تەوەری سەرەکیی بابەتی ئەم ڕۆمانەی داگیر کردووە. پیرەمێردێك بەدوای سێبەرە ونبوەکەی خۆیدا دەگەڕێت. لاوێکی تەمەن پانزە سالْ کە لە دەست نەفرەتی




ڕەشی باوکی هەلأتووە، لە نێوانیاندا شارو کاراکتەر و گەڕانە بە دوای خۆشەویستی، مانای مەرگ و بەهای یادەوەریەکاندا،

رۆمانی "کافکا لە کەناردا" دەیەمین رۆمانی رۆماننووسی ژاپۆنی "هاروکی موراکامی"یە. گێڕەری ڕووداوەکان کافکا تامورایە کە لاوێکی تەمەن پانزە سالْە و چیرۆکی خۆی و ناکاتای گەمژە دەگێڕێتەوە. وا پێ دەچێت کە ئەم دووانە دوور و نزیك چ پەیوەندیەکیان بە یەکترەوە نەبێت، چونکە هەریەکە و لە جێگایەك و سەردەمێکی جیاوازدا دەژین. بەلأم لە ئەنجامی تێکەلْبوونی ڕاهێڵی ڕووداوەکان و مێژوەکانەوە ئەم دوو کاراکتەرە لە دواییدا ئاوێزانی یەکدی دەبن و بەیەك ئاراستەدا دەچن. ئەمەیش

لــەڕێی حیکایــەتی ســەیر و ســـــــەمەرەو هـــــــەواڵی سەرســـــــوڕمێنەوە لـــــە چوارچێوەی فانتازیایەکی بێ کۆتاییدا بەدی دێت.

ســەرەتای ڕۆمانەکــە لــە هەڵاتنی کافکا تامۆراوە دەست پێ دەکات. لە شەوی جەژنی پانزە ساڵەی لەدایکبوونیدا لە مــاڵی خۆیــان، لــە دەســت کویتــچی تــامۆرای بــاوکی کــە پەیکەرتاشــێکی بەناوبانگــە هەڵدێت. پەیوەندی نێوان ئەم کــوڕ و باوکــە گــەلێك خراپــە، کافکا لە تەمەنی چوارساڵیەوە لە دایك و خوشك بێ بەشە چونکە باوکی دەری کردوون، بەردەوامیش نوقلانەی ئەوە بۆ کافکا لێ دەدات کە ئەویش وەك ئۆدیب تووشی قەدەرێکی تراژیـــدی دێـــت، بـــاوکی دەکوژێــت و لەگــەڵ دایکیــدا دەمێنێتـــەوەو هاموشـــۆی خوشکی دەکات.

کافکا لە ماڵ و قوتابخانە بەرەو شارێکی دوور هەڵدێت لە یەکێك لە ئوتێلەکانی ئەو شـــارەدا نیـــشتەجێ دەبێـــت دوای ئـــەوەی بـــاوکی بـــەوە دەخڵەتێنێت کە بۆ گەشتێکی دیدەوانی دەچێت.

ئـــەم کـــوڕی پەیکەرتاشـــە بەناوبانگە (کافکا) دەیەوێت لە دەســـت توندوتیـــژی بـــاوکی ڕابکــات، دنیایــەکی گریمانــەی وا بۆ خۆی دروست بکات کە دەستەبەری توانایەك بێت بۆ ئامــادەگیی هەڵهاتنەکــەی. لــە تۆکیـــوە بـــەرەو دوورگـــەی شـــیکوکو دەچـــێت، ئـــەم دوورگەیـــــە نموونـــــەی ئاسوودەیی و هێمنیە بۆ ئەو لاوە کە چەند مانگێك بیری لێ کردۆتەوە.

لەلاپـــەڕەکانی بـــەرایی ڕۆمانەکــەدا بــەم جــۆرە باســی ئــەو خەیاڵــەی خــۆی دەکــات: "دوو ساڵی دوایی خوێندنم پرۆڤەم لەسەر چۆنیەتی ئەو هەڵاتنە دەکرد"

لە کاتی ڕۆیشتندا و لە ناو ئــەو ئۆتومبیلــەدا کــە پێــی دەڕوات تووشی کچێك دێت بە نــاوی "ســاکۆرا"وە، ســاکۆرا تــەواو لە خوشکەکەی دەچێت کە لەگەڵ دایکیدا ڕۆیشتووەو ماڵەکــەیان بــۆ ئــەم و بــاوکی بەجێهێـــشتووە. لـــە شـــارە تازەکـــەدا کافکـــا بـــەردەوام دەچـــێتە کتێبخانەیـــەکی گـــــــشتیەوەو کتێـــــــب دەخوێنێتـــــەوە، خـــاوەنی کتێبخانەکە بێوەژنێکە بەناوی "ســایکی"کــە مێردەکــەی لــە جەنگــدا کــوژراوە، کافکــا وای بیر لێ دەکاتــەوە کــە ســایکی نـــەنکی بێـــت. وەك پێـــشتر باسمان کرد باوکی کافکا ئەو پێـــشبینیەی کـــردووە کـــە چارەنووسی کافکا بەرانبەر بە دایکــی هــەمان چارەنووســی ئۆدیبە.

لــە لایــەکی تــری ولاتــەوە کەســێکی تــریش بڕیــاری هەڵهاتن لەو واقیعە دەدات کە تیایــەتی و پــەنا بــۆ نادیــار دەبـــات. ئـــەمیان نـــاوی "تاناکـــا"یـــە کـــە لـــە چرکەســاتێکی وڕێنــەئامێزدا پیاوێکی کوشتووە.

تاناکـــا بەشـــداریی لـــە جـــەنگی دووەمـــی جیهانیـــدا کردووە، کە منداڵ بووە لەگەڵ هەنـــــدێك قوتـــــابی قوتابخانەکەیدا، لە ئەنجامی خواردنی ڕوەکێکەوە ژەهراوی بـــوون و هـــەموویان تووشـــی نەخۆشـــی لـــەبیر چـــوونەوە هاتوون.

بـــەلام ئـــەم کارەســـاتە، لەلایـــەکی تـــرەوە، هێزێکـــی سەیری پێ بەخشیوە، هێزی قــسەکردن لەگــەڵ پــشیلەدا. هەروەها شتگەلێك دەبینێت کە کەســانی تــر نــایبینن. بــۆ نمونە پێش بینی ئەوە دەکات کـــە ســـبەینێ ماســـی لـــە ئاسمانــەوە دەبارێـت و وایـش دەردەچێت، ئەمەنــدەیش لــە

وتنەکەی خۆی دڵنیایە کە وەك بینیبێتی وایە.

کەواتە ئێمە لەبەردەم دوو کەسایەتی سەیرداین کە هیچ پەیوەندیەکیان بەیەکەوە نیە، بەلاّم هەریەکە لای خۆیەوە بڕیاری داوە لە دەست قەدەرێکی نهێنی بەرەو دنیایەکی نادیار و بۆ خۆرزگارکردن هەڵبێت.

ئەم دوانە وەك هێزێکی شاراوە پاڵیان پێوە بنێت، ڕێگا لەبەردەگرن، یەکێکیان بەدوای ئایندەدا وێڵە و لە دەست یادەوەریەکانی ڕادەکات، دووەمیان هەوڵی ئەوەیەتی جارێکی دی ئەو یادەوەریانە بەدەست بهێنێتەوە کە لە چرکەساتێکی ناخۆشی ڕابووردوودا لەدەستی داوە.

ڕۆمانەکە گەلێك کەسایەتی تیایە، لە تراژیدیەوە بۆ کۆمیدی، لە رووناکبیرەوە تا مرۆڤی سادە، لە بێتاوانەوە تا تاوانبار. بەلاّم هەموویان لە ناو واقیعێکدا هەڵدەسووڕێن وەك ئەوە وایە لە دارستانێکدا بن. لە دەست گۆشەگیری هەڵدێن و بە دوایشیدا دەگەڕێن، دەیانەوێت لە خۆیان و کەسانی دی تێبگەن، لە دەست ترس ڕادەکەن و دەیانەوێت مانایەك بە ژیانیان بدەن.

*****

هۆراکی موراکامی ساڵی 1949لە شاری تۆکیو لەدایك بووە، سەرەتای کاری بەڕێوەبردنی یانەیەکی جاز بوو، پاشان دەستی بە نووسین کرد، بەرهەمەکانی وەرگێڕاونەتە سەر 39 زمان، گەلێك خەلاّتی ئەدەبی وەرگرتووە دواییان خەلاّتی یومیوری ئەدەبیە کە پێشتر ڕۆماننووسە گەورەکانی ژاپۆن لە بابەتی یوکیومیشیما، کینزا بوورو کوبوتابی وەریان گرتووە.

لەبارەی ئەم نووسەرەوە ئەمەل ئەندری لە ڕۆژنامەی هەواڵی میسریدا دەڵێت: لە سەرەتای خوێندنەوەی بەرهەمەکانیدا وا هەست ناکەیت موراکامی نووسەرێکی ژاپۆنیە، نووسینەکانی تێکەڵەیەکە لە ئاراستەی جیاواز، لەسەر ئاستی شوێن و ڕمووز و ئەیقوونە کلتووریە جیاوازەکان، لە دیکارتەوە بۆ بیکاسۆ، لە دار ئەلبەیزاوە بۆ باستاوالسکی و جۆن ووکەر کە کابرایەکە پشیلە دەکوژێت بۆ ئەوەی لە ڕۆحیان فلووت دروست بکات وەك لە ڕۆمانی (کافکا لەکەناردا) کە خەلاّتی کافکای لەسەر وەرگرت.

مۆراکامی لەبارەی خۆیەوە دەڵێت: "منداڵێکی ئاسایی بووم لە چینێکی مام ناوەندیی ژاپۆن. ساڵی 1968 وەك هەموو دنیا (مەبەستی شۆڕشی قوتابیانی فەرەنسایە لەو ساڵەدا –وەرگێڕ) گەمارۆی زانکۆماندا و شەڕی پۆلیسمان کرد، ئەوسا خەونم بە دنیایەکی نموونەییەوە دەبینی. بەلاّم کۆمەڵگە لە ئێمە بەهێزتر بوو، بۆیە وازم لە هەموو شتێك هێنا".

**سەرچاوە:**

تۆڕی هەواڵی عەرەبی 26ی مایسی 2008.

# کوخەکەی هایدگەر

لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد

*Adam shar*
*Heideggers Hut*
*MIT press 2007*
*P.112*

نوسەری ئەم کتێبە پرۆفیسۆر "ئادەم شار"ە. "شار" مامۆستایە لە زانکۆی کاردیف لە ئینگلتەرا، لەم کتێبەیدا باس لە چیرۆکی ئەو پەیوەندیە تایبەتیە دەکات کە لە نێوان فیکری "مارتن هایدگەر" و کوخدا هەیە، ئەو کوخەی "هایدگەر" لە ناوجەرگەی دارستانی ڕەشدا دروستیکرد. دارستانی ڕەش دەکەوێتە ناو زنجیرە شاخەکانی ئەلب لە باشوری ئەڵەمانیا.

لە ڕاستیدا ئەوەی "هایدگەر" لەوێدا دروستیکرد کوخ نەبوو بەو مانایەی هەمووما‌ن دەیزانین، بەڵکو بریتی بوو لە ماڵێکی خنجیلانەی سێ ژوری، بەلاّم "هایدگەر" خۆی ناوی لێنابوو کوخ، ئەم ناوەش وا ڕۆیشت و هەموو خەڵکیش بەو جۆرە بەکاریان دەهێنا. لەوێدا گەورەترین فەیلەسوفی سەدەی بیستەم پەنای دەگرت، بۆ ئەوەی بەرهەمە سەرەکیەکانی خۆی بنوسێت، ئەمەش لە ساڵی 1922 دەستی پێکرد.

"هایدگەر" بەو ناوچە شاخاویە زۆر سەرسام بوو کە دارستانی چڕ و دارو درەختی زۆر جوانی تێدا بوو. لە کەشێکی ئاوادا بلیمەتی فەلسەفی ئەو تەقیەوە. ئەم کەشە دڵڕفێنە بە ئەندازەیەك کاری لێکردبوو کە بڵێت ئەوەی فیکر و فەلسەفە و شیعر دەنوسێت ئەو نییە، بەڵکو ئەوە چیاو دیمەنە سروشتیە دڵڕفێنەکان لە ڕێی ئەوەوە دەینوسن. لە بەشێکی دیکەی ئەم کتێبەدا (کوخەکەی هایدگەر)، نوسەر باس لە پانۆرامایەکی گشتی ژیانی ئەو فەیلەسوفە بەناوبانگەی ئەڵەمانیا دەکات و دەڵێت: (مارتن هایدگەر ساڵی 1889 لە شارۆچکەیەکی ئەڵەمانیا هاتۆتە دنیاوە و هەر لەوێدا خراوەتە بەر خوێندن و پاشان

خوێندنی ئامادەیی لە شارێکی گەورەی وەك فرایبۆرگدا تەواو دەکات. سەرەتا بە خوێندنی تیۆلۆژیا دەست پێدەکات و بۆ خۆی لەو قۆناغەدا کەسێکی ئیماندار دەبێت، بەڵام کاتێك دەست بە خوێندنی ئەدەب و دواتر فەلسەفە دەکات، ئەو ئیمان و بڕوایەی سەرەتای نامێنێت).

پاشان لە زانکۆی فرایبۆرگدا دەبێتە مامۆستا، شان بە شانی فەیلەسوفێکی دی کە لە خۆی بە تەمەنتر و بەناوبانگترە، ئەو فەیلەسوفەش "ئەدمۆند هۆسێرل"ە. ماوەیەك دوای ئەوە "هایدگەر" خۆی گۆشەگیر کرد و لە دارستانی ڕەشدا دەژیا، بەتایبەت لەو ماڵە خنجیلانەیەی لەوێدا دروستی کردبوو، ناوی نابوو کوخ. هەر لەوێدا کتێبە بەناوبانگەکەی (بوون و کات)ی نوسی.

لە ڕاستیدا گۆشەگیری و تەنها بونی "هایدگەر" لەو کوخە چەپەك و دوورە دەستەدا، بواری ئەوەی بۆ ڕەخساند کە گوێ بیستی سروشت بێت و لە هەراو زەنای پایتەخت و شارە گەورەکان دوور کەوێتەوە. ئاشکرایە ئەفراندنی فەلسەفی، پێویستی بە تەنهایی و گۆشەگیری هێمن هەیە. هەروەها دواتر دەرفەتی ئەوەی بۆ ڕەخساند تا تیۆریا مەزنەکانی دەربارەی (بوون و کەینونە و کات و مێژووی



فەلسەفە لە سوکراتەوە تا ئەمڕۆ)، فۆرمەلە بکات. لەو ماوە دوور و درێژانەی بە تەنهایی لە ئامێزی سروشتی ئەڵەمانیدا دەمایەوە، توانی گوێ لە دەنگی کەینونە بگرێت لە سەدە کۆنەکانەوە تا ڕۆژگاری خۆی.

لێرەوە ئەوەی بۆ ئاشکرا دەبێت کە فەیلەسوفان لە "ئەرستۆ"وە تا ساتەوەختی ئێستا، کەینونەیان لە یادکردووەو تەنها گرنگیان بە هەبوو داوە. هەر بۆیە "هایدگەر" مەسەلەی کەینونە و بوون و کات دەگێڕێتەوە بۆ ناوجەرگەی تێڕامانی فەلسەفی، دوای ئەوەی بە درێژایی دوو هەزار و پێنج سەد ساڵ لە یادی کردبوو. ئەمەش بە گەورەترین کاری ئەو ئەژمار دەکرێت. دواتر "هایدگەر" دەست دەکات بە نوسینی باس و خواسێکی زۆر دەربارەی "نیچە" و ئەمەش ئەو کتێبە گەورەیەی لێدەکەوێتەوە کە فەرەنساییەکان لە دوو بەرگدا وەریانگێڕایە سەر زمانەکەی خۆیان.

لە بەشێکی دیکەی کتێبەکەیدا "ئادەم شار" باس لەو ڕەخنە و پلارانە دەکات کە ئاڕاستەی "هایدگەر" کراوە، بە هۆی بوونی پەیوەندیی بە "هتلەر" و نازیزمەوە. بەڵام گەربێت و بە وردی لە مەسەلەکە بڕوانین، دەبینین ئەم تۆمەتە ڕاست نییە، یان لانی کەمی زۆری پێوەنراوە. بابزانین حەقیقەتی پەیوەندی

"هایدگــەر" بــە نازیزمـــەوە چـییە؟ ئـەوەی ڕاسـتی بێـت پەیوەندی ئەو بە نازیزمەوە کە لە ماوەی نێوان ساڵانی 1933 بـــــۆ 1945 حــــــوکمی ئەڵـــەمانیایان کـــرد، لـــە دە مانگێــك تێپــەڕ ناکــات! لــە مـاوەی ئـەو دە مانگــەدا ڕازی بـوو ببێتـە سـەرۆکی زانکـۆی فرایبــۆرگ و ئــەم پۆســتەش داوایــان لێکــرد، نــەك خــۆی داوای کردبێـت و هەڵپـەی بـۆ کردبێت.

بەهۆی ناکۆکی و جیاوازی لەگــەڵ نازیـستەکاندا، تــەنها دوای مــاوەی دە مانگێــك لــە دەسـتبەکاربوونی لـەو پۆسـتە ئیداریــە بــەرزەدا، لایــانبرد. لەگەڵ ئەوەشدا هـەر بە نـازیزم تاوانبار دەکرێت. دوای ئـەوەو بـە درێــژایی دوانـزە سـاڵ بـە دوور بـوو لـە ڕژێمـی نـازی و تەنانەت نازیستەکان بە گومان بوون لێی و ڕقیشیان لێی بوو. لەگــەڵ ئەوەشــدا نــەیارەکانی بوهتــــانی بـــۆ دەکـــــەن و دەیانـــەوێت قەناعـــەت بـــە هــــەمووومان بهێـــنن کـــــە "هایدگـــــەر" نازییـــــەکی ترسناك بووە.

ئەمـە گـەورەترین درۆیـە لـە مێــــــژووی فەلـــــــسەفەی هاوچەرخدا، چونکە ئەو دوای دەست لە کار کێشانەوەی لەو پۆستە زانکۆییەی، نەك هەر لـە ڕژێمـی نـازیزم دوور کەوتـەوە، بەڵکو ڕازیش نەبوو هیچ شتێك لە سایەی ئـەودا بڵاوبکاتـەوە. ئـــەو کاتـــەش دەســـتی بـــە نوسین و بڵاوکردنـەوە کـرد کـە "هتلەر" و دەسەڵاتی نازیزم لە ناوچـــون. نازیـــستەکان بـــە درێـــژایی مــاوەی حــوکمڕانی "هتلــەر"، ڕێگــەیان نــەدا لــە زانکــۆدا وانــە بڵێتــەوە. ئــەم دۆخـــەش تـــا ســـاڵی 1951 بەردەوام بوو. واتە دوای تەواو بـــوونی جـــەنگی دووەمــــی جیهانی بە چەند ساڵێك، بۆی نـــەبوو بگەڕێتـــەوە زانکـــۆ و دەرس بڵێتەوە.

بـــەڵام "هایدگـــــەر" بـــە درێژایی ئەو ساڵانە لـە نوسین نەوەستا، بە پێچەوانەوە ئەوە وایکرد ماوەیەکی زۆر بە تـەنها و دوور لـــە خـــەڵکی لـــە نـــاو کوخەکەیـدا و لـە ئـامێزی ئـەو سروشـــتە دڵڕفێنـــەدا بـــژی، بۆئـەوەی تێکستە مەزنـەکانی دەربارەی: (میتافیزیك و کانت و هیگل و هۆڵدەرلین و ڕێلکە) بنوسێت.

"هایدگـەر" هـەر بـە تـەنها فەیلەسوفێکی ئەقڵانی لۆژیکی نەبوو، بەڵکو هاوکات شاعیر و نوســەرێکی ئاســت بــەرزیش بـوو. دەکرێـت نوسـینەکانی دەربــارەی "هۆڵـــدەرلین" بـــە نایـابترین و دەگمــەنترین ئـەو نوسینانە ئەژمار بکرێت کە لە بـــواری ڕەخنـــەی ئەدەبیـــدا نوســـراوە. ئـــەم نوســـینەی ڕەخنەیـەکی بێئەنـدازە جوانـە کـە لـە فەیلەسـوفێکی قوڵـەوە دەردەچـێت و بـەرەو قـوڵایی شتەکان دەچێت.

لـــەو کتێـــب و تێکـــستە مەزنانـــەی بـــە گـــشتی لـــە کوخەکەیـدا بەرهـەمی هێنـان دەربارەی"هۆڵدەرلین" بـوو کـە چــــەند لێکۆڵینەوەیــــەکی ڕەخنەییـــە دەربـــارەی ئـــەو شـاعیرە گەورەیـەی ئەڵـەمانیا. هەرکەسێك بیەوێت بە قوڵی لە شــــیعرەکانی "هۆڵــــدەرلین" تێبگـات، پێویـستە بگەڕێتـەوە ســــەر ئــــەو نوســــینانەی "هایدگــەر". هــەروەها لێــرە دەبێــت بــاس لــە کتێبێکــی دیکـــەی بکـــەین کـــە ئـــەم ناونیـشانە قەشـەنگەی هەیـە: (ڕێگـای تونـاتون)، واتـە ئـەو ڕێگایانـــەی بـــەرەو نادیـــار و ئازادیمـــان دەبـــەن. ئـــەوەش هەمان ئەو ڕێگایانەیە کە خۆی لـە دارسـتانی ڕەشـدا پیایـدا دەڕۆیـــشت، چـــونکە ڕۆژانـــە بەناو درەخت و ڕێگا بـە پێچ و پەنهانەکانیدا پیاسـەی دەکرد.

وەکی ئاشکرایە "هایدگەر" وەك "نیچە"ی مامۆستای، حەزێکی زۆری بە پیاسەکردن و لە ڕێ ڕۆشتن هەبووە لە ناو شاخ و دارستانەکاندا.

لێرەدا دەبێت باس لە کتێبە گەورەکانی دیکەشی بکەین وەك: (دەروازەیەك بۆ میتافیزیك یاخود کانت و کێشەی میتافیزیك، یان پرانسیپی ئەقڵ و بیرکردنەوە چی دەگەیەنێت؟ یاخود فەلسەفە چییە؟ یان هیگڵ و یۆنان، یاخود تێزەی کانت دەربارەی کەینونە یان تیۆریای ئەفلاتۆن سەبارەت بە حەقیقەت، یاخود پەیامێك دەربارەی هیومانیزم، یان پایانی فەلسەفە و ئەرکی فیکر لە ساتەوەختی ئەمرۆماندا و... هتد).

هەموو ئەم کتێبانەو چەندانی تر، بوونە ژێدەر و سەرچاوەی کلاسیکی لە مێژووی فەلسەفەی خۆرئاوادا.

لێرەدا نابێت تیۆریا بەناوبانگەکانیشی دەربارەی لایەنە خراپ و نێگەتیڤەکانی شالاوی تەکنۆلۆژی بۆ سەر ژیانی هاوچەرخ، لەیاد بکەین. سەبارەت بەم مەسەلەیە "هایدگەر" ئایدیایەکی جەوهەری هێنایە ئارا، کە تا ئێستاش بیریارە مەزنەکان بە گرنگی و بایەخێکی زۆرەوە سەیری دەکەن.

بۆچونی ئەو سەبارەت بە تەکنۆلۆژیا کورتەکەی ئەمەیە: (تەکنۆلۆژیای ئەمریکایی ئەم دنیایەی تەنیوەتەوەو خەریکە ژینگە و جوانی سروشت لە ناو دەبات. ئەمەش بۆتە مەترسیەك بۆ سەر ژیاری ئینسانی. تەکنۆلۆژیا پێویستە لە خزمەتی مرۆڤدا بێت، نەك مرۆڤ لە خزمەتی تەکنۆلۆژیادا بێت. هاوکات گەر بێت و تەکنۆلۆژیا سروشت وێران بکات، ئەوا دەبێت مایەی تێکچونی هاوسەنگی مرۆڤایەتی بە گشتی. چونکە مرۆڤ هەر بەتەنها پێویستی بە ئامێر و ئامرازە تەکنۆلۆژیەکان نییە، بەڵکو پێویستی بە سروشتیشە. بۆیە دەبێت هاوسەنگیەك لە نێوانیاندا دروستبکرێت. ئەمەش ئەو شتەیە حیزبە سەوزەکان و ڕێکخراوە ژینگەپارێزەکان لە ڕۆژگاری ئەمرۆدا داوای دەکەن. لە ئێستادا لێرەو لەوێ گوێ بیستی ئەو دەنگانە دەبین کە لە پیسبونی ژینگە لەرێی تەکنۆلۆژیا و دوکەڵی کارگە گەورەکانەوە ئاگادارمان دەکەنەوە...).

کەواتە کێ دەتوانێت بڵێت کوخەکەی "هایدگەر" کاریگەریی بەسەر فەلسەفەکەیەوە نەبووە؟ ئەو کوخەی لە ئامێزی سروشتێکی قەشەنگ و دڵفرێندا بوو.

**سەرچاوە:**

بيان الكتب – 2008/9/1.

# فەلسەفەی سیاسی

لۆك ڤێری و ئالان ڕینۆ

لە عەرەبییەوە: هەورامان وریا قانع

هەریەك لە "لۆك ڤێری"و "ئالان ڕینۆ" هەستاون بە دانانی ئەم کتێبە گرنگەی مەنهەجی خوێندن، "لۆك ڤێری" دوای ئەوەی لە گۆڕەپانی ڕۆشنبیری فەرەنسیدا شوێنی "سارتەر"، "فۆکۆ"، "دۆلۆز"ی گرتەوە، ناوبانگێکی هێجگار زۆری پەیداکرد. ئاشکرایە ئەم نوسەرە لەسەردەمی "جاك شیراك"دا بووە وەزیری پەروەردە، ئەمەش یەکەمجارە وەزارەتی پەروەردە بدرێتە کەسێکی فەیلەسوف، جگە لەوە کتێبە زۆرەکانی بۆ زیاد لە بیست زمانی جیهانی وەرگێڕدراون و لەناوەوەو دەرەوەی فەرەنسادا




پێشوازییەکی زۆر لە کتێبەکانی کراون و سەرکەوتنێکی باشیان بەدەستهێناوە. "ئالان ڕینۆ" ئەویش فەیلەسوفێکی ناسراوە، بەڵام بە قەبارەی "لۆك ڤێری" هاوڕێی ناسراو نییە، ئەم دوانە پێکەوە هاوڕێی خەبات و تێکۆشانی یەکترن دژ بە چەپی پەڕگیرو هەرزەگۆی فیکری فەرەنسا.

"ئالان ڕینۆ" لە زانکۆی سۆربۆن مامۆستای فەلسەفەی سیاسییە، هەروەها بەڕێوەبەری ناوەندی ئەوروپییە بۆ سیاسەتی زانکۆ، ئەمەش مانای ئەوەیە ئەم فەیلەسوفە کەسێکی گرنگەو یەکێتی ئەوروپا وەك ڕاوێژکارێکی خۆی دایناوە، بگرە وەك بەرپرسێك بۆ دانانی نەخشەوپلانی سیاسەتەکانی کە تایبەتە بە خوێندنی زانکۆ.

ئەم دوو نوسەرە ساڵی 1984 ناوبانگێکی زۆریان پەیداکرد، لەو ساڵەدا

هەردوکیان پێکەوە کتێبێکیان لە دژی چەپی پەڕگیری فەرەنسا بڵاوکردەوە کە لە گۆڕەپانەکەدا باڵادەستبوون، واتە کتێبەکەیان دژ بە "فۆکۆ"،"دۆلۆز"، "جان فرانسوا لیوتارد"، "جاك دێریدا"، "پییر بۆردیۆ"، "جاك لاكان" بوو. هەندێ کەس پێیان وابوو ئەم هێرشە سەرکەوتوانەیە لە بەرژەوەندی ڕاستڕەوی فەرەنسی ڕۆشنگەر بووە، ڕاستڕەوێك لەسەر شێوازی سەرۆك وەزیرانی کۆچ کردوو "ڕیمۆن بار"، پێدەچێ ئەم دوو فەیلەسوفە بە شێوەیەك لە شێوەکان لەو سەرەك وەزیرانە کۆچکردووەوە نزیك بوبن. وەلێ لەوانەیە فەرەنسا لەو سەردەمەدا (1984)، بێزاربوبێت بەدەست ئەزمونی چەپ و گەمە منداڵانەکەی بزوتنەوەی مایسی 1968، بۆیە بانگەشەی هێمنی و گەڕانەوە بۆ بەها تەقلیدییە جێگیرەکان دەکرد کە خۆی لە ڕێزگرتنی دەسەڵات، خێزان، ژنهێنان، دوورکەوتنەوە لە ئیباحییەتی سێکسی و شزوزو لادانە ئەخلاقییەکاندا دەبینییەوە. پێویستە لە چوارچێوەی ئەو بارودۆخەدا تەماشای کتێبە سیاسی و فەلسەفییەکانی "لۆك ڤێری"و "ئالان ڕینۆ" بکرێت.

لەم کتێبە تازەیەشدا کە ئاراستەی خوێندکارانی زانکۆ و خوێندنی باڵاکراوە، هەردوو دانەر پانۆرامایەکی مێژوویی گشتگیر سەبارەت بە فەلسەفەی سیاسی، هەر لە سەردەمانی کۆنەوە تاکو ئەمڕۆ دەخەنەڕوو. بەڵام هەردوکیان بەپلەی یەکەم زیاتر تەرکیز لەسەر سەردەمی ئێستامان دەکەن، واتە لە سەردەمی ڕۆشنگەرییەوە تاکو ئەمڕۆ. کتێبەکە دابەشکراوە بەسەر سێ بەش و چەندین نەسکدا. بەشی یەکەم ئەم ناونیشانەی لەخۆگرتووە (ململانێ تازەکەی نێوان کۆنخوازان و تازەگەران)، تێیدا هەردوکیان قسە لەسەر ئەو ڕەخنانەی "فۆکۆ"، "دێریدا"، "لیوتار"، "دۆلۆز" دەکەن کە لە ڕۆشنگەریان گرتووە. بەڵام پێش ئەوە قسە لەسەر ڕەخنەکانی مامۆستا گەورەکەیان دەکەن، واتە "مارتن هایدگەر"، ئاشکرایە ئەم فەیلەسوفە بەناوبانگەی ئەڵمانیا، ئەو بوو یەکەم گورزی ئازاربەخشی ئاراستەی ڕۆشنگەری و تەکنەلۆژیای مۆدێرن کرد، گەرچی "نیچە" پێش ئەو کەوتبوو.

هەردوو دانەر لە بەشی یەکەمی کتێبەکەیاندا، زۆر بە دووردرێژی لەسەر ڕەخنەکانی "هایدگەر" لە مۆدێرنە ڕادەوەستن، ئالێرەدا "هایدگەر"ی فەیلەسوف نارەزایی و بێزارییە گەورەکەی خۆی سەبارەت بە هەژموونی تەکنەلۆژیا لەسەر سروشت و بگرە سەبارەت بە لەناوبردنی بەرائەتی بنەڕەتی ژیانی سروشت و مرۆڤ دەردەبڕێت. لە واقیعدا ئەو ڕەخنانەی "هایدگەر" تارادەیەکی زۆر لە شوێنی خۆیدابوو، بەڵگەش بۆ ئەوە دروستبون و دەرکەوتنی پارتی سەوز یان پارتی ژینگەپارێز بوو، ئەم پارتانە بەرگری لە سروشت و دارستانەکان و کێڵگە سەوزەکان و لادێکان دەکەن، ئەو شوێنانە دوای ئەوەی ئەوروپا چووەتە ناو سەردەمی پیشەسازییەوە، وردە وردە بەرەو نەمان و لەناوچوون دەچن.

لێرەوە "هایدگەر" پێمان دەڵێ: بەڵێ بۆ زانست و تەکنەلۆژیا، بەڵام بەمەرجێ مرۆڤبونی مرۆڤەکان نەهارێت و بەرائەتی سروشت لەناونەبات و دارستان و جەنگەڵ و سەوزاییەکان و درەختەکان لەسەر ڕووی زەوی

له ڕەگوڕیشەوە هەڵنەکێشێ.
ئاشکرایە "هایدگەر" زۆر پەیوەست بووە بە دارستانە جوان و قەشەنگەکانی ئەڵمانیاوە، بەتایبەتی ئەو دارستانە ڕەشەی تێیدا کوخێکی بچوکی دروستکرد، تاکو بەتەنها بێت و لە مرۆڤەکان دوورکەوێتەوەو بنوسێ و بیربکاتەوە. "هایدگەر"یش زۆرجار وەك پیشەی "نیچە"ی مامۆستای، لە باوەشی سروشتدا پیاسەی دوورودرێژی کردووە. سروشت دایکە میهرەبان و بەسۆزەکەی هەموومانە، گەر لەناومان برد، ئەوا ئێمە بوونی خۆمان دەشێوێنین و خودی خۆمان لەناودەبین.

دواتر هەردو دانەر دەڵێن: ئەم بیروڕایانەی "هایدگەر" لە سالآنی سی و چلەکانی سەدەی ڕابردودا دەرکەوت، بەڵام تەنها بەم دوایانە لە مانا قووڵ و مەغزا گەورەکانی تێگەشتین، ئەویش دوای پیسبوونی کەش وهەواو بەرزبونەوەی پلەی گەرمی زەوی و زۆربونی لافاوەکان و کارەساتە سروشتییەکان لێرەو لەوێ. ئەمەش مانای ئەوەیە "هایدگەر"ی فەیلەسوف بەلای کەمەوە نزیکەی چل بۆ پەنجا ساڵ پێش سەردەمەکەی خۆی کەوتبوو، ئا ئەمەیە سیفەتی فەیلەسوفە گەورەکان، ئەوان زۆر دوورتر لە خۆیان شت دەبینن، تەواو بە پێچەوانەی خەڵکانی ئاسایی یاخود بیرمەندە بچوکەکانەوە.

پاشان هەردوو دانەر لە بەشی دووەمی کتێبەکەیاندا باس لەو فەلسەفە مێژووییە گەورانە دەکەن کە لە ڕۆژئاواو بەدرێژایی دوو سەدەی ڕابردوو دەرکەوتون. واتە فەلسەفەی "هیگڵ"، "ئۆگست کۆنت"و ئەوانی دیکە. ئاشکرایە هەر فەیلەسوفێکی گەورەو مەزن، تێڕوانینێکی گشتی دەربارەی مێژووی مرۆڤایەتی و ڕەوتی ڕوداوەکان و ئایندەی ڕۆژەکان گەڵاڵەدەکات، هەندێجار ئەو تێڕوانینە ڕاست دەردەچێ و هەندێجاری دیکە ئایندە ئەو تێڕوانینانە بەدرۆ دەخاتەوە. بۆ نمونە تێڕوانین و پێشبینییەکانی "مارکس" دەربارەی حەتمیەتی کەوتنی سەرمایەداری نە ڕاست دەرچوو نە جێبەجێ بوو، وەلێ تێڕوانین و پێشبینیەکانی دیکەی لەجێی خۆیاندابوون، دەکرێ هەمان شت سەبارەت بە "نیچە"ش بوترێ کە پێشبینی ڕودانی جەنگە جیهانییەکانی کرد، تەنانەت پێش بەرپابونی بە چل یان پەنجا یاخود حەفتا ساڵ.

لە واقیعدا سەبارەت بە مێژوو چەندین فەلەسەفە هەیە، هەموو فەیلەسوفێکی گەورە فەلسەفەیەکی تایبەت بە خۆی دەربارەی بزاوتی مێژوو، چارەنوسی ڕەگەزی مرۆڤایەتی گەڵاڵەکردووە. بۆ نمونە "جان جاك ڕۆسۆ" لە فەلسەفەکەی خۆیدا سەبارەت بە مێژوو دەڵێ: (شارستانیەتی مۆدێرن گەر هاوکات لەگەڵ پێشکەوتنە مادی و تەکنەلۆژییەکەی، پێشکەوتنێکی ئەخلاقی بەخۆوە نەبینێ، ئەوا ئەو شارستانیەتە ڕۆژێ لە ڕۆژان دەگاتە دیوارێکی داخراو). ڕۆژگار دوای دووسەد ساڵ ئەو پێشبینییەی "ڕۆسۆ"ی سەلماند. لە ئێستادا هەموان ئیعتراف بەوەدەکەن کە شارستانیەتی مۆدێرنی ڕۆژئاوا گیرۆدەی قەیرانێکی قووڵی ئەخلاقی بووە کە وێنەی نییە، ئەمەش لەبەر ئەوەیە تەنها بایەخ بە قازانجی مادیی و کەڵەکەبونی سەرمایە دەدات و لەبیری چوەتەوە ئامانجی سەرەکی شارستانیەت بریتییە لە

ئاسودەیی مرۆڤ لەسەر گۆی زەوی، هەروەها بەهاکانی دادپەروەری و حەق و ویژدانی لەبیرچووە، ئەمەش مەترسیدارترین شتە. لێرەوە شارستانیەتی مۆدێرن هاوسەنگی خۆی لەدەستداوە و پێویستە ئاراستەکەی راستبکرێتەوە، تاکو بەدروستی ببێت بە شارستانیەتێکی مرۆڤ دۆستانە. ئەم قسانە بۆ درندەیی جیهانگیریش راستە، جیهانگیرییەك بووەتە هۆی ئەوەی دەوڵەمەندەکان زیاتر دەوڵەمەند بن و هەژارەکانیش تابێت هەژارتربن.

هەر ئەمەش بوو "جان جاك رۆسۆ" لە سەدەمی خۆیدا ئیدانەی دەکرد، بەلام دەبێ ئەوەش بلێین شارستانیەتی مۆدێرن کۆمەڵێ دەستکەوتی زۆر گەورەی بەدەستهێناوە کە ناکرێ گاڵتەیان پێبکرێ و بەسوك تەماشایان بکرێ. لێرەوە شارستانیەتی مۆدێرن دەستکەوتەکانی لە سلبیاتەکانی زیاترە. ئالێرەدا فەیلەسوفانی مێژوو بۆ دوو بەرە دابەش دەبن، بەرەی گەشبین و بەرەی رەشبین، لە رابردودا "کانت" و "هیگل" و لە ئێستاشدا "کاسیرر" و "هابرماس" و هەردوو دانەری ئەم کتێبە سەر بە بەرەی یەکەمن، ئەو فەیلەسوفانە وایدەبینن خاڵە پۆزەتیفەکانی مۆدێرنە زۆر زیاترە لە خاڵە نێگەتیفەکان و کەموکورییەکانی. بەلام هەندێ فەیلەسوفی گەورەی دیکە سەر بە بەرەی دووەمن، بەرەی رەشبین، لەوانە "نیچە"، "هایدگەر"، "فۆکۆ"...هتد. ململانێی نێوان گەشبین و رەشبینەکان تاکو ئێستا بەردەوامە.

لە بەشی سێیەم و کۆتایی ئەم کتێبە بە پێزەدا، هەردوو دانەر قسە لەسەر مافەکانی مرۆڤ و سیستمی کۆماری مۆدێرن لە فەرەنسا و تەواوی ئەوروپادا دەکەن. هەردوکیان لەم بەشەدا بەرگری لە دیموکراتی و مافەکانی مرۆڤ دەکەن دژ بە هێرشی فەیلەسوفە نیچەوییەکان لە نمونەی "فۆکۆ"، "دۆلۆز"، "درێدا" و ئەوانی دیکە. ئەم دوو دانەرە وایدەبینن روخاندنی سیستمی فیوداڵی کۆن، شتێکی تابلێی پۆزەتیف بووە، چونکە دەرفەتی بۆ هاتنەئارای سیستمێکی دیموکراتی مۆدرێن لە نێوان مرۆڤەکاندا رەخساند.

گومانی تێدانییە دیموکراتییەتی رۆژئاوا بەدەست کۆمەڵێ ناتەواوی زۆرەوە دەناڵێنێ، هەروەها گومانی تێدانییە چینی سەرمایەداری مۆدێرن شوێنی چینی فیوداڵی خانەدانی کۆنی گرتووتەوە، بەلام ئەمانە مانای ئەوە نییە کاتێ لە سیستمی کۆنەوە گواستومانەتەوە بۆ سیستمی مۆدرێن، هیچ پێشکەوتنێ یان گەشەکردنێك بەسەر رەگەزی مرۆڤایەتیدا نەهاتووە. لێرەوە هەردوو نوسەر کتێبە گەورەکەیان بە ستایشکردنی مۆدێرن دەستکەوتە باشەکانی کە نرخی تەواونابێت کۆتایی پێدەهێنن و بانگەشەی پێکهێنانی فەلسەفەیەکی سیاسی دیموکراتی تازە دەکەن کە شایەنی سەردەمەکەمان بێت.

**سەرچاوە:**

بیان الکتب 2008/4/7

*کتێبی فەلسەفەی سیاسی: نوسینی لوك ڤێری و ئالان رینۆ، لەبلاوکراوەکانی زانکۆی فەرەنسا، پاریس، 2007، 603 لاپەرەی مام ناوەند.

# لێگەڕێ منداڵیەکەت ڕابەریت بکات:
## خوزییە ساراماگۆ لە "یادەوەرییە بچووکەکان"

لە عەرەبییەوە: ساکار رەئووف

لە کورتەی ئەو ژیاننامەی کە پێشکەشی سەرۆکی لیژنەی خەڵاتی نۆبڵی کردبوو، نووسەری پورتوگالی خوزییە ساراماگۆ، نووسیبوی " پاش قوتابخانەی پیشەسازی، بۆ ماوەی دوو ساڵ لە گەراجێکی ئۆتۆمبیلدا فیتەریم کرد، ئەو کات و لە ئێوارانـدا بوومە میوانێکی بەردەوامی کتێبخانەی گشتی لە لەشبۆنە، ئەوەی رێبەریشی ئەکردم تەنها حەزو ئارەزوم بوو بۆ زانیاری کە چێژی خوێندنەوەیان تیا پەرەپێدام.

نوێترین کتێبی ساراماگۆ" یادەوەرییە بچووکەکان"ە کە باس لەم قۆناغەی ژیانی و تەمەنی منداڵی دەکات. نووسەر لەم کتێبەدا ژیانی خۆی تا تەمەنی پانزە ساڵی تۆماردەکات، منداڵییەك بەشکراوە لە نێوان گوندی ئازینهاگا، کە تیایدا لەدایك



بووە و شاری لەشبۆنە کە خێزانەی پێش ئەوەی ئەم تەمەنی ببێتە دوو ساڵ کۆچیان بۆی کردوە، کتێبەکە بە قەبارە بچووکە، وەلێ بە درەوشانەوەی شاعیر دەوڵەمەندە، لەنێو پەڕەکانی کتێبەکەدا چەند وێنەیەکی کۆنی ساراماگۆ بە منداڵی و بە گەنجی و وێنەی کەسوکارەکەی هاوڕێ لەگەڵ چەند روونکردنەوەیەکدا دەبینرێت.

پرۆژەی نووسینی ئەم ژیاننامەیە چەند ساڵێکی خایاند، نووسەریش زۆر جار باسی لێوە دەکرد، تا لە

کۆتاییدا گێڕانەوەیەکی سادەی بۆ پانزە ساڵی بەرایی ژیانی لە شارە مەزنەکەو لەو گوندەی زۆربەی کاتەکانی پشووی لەماڵی هەردوو باپیریدا تیا بەسەر دەبرد، هەڵبژارد. ئەو وردەکارییە بچووکانەی دواتر ئەو پیاوەیان دارشت کە لە تەمەنێکی گەورەدا ئەدەب دەکاتە پیشەو دەبێتە مەزنترین نووسەری سەردەم.

وەك دەرئەکەوێ لە لاپەڕە بەراییەکانی کتێبەکەدا، لەوە ناچێت ئەو ژینگەیەی نووسەر تێیدا ژیاوە هیچ پەیوەندییەکی بە جیهانی ئەدەبەوە هەبێت. خێزانەکەی بە کاری جووتیاری و ڕەنجدانەوە لە گوندی ئازینهاگا، " ئەو گوندەی لە بەرەبەیانی نەتەوەی پورتوگالەوە هەبووە" دەژیان. لە شاریشدا خوزییەی لاو ناچاردەبێ بۆ یارمەتیدانی خێزانەکەی دەست لە خوێندن هەڵگرێ. ئەو قۆناغی منداڵییەی لە تەمەنێکی زوودا، وەك لە زۆربەی ژینگە هەژارەکاندا، تەواو دەبێت وەلێ لە یادەوەرییدا بەرۆشنی دەمێنێتەوە. سەبارەت بەم تەمەنە ساراماگۆ دەنووسێ" نازانم بارودۆخی منداڵان ئێستا چۆنە، بەڵام لەو زەمەنە دوورەدا کات وا دیاربوو لەچەند کاتژمێرێکی بێوێنەی هێواش، درێژو بێ کۆتا پێکهاتبێ. چەند ساڵێکی خایاند تا تێگەیشتم هەموو کاتژمێرێکی بێکۆتا تەنها شەست دەقیقەیە، دواتریش دڵنیابووم کە ئەم دەقیقانە دوای شەست چرکە کۆتاییان پێدێت.

نووسەر منداڵی خۆی بەو وردەکارییە ئاساییانەی کە هەریەك لە ئێمە تیایدا دەژین، دەخاتە ڕوو. باس لە یەکەم خۆشەویستی خۆی بۆ ئەو کچە دراوسێیەی لەم گەورەترو ئەو دراوسێ لاوەی وەك دۆن کیشۆت لە ئەنجامی خوێندن وخوێندنەوەی زۆردا تووشی شێتی دەبێت، دەکات. هەروەها باس لەو خانەی سینەمایانە دەکات کە ڕێگەیان بە منداڵی بچووك بە بەروانکەو دەرپێی کورت و لووتی چڵمنەوە دەدا، ئامادەی بن. هەر لەوێش بە شارلی شاپلن و بەستەر کیتۆن و قەڵەوو لاوازەکە ئاشنا دەبێت. لەگەڵ ئەوەشدا بەدبەختی ئامادەگی دەبێت لە ژیانی ئەم منداڵەدا، کاتێ مەرگی برا گەورەکەی ئاسەوارێك جێدەهێڵێ کە ناسرێتەوە. هەرچەندە نووسەر ئەم برایەی خۆی بەبیر نایەت چونکە ئەم تەمەنی دوو ساڵ دەبێت کە فرانشسکۆی برا گەورەی لە تەمەنی چوار ساڵیدا دەمرێ، وەلێ ئەم لەدەستدانە بەدرێژایی ژیانی لێی نابێتەوە. ساراماگۆ لەم بارەیەوە دەنووسێ " بەر لە چەند ساڵێك کە بیرۆکەی نووسینی ئەو یادەوەرییانەم لا گەڵاڵە بوو، هەر زوو ئەوەم بە بیردا هات و دڵنیاش بووم کە تیایدا باس لە مەرگی فرانشسکۆی برام دەکەم، "چونکە ئەو ژیانی زۆر کورت بوو". لە گەورەیشدا پرسی مەرگی ئەم برایە بەدوایەوە دەبێت، هەربۆیە بڕیاردەدات لە بەڕێوەبەرایەتی ناسنامەی مەدەنی و ئەو خەستەخانەیەی تیایدا کۆچی کردووە دەست بە گەڕان بکات. ئەو دەڵێ (بەبۆچونی من ڕۆمانی "گشت ناوەکان" وا دەرنەئەچوو ئەگەر بە شێوەیەکی ورد و لەساڵی 1996 بەدواداچوون و گەڕانم نەکردایە بەدوای ئەوەی کە چی بەسەر فرانشسکۆی برام هاتوە) لەنێو وێنەکانی کتێبەکەدا وێنەیەکی ئەو برایەی تیایە کە لە ژێریدا

ساراماگۆ نووسیویەتی: "ئەمە فرانشسکۆیە، کە هەرگیز نەمویراوە دەستبەرداری وێنەکەی بم. ژیانێکی کورت ژیا، داخۆ دەبووە چی. هەندێ جار بیردەکەمەوە کە من هەولمئەدا لە ژیانی خۆمدا ژیانی ئەو بژیم".

هەروەك رۆمانەکانی تری، شوێن ئامادەگییەکی بەرچاوی هەیە لەم یادەوەرییانەدا، ئێمە بە جوگرافیای ئەو شارو گوندەی منداڵی ئەمی تیا بەشکراوە ئاشنا دەبین، کاتێك بە وردی ناوی ئەو شوێن و شەقامانەی کە ماڵی منداڵی ئەوی تیا بوو، ئەگێڕێتەوە. سەبارەت بە شاری لاوێتی خۆی دەنووسێ: "لەشبۆنەکەم هەمیشە شاری گەڕەکە هەژارەکان بووە، یان بەزۆری کۆلانی چینە ناوەندەکە بووە. وێڕای ئەوەی دواتر بارودۆخ بە جیهانی تری ئاشنا کردم، بەلام خۆشەویسترین و بەنرخترین یادەوەرییەکانم هەمیشە ئەوانەی لەشبۆنەی ساڵە بەراییەکانی ژیانمە، لەشبۆنەی ئەو گەلەی پارەی کەم و دڵێکی گەورەیان هەیەو تا ئێستاش دابونەریت و وێناکردنی بۆ دنیا گوندییە".

لێرەدا ئەو بڕگەیەی باس لە کتێبی "یادەوەرییە بچووکەکان" دەکات، هەڵدەبژێرین. "کاتی ئەوە هاتووە روونی کەمەوە بۆچی لە سەرەتاوە ویستم ئەم یادەوەرییانە لەژێر ناونیشانی "کتێبی فریودانەکان" دابنێم. ئەم ناونیشانە نە لە یەکەم تێڕوانین و نە لە دووەم و نە لە سێیەمیشدا لەوە ناچێت هیچ پەیوەندییەکی بە بابەتەکانی ناو کتێبەکەوە هەبێت، تا ئەو سنوورەی کتێبەکەی گرتبێتەوە. بیرۆکەی خەونە سەرەکیەکە- ئەو دەمە لەدایك بوو کە رۆمانی "بیرەوەریی کلێسا"م دەنووسی. چەند بەسەر ئەو کاتەدا تێپەڕی؟- بۆ ئەوە بوو ئەوە نیشاندا کە چۆن (پیرۆزیی) ئەم گوزارشتە (لۆجیکیە شازە)ی گیانی مرۆڤایەتی، ئەو ئاژەڵیە شاراوەمان تیا ئیفلیج دەکات و، وادیارە لەناویش ناچێ، سروشت ئەشێوێنێو تووشی سەرسوڕمانی دەکات. ئەو کات وای بۆ دەچووم کە قەشە ئەنتونیۆسی کوێر، کە یەرون بوش لە "فریودان"دا، وێنای کردووە، لەبەرئەوەی قەشەیە ئەوا هەموو هێزەکانی سروشت ناچار بەوە کراون لە

ناخەوە، لە بینراوو نەبینراو، لە ئاژەڵی و لە مەزنی رۆحەوە، رابێن و هەموو غەریزە چەپێنراوەکان و گوناهە دیارەکانیش دەرکەوتن.

هەوڵدان بۆ دانانی ئەم بابەتە ئاڵۆزە (بەداخەوە، بەم زووانە بۆم دەردەکەوێت کە بەهرە ئەدەبیەکانم چەند لە مەزنی ئەم پرۆژەیەوە بەدوور مایەوە)، لە کۆگایەکی بچووکی بیرەوەریمدا، کە لەراستییدا پێویستی بە ناونیشانێکی گونجاوتر هەیە، ئەو سەرسوڕمانەمیان نەڕەواندەوە کە خۆم لە بارێکی هاوشێوەی باری قەشەکە ببینمەوە، واتا، لەبەرئەوەی من ببومە بابەتی هەموو دنیا، ئەوا دەبوایە بەهۆی(گونجانێکی ناوەوە)ی سادە، واز لە هەموو غەریزەکانی ناوەوەی خۆم بهێنم و ببمە ئامانجێك بۆ هەموو چەشەکان. گریمانەی ئەوە بکە کە تۆ تەنها منداڵێکی، تەنها کوڕێك، دواییش تەنها پیاوێك، جێی ئەنتونیۆسی قەشە ئەگریتەوە، جیاوازیەکە لە کوێدا دەبێت؟ هەروەك قەشەکە کاتێ بە دێوەکانی خەیاڵ گەمارۆ دراو، کوڕەکەش تارماییە هەرە

دزێوەکـانی شـەو بـە دویـدا بـوون. ئەگـەریش راسـت بێـت وەهمـــەکان هـــەموو جـــۆرە بـــەراوردێك لـــەنێوان قەشـــەو کورەکـە حـەرام بکـات، ئـەوا لەبەرئەوەیـە کـە ئێمـە بـەبیرمان نایـەت یـان نامانـەوێ بیرمـان بکەوێتـەوە ئـەو کاتـە چـی بـە زەینمانـــدا ئـــەهات. ماســـیە باڵدارەکەی سەر تابلۆی بوش کە قەشەکە بە ئاسماناداو بەنێو بادا هەڵدەگرێ، جیاوازییـەکی ئـەوتۆی لەگـەڵ جەسـتەماندا نییـــە کـــە ئـــەفرێ، هـــەروەك لاشەی من کە زۆر جار رەشـەبا بـــەنێو مـــالان و بەســـەر باخـچەکانی شـەقامی کـاریلۆ فیـدیرا هەڵیـدەگرت و دەفـرێ بەسـەر درەختـی لیمـۆو قۆخـدا یـــان حـــەزی دەکـــرد بـــەرزتر بەباڵـــەکانی بفـــرێو پاشـــان بەســـەر ســـەربانی مالانـــدا بگـــەرێت. بـــرِوام نەئـــەکرد ئەنتونیۆســـی قەشـــە بەرگـــەی ئـەو ترسـە زۆرەی گرتبێـت کـە مــن بــەهۆی ئــەو مۆتەکانــەی شەوانە چەندەها جار دەهاتنە خەوم، بەرگەیم گرتبوو، کاتێك خـــۆم وەك زیندانیـــەك لـــە ژوورێکی سێگۆشەی بێکەل و پەلـــدا بـــە دانیـــشتووی ئەبینیـــەوە، بـــێ پەنجـــەرەو دەرگـــا، لـــە سوچـــێکی ئـــەو ژوورەدا "شـتێك" هەیـە، (پێـی دەڵـێم شـتێك چـونکە نـازانم جەوهەرەکـــــەی چـــــییە)، بەهێواشـــی گەشـــە دەکـــاو گـەورەتر دەبـێ، مۆسـیقایەك هەمیشە بەهەمان ئاواز دەنگ ئەداتـەوە، ئـەو شـتەش وردە وردە گـــەورە دەبـــێ، منـــیش بـــەرەو گۆشـــەیەکی دوورتـــر بەرەو دواوە دێم، تا لە دواییدا بـەئاگا دێـم، پـرِدەبم لـە تـرس، هەناسەبرِکێمەو لەنێو تاریکی و بێـدەنگی شـەودا غـەرقم لـە عارەقا. لەوانەیـە وا بزانـی کـە هـــیچ شـــتێك لـــەوەی ئـــەیڵێم پـــەیجورێکی تیـا نییـە، لەبـەر ئەم هۆیە ناوی کتێبەکە گۆراو بـــوو بـــە "یادەوەرییـــە بـــچووکەکان" بـــەڵێ تـــەنها یادەوەرییـــەکی بـــچووکی تەمەنی منداڵیم.

**سەرچاوە:**

رۆژنامەی (الشرق الاوسط)

پێنجشەممە 8 ی مایو 2008

# ژياننامەو فيكرى جۆن لۆك

ڕۆجێر ولهاوس

لە عەرەبييەوە: هەورامان وريا قانع

دانەرى ئەم كتێبە پرۆفيسۆر "ڕۆجێر ولهاوس"ە، كە يەكێكە لە شارەزايانى فيكرى مۆدرێن بە گشتى و فەلسەفەى "جۆن لۆك" بە تايبەتى. دانەر لەم كتێبەيدا يەكێك لە باشترين ئەو ژياننامانە پێشكەشدەكات كە لەسەر فەيلەسوفى گەورەى ئينگليز نوسراوە، زۆربەى ڕەخنەگران و مێژونوسان دانيان بە گرنگى و مەزنى ئەم ژياننامە تازەيەدا ناوە كە ڕۆشناييەكى پرشنگدارى خستۆتە سەر ژيانى دامەزرێنەرى فەلسەفەو سياسەتى مۆدێرن لە




ئينگلتەرا، واتە "جۆن لۆك"ى فەيلەسوف.

ئاشكرايە "جۆن لۆك" بەيەكێك لە فەيلەسوفە گەورەكانى ڕۆشنگەرى دادەنرێت، نەك تەنها لەسەر ئاستى ئينگلتەرا، بگرە لەسەر ئاستى ئەوروپاو جيهانيش، دانەر هەر لەسەرەتاوە ئاوا دەڵێ: "جۆن لۆك" لە ساڵى 1632 لە ئينگلتەرەو لە شارى سۆميرسيت لەدايكبووە، ساڵى 1704 لە ناوچەى ئايسيكس كۆچى دوايى كردووە، لێرەوە ئەو 72 ساڵ ژياوە، ئەمەش بەس بووە بۆ ئەوەى بە زانست و تيۆرە سياسى و فەلسەفييەكانى دنيا پڕبكات و خەڵكى سەرقاڵ بكات. "جۆن لۆك" بە گرنگترين فەيلەسوفى ئينگليزى ڕۆشنگەرى سەدە تازەكان دادەنرێ. ئينگلتەرا وەك چۆن شانازى بە

"نیوتن"ەوە دەكات كە یاسای هێزی ڕاكێشانی گەردونی دۆزییەوە، ئاواش شانازی بە "جۆن لۆك"وە دەكات. دواتر دانەر بەردەوام دەبیٚ و دەڵیٚ: لەسەر ئاستی سیاسەت، "جۆن لۆك" بە یەكێك لە دامەزرێنەرانی سیستمی لیبرالی دیموكراتی مۆدێرن دادەنرێ، ئەمە گەر نەڵێین یەكەم دامەزرێنەریەتی، بۆیە كاریگەری لەسەر سەردەمەكەی و سەردەمەكانی دواتر زۆر گەورە بوو.

"جۆن لۆك" لە شارێكی بچوكی نزیك شاری بریستۆل لەدایكبووە، باوكی سەرەتا پارێزەر بووە پاشان لە ساڵی 1648 بووەتە فەرمانبەرێكی گەورە كە خزمەتی پەرلەمانی كردووە، بەڵام بەهۆی جەنگی ناوخۆی نێوان كاسۆلیك و پرۆتستانت لە ئینگلتەرا، هەمو شتێك لەدەستدەدا و ئیفلاس دەكات. ئاشكرایە سەردەمی ژیانی "جۆن لۆك" سەردەمی تایفەگەری و مەزهەبە نەیارەكان بووە. سەردەمی فێندەمێنتاڵیزمی دەمارگیربووە، شوێنكەوتوانی "پاپا"، واتە كاسۆلیكەكان، ڕقێكی زۆریان لە شوێنكەوتوانی مەزهەبەكەی دیكەی مەسیحی بوو، واتە مەزهەبی پرۆتستانت. كاسۆلیكەكان، پرۆتستانتەكانیان بە گومڕاو لە ئاین لادەر تۆمەتبار دەكرد، بەڵام بۆ نەگبەتی خۆیان، ژمارەی پرۆتستانتەكان لە ئینگلتەرە زۆر لە ژمارەی كاسۆلیكەكان زۆرتربوو.

"جۆن لۆك" لە منداڵیدا زمانی یۆنانی و لاتینی خوێندووە، چونكە ئەو دوو زمانە لەو سەردەمەدا زمانی زانست و فەلسەفە بووە، هەروەها لەنێوان ساڵانی 1646-1653 لە قوتابخانەی (ویستمنستر) فەلسەفەی "ئەرستۆ"ی خوێندووە. دواتر لە شاری ئۆكسفۆرد دەبێتە پارێزەر، ئاشكرایە لەو سەردەمەدا ململانێیەكی گەورە لەنێوان كامبردج و ئۆكسفۆردا هەبووە، هەردووكیان دوو شاری زانكۆیی ئاست بەرزن. شاری یەكەمیان لایەنگرانی "ئەفلاتون" كۆنترۆڵیان كردبوو، شاری دووەمیان لایەنگرانی "ئەرستۆ" كۆنترۆڵیان كردبوو، ئێمە ئەمە دەڵێین و دەزانین ململانێی نێوان فەلسەفەی ئەفلاتونی و فەلسەفەی ئەرستۆیی، بەتەواوی مێژووی فەلسەفەی لە سەرەتاوە تاكو كۆتایی بڕیبوو. فەلسەفەی ئەفلاتونی فەلسەفەیەكی زۆر میسالی یان زۆر ڕۆحانی بوو، كەچی فەلسەفەی ئەرستۆیی فەلسەفەیەكی واقیعی یاخود بەشێوەیەكی گشتی فەلسەفەیەكی مادیی بوو. ئەمەش ڕەنگدانەوەیەكی تەواوی بەسەر خودی فەلسەفەی عەرەبی ئیسلامیدا هەبوو، بۆ نمونە "ئیبن ڕوشد" لە لایەنگرانی "ئەرستۆ" بووە، كەچی "ئیبن سینا" كەسێكی میسالی بووەو پڕ بووە لە شەتەحاتی خەیاڵ و ڕۆحانییەت لەسەر شێوەی "ئەفلاتون"ی مامۆستای.

بەڵام پێویستە دان بەوەدا بنێین كە فەلسەفەی مۆدێرن، واتە فەلسەفەی "فرانسیس بیكۆن" و "تۆماس هۆبز" و "ڕێنییە دیكارت"، زۆر بە توندی ڕەخنەیان لە فەلسەفەی "ئەرستۆ" و "ئەفلاتون" گرتووە، بەمەش بوارێكی تەواو تازە لەبەردەم مەعریفەدا كرایەوە. لێرەوە "جۆن لۆك" سود و كەڵكی لە هەموو ئەوانە وەرگرتووە و تیۆرە فەلسەفی و سیاسییەكانی ئایندەی لەسەر بنیادنا. دواتر "جۆن لۆك"

پەیوەندییەکی هاوڕێیانە لەگەڵ یەکێك لە سیاسەتمەدارە گەورەکانی ئینگلیز کە ناوی "لۆرد ئاشلی" بوو دەبەستێ. ئەم پیاوە سیاسەتمەدارە وەزیری "شارلی دووەم"بووە، وەلێ بارودۆخی سیاسەت لە دژی ئەم وەزیرە هەڵدەگەڕێتەوەو ناچار لەگەڵ "جۆن لۆك"دا نەفیدەکرێ بۆ هۆڵەندەو شەش ساڵ پێکەوە لە هۆڵەندە دەمێننەوە. لەو ماوەیەدا "جۆن لۆك" بەوردی تەماشای بارودۆخی ئەوروپا دەکات، بیر لە کێشە تایفییەکانو جەنگە ناوخۆییەکانی دەکاتەوە، ئیدی تیۆرەیەك بەرهەمدەهێنێ کە لە ئایندەدا تەجاوزی هەمو ئەوانەی پێدەکات، تیۆرەکەی کتێبێکی بەناوبانگی بەناوی (وتارێك لەسەر لێکبوردن) لێکەوتەوە، دواتر "ڤۆڵتێر" لاسایی دەکاتەوە.

ئەم فەیلەسوفەی ئینگلیز، تیۆرەی لیبرالیەت بۆ دەوڵەتی ماف و یاسا گەڵاڵەدەکات، تێدا بەرگری لە مافی موڵکیەتی تاك و ئازادی تاك دەکاتو دەڵێ: ئازادی من لەوێدا تەواودەبێت کە ئازادی ئەوانی دیکە دەستپێدەکات. لێرەوە گەر "جۆن لۆك" فەیلەسوفی لیبرالیەت، واتە فەیلەسوفی ئازادی بێت، بەڵام ئەمە مانای ئەوە نییە ئەو لەگەڵ فەوزاو گێرەشێوێنیدا بێت. کۆمەڵگای لیبرال ئەو کۆمەڵگایەیە تێدا هەمو کەسێ ڕێز لە ئازادی ئەوانی دیکە دەگرێو دەستدرێژی ناکاتە سەریان، لەسەر ئەم بنەمایە کاروبارەکانی کۆمەڵگا ڕێکدەخرێن. هەر لەمبارەیەوە "جۆن لۆك" دەڵێ ئازادی مانای بەرەڵایی نییە، بگرە ئازادی مانای بەرپرسیارەتییە. خودا عەقڵو ئازادی پێبەخشیوین تاکو بەشێوەیەکی ڕاستو دروست بەکاریبهێنین، نەك بەشێوەیەکی هەڵە بەکاریبهێنین. یاسای سروشتی کە حوکمی ئادەمیزاد دەکات، لە بنەڕەتدا یاسایەکی خودایانەیە.

دواتر ئەم فەیلەسوفە گەورەیە ئەم پرنسیپانەی خوارەوە ڕادەگەیەنێ: لەسەر خەڵکی پێویستە ئەوەندەی دەتوانن پارێزگاری لە ژیانیان بکەن، چونکە ئەوە بەخشیشێکە لەلایەن خوداوە. لەسەر خەڵکی پێویستە رێزی ژیانی یەکتربگرنو پارێزگاری لە موڵكو ماڵی یەکتر بکەن، چونکە گەر وانەکەن ئەوا کۆمەڵگا دەچێتە حاڵەتی پەشێویو شپرزەییەکی مەترسیدارەوە، ئەمەش دەبێتە هۆی وێرانکردنی ژیانی کۆمەلایەتی. لەسەر هەموو تاکێك پێویستە بەتەبایی لەگەڵ ئەندامانی دیکەی کۆمەڵگادا بژیو پەنا نەباتە بەر توندوتیژی، چونکە لە کۆمەڵگای لیبرالدا کە لەسەر بنەمای عەقڵو ڕێزگرتنی بەرامبەر دامەزراوە، توندوتیژی ڕەتدەکرێتەوە. توندوتیژی تەنها ئەو کاتە ڕێگەپێدراوە کە بەرگریکردن بێت لە خود یان بەرگریکردن بێت لە کەسێکی مافخوراو کە لەلایەن کەسێکی دیکەوە دەستدرێژی کراوەتەسەرو ڕوبەڕوی لێدان بووەتەوە. بۆ ئەوەی کاروباری کۆمەڵگە بەشێوەیەکی باشو ڕێکوپێك بڕوات بەڕێوە، پێویستە لەسەر خەڵکی ڕێزی ئەو پەیمانو بەڵێنانە بگرن کە ڕێکەوتوون لەسەری. گەر هەر کەسێ لە قسەکانی خۆی پەشیمان بووەوەو ڕێزی ئەو بەڵێنو پەیمانانەی نەگرت کە دابونی، ئەوا کۆمەڵگا تێکدەچێو کاولدەبێ. لێرەوە ئازادی

مانای ڕێزگرتنی هەموو ئەو پرنسیپانەیە.

ئازادی لە تێڕوانینی "جۆن لۆك"دا مانای بەرپرسیارەتی دەگەیەنێ، یاساکانی سروشت ئەوەمان بەسەردا دەسەپێنێ، ئەو یاسایانەش کۆمەڵێ یاسای عەقڵانین و بەسەر هەموو کەسێکدا پراکتیك دەکرێ. پاشان "جۆن لۆك" دەڵێ: لە کۆمەڵگای لیبرالی مۆدێرندا مرۆڤ مافی ژیانی هەیە، مافی ئازادی هەیە، مافی ئەوەی هەیە سود لە موڵکە تایبەتییەکانی وەربگرێ، هەر کۆمەڵگایەك بتوانێ ئەو مافە سەرەکیانە بۆ تاکەکانی زامن بکات، دەتوانین بڵێین ئەوە کۆمەڵگایەکی لیبرالی عەقڵانییە. هەروەها هەموو تاکێك مافی ئەوەی هەیە بڕوا بە ئاین یاخود مەزهەبەکەی خۆی بکات، بە مەرجێ ئەوە لەڕێگەی بەکارهێنانی هێزەوە بەسەر خەڵکانی دیکەدا نەسەپێنێ. بەڵام لە کۆمەڵگاکانی پێشتردا، یاسای جەنگەڵ و گورگ تێدا بڵاوببووەوە. بە واتای ئەوەی بەهێز بێهێزی دەکوشت و دەستدرێژی دەکردە سەر موڵکەکانی. لەبەر ئەم هۆیەیە مرۆڤە پێشکەوتووەکان، خۆشبەختانە لەو حاڵەتە سەرەتاییە هەمەجیانە ڕزگاریان بووەو گواستویانەتەوە بۆ حاڵەتێکی دیکە کە تێدا حوکمی یاسا بەرقەرارە.

پاشان دانەری کتێبەکە بەردەوام دەبێ و دەڵێ: دەکرێ بڵێین ئەوە فیکری "جۆن لۆك" بوو لیبرالیەت، واتە فەلسەفەی ئازادی لەسەر هەردوو ئاستی سیاسی و ئابوری دامەزراند. لێرەوە کۆمەڵگای پێشکەوتوی ئینگلتەرە، بەرهەمی فیکری ئەم فەیلەسوفە گەورەیەیە.

ئەو پرسیارەی لەسەر ئاستی سیاسی ڕووبەڕوی "جۆن لۆك"بوەوە، بریتی بوو لەوەی ئایا دەکرێ لەو دەسەڵاتە دیکتاتۆریەی لەسەرەوە بەزۆری بەسەر خەڵکیدا سەپێنراوە ڕزگاربین؟ چۆن و بە چ شێوەیەك ڕزگاربین؟ ئایا دەکرێ بگەینە سیستمێکی حوکمڕانیکردن کە لەسەر بنەمای ئازادی، واتە ڕێزگرتن لە کەرامەتی خەڵکی دامەزرابێت؟ ئەمە ئەو پرسیارە بنەڕەتیانە بوو کە لەو سەردەمە پڕ پەشێوییەدا خرابوونەڕوو، سەردەمێك قێزەونترین و دڕاندانەترین ستەمەو جەنگی ناوخۆیی بەخۆوەبینیبوو. لەبەر ئەم هۆیەش بوو "جۆن لۆك" توانایەکی لەڕادەبەدەری بۆ دژایەتی کردنی ستەم و چەوسانەوەو دامەزراندنی سیاسیەت لەسەر کۆمەڵێ بنەمای دیکە خستبووەکار، وەك بنەمای ئازادی و بەرپرسیاریتی، چونکە دەسەڵاتی ستەم و چەوساندنەوەو هەرەمەکی پێویستە کۆتایی پێبێت و چیتر نەگەڕێتەوە.

هەر ئەمەش بوو لە ئینگلتەرا ڕویدا، دوای شۆڕشی پیرۆزی ساڵی 1688 کە "جۆن لۆك" تیۆریزەی بۆکردو پاڵپشتی بوو، کۆتایی بە ستەم و چەوساندنەوە هات، دەکرێ بڵێین بیروڕاکانی "جۆن لۆك" لەپشت بەرپابونی ئەم شۆڕشەی ئینگلتەرەوە بوو کە بۆ یەکەمجار لە مێژودا دەولەتی ماف و یاسای دامەزراند. بەم شێوەیە ئینگلتەرە بە سەد ساڵ پێش فەرەنسا، سیستمی دیموکراتی لیبرالی ئازادی هێنایەئاراوە، لەبەر ئەم هۆیەش بوو کاتێ "ڤۆڵتێر"

سالَی 1728 چووە ئینگلتەرەو ئەو سیستەمەی بینی، ئەو هەموو پێشکەوتنەی بینی کە ئەو شێوە حوکمڕانییە بەرهەمی هێنابوو کەوتە ستایش و پیاهەڵدانی. خەفەتی بۆ ئەوەخوارد کە فەرەنسا هێشتا لەلایەن ڕژێمێکی دەمارگیری ستەمگەرای ڕەهاوە دەبرێ بەڕێوە، مەبەست لەو ڕژێمە ڕژێمی "لویسی پازدەهەم"بوو. ئاشکرایە "ڤۆڵتێر" زۆر سەرسام بووە بە فیکری "جۆن لۆك" و هەوڵیداوە وەریگێڕێت و بیگوێزێتەوە بۆ فەرەنسا، تاکو لە فەرەنساشدا کەش وهەوای ئازادی و لێکبوردەیی و دیموکراتی بڵاوبێتەوە.

لێرەوە گەر فەلسەفەی "جۆن لۆك" نەخوێنینەوە، ناکرێ لەو سیستەمە سیاسییە تازەیە تێبگەین کە بەمدوایانە لە ئەوروپادا دروستبووە، چونکە ئەو تیۆریستی یەکەمی ئەم شۆڕشە دیموکراتییە بووە کە تەخت و سیستمی ستەم و چەوسانەوەی لە بنەوە لەقکرد و هەڵیتەکاند. جگە لەوانە "جۆن لۆك" فەلسەفەی لێکبوردنی ئاینی لە ئەوروپادا دەمەزراند و بانگەشەی دژایەتیکردنی فەندەمێنتالیزم و تایفەگەری دەکرد کە تووی ڕق و کینە لەنێوان ڕۆڵەکانی یەك کۆمەڵگادا دەچاند.

**سەرچاوە:**

بیان الكتب 2007/8/13

* کتێبی ژیاننامەو فیکری جۆن لۆك: نووسینی ڕۆجێر ولهاوس، لەبڵاوکراوەکانی زانکۆی کامبردج 2007، 558 لاپەڕەی گەورە.

# بڵاوكراوەكانی دەزگای چاپو پەخشی سەردەم

ئامادەكردنی: باوكی ڕەهەند

ئەو كتێبانەی لە مانگەكانی ئازارو نیساندا لەلایەن دەزگای چاپو پەخشی سەردەمەوە بڵاوكرانەوە، بەشی زۆری كتێبی بوارەكانی ئەدەب بوونو بەتایبەتی بواری شانۆ، هۆكارەكەشی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە كە دەزگای سەردەم وەك ڕێزلێنانێك بۆ ڕۆژی شانۆی جیهانی، وەك بەرزڕاگرتنی ئەو ڕۆژەو وەك بوژانەوەیەك بە بورای شانۆ، ماوەی دوو ساڵە لەو ڕۆژەدا كۆمەڵێ دەقی شانۆیی، چ خۆماڵی یان وەرگێڕدراو یاخود نوسین لەسەر مەسەلەی شانۆ بڵاودەكاتەوە، لەڕاستیدا ئەم هەوڵەی دەزگای سەردەم شایەنی دەستخۆشیو سوپاسە، هەوڵێكە شوێنی شیاوی خۆی لە ڕەوتی بەرەوپێشچونی شانۆی كوردیدا دەگرێ، چونكە ئەمە وادەكات كتێبخانەی كوردی ببێتە خاوەنی هەندێ دەقی شانۆیی كە دواتر خوێندكارانی پەیمانگای هونەرە جوانەكان سودی لێدەبینن و بۆ كاری تێزی دەرچونیان ئیش لەسەر ئەو دەقانە دەكەن، هەروەها تیپە شانۆییەكان دەتوانن كار لەو دەقانەدا بكەنو لەسەر ڕووی لاپەڕەكان بیانگوازنەوە بۆ سەر تەختی شانۆ. واتە ئەم هەوڵە بە ئاسانی كۆمەڵێ دەقی نایابی بیانیو خۆماڵی دەخاتە بەردەست هەمو ئەو تیپو هونەرمەندانەی سەروكاریان لەگەڵ كاری شانۆیدایەو وادەكات تاڕادەیەك مەسەلەی قەیرانی نەبونی دەقی شانۆیی كەمكاتەوە.

## ئاهەنگی جەژنی لەدایكبوون

ئەم كتێبە یەكێكە لە دەقە هەرە جوانەكانی نوسەری ئینگلیزی بەناوبانگ "هارۆڵد پینتەر"، ئاهەنگی جەژنی لەدایكبوون دووەم كاری شانۆیی "هارۆڵد پینتەر"و لە ساڵی 1958 نمایشكراوە، ئەم دەقە گەرچی لەلایەن ڕەخنەگرانەوە پێشوازییەكی باشی لێكرا، بەڵام لەلایەن جەماوەری لەندەنەوە بەشێوەیەكی زۆر سەیرو نامۆ پێشوازیلێكرا، لە ڕۆژی یەكەمی نمایشەكەدا تەنها شەش كەس ئامادەی بینینی

بوون، وەلێ دوای ئەوەی لە ساڵی 1960 شانۆنامەی (پاسەوانی شەو)ی نوسیو لەلایەنی مادییەوە ڕەواجێکی باشی هەبوو، جارێکیتر شانۆنامەی ئاهەنگی جەژنی لەدایکبوون نمایشکرایەوەو ئەمجارەیان سەرکەوتنێکی باشی بەدەستهێنا.

"هارۆڵد پینتەر" لە 10 تشرینی یەکەمی ساڵی 1930 لە شارۆچکەی (هاکنی) لە دایك و باوکێکی جوولەکە لەدایکبووە، هەر لەو شارۆچکەیەدا دەچێتە قوتابخانەی سەرەتایی، لە قوتابخانەدا ڕۆڵی ماکبێس و پاشان ڕۆڵی جۆلێت لە شانۆنامەکانی "شەکسپیر"دا دەگێڕێ. بەلام یەکەمجار کە "هارۆڵد پینتەر" دەڕوا بۆ شانۆ ئەوکاتە بوو کە ڕۆیشتووە ئەکتەری ئینگلیزی "دۆناڵد وڵفس" ببینێ کە لە یەکێك لە شانۆنامەکانی شەکسپیردا ڕۆڵی بینیوە، دواتر "هارۆڵد پینتەر" شەش جاری دیکە دەچێتەوە بۆ شانۆکە تاکو هەمان ئەکتەر ببینێتەوە، کار گەشتە ئەوەی "هارۆڵد پینتەر" ڕۆڵێکی سانەوی لەگەڵ "دۆناڵد وڵفس" لە شانۆنامەیەك بەناوی (یەکێك لە سوارچاکی پاشا) ببینێ.

"هارۆڵد پینتەر" خاوەنی گەلێك دەقی شانۆیی ناوازەو دەگمەنە، بەلام لە ساڵی 2005 وازهێنانی خۆی لە نوسین ڕادەگەیەنێ و خۆی بۆ کاری سیاسەت تەرخاندەکات، ئەم شانۆنوس و دەرهێنەرە شانۆییە کۆمەڵێ چالاکی سیاسی دیارو بەرچاوی هەیە کە تێیدا بەرگری لە ماف و ئازادی خەڵکانی بەشخوراو کردووە، بەبێ ئەوەی گوێبداتە هەڵوێستی ڕەسمی وڵاتەکەی. بۆ نمونە لە ساڵی 1985 لەگەڵ شانۆکاری ئەمریکی "ئارسەر میللەر" بەسەردانێك دەچنە تورکیا، لەوێ ئەو شێوە جیاوازانەی ئەشکەنجەدان و سەرکوتکردنانەی بینی کە ڕووبەڕوی ئۆپۆزسیۆنەکانی ئەو وڵاتە دەبنەوە، لە ئاهەنگێکی ڕەسمی کە لە تورکیا و لەسەر شەرەفی "ئارسەر میللەر" لە سەفارەتی ئەمریکا سازکرابوو، "هارۆڵد پینتەر" دەڕوات وتەیەك دەربارەی شێوازەکانی ئەشکەنجەدان و سوکایەتیکردن بە لاشەی خەڵکانی دژ بە ڕژێمی تورکیای ئەو کات پێشکەش بکات کە حکومەتی ئەمریکا پاڵپشتێکی تەواوی لەو ڕژێمەی تورکیا دەکرد، وتەکەی "هارۆڵد پینتەر" بووە هۆی ئەوەی لە ئاهەنگەکە دەریبکەنە دەرەوە، "ئارسەر میللەر"یش وەك هاوسۆزییەك لەگەڵ "هارۆڵد پینتەر"دا لە ئاهەنگەکە هاتەدەرەوە، گەرچی ئاهەنگەکە لەسەر شەرەفی ئەو سازکرابوو، کاریگەری ئەم سەردانەی "هارۆڵد پینتەر" لە شانۆنامەی



(زمانی شاخ) کە لە ساڵی 1988 نوسیویەتی بەئاشکرا دیارە.

لە 13 تشرینی یەکەمی ساڵی 2005 ئەکادیمیای سویدی پادشاتی نۆبڵی ئەو ساڵەی بۆ ئەدەب بەخشییە "هارۆڵد پینتەر". دەقی شانۆنامەی ئاهەنگی جەژنی لەدایکبوون لەلایەن "عەلی عوسمان یەعقوب"ەوە لە زمانی ئینگلیزیەوە وەرگێڕدراوە، ئەم کتێبە جگە لە دەقی شانۆنامەکە کۆمەڵێك وتاری زۆری لەخۆگرتووە کە زۆربەیان باس لە ژیان و بەسەرهاتی نوسەر دەکات و باس لە گرنگی و بایەخی شانۆنامەکانی "هارۆڵد پینتەر" دەکات و نزیکەی 70 لاپەڕەی کتێبەکەیە، واتە دەقە شانۆییەکە لە لاپەڕە 72 دەستپێدەکات، ئەم وتارانە وادەکات خوێنەر تاڕادەیەکی باش ئاشنای جیهانی شانۆیی "هارۆلد پینتەر" بەتایبەتی و شانۆی ئینگلیزی بە گشتی ببێت.

تیراژی کتێبەکە 500 دانەیەو نرخی 2000 هەزار دینارەو ژمارەی لاپەڕەکانی 189 لاپەڕەی بچوکە.

### حەوت شانۆنامە بۆ منداڵان

یەکێکی دیکە لەو کتێبانەی کە تایبەتە بە دەقی شانۆیی، کتێبی حەوت شانۆنامە بۆ منداڵانە، ئەم کتێبە حەوت دەقی شانۆیی جوان و سەرنجڕاکێشی لەخۆگرتووە کە بەتایبەت بۆ منداڵان نوسراون و دەکرێ بەشی منداڵانی تەلەفزیۆنەکان و کەناڵە ئاسمانییە کوردییەکان سودی لێوەربگرن و بیانکەن بە ئۆپەرێت و لە شاشەی تەلەفزیۆنەکانەوە نمایشی بکەن. ئاشکرایە کتێبخانەی کوردی لە بواری دەقی شانۆیی بۆ منداڵان تابڵێی هەژارو دەستکورتە، ئێمە بەدەگمەن نەبێت نوسەرێکمان نییە تایبەت بێت بە نوسین بۆ منداڵ و جیهانە پڕ پرسیارو پڕ سەرسوڕمانەکەی.




لێرەوە گرنگی ئەم دەقانە لەوەدایە نوسەرێك نوسیویەتی ئیش بۆ جیهانی منداڵ دەکات و لەم بوارەدا ژمارەیەکی زۆر دەقی شانۆیی بۆ منداڵ و مێردمنداڵان نوسیوە، نوسەری کتێبەکە "ئەحمەد ئیسماعیل ئیسماعیل" بە ڕەگەز کوردەو خەڵکی سوریایە، بەڵام بە عەرەبی دەنوسێ، سەرجەم شانۆنامەکانی ناو ئەم کتێبە بەزمانێکی سادەو ڕەوان نوسراون کە منداڵ بەئاسانی لێیتێدەگات و دەتوانێ گەر دەقەکان خرانە سەر تەختی شانۆ، بەئاسانی ڕۆڵەکان ببینێ، ئەمە جگە لەوەی بەشێکی زۆری کارەکتەرەکان ئاژەڵن، وەك ڕێوی و گورگ و ئەسپ و مراوی و کەڵەشێر..هتد. ئەم

ئاژەڵانەش لە دنیای منداڵەوە نزیکن و ئاشنان پێیان، ئەمە وادەکات گواستنەوەی دەقەکان بۆ ناو هۆڵی شانۆکان و لە ڕێگەی منداڵانەوە، کارێکی قورس نەبێت و زەحمەتێکی زۆری نەوێت.

ئەم کتێبە لەلایەن "هەورامان وریا قانع"ەوە کراوە بەکوردیو تیراژەکەی 500 دانەیەو نرخی 3000 دینارەو ژمارەی لاپەڕەکانی 288 لاپەڕەی گەورەیە.

## فەرهەنگی شانۆ

یەکێکی دیکە لەو کتێبانەی تایبەتە بە بواری شانۆ، کتێبی فەرهەنگی شانۆی کە "یاسین قادر بەرزنجی" ئامادەیکردووە، ئاشکرایە ئامادەکاری ئەم کتێبە بۆخۆی یەکێکە لە کەسە چالاك و بە تواناکانی مەیدانی شانۆی کوردیو سالانێکی زۆرە سەرقاڵی کاری نواندنەو لە بواری نواندندا ڕۆڵێکی بەرچاوی هەیەو خاوەنی ستایلی تایبەت بەخۆیەتی. هەڵبەتە گرنگی ئەم کتێبە لەوەدایە قسەوباس یاخود شەرحی کۆمەڵێك زاراوەی شانۆیی دەکات کە زۆر پێویستن بۆ کاری شانۆیی و دەبێ هەمو ئەکتەرێك یاخود دەرهێنەرێکی شانۆیی شارەزایی لەبارەیانەوە هەبێت و بزانێ چۆن و بە چ شێوەیەك مامەڵەیان لەگەڵدا دەکات. لە ڕاستیدا بەبێ تێگەشتن لەو زاراوانەو بە بێ ناسینیان بە شێوەیەکی زانستی، ئەستەمە ببینە خاوەنی شانۆیەکی مۆدرێنی پێشکەوتوو. ئەستەمە کاری دەرهێنان و نمایشکردنی شانۆ ئەنجامبدەین، بەڵام لەهەمانکاتدا بێ ئاگابین لەو هەمو زاراوە شانۆیانەی لە شانۆدا بەکاردەهێنرێن، زەحمەتە بەبێ تێگەشتن لە زاراوەکان بتوانین شانۆیەکی پێشکەوتوی تاڕادەیەك موتەکامل پیشانی بینەر بدەین، ئەو زاراوانەی لەم کتێبەدا خراونەتەڕوو کۆڵەکەیەکی گرنگی شانۆیەو ناکرێ لەوەزیاتر پشتگوێ بخرێن. کتێبەکە بۆ دوو بەش دابەشکراوە، بەشی یەکەمیان بریتییە لە شەرحکردنی زاراوە شانۆییەکان کە ژمارەیان 111 زاراوەیە، لەوانە ئارایشت، پانتۆمایم، پرۆڤە، پشوو، دەمامك، ڕوداو، وەستانی کاتی، نواندنی بێدەنگ..هتد




بەشی دووەمی کتێبەکە تەرخانە بۆ ناوە دیارو درەوشەدارەکانی جیهانی شانۆ، لەم بەشەدا خوێنەر ئاشنادەبێ بە ژیان و بەسەرهاتی ژمارەیەك لە نوسەران و شانۆنوسانی جیهانی، لەوانە سامویل بیکێت، سارتەر، ڤیکتۆر هیگۆ، ڤۆڵتێر، مۆلێرو زۆرێکی دیکە، جگە لەو دوو بەشەو لەنێوان لاپەڕەکانی کتێبەکەدا، واتە لەسەرەتای کتێبەکەوە بۆ کۆتاییەکەی چەندین وێنەو

تابلۆی جوانو ناوازە دانراون كە گوزارشت لە زاراوەیەك لە زاراوەكان دەكەن، یاخود وێنەی دیمەنێكە لە نمایشێكی شانۆیی، یان وێنەی نوسەرێكی شانۆییە، ئەمەش جوانیەكی زیاتری بەخشیوەتە دیزاینی كتێبەكەو وادەكات خوێنەر كاتێكی خۆشو بەسود لەگەڵ خوێندنەوەی كتێبەكەدا بباتەسەر.

### مەزرای ئاژەڵان

رۆمانی مەزرای ئاژەڵان یەكێكە لەو رۆمانە نایابانەی دەزگای سەردەم چاپیكردووە، ئەم رۆمانە پێگەیەكی بەرزی لە ئەدەبیاتی جیهانیدا هەیە، ئەو پێگەیەش تەنها بەهۆی ناوەڕۆكە سەرنجڕاكێشەكەیەوە نییە، بەڵكو لەبەر بەها هونەرییە بەرزەكەشیەتی، دانەری رۆمانەكە "جۆرج ئۆروێل" لە ساڵی 1943 ئەم رۆمانە تاڕادەیەك كورتەی نوسیوە، رۆمانەكە باس لە مەزرایەكی ئاژەڵان دەكات كە لەلایەن مستەر "جۆنز"ەوە بەڕێوەدەبرێ، ئاژەڵەكانی ناو ئەم مەزرایە هەستدەكەن شێوازی بەڕێوەبردنی مەزراكە و مامەڵەكردنی خاوەنی مەزراكە زۆر نادادپەروەرانەیەو پڕە لە زوڵمو توندوتیژیو چەوساندنەوە، بۆیە لە یەكەم دەرفەتدا ئاژەڵەكان شۆڕش لەدژی مستەر "جۆنز" بەرپادەكەنو دەتوانن لە مەزراكە دەریپەڕێنن، پاشان كۆمەڵێ لە بەرازەكان كاروبارەكانی مەزراكەو سەرلەنوێ رێكخستنەوەی بەڕێوەدەبەنو بۆ دروستكردنی مەزرایەكی تازە كە دووربێ لە چەوساندنەوەو ئیستغلالكردنو پڕبێت لە دادپەروەریو خۆشگوزەرانی، چەند دروشمێك بەرزدەكەنەوە، دروشمەكان باس لە دڵسۆزی دەكات لە ئیشوكارەكانداو دووركەوتنەوە لە تەمەڵیو ناكۆكی.




بەڵام چی بڵێین گەر ئەم دروشمە بریقەدارانە بگۆڕدرێنو ببنە چەقۆ بەسەر ملی ئاژەڵەكانەوە، هەر ئەوەشبوو روویدا، بەناوی ئازادییەوە ئاژەڵەكان بوونە كۆیلە، بەناوی یەكسانییەوە مافەكانیان زەوتكرا، بەناوی خۆشگوزەرانییەوە برسی كران، بەناوی ژیانەوە خوێنیان ڕژاو بەناوی دواڕۆژەوە دەمیان بەسترا. ئەم رۆمانە لەلایەنی هونەرییەوە وەك باڵەخانەیەكی تۆكمەو پتەو دەردەكەوێ، گەرچی كەسێتیەكانی ناو رۆمانەكەو رووداوەكانیو شوێنو زەمانی رۆمانەكە، تایبەتن بە جیهانی خەیاڵو لە دەرەوەی جیهانی واقیعیدان، كەچی لەگەڵ ئەوەشدا نزیكە لێمانەوەو بە ئاسانی دەخوێنرێتەوەو تێگەشتن لێی سەخت نییە، بگرە مرۆڤ لەكاتی خوێندنەوەی رۆمانەكەدا بەرامبەر بە كارەكتەرەكانی ناو رۆمانەكە هەست

بەهیچ شتێکی نامۆ ناکات، توشی پرسیاری لەم جۆرە نابێت: ئایا ئەو ئاژەڵانە چۆن دەتوانن بەم شێوەیە قسەبکەن؟ یاخود ئەو ئەسپە چۆن دەتوانێ ئاوا بگری؟ یاخود بەراز چۆن دەتوانێ تفەنگ بەکاربێنێت؟ هەمو شتەکان بەلای خوێنەرەوە ڕێچکەی ئاسایی خۆیان وەرگرتووە، ئەم پەیوەندییە بەهێزەی نێوان خەیاڵو واقع، ئەوە وایکردووە ڕۆمانەکە بەشێوەیەکی بەرچاو بڵاوببێتەوەو وایکردووە بۆ زۆربەی زمانەکانی جیهان وەربگێڕدرێت.

"جۆرج ئۆروێل" نوسەرو ڕۆماننوسی بەریتانی لەساڵی 1903 لە گوندی (مۆتاهای) سەر بە ویلایەتی (بونجاب)ی هندستان لە خێزانێکی نیمچە هەژار لەدایك بووەو لە ساڵی 1950 بەهۆی نەخۆشی (سیل)ەوە کۆچی دوایی کردووە، واتە تەمەنی ئەم ڕۆماننوسە تەنها 47 ساڵ بووە، ناوی ڕاستی "ئەریك ئەرسەر بلێر"بووەو نازناوی "جۆرج ئۆروێل"و هەر بەم نازناوەشەوە ناوبانگی دەرکردووە، باوکی فەرمانبەرێکی بچوك بووە لە ئیدارەی بەریتانیا لە هیندستان، ساڵی 1911 کاتێ تەمەنی "جۆرج" دەگاتە یازدە ساڵ، خێزانەکەیان دەگەڕێنەوە بۆ بەریتانیاو لە (هنلی) نیشتەجێدەبن، بەڵام باوکی تاکو ساڵی 1912 لە هندستان دەمێنێتەوەو لەو ساڵەدا واز لەکارەکەی دەهێنێت و ئەویش دەگەڕێتەوە بۆ بەریتانیا.

"جۆرج ئۆروێل" یەکەم کتێبی خۆی لەساڵی 1929 نوسینی، کتێبەکەی بریتی بوو لە ڕاپۆرتێك لەسەر ئەو ماوەیەی لەنێوان لەندەن و پاریس و لەنێو هەژارانی ئەو دوو شارەدا بردبویەسەر. بەڵام ئەم ڕاپۆرتە تەنها لەساڵی 1933 ڕوناکی دەبینێ و بڵاودەبێتەوە، دواتر کتێبێکی دیکە بەناوی (ڕۆژەکانی بۆرما) بڵاودەکاتەوەو باس لەو ڕۆژگارە دەکات کە لە بۆرمادا گوزەراندویەتی. ساڵی 1935 ڕۆمانی (کچی قەسیس) دەنوسێ، لە ساڵی 1936 ڕۆمانی "لێگەڕێ با گوڵەکە بفڕێ". ساڵی 1938 توشی نەخۆشی سیل دەبێ و بۆ بەسەربردنی کات دەڕوات بۆ مەغریب، لەوێ ڕۆمانی (هاتنەدەرەوە بۆ هەناسەدان) دەنوسێ و ساڵی 1939 بڵاودەکرێتەوە. ساڵی 1943 دەستدەکات بە نوسینی ڕۆمانە بەناوبانگەکەی مەزرای ئاژەڵان، دواجار لە ساڵی 1946 دواهەمین ڕۆمانی (ساڵی 1984) دەنوسێ.

وەرگێڕانی لەلایەن ئەدیب نادرەوە لە ئینگلیزییەوە کراوە بە کوردی. تیراژی کتێبەکە هەزار دانەیەو نرخی 3000 دینارەو ژمارەی لاپەڕەکانی 172 لاپەڕەی بچووکە.

